شلماشی، محمد
مەجلیسی ئەولیا بەرگی ٢-١؛ دانراوی محمدی شلماشی؛ پیاچوونەوەی زبیر حافظ. ـ
سنندج: انتشارات کردستان، ١٣٧٩.
٢ج. در یک مجلد (٤٨٠).
ISBN: 964 - 6564 - 21 - 8 ٤٠٠٠٠ ریال.
فهرستنویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی.
کتابنامە.
عارفان ـ ـ سرگذشتنامە. ٢. اسلام ـ ـ سرگذشتنامە. الف. حافظ، زبیر، ویراستار.
ب. عنوان.
٩م٧٨ش/BP٢٧٨ ٢٩٧/٨٩٢
کتابخانه ملی ایران ١٢٨٥٠ ـ ٧٩م




# مەجلیسی ئەولیا

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | مەجلیسی ئەولیا |
| ✓ دانراوی (تألیف): | محمدی شلماشی |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | سێهەم (سوم)؛ ١٣٨٦ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ٣٠٠٠ دانه (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ٤٨٠ صفحەی وزیری |
| ✓ بلاوکەرەوە (ناشر): | بلاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کردستان) |

نرخی: شابک: ٨ ـ ٢١ ـ ٦٥٤٦ ـ ٩٦٤
٤٠٠٠ تمەنە ISBN: 964 - 6545 - 21 - 8

# سەرباسەکان (ناوەڕۆک)

# سەرچاوەکانی ئەم کتیبە

قورئانی پیرۆز

حەدیسی پێغەمبەر

تذکرةالاولیاء ........................................ فریدالدین عطار

سفینةالاولیاء ........................................ محمد دارا شکوه

حلیة الاولیاء ........................................ احمد اصفهانی

نفحات الانس ........................................ مولانای جامی

کرامات الأولیاء ........................................ یوسف النبهانی

الرسالة القشیریة ........................................ عبدالکریم القشیری

الروض الفائق ........................................ الشیخ حریفیش

نور الأبصار ........................................ الشیخ مؤمن

طبقات الکبریٰ ........................................ عبدالوهاب الشعرانی

تأریخ بغداد ........................................ الخطیب البغدادی

کلیات ........................................ الشیخ سعدی شیرازی

اعانة الطالبین ........................................ السید ابوبکر

طبقات الصوفیة ........................................ الشیخ عبدالرحمن سلمی

الحدائق الوردیه ........................................ عبدالمجید بن محمد الخانی

حالة اهل الحقیقة مع الله ........................................ ابی شجاع الشافعی

الاعمال الكامله ........................ الشيخ معروف النودهى

الفتاوى الحديسيه.......................... الشيخ ابن حجر

اسرار التوحيد فى مقامات الشيخ ابى سعيد ................ محمد ابن منور

ربيع الابرار.......................................... للعلامة الزخشرى

بوستان العارفين .......................................... الشيخ نووى

وفيات الاعيان ............................................. ابن خلكان

الفتوحات الاسلامية ......................... السيد احمد ابن زينى دحلان

# پێشەکی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمدُلِلّٰهِ رَبِّ الْعالَمِينَ. وَالصَّلاٰةُ وَالسَّلاٰمُ عَلىٰ سَيِّدِ الأَنْبِياٰءِ وَ نُورِ الأَوْلِيٰاءِ مُحَـمَّدٍ الْقٰائِل: بِقَوْلِهِ ـ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَعَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ التّٰابِعِينَ لَهُمْ بأَحْسٰانٍ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ].

خوێنەر و گوێگری بە ڕێز، دوا ئەوەی، کە ژیانی ئەو بیست و پێنج پێغەمبەرەم نووسی ـ کە خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بە ئاشکرا ناویان دەبا ـ بڕیارمدا، کە ژیان و کەشف و کەرامات و بە سەرهات و زوهد و تاعەت و فەرمایشتی چەند ئەولیای گەورە لە ئەولیای ئوممەتی پێغەمبەر بنووسم و بیکەمە کتێبێک و لە مەجلیس و کۆڕی دانیشتندا بۆ خەڵک بخوێندرێ و لە چەند دەقیقەو سەعاتی ژیانیاندا بە دڵێکی پڕ لە ئیمان و باوەڕەوە هەر ڕۆژە بچنە مەجلیسی یەکێک لەو پیاوە گەورانەو، مشت وماڵی عەقیدەو بیر و باوەڕیان بکەنەوە، لەوانەشە هێندێک لە زانایان و خوێنەرە بەڕێزەکان بڵێن: تازە باوی ئەو جۆرە قسەو باسە نەماوە، بەڵام بە لای منەوە لە بەر ئەو چەند هۆیەی خوارەوە، یادی ئەو جۆرە پیاوە بەرز و پیرۆزانە بە سوودە.

یەکەم لە بەر ئەو حەدیسە شەریفەی، کە حەزرەتی عومەر ـ ڕەزای خوای لێ بێ ـ لە پێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە ڕۆژێک پێغەمبەر فەرمووی: [إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لَأُنَاساً مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءٍ وَ لا شُهَدَاءٍ يَغْبِطُهُمْ الأَنْبِيَاءُ وَ الشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْـقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللهِ عَزَّوَجَلّ] واتە بە ڕاستی لە ناو عەبد و بەندەکانی خوادا، کۆمەڵێک هەن، نە پێغەمبەرن، نە شەهید، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتا، زۆر لە پێغەمبەران غیبتەیان پێ دەبەن، بە هۆی ئەو پلەو پایەوە، کە خودا داویەتی بە وان، یەکێ عەرزی کرد:

قوربان ئەوانە کێن و کردەوەیان چیە تا بیان ناسین و خۆشمان بوێن؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوانە چەند کەسانێک دەبن لە ئۆممەتی من، لە بەرخوا، خوا و پەکتریان خۆش دەوێ و ناوچاوانیان نووری لێ دەبارێ و لەو ڕۆژەدا کە خەڵک، زۆر لە عەزابی خوا دەترسن، ئەوان هیچ خەفەتیان نیەو، کاتێک عالەم مەحزون و غەمبارن، ئەوان بێ غەم‌ئەبن، ئنجا ئەو ئایەتەی سوورەی یونسی خوێندەوە، کە خواوەندی گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَ لاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئاگادار بن، کە ئەولیای خوا لە ڕۆژی قیامەتا هیچ خەوفیان لە سەر نیەو، بۆ هیچ شتێکیش بە پەرۆش نین، جا بابزانین، کە ئەولیای خوا بە کێ ئەڵێن؟

لە ئایەتی دوای ئەو ئایەتەی پێشودا خوای گەورە ئیشارەیان بۆ دەکا و دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَ كَانُوا يَتَّقُونَ﴾ ئەولیا ئەو کەسانەن پەرهێزگار بن و ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەر و قیامەت هێنابێ و موخالەفەی ئەمر و فەرمانی خوا و پێغەمبەر نەکەن و بەر دەوام بن لە سەر خواپەرستی، خواوەندی گەورە لە مەدح و سەنای ئەواندا دەفەرموێ: ﴿لَهُمُ الْبُشْرىٰ فِى الْحَيٰوةِ الدُّنْيَا وَ فِى الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللهِ ذٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ موژدەی خۆشی بۆ ئەو کەسانە ژیانی دنیادا، کە بە هۆی پێغەمبەر و قورئانەوە، دراوە بەو جۆرە کەسانە و بە کشف و کەرامەت و بە هۆی مەلائیکە، کە لە کاتی سەرەمەرگدا جێگا و مەقامی خۆیان نیشان ئەدەن، کە دیارە خواوەندی گەورە ڕوتبەو مەقامێکی دا بە کەسێک، تازە لێی پەشیمان نابێتەوە.

جا هەر لە بەر ئەو ڕوتبەو مەقامەیە، کە پێغەمبەری خۆشەویستمان دروودی خوای لە سەر بێ فەرموویەتی: [تَنَزَّلُ الْبَرَكَةُ عِنْدَ ذِكْرِ الصَّالِحِينَ] واتە بەرەکەت دەبارێ بە سەر دانیشتووانی ئەو مەجلیسەدا، کە یادی پیاو چاکانی تێدا دەکرێتەوە.

دووەم، لام وایە ئەگەر ئینسان بیری لێ بکاتەوەو بە راوردی بکا، بۆی دەردەکەوێ، کە هەر وەک چۆن ئەگەر یەکێک جارێک قسەیەکی نالایقی پێ بڵێ تا

دەمرێ لە دڵی دەرناچێ و پێی ناخۆشە، ئاواش باسی ژیان و بە سەرهات و قسە خۆش و جوانەکانی ئەو پیاوە بەرز و پیرۆزانە، چەند قات تەئسیری باشیان لە نەفسی ئینساندا دەبێ.

هەرچەند ئێمەش نەگەیشتبینە ئەو پلەو پایە، کە لە ڕاز و نیازو فەرمایشتی ئەو زاتانە بگەین، بەڵام یاد کردنەوەیان فائیدەی هەر زۆرە هەر وەک ئەڵێن: جارێک لە شێخ عبدالرحمنی ئیسکافیان پرسی قوربان، کەسێک قورئان بخوێنێ وە هیچ مەعنای نەزانێ سوودی پێ دەگا؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوەی دەرمان دەخوا و نازانێ ئەو دەرمانە لە چی دروست کراوە ئیستیفادەی لێ دەکا! بەڵام ئەوەی قورئان بخوێنی و مەعنای نەزانێ ئیستفادەی لێ ناکا؟

**هۆیەکی ترم** بۆ باسی نووسینی ئەو چەند ئەولیایە، ئەو فەرمایشتەی شێخ یوسفی هەمەدانیە، کە جارێک عەرزیان کرد قوربان.

ئەگەر هات و زەمانێک داهات ئەولیا و پیاو چاک بە نادر دەست دەکەوتن، کە موسوڵمانان بە خزمەتیان بگەن چی بەکەین؟

لە وەڵامدا فەرمووی: خوو ڕەوشت و ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتەکانیان بنووسن و بیان خوێنن سوودیان لێ وەر دەگرن.

هەر وەها **هۆیەکی تری** دانانی ئەم کتێبە ئەوەیە، باسی ئەولیا و پیاو چاک بە هەموو زمانەکانی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاست و زۆر بەی زمانەکانی تریش تا ئێستا نووسراوەو لە چاپ دراوە، بە لام کۆشکی ئەدەبی زمانی کوردی، بەشی کتێبخانەکەی لەفەرمایشتی وەک گەوهەرە و مراوری ئەو پیاوە گەورانە خاڵی یە، ویستم با بە ئامانەتیش بێ ئەو کەلێنە پڕ بکەمەوە. تا نووسەرێکی دوورناس، وەک مەلەوانی چاک خۆی داوێتە دەریای مەعانیەوە و بە پێ مەلە بە بەحری مەعریفەت و دەریای حەقیقەتا دەڕواتە خوارەوەو بە دانەی جەوهەری و داوی نووکی قەڵەمی و شیرینی زمانی کوردی، یەکە، یەکە، گوهەرەکانی ئەو

زانایانەمان لە گێژی قوولّی ویلایەتا بۆ دێنیتە سەر شریتی نووسین و تۆماریان دەکا و خەڵک ئەوکاتە بە ئارەزووی خۆیان سوودیان لێ وەر ئەگرن.

**هۆیەکی تر** ئەوەیە، زۆر کەس بە ناوی کۆلکە شیخەوە زۆر کردەوەی دوور لە دین و شەریعەتی ئیسلامی دەکەن و لە ڕێبازی تەریقەت و ئەولیا لا ئەدەن و ئەوەش بۆتە هۆی ئەوە، کە زۆریەی خەڵک و زۆر خوێندەوار و نیمچە خوێندەواریش باوەڕیان بە ئەولیا و پیاو چاک نەمێنی.

لە گەڵ ئەوەشدا، کە گەورەیی و کەڕاماتی ئەولیای ڕاستەقینە، بە ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر و یەک دەنگی ئەهلی سوونەت و جەماعەت حەقە و ئاشکرایە.

بۆ وێنە خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەی ئالی عیمران دا فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِاللهِ﴾ زۆر لە عولەمای تەفسیر فەرموویانە: کاتێک حەزرەتی مەریەمە حامیلە بوو بە حەزرەتی عیسا، حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەر (عَلىٰ نَبِيِّنَا وَ عَلَيْهِ السَّلامُ) ژوورێکی تایبەتی لە «بیت المقدس» دایە و دەرگای لە سەر دادەخست، حەزرەتی مەریەمە بۆ کاری تایبەتی خۆی نەبووایە نە دەهاتە دەر، وە حەزرەتی زەکەریاش نەبووایە کەس حەقی نەبوو لەو ماوەیەدا بچی بۆ لای. بەڵام هەرکاتێ حەزرەتی زەکەریا دەچوو بۆلای تەماشای دە کرد میوەی هاوینی لە کاتی زستاندا لایەو هی زستانیش لە هاویندا لایە، چونکە ئافرەتی حامیلە زۆر جار وایە ئارەزوو بێزوی شتی وا دەکا، کە لە کاتی خۆیدا دەس ناکەوێ: حەزرەتی زەکەریا زۆری لە لاسەیر بوو، پرسیاری لێ کرد و فەرمووی: ئەی مەریەمە ئەوەت لە کوێ بووە؟ لە وەڵامدا حەزرەتی مەریەمە فەرمووی: لای خواوە بۆم دێ. دەی کەڕامەت بوو بۆ حەزرەتی مەریەم و موعجیزە بوو بۆ حەزرەتی زەکەریا.

لەوەش عـەجایبتر و گـەورەتر، کـە بـەڵگە و دەلیـل بـێ لە سـەرکەشف و کەرامەت، مەسئەلەی هێنانی تەختی بەڵقیسە بۆلای حەزرەتی سولەیمان، هـەر وەک خواوەندی گەورە لە سوورەی نەملدا ـ بۆمان بەیان دەکا و دەفەرمووێ:

﴿قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾

وەختێ حەزرەتی سولەیمان هەواڵی هاتنی بەڵقیسی پاشای شاری سەبای زانی، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی دانیشتوان، کێ دەتوانێ تەختی بەڵقیسم بۆ بێنێ؟ لە پێش ئەوەی دابگاتە لای من و موسوڵمان ببێ؟ عیفرێتێک لە ئەجینە کان ووتی: مـن دەچم بۆت دێنم لە پێش ئەوەدا کە لە جێگای خۆت هەستی، زۆریش بە تاقەتم و خەیانەتیشی لێ ناکەم، بەلاّم یەکێ تر لە وانەی خواوەندی گەورە زانای کرد بوو، گوتی: من لە پێش ئەوەیداتەماشای شتێک بکەیت و چاو لە سەرێک بنیێتەوە بۆت دێنم، حەزرەتی سولەیمان کە چاوی هەڵێنا تەختی بەڵقیسی لا دانرا بـوو، فەرمووی: ئەوە لە گەورەیی خواوەیە، بۆ تاقی کردنەوەی منە، داخۆ شوکرانەی نیعمەتی خوا دەکەم یان نا، کاتێ ئەو زانایە وای گوت: حەزرەتی سولەیمان بە مەحاڵی نەزانی و ئینکاری نە کرد خۆ دیارە ئەگەر ئەو زانایە ئاسەفی وەزیر بوو بێ پێغەمبەر نەبووە تا بڵێین موعجیزەی نواندووە.

ئەوە کەراماتی ئوممەتەکانی پێغەمبەرانی پێش پێغەمبەری خۆمان بوون، ئەی باشە [يَا سَارِيَةُ الْجَبَلَ الْجَبَلَ]ی حەزرەتی عومەر ڕەزای خوای لە سەر بێ، کەشف و کەرامەت نەبوو؟ لەو کاتەدا، کە لشکـری ئیسلام بـەسەر کـردەیی سـاریە لە نەهاوندی لای شاری هەمەدان شەڕیان دەکرد، ئاگایان لە خۆیان نەبوو کافرەکان لە پشت کێوەکەوە خەریک بوون پشتیان بگرن، حەزرەتی عـومەر لە خـوتبەی جومعەدا لە شاری مەدینە فەرموی: ئەی ساریە ئاگاتان لە خۆتان بێ خـەریکن پشتی کێوەکەتان لێ بگرن، بە ئەمری خوا ساریە گۆی لە دەنگی حەزرەتی عومەر بوو، ناردی کێوەکەیان گرت، نموونە یەکی تر لە کـەرامـتی ئـەولیای ئـوممەتی

پێغەمبەر، وەسیەتەکەی حەزرەتی ئەبوبەکری سدیقە، کە جابیری کوڕی عبدالله بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کاتێ حەزرەتی ئەبوبەکر نەخۆش کەوت، وەسیەتی کردو فەمووی: ئەگەر مردم تەرمەکەم بەرنە بەر قاپی حوجرەکەی پێغەمبەر و لە قاپی بدەن و بڵێن: ئەوە تەرمی ئەبوبەکری هاوڕێی پێغەمبەرە، لە دنیادا زۆری حەز بە خزمەت پێغەمبەر دەکرد، وەسیەتی کردووە لە خزمەت پێغەمبەردا بینێژن، فەرمووی: جا ئەگەر قاپی حوجرەکەی حەزرەت لە خۆیەوە کرایەوە ئەوە لەوێ تەسلیم بە خاکم بکەن، ئەگەر نەشکرایەوە لە گۆڕستانی «بەقیع» بمنێژن، جابیر دەفەرمووێ: کە وەفاتی فەرموو: بردمان بۆ بەرقاپی پێغەمبەرو چی فەرموو بوو وو‌تمان: بە ئەمری خوا لە غەیبەوە قاپی حوجرەکەی حەزرەت کرایەوەو لە وێمان تەسلیم بە خاک کرد.

هەروەهاش کۆمەڵی زانایان فەرموویانە: کەرامەتی ئەولیا حەقەو تا ئیستا زۆر لە ئەولیا کەراماتیان نواندووە. شێخ شەهابەدینی سووهرەوەردی ڕەزای خوای لێ بێ فەرموویەتی: کەراماتی ئەولیا دەبێتە موعجیزەی پێغەمبەری خۆشەویستمان.

خواجە معین الدین فەرمویەتی: چوونە لای پیاوی چاک و یاد کردنەوەیان لە زۆرکاری باش باشترەو هاتوو چۆ کردنی پیاوی خراپیش لە زۆر کاری خراپ خراپترە. جا برای گوێ گری موسوڵمان ئەگەر بە عەقیدە و بیر و باوڕەوە ئەم کتێبە بیخوێنی یان بۆت بخوێننەوە، وەکو ئەوە وایە، کە بە خزمەت ئەوزاتانە گەیشتبی و گوێت لە فەرمایشتەکانیان بووبێ. هەر وەک چۆن ئێمە بە خزمەت پیغەمبەرو ئەسحاب و سەر مەزهەبەکان نەگەیشتوین و خۆشمان دەوێن و بە قسەمان کردون.

ئنجا بە ئومێدی خواوەندی گەورە لە مەجلیسەکانی داهاتودا، هەر ڕۆژە دەچینە خزمەت یەکێک لەو ئەولیا و گوێ دەگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و

فەرمایشتەکانیان، بەڵکو خوای گەورە لە خۆشەویستی ئەوانەوە بە گەورەیی خۆی عەفوومان بکا. خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت و پیاو چاکان عەفوومان کەی، خوایە لە بەڵاو موسیبەت بمان پارێزی. خوایە لە ڕەفیقی خراپ بە دوورمان کەی.

وَٱلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتَهُ

# (١)
# ئیمام جەعفەری سادق

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُلِلّٰهِ عَلىٰ نِعْمٰائِهِ. وَالصَّلاٰةُ وَ السَّلامُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ حَبيبِ اللهِ وَ خٰاتَمِ النَّبِيِّينَ. وَعَلىٰ آلِهِ وَ اَصْحٰابِهِ وَ مَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الأَوْلِياءِ وَ الْعُلَمٰاءِ وَ اَلْصّٰالِحِينَ وَ كٰافَةِ الْمُسْلِمِينَ مِنَ الْيَوْمِ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينِ].

موسوڵمانینە: لام وایە تائیستا لە زۆر کۆڕوو کۆمەڵ ومە جلیسدا دانیشتوین وگوێمان بۆ زۆر قسەوباسی پڕ و پوچ ڕاگراتووەو، زۆربەی کات و عومری خۆمان بە فیڕۆداوە.

با لە کۆڕو مەجلیس و دانیشتنی ئیستاماندا، بچینە مەجلیسی سوڵتانی ئۆممەتی «محمد المصطفی» گەورەو ڕابەرو دەلیلی ئەولیا، مامۆستای مامۆستایان و عولەماو سولەحا، بەرو سەمەرو میوەی دڵی مەشایخان و جگەر گۆشەی فاتیمەی زەهرا، دەست مایەی ئیمام محمد باقر و حەزرەتی حەسەن و حوسێن و عەلی مورتەزا. پیشەوای عارفانی عاشق، «حەزرەتی ئیمام جەعفەری سادق».

جا تکایە زۆر بە ئەدەب دانیشن و بە گۆیی دڵ گۆێ بگرن بۆ باسی ژیان و خوو ڕەوشت و عیلم و زانیاری و وەرع و تاعەت و تەقوا و عیبادت و فەرمایشتی جوان و کەڕاماتی ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«ئیمام جەعفەری سادق» کوڕی ئیمام محمد باقری کوڕی ئیمام عەلی زینو لعابدینی کوڕی ئیمام حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی‌یە. لە ساڵی هەشتای کۆچیدا

لە شاری مەدینەی مونەووەرە لە دایک بووە.

دایکیشی ئوممو فەروەی کچی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکری سدیقە.

+ «ئیمام جەعفەری سادق» خەرقەی ئیمامەت و ئیجازەی عیلم و ڕوخسەتی ئیرشادی لە ئیمام محمد باقری باوکی و زانای بە ناو بانک باوکی دایکی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکر وەرگرتوو.

ـ ئەو زاتە بەرزو پیرۆزە، زۆر دانا و زانا و عالم بووە، زۆر بە سام و هەیبەت بووە، زۆر ڕو خۆش و دەم بە پێکەنین بووە، بە تەواوی مەعنای کەلیمە زاهید و واریع و لە خوا ترس بووە، ڕیاسەت و گەورەیی پێ خۆش نەبووە، پێشەوای مەشایخان بووە، پێشرەوی ئەهلی زەرق بووە، سەر دەفتەری کۆمەڵی عاشقانی ڕەببانی بووە، دۆعای زۆر جار زۆر زووگیرا بووە، تەکەبوری نەبوە و خۆی زۆر بە کەم گرتووە. بۆ وێنەی‌خۆ بە کەم گرتنی، دەڵێن: ڕۆژێک شێخ داوودی تائی دەچێتە خزمەتی و سەلام دەکا و بە ئەدەب دادەنیشێ عەرزی دەکا قوربان هاتوومە خزمەتت دەبێ ئامۆژگاریەکەم بکەی، دڵم زۆر ناڕەحەتە و زۆر غەمبارم، «ئیمام جەعفەر» دەفەرمووێ: ئەی داوودی تائی، لە خوا بە زیاد بێ، تۆ ئیستا زاهید و عابیدی ئەم زەمانەی، کەی تۆ موحتاجی ئامۆژگاری منی، شێخ داوود دەست دەکا بە گریان و دەڵێ: ئاخر قوربان جەنابت سەیید و ئەولادی پێغەمبەری، لە سەرت لازمە ئامۆژگاریمان بکەی، «ئیمام جەعفەری سادق» دەفەرموێ: ئەی داوودی تائی ئاخر لەوە دەترسم، کە لە ڕۆژی قیامەتا، با پیرم بانگم کاو لێم توڕە بێ و بفەرمووێ: ئەی «جەعفەر» تۆ بۆچی بە تەواوی پەیڕەویت لە من نەکرد؟ دووبارە فەرمووی: ئەی داوودی تائی خۆ پیاو چاکی بە حەسەب و نەسەب نیە! بە تەقوا و تاعەتە. شێخ داوود ئەوندەی تریش مەحزون بوو، گریا و ووتی: ئەی خاک بە سەرمان، وە ئەی خوای گەورە خۆ ئەوەی قوڕی بەدەنی لە نووری

نبووەتەو تەرکیبی ئەندامی لە ئەهلی بورهان و حوجەتەو، با پیرە گەورەی رەسول اللەیەو بابی شێری خوایەو، لە نەوەی حەزرەتی فاتیمەی زەهرایە، ئاوابترسێ! قورِ بەسەر یەکێ وەک داوودی تائی ئەبێ چ ئومێدێکی بە کردەوەی خۆی بێ؟

هەروەها ئەڵێن: جارێک لە گەڵ مورید و بە ردەستە کانیدا دانیشتبوو ڕووی موبارەکی کردە خەڵکە کەو فەرمووی: خەڵکینە وەرن با پەیمان ببەستین، کە هەر کام لەئێمە لە ڕۆژی قیامەتا زووتر ڕزگاری بوو، شەفاعەت بۆ ئەوانی‌تر بکا، خەڵکە کە عەرزیان کرد، ئەی ئەولادی پێغەمبەر، تۆ کەی موحتاجی شەفاعەتی خەڵکی، با پیری تۆ شەفاعەت بۆ هەموو کەس دەکا، لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن، من شەرم دەکەم بەو کردەوانەوە، کە کردومن، لە ڕۆژی قیامەتا، بچمە خزمەت با پیرم تا شەفاعەتم بۆ بکا.

«ئیمام جەعفەری سادق» ڕەزاری خوای لێ بێ، بەو هەموو فەزل وگەورەیی و حەسەب و نەسەبەوە، ئاوا خۆی بە کەم دەگرت و موتەوازیع بوو، بە ڵام زۆربەی ئێمە، بە کۆڵێ گوناحەوە، خۆمان بەزل دەگرین و فەخر بە سەر خەڵک و ئەرزدا ئەکەین، بیر لە کردەوەی خۆمان و دووا ڕۆژی خۆمان ناکەینەوە.

«ئیمام جەعفەری سادق» هەر لەو کاتەشدا زۆر لە موسوڵمانان بە گلەیی بووەو ماوەیەک دووری لە خەڵک کردووە. سەفیانی سەوری دەچێتە خزمەتی و عەرزی دەکا، ئەی گەورەو ئەولادی پێغەمبەر، خەڵک زۆر ئارەزوی دیداری تۆن، بۆ خۆت لە خەڵک شاردۆتەوە؟

لە وەڵامدا دەفەرموێ:

ذَهَبَ الوَفاءُ ذِهٰابَ أَمْسِ الذّاهِب وَالنّـاسُ بَـيْنَ مُخـائِلٍ وَ مَآرِبُ

يَـفْشُونَ بَـيْنَهُمُ المَـوَّدَةَ وَ الوَفـا وَقُـلُوبُهُمْ مَحْشُـوةٌ بِـعَقارِبُ

ئەی سەفیانی سەوری، چۆن بێمە ناوئەو خەڵکەو دڵم پێ خۆش بن؟ وەفا، لە ناویاندا نەماوەو وەک ڕۆژی دوێنێ باری کردووە، خەڵک بە خەیاڵ و ئارەزووی

نەفسەوە دەژین. ڕاستە بە ڕواڵەت قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن وە یەکتر دەدوێنن، بەڵام دڵیان پڕە لە بوغز و کینە و حەسادەت و، ئەگەر دەستیان بڕوا وەک دووپشک بە یەکترەوە ئەدەن:

جا بە ڕاستی، ئەگەر بە وردی سەرنجی زۆربەی خەڵکی ئێستا بدەین، ئەو فەرمایشتەی «ئیمام جەعفەریان» بە سەردا دەشکێتەوە و هەر وەک لە گەڵماندا ژیابێ وایە. قسەمان خۆشەو لە دڵەوەنیە، زۆر بێوەفا و وەعدەین، حەسادەتمان هەیە. [illegible]
قسەو فەرمایشاتی «ئیمام جەعفەر» هەمووی وەک دڕڕو یاقووت وا بوون و قووتی ڕوح بوون.

ئیمامی حەنەفی جارێک دەچێتە خزمەتی و لە بەینی گفتوگۆدا «ئیمام جەعفەر» دەفەرموێ: ئاقڵ کێیە؟ ئیمامی حەنەفی دەڵێ بەلای منەوە ئاقڵ ئەو کەسەیە فەرقی چاک و خراپ بکا. «ئیمام جەعفەر» دەفەرموێ: جا خۆ حەیوانـاتیش فەرقی چاک و خراپ دەکەن، نابینی ئەوەی ئەیان لاوێنێ، بەدەمیەوە دەچن و، ئەوەی لێشان تورە بێ و لێیان بدا، لە بەری ڕائەکەن. ئیمامی حەنەفی فەرمووی: دەی باشە قوربان ئاقڵ کێیە؟ فەرمووی: ئاقڵ ئەوکەسەیە فەرق و جیاوازی لە بەینی دووکاری خێر و دووکاری شەڕدا بکا، تا لە دوو کارە خێرەکە، کە هەر دووکیانیی بۆ نەکرا، ئەوەیان بکا، کە خێری زۆرترە، و لە دوو کارە شەڕەکەش، کە ناچار بوو یەکیان هەربکا، ئەوەیان بکا، کە زەرەری کەمترە، ئیمامی حەنەفی فەرمووی: زۆر جوانە..

«ئیمام جەعفەری سادق» لە خواوەندی گەورە نەبێ لە عەبد نەترساوە بۆ قسەی حەق شەرمی لە کەس نەکردووە، بۆ نموونە میسالێکتان بۆ بێنمەوە: ئەڵێن: ئەبوو جەعفەری مەنسوور، کە لەو سەردەمەدا خەلیفەی بەغدا، دەبێ، دەچێ بۆ حەج، لە پێشدا دەچێتە مەدینە، لەو کاتەدا «ئیمام جەعفەر» لە مەدینە دەبێ،

خەلیفە، کە دەزانێ موسوڵمانان بە گشتی و خەڵکی مەدینە بە تایبەتی ئەوەندەی ڕێز لێ دەگرن و خۆشیان دەوێ، حەسادتی پێ دەباو ڕقی لێ دادە گرێ، وەزیرەکەی، کە ناوی ڕەبیع دەبێ بانگی دەکا و ئەڵێ: ئەی وەزیر دەبێ هەر ئێستا بچی «جەعفەر»م بۆ بێنی، ڕووشی کردە دەست و پێوندو ووتی: هەر کە چاوتان لێم بوو، کە کڵاوەکەم لە سەر سەرم هەڵگرت فەوری بیکوژن. وەزیر زۆری پێ ناخۆش‌بوو، ئەو ڕۆژە لە بیری خۆی بردەوە، ڕۆژی دوایی خەلیفە لە وەزیر تووڕە بوو، ووتی: ئەبێ ئیستا بچی بۆم بێنی، وەزیر بە ناچاری چووە خزمەت «ئیمام جەعفەر»و کارەساتی بۆ گێڕایەوە. «ئیمام جەعفەر» فەرمووی: مەترسە هەستە با بچین بۆ لای خەلیفەکەت. کاتێ گەیشتەلای خەلیفە، خەلیفە زۆر بە حورمەتەوە لە لای ژووررووی خۆیەوە دای‌ناو خۆی لە لای خوارەوە بە ئەدەب دانیشت. خەڵکە کە واقی وڕماو زۆریان لاسەیر بوو، لە پاش هێندێک‌قسە و گفتوگۆ: خەلیفە عەرزی دەکا: قوربان هەر فرەمانێک هەیە ئامادەم بۆ خزمەتت، ئەویش دەفەرمووێ: خواهشتم ئەوەیە جارێکی‌تر بانگم نەکەی ئنجا خوا حافیزی دەکا و دەچێتەوە بۆماڵەوە.

لە پاشان لە خەلیفە ئەپرسن: قوربان تۆ زۆر بە تووڕەییەوە بە دواتا نارد، ئەی ئەوە چ حاڵەتێک بوو؟ خەلیفە گوتی: خەڵکینە قەسەم بە خوا هەر کە هاتە ژوورەوە لە پێش چاوم مارێکی لە گەڵ بوو، لێوێکی لەم لای ژوورەکەم و ئەوی‌تری لەو لا قایم کرد، بە زمانی حاڵ ووتی: ئەگەر لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێیت بە خۆت و خانوەکەتەوە سەرەو بنت ئەکەم.

ووتی: منیش لە ترسان نەمتوانی هیچی پێ بڵێم و خوا خوام بوو زوو هەستێ بڕوا.

یەکێ لە زانایان دەڵێ: هەرلە ئەسەری ئەوەوە بوو، کاتێک خەلیفە لە مەدینە، بەڕێ کەوت و هاتە «بیری عەلی» ئیحرامی بەست و بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ،

تەماشای کرد لە دیوارێک نووسراوە:

أَبَا جَعْفَرٍ خَانَتْ وَ فَاتُكَ وَ انْقَضَتْ سِــنُّكَ وَ أَمْــرُ اللهِ لابُـدَّ وَاقِـعُ
أَبَـا جَـعْفَرٍ هَـلْ كَـاهِنٌ أَوْ مُـنَجِمٌ لَكَ اليَوْمَ مِنْ رَيبِ المَـنِيَّةِ دافِـعُ

کەئەو دو شیعرەی خوێندەوە زۆر ترسا، زانی، کە دۆعای «ئیمام جەعفەری سادقی» لێ گیرا بووە نە خۆش کەوت و پێش ئەوەی بگاتە مەککە و حەجەکەی تەواوکا، لە عومری شەست و سێ ساڵیدا، عومری درێژیدا بە حازریان و، تیری غەیبی کاری خۆی کرد.

سەفیانی سەوری زۆر دەچوە خزمەتی، جارێک عەرزی دەکـا دەڵـێ: دەبـێ ئامۆژگاری یەکەم بکەی. «ئیمام جەعفەر» فەرمووێ: ئەی سـەفیان هـەر کـاتێ خواوەندی گەورە نیعمەتێکی دابە تۆو زۆرت پێ خۆش بوو لێت نە ستێنیتەوە، تا دەتوانی حەمد و سەنای خوا و ئەو نیعمەتەی بکە، چونکە خواوەندی گەورە لە سورەی ئیبراهیمدا فەرموویەتی:

﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ ئەگەر شوکرانەی نیعمەتی خوا بکەن، خوا بـۆتان زیاد دەکا، ئنجا فەرمووی: ئەی سەفیان، هەرکاتێ خوا ڕزقی لێ گـرتیەوە، زۆر [أَسْـتَغْفِرُاللهَ] بکـە، چـونکە خـوای گـەورە لە سـوورەی نـوحدا ئـایەتی دەدا فەرموویەتی: ﴿أَسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ اِنَّهُ كَانَ غَفَّاراً يُـرْسِلِ السَّمَآءَ عَـلَيْكُمْ مِـدْرَاراً، وَّ يُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَّبَنِيْنَ وَ يَجْعَلْ لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَّ يَجْعَلْ لَّكُمْ أَنهَاراً﴾

موسوڵمانینە: زۆر داوای لێ خۆش بوون بکەن لە بارەگای خوای خۆتاندا، چونکە خوا، لە عەبد و بەندەگانی خۆش دەبێ، کە داوای لێ خۆش بوونی لێ بکەن، بارانی بە ڕەحمەتیان لە ئاسمان بۆ دەبارێنێ، ماڵی دنیایان بـۆ زۆر دەکـا ئەولادیان زۆر و ساڵحیان دەکا، ئاوی کارێزو سەرچاوانیان بۆ زیاد دەکـا ڕەزو باغاتیان، بەری زۆر دەبێ، دەغڵ و دانیان باش دەبرێ.

دووبارە فەرمووی: ئەگەر لە لایەن حکومەت و ئامیر و گەورەوە، یـان هـەر

کەسێکی ترەوە تەکلیفی کارێک، یا، شتێ‌کیان لێ کردی وپێت ناخۆش بوو، زۆر بڵێ: [لاٰ حَوْلَ وَ لاٰ قُوَّةَ اِلاّٰ بِاللّٰهِ] چونکە ئەو جوملەیە کلیلی بەهەشتەو خەزنێکە، لە خەزنەکانی بەهشت.

ڕۆژێک «ئیمام جەعفەر» بانگی ئیمام مووسای کازمی کوڕی دەکا و دەفەرمووێ: کوڕم وەسیەتێکت بۆ دەکەم تا ماوی وەک ئاڵقەیەک بیکەرە گوێت و فەرامۆشی مەکە، ئەگەر ڕەفتاری پێ بکەیت و لێی لا نەدەی لە دنیادا بە خۆش بەختی ئەژیت وکە مردیشی خەڵک چاکەت ئەڵێن و ئاخر خێر دەبی، فەرمووی: ئەی کوڕی من هەر کەسێک بە بەشە ڕزقی خۆی ڕازی بێ، خواوندی گەورە دوڵەمەندی ئەکا، بەڵام ئەوەی چاولە دەستی خەڵک بێ هەر بە فەقیری دەمرێ، با ماڵی دنیاشی زۆربێ. فەرمووی: ئەوەی ڕازیش نەبێ ئەوە مەعنای وایە ئیعتیراز لە کاری خوا ئەگرێ. فەرمووی: ئەی کوڕم تکات لێ ئەکەم قەت عەیب و عاری خەڵک بەیان مەکە، چونکە هەر کەسێک عەیبی خەڵک ئاشکرا بکا، ئەوە خوای گەورە عەیبی ماڵ و عائیلەی ئەو ئاشکرا دەکا، فەرمووی: خوادەزانێ، هەرکەسێک داوێک بۆ یەکێک بنێتەوە، چاڵێک بۆ خەڵک هەڵکەنێ، خۆی بە داوەوە ئەبێ و دەکەوێتە چاڵەوە و قەت ڕزگاری نابێ، فەرمووی: لە گەڵ ئینسانی دوور لە دین تێکەڵ مەبە، چونکە هاوڕێی بێ دین پیاو بێ قیمەت دەکا، بەڵام ڕەفاقەتی ئینسانی دانا و زانا و بە دین سوودی زۆرە، فێری ئەدەب و حورمەت و ویقار دەبی، فەرمووی: دووبارە وەسیەت بێ، ڕوو مەکە ئەو جێگایانە کە شوێنی بەدناوین، تا لە ناو خەڵکا بەد ناو نەبی، فەرمووی: دەخیل سەد دەخیل حەق بڵێی با زەرەری خۆشتی تێدابێ، فەرمووی: قەت خۆت بە شتێکەوە خەریک مەکە، کە عەلاقەی بە تۆوە نیەو بێ کەڵکە، فەرمووی: تا دەتوانی قورئان بخوێنە و سەلام لە خەڵک بکەو ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکە، فەرمووی: دەخیلە تا درەنگ نەبووە تۆبە بکە، چونکە خواوەندی گەورە لە سوورەی تەحریم دافەرموویەتی

﴿اَلتَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ﴾ لەو کەسانە خۆش دەبم و لەو کەسانە ڕازیم کە تۆبە ئەکەن، ئنجا عیبادەت دەکەن، خوای گەورە تۆبەی لە پێش عیبادەت خستووە، فەرمووی: بە تایبەتی ئامۆژگاری بێ بۆ تۆ و خەڵکی تریش: خۆتان لە پێنج نەوعە کەس بپارێزن. یەکەم، لە ئینسانی درۆزن، دووەم، لە ئینسانی ئەحمەق، سێیەم، لە ئینسانی بەخیل و ڕژد، چوارەم، لە ئیسنانی دڵ پیس، پێنجەم لە ئینسانی دووڕوو و فاسق، فەرمووی: ئەی کوڕی خۆشەویستم کاتێک ویستت زیارەتی کەسێک بکەی، بچۆ لای کەسێک کە پیاوی چاک بێ، چونکە ئینسانی خراپ وەک بەردی ڕەق وایە، ئاوی لێ پەیدانابێ، وەک ئەرزێک وایە، کە قەت گیاسەوز ناکا، وەک داری بێبەرگ و سێبەرە، فەرمووی: هیچ تۆشەو زەخیرەیەک بۆ دنیا و قیامەتی ئینسان لە پەرهێزگاری باشتر نیەو هیچ شتێک لە بێ دەنگی جوانتر نیەو هیچ دوژمنێک لە جەهلو نەزانین دوژمنتر نیە و هیچ دەردێک لە درۆ خرابتر نیە، دەخیلە ئاگاتان لە خۆتان بێ..

لە کتێبی «فُصُولُ الْهُمِه» دا، لە «ئیمام جەعفەر» نەقڵ دەکا: کە فەرموویەتی: من لە باوکم و باوکم لە با پیرم و ئەو لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتی کردووە، کە فەرموویەتی: هەرکەسێک دڵی خەڵک خۆش بکا و لە تەنگ و چەڵەمە ڕزگاریان بکا، خواوەندی گەورە مەلائیکە یەک دەکاتە مەئموری، کە کاتێ ئەو پیاوە وەفاتی کرد و بردیانە سەر قەبران و مەلا بۆ تەڵقینی دانیشت، دەچێتە لای و دەڵێ: ئەی ڕۆحیانەتی فلان کەس، مەترسە لە عەزابی قەبر و وەڵامی پرسیاری مەلائیکە، من یارمەتیت ئەدەم و جێگای خۆت لە بەهەشت نیشان ئەدەم.

یەکێ لە زانایان، بە ناوی ئیبنی ئەبی لەیلا وە باسی زانایی «ئیمام جەعفەر»مان بۆ دەکا و دەڵێ: یەکەم جار کە ئیمامی حەنەفی چوو بۆ خزمەت «ئیمام جەعفەری سادق»، منی لە گەڵ بووم، دوای سەلام و بە خێر هاتن، ڕووی کردە من و فەرمووی: ئەو زاتە کێیە؟ عەرزم کرد قوربان ئەو زاتەپیاوێکی زۆر دانا و زانایە لە

عێراق، فەرمووی: ئەوە نەبێ، کە عەمەل بە قیاس دەکا؟ ئنجا ڕووی کردە ئیمامی حەنەفی و فەرمووی: ناوت چیە؟ عەرزی کرد ناوم نعمانە فەرمووی: یا نەعمان دەزانی خواوەندی گەورە بۆچی ئاوی چاوانی سویر کردووەو ئاوی گوێیانی تاڵ کردووە و ئاوی کونە لووتانی گەرم کردووەو ئاوی ناو دەم و لێوی شیرین کردووە؟ عەرزی کرد: قوربان نازانم.

فەرمووی: خواوەندی گەورە بە کەرەمی خۆی ئاوی ناو چاوی ئادمیزادی سوێرکردووە، چونکە چاوی لە بەزووپیو دروست کراوە، ئەگەر بە هۆی ئەو ئاوە سوێرەوە نەبوایە، زوو دەتوایەوە، ئاوی گۆێشی تاڵ کرددوە، تا دەعبا نەتوانن لە گۆێوە بچنەناو دەماغی سەری ئینسانەوە، ئاوی کونە لووتی گەرم کردووە، تا کونە لووت هەوا ورەرگرێ، ئەگەر ئاوی کونە لووت گەرم نەبوایە، دەماغی ئینسان بۆگەنی دەکرد.

هەروەها فەرمووی: بۆیە ئاوی ناو دەم و لێویش شیرینە، تا بتوانی زۆرێەی تەعام و خوراردەمەنی بجوی و بە زمانی شیرین گفتوگۆ لە گەڵ خەڵک بکەی..

ئەوەی تا ئیرە بۆم باسکردن هێندێک بوو لە باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتی «ئیمام جەعفەری سادق»، ئومێد دەکەم پەند و دەرس و ئاموژگاریتان لێ وەر گرتبێ ولێی وەرگرن. ئەوزاتە بەرز و پیرۆزە، لە عومری شەست و هەشت ساڵیدا، لە ڕۆژی دوشەنبەی پازدەی مانگی ڕەجەب، یا شەووال‌دا لە ساڵی سەت و چل و هەشتی کۆچیدا لە مەدینەی مونەووەرە، وەفاتی فەرمووە، مەرقەدی موبارەکی لە گۆڕستانی بەقیعە.

لە خواوەندی گەورە دەپاڕێمەوە کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی ئال و بەیتی پێغەمبەر لێمان خۆش بێ. خوایە عەفوومان بکەی، خوایە شیفای نەخوشانمان بدەی، خوایە لە گەڵ پیاو چاکانی ئۆممەتی پێغەمبەر

حەشرمان بکەی، خوایە لە رەفیقی خەراپ و بەلا و موسیبەتی دنـیا و قـیامەت بمان پارێزی. ئامین

وَ ٱلسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ و رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکاٰتُهُ

# (٢)
# وەیسی قەرەنی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُلِلّٰهِ اَلعَلِيُّ اَلغَنِيُّ. وَالصَّلاٰةُ وَالسَّلاٰمُ عَلىٰ خَيْرِ خَلْقِهِ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدِ اَلْمَكِّي اَلْمَدَنِيُّ. وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلىٰ حَضْرَةِ أَوَيْسِ اَلْقَرَنِيُّ.]

گۆی گر ودانیشتوانی خۆشەویست، با چەند دەقیقەیەک لەم کاتەدا و لەم دانیشتنەماندا ڕوح و دڵ و دەروونی خۆمان ئازاد بکەین و بە ئەدەب و بێدەنگ دانیشین و گوێ بگرین بۆ باسی هێندێک لە ژیان و فەرمایشتی یەکێک لە ئەولیای خواوەندی گەورە و پەند و عیبرەت و ئاموژگاری زۆر بە نرخی لێ وەرگرین.

جا بزانن کە گڵوپ و چرای کۆڕو و مەجلیسی ئیمڕومان یەکێکە لەو زاتە بەرز و پیرۆزانە، کە پێغەمبەری ئیسلام، «خَيْرُ الأَنٰام»، حەزرەتی «مُحَمَّدُ الْمصطفى» (دروودی خوای لە سەربێ) دەربارەی ئەوان لە فەرمایشتێک دا فەرموویەتی:

[إِنَّ مِنْ عِبٰادِ اَللهِ لَأُنٰاساً مٰا هُمْ بِأَنْبِيٰاءٍ وَ لاٰ شُهَدٰاءٍ يَغْبِطُهُ اَلأَنْبِيٰاءُ وَ الشُّهَدٰاءُ يَوْمَ اَلْقِيٰامَةِ بِمَكٰانِهِمْ مِنَ اَللهِ]

هەروەکو حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (سەلات و سەلامی خوای لە سەربێ) فەرمووی: بە ڕاستی هێندێک لە عەبد و بەندەگانی خوای گەورە، هەڵدەکەون، کە نە پێغەمبەرن وە نە شەهیدن، بەڵام پێغەمبەران و شەهیدان لە ڕۆژی قیامەتدا غیبتەیان پێ دەبەن، چونکە لای خواوەندی گەورە، ئەوەندە مەرتەبەیان بەرزەو خۆشەویستن. یەکێک لە

ئەسحاب عەرزی دەکا، قوربان ئەو عەبدانە کێین و ئیش و کاریان چیە؟ بفەرموو با، بیان ناسین و خۆشمان بۆین؟ حەزرەت فەرمووی: ئەوانە چەند عەبدانێک و بەندەگانێکن، لە ناو ئوممەتی مندا هەڵدەکەون، کە خوا و پێغەمبەری خوایان زۆر خۆش دەوێ و، بە ڕاستی ڕوو دەکەنە خوا و لە ئایین و دین و شەریعەتی ئیسلام لا نادەن.

فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا، لە کاتێکدا، کە خەڵک لە شیددەتی موحاسەبەدا دەبن و زۆر دەترسن، ئەوان لەو پەڕی خۆشی دا دەبن و هیچ خۆفیان نابێ.

ئنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوا لە سورەی یونس‌دا دەفەرمووێ: ﴿أَلاٰ اِنَّ أَولِيٰاءَ اللهِ لاٰ خَوفٌ عَلَيْهِم وَ لاٰ هُمْ يَحْـزَنُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر و، ئەی ئوممەتی پێغەمبەر ئاگادار بن، کە کۆمەڵێ پیاو چاک و ئەولیای خواهەن، نەلە ڕۆژی قیامەتا خەوفیان هەیەو دەترسن، نە لە دنیا دا لە خەڵک ئەترسن.

ئەو زاتە بەرز و پیرۆزەش، کە لەم چەند دەقیقەدا لە خزمەتیدا دەبین، ڕۆژی ڕووناکی دنیای تاریکی سەردەمی خۆی بووە، زۆربەی تابیعینی ئەسحابی پێغەمبەر، بە قیبلەی ڕێگای خواناسی‌یان داناوە، کە ئەویش ئەستێرەی گەشی ئاسمانی یەمەنی، «حەزرەتی وەیسی قەرەنی»یە.

حەزرەتی «وەیسی قەرەن» لە زەمانی پێغەمبەردا بوو. بەڵام بە خزمەت پێغەمبەر نەگەیشتبوو.

«وەیسی قەرەنی» ئەو زاتە موبارەکە بووە، کە حەزرەت جارێک یاسی کردووەو فەرموویەتی: [أُوَيْسُ الْقَرَنی خَـيرُالتَّـابِعينَ] واتە «وەیسی قەرەنی» باشترین و چاکترینی تابیعینی ئەسحابی منە. هەروەها زۆرجار ڕووی موبارەکی دەکردە وولاتی یەمەن و، دەیفەرموو: [إِنِّی لأَجِدُ نَفَسُ الرَّحْمٰنِ مِنْ قِبَلِ الْيَمَنِ] واتە من بۆنی ڕەحمەت وبەر کەت و هەناسەی خواپەرستی ڕاستەقینەو ڕەحمەتی خوا، لە یەمەنەوە ئەکەم، بە هۆی یەکێک لە ئەولیای ئوممەتم کە «وەیسی قەرەنی»یە.

ڕۆژێک فەخری عالەم، سەیید و گەورەی ئەولادی ئادەم، حەزرەتی مُـحَمَّدَ المصطفی (سەلات و سەلامی خـوای لە سـەر بـێ)، ڕووی کـردە ئـەسحاب و فەرمووی: ئەی هاوڕێکانم! ئێوە نازانن، کە لە ناو حازریانی ئۆممەتی مندا عەبد و بەندەیەکی خوای گەورە هەیە، ئەوەندی لای خوا خۆشەویستە، لە ڕۆژی قیامەتا، بە هۆی شەفاعەتی ئەوەوە، خوای گەورە بە ئەندازەی تـووکی مـەڕی تـائیفەی ڕەبیع و موزەر، لە گوناهباری ئوممەتی من خۆش دەبێ ئەسحاب زۆریان ئـەو فەرمایشتەی حەزرەت، لاعەجایب بوو. عەرزیان کرد، قـوربان ئـەوە کـێیەو چ کەسە و چ کارەیە؟ فەرمووی: بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا. دووبارە عەرزیان کرد: قوربان جا هەموومان هەر یەکە عەبدێکین لە عەبدانی خوا، ئەو عەبدە ناوی چیە؟ فەرمووی: «وەیسی قەرەنی»یە. گوتیان: قوربان تا ئـیستا بـە خـزمەت جـەنابت گەیشتووە؟ یان بە خزمەتت دەگا؟ فەرمووی، تا ئێستا بە چاوی سەرمنی نەدیوە، بە ڵام بە چاوی دڵ زۆر جار هاتۆتە لام و منی دیوە. ئەسحاب ئەوەندەی تریش واقیان وڕماو ووتیان: ئەی قوربان ئـەگـەر ئـەوەندە عـاشقی دیـداری جـەماڵی جەنابتە، بۆ تا ئیستا نەهاتووە بۆ خزمەتت؟ فەرمووی: ئاخر لە بەر دووشت؟ بۆی نەکراوە بێتە لام. یەکەم، لە بەر ئەوەی، «وەیسی قەرەنی» زۆربەی کات مەجزوبەو لە حاڵەتی جەزبە دایـە مـنی لە بـەر چـاوە. دووەم، لە بـەر خـاتری حـوڕمەتی شەریعەتی من و بۆ ئەوەی لە شەرع لا نەدا پێی نەکراوەو پێشی ناکرێ بێتە لام، چونکە دایکێکی زۆر پیری هەیە کوێر بووە، خزمەتی دەکا، فەرمووی: «وەیسی قەرەنی» بە ڕۆژ دەچێتە لای وشتر و مەڕ و ماڵ و، کە ئێوارەش هاتەوە خەریکی خزمەتی دایکی دەبێ و بێدڵی دایکی ناکا، جا لە بەر ئەوەی بێ شەرعی نەیەتە سەر، دایکی بە جێی ناهێڵی و بۆی ناکرێ بێتە لام. کە حـەزرەت ئـاوا بـاسی «وەیسی قەرەنی» کرد، زۆربەی ئەسحاب بە دڵ ئاواتیان خـواست و بـە زمـان عەرزی پێغەمبەریان کرد و گوتیان: ئەی خۆشەویستی خوا، ئایا ئێمە چاومان بە

«وەیسی قەرەنی» دەکەوێ؟ پێغەمبەر تۆزێک بێ دەنگ بوو، لە پاشان سەری موبارەکی بەرز کردەوەو ڕووی کردە حەزرەتی ئەبوبەکری سدیق و فەرموی: تۆ «وەیسی قەرەنی» نابینی، بە لاّم لەم جەماعەتەتان عومەر و عەلی چاویان پێ دەکەوێ. عەرزیان کرد قوربان ناوو نیشانەی چیە؟ فەرمووی: ئیستا شوانە و لە لای چەپی و لە بەری دەستی ڕاستی بەقەد درهەمێک خاڵێکی سپی پێوەیە، بەلاّم ئەو خاڵە و پەڵە نەخۆشی بەڵەکی نیە بەڵکە مۆرو نیشانەیە.

فەرمووی: ئەگەر چاوتان پێ کەوت سەلامی منی پێ بگەیێنن و پێی بڵێن: دۆعا بۆ ئوممەتم بکا. پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ)، «وەیسی قەرەنی» زۆر خۆش ویستووە، دەڵێن کاتێک پێغەمبەر (سەلات و سەلامی خوای لە سەربێ)نەخۆش کەوت، عەرزیان کرد، قوربان ئەگەر خوا نە خواستە جەنابت وەفاتی فەرموو جبەی موبارەکت شایانی شانی کێیە و بیدەین بە کێ؟ لە وەلاّمدا فەرمووی: بیدەن بە «وەیسی قەرەنی». ئای سەد هەزار خۆزگە بەو کەسەی، ئەوەندە لای خۆشەویستی خوا خۆشەویست بێ، کە حەزرەت وەسیەت بکا جبەی موبارەکی خەلاّتی ئەوبکرێ.

بەڵێ برای گۆی‌گر و خوێنەری خۆشەویست، زۆری نەخایاند، فەخری عالەم وەفاتی فەرموو: حەزرەتی ئەبوبەکری سدیق بوو بە خەلیقە و دوو ساڵ و سێ مانگ خەلافەتی کرد و لە عومری شەست وسێ ساڵیدا، لە ساڵی سێزدەی کۆچیدا لە مەدینە وەفاتی کرد. حەزرەتی عومەر ڕەزای خوای لێبێ بوو بە خەلیفە. حەزرەتی عومەر لە ماوەی خەلافەتیدا چوار کەرەت تەشریفی هاتووە بۆ وڵاتی شام و، جارێکیان دێتە شاری کووفەی لای نەجەف، لەو سەفەرەدا حەزرەتی عەلی لە گەڵ دەبێ. ئیمامی عومەر تەشریفی دەچێتە سەر مینبەر و خوتبەی جومعە دە خوێنێتەوە و لە پاشان ڕوو دەکاتە خەڵکە کەو دەفەرمووێ: ئەی خەڵکینە، لە تائیفەی قەرەنیان کەستان لە ناو دایە؟ یا کەسیان لێ دەناسن؟ گوتیان:

بەڵێ ئەی خەلیفەی ئیسلام. چەند کەسێک هەستانە سەر پێ‌و خۆیان نیشاندا، حەزرەتی عومەر فەرمووی: کەستان «وەیسی قەرەنی» دەناسن؟ عەرزیان کرد، بەڵێ قوربان دەی ناسین، بە لاّم «وەیس» پیاوێکی وانیە جەنابت ئەحواڵی بپرسی، کابرایەکی شێتی دیۆانەیە، بە زۆری لە دەشت و سەحرا دەژی، هەر شوێنێک خەڵکی لێ‌بێ ڕووی تێ ناکا، کاتێک خەڵک، کەیف خۆشە و پێدەکەنی، ئەو دەگری، کە خەڵکیش غەمبار و ناڕەحەتن، ئەو پێدەکەنێ. حەزرەتی عومەر فەرمووی: دەزانن ئیستا لە کۆییە؟ گوتیان: بەڵێ ئیستا لە فلاّن جێگایە. حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عەلی و چەند پیاوێکی شارەزایان برد و ڕۆیشتن، کە چوون تەماشایان کرد ئەواڵە سوجدە دایە و نوێژ دەکا، «وەیسی قەرەنی»ش کە هەستی ئەوانی کرد، نوێژەکەی کورت کردەوەو سەلامی دایەوە، حەزەتی عومەر وەلاّمی سەلامەکەی دایەوە و فەرمووی، ئەی شوان ناوت چیە؟ گوتی: عبدالله حەزرەتی عومەر فەرمووی: جا هەموومان عەبدی خواین، ناوی تایبەتت چیە؟ ووتی: ناومم «ویسە». حەزرەتی عومەر فەرمووی: دەستی ڕاستم نیشان بدە دەستی ڕاگرت و فەرمووی: فەرموو، کە تەماشای کرد، ئەو عەلامەت و نیشانەی، کە پێغەمبەر (درودی لە سەر بێ) فەرموو بوونی، تیدا ئاشکرا بوون، بەقەد پەنجا فلووسی یەک بەری دەستی وەک سەدەف سپی بوو، حەزرەتی عومەر و حەزرەتی عەلی زانیان کە ئەوە ئەو «وەیسی قەرەنی»ە، کە پێغەمبەر (سەلات و سەلامی لە سەر بێ) باسی دەکرد و وەسیەتی فەرمووی، کە جبەی موبارەکی بە خەلاّت بدەنێ، حەزرەتی عومەر دستی گرت و ماچی کرد، فەرمووی: ئەی «وەیسی قەرەنی» پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەرکاتی چاوتان بە «وەیس» کەوت سەلامی منی پێ بەگەیەنن و ئەو جبەی منیشی بە خەلاّت بدەنێ و پێی بڵێن دۆعای خێر بۆ ئۆممەتم بکا.

«وەیسی قەرەنی»زۆری پێ خۆش بوو، گوتی: کوا، خەلاّتەکەم بدەنێ، تا دۆعا

بۆ ئۆممەتی پێغەمبەر بکەم. جبەی حەزرتیان دایە، هێندێک دوور کەوتەوە و بە سوجدەدا کەوت، گوێیان لێ بوو لە سوجدەدا ئەیوەوت ئەی خوای گەورە بە گەورەیی تۆ، ئەو جبەیە لە بەر ناکەم تا، لە ئۆممەتی پێغەمبەر خۆش نەبی. دەیگوت: ئەی خوای گەورە، پێغەمبەر و حەزرەتی عومەر و عەلی کاری خۆیان کردووە، هەر تۆ ماوی. لەو کاتەدا ڕاوی دەڵی: لە غەیبەوە بانگ کرا، کە ئەی «وەیسی قەرەنی»، ئەواڵە بەر خاتری خۆشەویستی پێغەمبەر و ئیخلاسی تۆ، لە هەزاران گوناح کاری ئۆممەتی پێغەمبەر خۆش بووم. دەڵێم یارەببی ئێمەش بەر ئەو عەفواتە بکەوین و خوا لەو کۆمەڵەمان حیساب کا.

لەو وەختەدا حەزرەتی عومەر و حەزەرتی عەلی بە لایەوە هاتن، کە هەستی ئەوانی کرد. سەری لە سوجدە بەرز کردەوە و فەرمووی: ئەگەر ئێوە لێتان تێک نەدامایە، سەرم لە سوجدە هەڵنەدەبڕی، تا خواوەندی گەورە لە بەر خۆشەویستی پێغەمبەر و دۆعای من، لە زۆربەی گوناح باری ئۆممەتی پێغەمبەر خۆش دەبوو.

حەزرەتی عومەر بە چاوی سەر تەماشای «وەیسی قەرەنی» کرد بەرگ و لیباسی پەڵاسی فەقیرانەی لە بەردا بوو، بەڵام کاتێ بە چاوی دڵ تەماشای کرد. ئەو پەڵاس پۆشە ڕەئیسی هەژدە هەزار عالەمەو، بە خۆڕایی نیە «حەزرەت» خەڵاتی کردووە. بۆ خۆی بە خۆی ووت: ئەی عومەر، تۆش خۆت لا پیاوە و خۆت بە گەورە دەزانی! گەورەو پیاو وەک «وەیسی قەرەنی» دەبێ.

ئنجا ڕووی کردە «وەیسی قەرەنی» و فەرمووی: ئەی «وەیس» تۆ کە ئەوەندە موخلیسی و پێغەمبەر بووی بۆچی بە خزمەتی نەگەیشتی؟ «حەزرەتی وەیس» تۆزێک بێ دەنگ بوو، لە پاشان گوتی: ئێوە پێغەمبەرتان دیوە؟ حەزرەتی عومەر فەرمووی: بەڵێ. «وەیسی قەرەنی» گوتی: بە ڕاستی پێغەمبەرتان خۆش دەویست؟ ووتیان بەڵێ. «وەیسی قەرەنی» نەعرەتەیێکی لێدا و فەرمووی: ئەی ئەگەر پێغەمبەرتان دیوە و خۆشتان ویستووە و دۆستی بوون، بۆ کە لە غەزادا

ددانی موبارەکی شەهید کرا، ئێوە چۆن لە تاوانی قەرارتان گـرت و ددانـەکـانی خۆتان هەڵنەکەندن و بۆ دەرتان نەهێنان؟

فەرمووی: ئەی عومەر قسەم بە خـوا، کـە خـەبەری شـەهید کـردنی ددانـی موبارەکی حەزرەتم بیست، قەرارم نەگرت و ئارامم لێ بـڕا لە تـاوان، تـەواوی ددانەکانی خۆم هەڵکەندن. هەر ددانێکم هەڵدەکەند دەمگوت: لەوانەیە ئەوەیان نەبوو بێ، دانێکی تری خۆم هەڵ دەکەند. هەر سیوو دوو ددانەی خۆم هەڵکەند.
فەرمووی: ئەی خەلیفەی ئیسلام، شەرتی خـۆشەویستی ئـەوەیە لە خـۆشی و ناخۆشی‌دا، لە فەقیری و دەوڵـەمەندیدا، لە شـایی و شـیندا، خـۆت بکـەی بـە شەریک و هاوبەشی دۆستەکەت و خۆشەویستەکەت.

فەرمووی: ڕاستی لە خۆشەویستدا وەک حەزرەتی ئەبوبەکر دەبێ، کە تەواوی سەروەت و دارایی خۆی لە پێناوی خۆشەویستی پێغەمبەردا بەخشی، بۆ ئەوەی لە پێغەمبەر دەوڵەمەندتر نەبێ ووەک ئەو فەقیری بێ.

دووبارە فەرمووی: وەفا و خۆشەویستی وەک حەزرەتی ئەبوبەکر دەبێ، پاژنە پێی خۆی خستە کونی مارەوە، لە ناو ئەشکەوتەکەدا، بۆ ئەوەی ئـەگـەر مـاری تێدابێ بە خۆیەوە بدا و بە خۆشەویستەکەیەوەنەدا.

جا بە ڕاستی خۆشەویستی و وەفـا وەک حـەزرەتی ئـەبووبەکـر دەبـێ، کـە پێغەمبەری لە خۆی خۆشتر دەویست.

شێخی سـەعدی خـوای لێ ڕازی بـێ لە مـەدحی حـەزرەتی ئـەبووبەکـردا دەفەرمووێ:

***مردان قدم به صحبت یاران نهادەاند لکن نه آن چنان که تو در کام اژدهـا***

واتە پیاوان ڕەفاقەتی یەکتریان کردووەو یەکتریان خۆش ویستووە، بەڵام قەت وەک حەزرەتی ئەبووبەکر نەبوون، لە بەر خاتری هاوڕێکەیان پێی خۆیان بخەنە ناو زاری مارەوە.

شەمایل و فەزایل و ئاساری گەورەیی «وەیسی قەرەنی» ئەوندە زۆن لە حیساب نایەن.

جارێک عەرزیان کرد قوربان ئاموژگاریەکمان بکە، فەرمووی ﴿إِخْوانِي طَـلَبْتُ الرَّفْعةَ فَوَجَدتُهُ فِي ٱلتَّوَاضُعِ، وَ طَلَبْتُ ٱلرِّيَاسَةَ فَوَجَدْتُهُ فِي نَصِيْحَةِ ٱلخَلْقِ، وَ طَلَبْتُ ٱلمُرُوَّةَ فَوَجَدْتُهُ فِي ٱلصِّدْقِ، وَ طَلَبْتَ ٱلْـفَخْرَ فَـوَجَدتُهُ فِيٱلفَـقْرِ، وَ طَـلَبْتُ ٱلشَّرَفَ فَوَجَدتُهُ فِي ٱلقَنَاعَةِ وَ طَلَبْتُ الاِسْتِغْنَاءَ فَوَجَدتُهُ فِي ٱلتَّوَكُّلِ﴾

برایانی دینی چەند ئامۆژگاریەکتان دەکەم ئەگەر بە قسەم بکەن، سەربەرزی دنیا و قیامەتتان دەس دەکەوێ.

فەرمووی: ئەگەر دەتان ئەوێ گەورەبن، خۆتان بە گەورە مەگرن، چونکە من زۆر لەگەورەیی گەڕام، تەماشام کرد گەورەیی لە خۆ بە کەم گرتن دایە، ئەگەر دەتان ئەوێ ببنە ڕەئیس و پیاوەتیتان دەست کەوێ، ئامۆژگاری خەڵک بکەن و ڕێگای ڕاستیان نیشان بدەن، ئەگەر پیاوەتیان پێ خۆشە و پێتان خۆشە خەڵک بە پیاوتان بزانێ، ڕاست و ڕاست گۆ بن، چونکە پیاوەتی لە ڕاست گۆییدایە، ئەگەر دەتان ئەوی شانازی بە سەر خەڵکدا بکەن، بە فەقیری ڕازی بن، چونکە من لە فەخر و شانازی گەڕام، تەماشام کرد فەخر لە فەقیری دایە، بەو شەرتە ناشوکر نەبی، فەرمووی: ئەگەر شەرفتان دەوێ، قەناعەت بکەن، چونکە شەرافەت لە قەناعەت دایە، فەرمووی: ئەگەر دەتان ئەوێ دەوڵەمەندبن، تەوەکولتان بە خوابێ، چونکە دەوڵەمەندی لە تەوەکول دایە.

«حەزرەتی وەیسی قەرەنی» بە زۆری خۆی وەک شێت نیشان داوە. جارێک کۆمەڵێک منداڵ دوای دەکەون و بەرد بارانی دەکەن، ئەویش لەسەر خۆ دەفەرمووێ: ڕۆڵە کانم بەردی گەورەم پێ دامەدەن با بریندار نەبم و خوێنم لە بەر نەڕوا دەست نوێژ کەم بشکێنێ، چونکە ئاوم دەست ناکەوێ دەست نوێژ تازە بکەمەوە.

لە کتێبی «سَفِنَةُ الأَوْلِیا» دا، دەفەرمووێ: «وەیسی قەرەنی» بە قەولێک لە ساڵی بیست و دووی کۆچیدا و بە ڕیوایەتێک لە ساڵی سی و دووی کوچیدا، لە غەزادا شەهید کراوە.

زانای بە ناو بانگیش ئەحمەدی کوڕی عَبْدُاللەی ئەسفەهانی لە کتێبی «حِلْیَةُ الأَوْلِیا» دا لە زمان چەند کەسێکەوە دەگێڕێتەوە، کە لە زەمانی حەزرەتی عومەردا و لە غەزای ئیراندا شەهید کراوە، کەواتە «وەیسی قەرەنی مایدەشت»، «حەزرەتی وەیسی قەرەنی» مەشوورەو ئێستا گۆڕەکەی زیارەتگای موسوڵمانانە، ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و گەورەیی و فەرمایشتەکانی «حەزرەتی وەیسی قەرەنی».

یاڕەببی خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت و عەبدایەتی «وەیسی قەرەنی» لێمان خۆش بی. خوایە عەفوومان کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکەی. خوایە لە بەڵاو موسیبەت بمان پارێزی ئامین.

وَ ٱلسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ و رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٣)
# حەسەنی بەسری

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلعَلِيمِ اَلحَكِيمِ اَلعَلِيِّ، وَ اَلصَّلٰواةُ وَالسَّلٰامُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِـهِ وَ أَصْحٰابِهِ اَلجَلِيِّ، وَ عَلىٰ اَلتّٰابِعِينَ خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلىٰ ﴿اَلحَسَنَ اَلبَصْرِيِّ﴾ ]

دانیشتووانی خۆشەویست، با، لە کۆڕ و مەجلیسی ئێستاماندا زۆر بە ئەدەب دانیشین و بە چاوی دڵ بڕوانینە فەزڵ و گەورەیی چرای مەجلیسی ئیمرۆمان و پەند و ئامۆژگاری‌لێ وەرگرین.

مەوعیزەی ئێستامان باسی یەکێک لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی ویلایەت دەکا، کە لە زەمانی خۆییدا چرای عیلم و عەمەل بوو، ڕەئیسی واعزین بوو، گەورەی زۆربەی تابیعین بوو، بە خزمەت سەد و سیی ئەسحابی پێغەمبەر گەیشتبوو، کە ئەویش «حەزرەتی شێخ حەسەنی بەسری»، (ڕەزای خوای‌لێ بێ.)

دەڵێن: کاتیک «شیخ حـەسەنی بـەسری»، کـە لە دایک بـوو، بـردیانە خـزمەت حەزرەتی عومەر تا ناوی لێ بنێ.

حەزرەتی عەمەر تەماشای کرد و فەرمووی: چونکە ناو چاوانی زۆر جـوان و حەسەنە، ناوی بنێن حەسەن

دایکی «شێخ حەسەنی بەسری» خزمەتی ئوممووسەلەمەی حەرەمی پێغەمبەری کردووەو لە ماڵی ئەواندا بووە وکاری کردووە. دەڵین: ئومووسەلەمە بە مـنداڵـی «شێخ حەسەنی» زۆر خۆش ویستوەو فەرموویەتی: لە خوای گەورە داوا دەکەم،

کە ببێتە پیاوێکی چاک و خەڵک بە هرەی لێ وەرگرن.

ئەڵێن: ڕوژێک دایکی «شێخ حەسەن» لە ماڵ نەبوو، «شێخ حەسەن» گروی گرت و زۆر گریا، ئوممووسەلەمە چوو هەڵی گرت و لە باوەشی گرت و بۆ ئەوەی ژیرە وەبێ، مەمکی خۆی بۆ دەرهێنا و دەزاری نا، هەرچەند ئـوممووسەلەمە مـنداڵـی نەبوو تا شیری تێدابێ بەڵام بە ئەمری خودا چەند قەترە شیر دێتە ناو مەمکی و «حەسەن»، دەیان مژێ و ژیر دەبێتەوە، دەڵین، ئەو هەموو فەزل و گـەورەیی و، عیلم و زانیاری و، زوهد و تاعەت و، تـەقوا و فـەساحەتەی «شـێخ حەسەن» لە ئەسەری ئەو چەند قەترە شیرەوە بووە..

وا دایار دەکەوێ، کە تا «شێخ حەسەن» بووە، یان تا، بلوغی بووە، پێغەمبەر وەفاتی فەرمووە، بۆیە لە ئەسحاب نیەو بە تابیعین ناو دەبرێ.

«شێخ حەسەن» گەورە دەبێ. تا کاتێ شاری بەسرە دروست دەکرێ دێتە بەسرا و دەست دەکا بە گەوهەر فرۆشی.

خاوەنی «تِذْكِرَةُ ٱلأَوْلِیا» دەفەرمووێ: یەکەم هۆی تۆبە کردنی حـەسەنی بـە سری ئەو سەفەرە بوو، کە چوو بۆ وولاتی ڕۆم، لەو سەفەرەدا وارێکەوت چوو بۆ لای وەزیری پاشای ڕۆم. ڕۆژیک وەزیر گوتی: ئەی «حەسەنی بەسری» ئیمڕۆ لە شار دەچینە دەرێ، تۆش وەرە لە گەڵمان، ووتی: باشە.

ڕۆیین تا لە شار دوور کەوتنەوە، تەماشای کرد، خێوەتێک لە پارچەی بە نرخی ڕۆمی هەڵدراوە، تەنافەکانی لە ئاوریشمن، گوڵ مێخەکـانی لە ئـاڵتون دروست کراون. لە شکرێکی زۆر لە دەوری خێوەتەکـە بـە چـەکـی حـەربی و لیـباسی جەنگی‌یەوە بە سەف وەستاون، سەف بە سەف و دەستە دەستە، بـە بـەردەمی خێوەتەکەدا تێپەڕین و لە بەر خۆیانەوە شتێکیان ووت و ڕۆیشتن، لە دوای ئەوان کۆمەڵێک لە پیاو ماقووڵ هاتن و ئەوانیش بەو دەنگ تێپەرین، لە پاشان نزیکەی

جوانی تازە پێگەیشتوو، کە هەر یەکەی سینێکی پڕ لە گەوهەر و زێڕ و جەواهێری لە سەر سەر بوو، بە لای خێوەتەکەدا ڕۆیشتن، لە پاشان قەیسەری ڕۆم لە گەڵ وەزیرەکان چوونە ناو خێوەتەکەوە و پاش ماوەیەک هاتنە دەرەوەو ڕۆیشتن.

«حەسەنی بەسری» سەری لەو کارە ساتە سڕما، رووی کردە وەزیری ئاشنای و گوتی: وەختە شێت بم، پێم بڵێ ئەوە چی بوو؟ وەزیر ووتی: ئەی «حەسەنی بەسری» قەیسەری ڕۆم کوڕێکی زۆر ئاقڵ و جوان چاک و سوارچاکی بوو، بە دڵ خۆشی دەویست، قەزای ڕەببانی تووشی نەخۆشیەک بوو، بۆ تەداوی دوکتۆری دنیای هێنایە سەری چاری ئەو نەخۆشی یەیان بۆ نەکراو کوڕە کە مرد.

ئەو خێوەتە گۆڕی کوڕی قەیسەرە، ساڵی جارێک دێنە سەر گۆڕەکەی و دەڵێن: ئەگەر بە سپا و لشکر و ماڵی دنیا نەجاتت دەبێ، ئێمە هەموومان ئامادەین گیانی خۆمان فیدای تۆ بکەین، بەڵام ئەوەی بەسەر تۆ هاتووە، کاری کەسێکە، کەس دەسەڵاتی ئەوی نیەو هیچی لە گەڵ ناکرێ.

«حەسەنی بەسری» کە ئەوەی بیست حاڵی گۆڕا و زوو گەڕایەوە بۆ بەسرا و سوێندی خوارد کە تەرکی دنیا پەرستی بکا و خەریکی خوا پەرستی بێ.

ئەم گەوهەر فرۆشە بوو بە پیاوێکی وا، لە ماوەی حەفتا ساڵدا زۆر بە کەمی بێ دەس نوێژ بووە، بوو بە واعیزێکی وا، خەڵک لە وڵاتانڕا دەچوونە مەجلیسی مەوعیزە و ئامۆژگاری بۆ شاری بەسرە، دەیان دانا و زانا لە کۆڕی ئامۆژگاری ئەودا، بە چۆکدادەهاتن و گوێیان لە فەرمایشتەکانی دەگرت، کەم کەس هەبوو، لە مەجلیسی مەوعیزەی «شیخ حەسەن»دا دانیشێ و خۆی بۆ ڕابگیرایە و نەگریایە.

جارێک لە مەوعیزەدا بە تووڕەییەوە ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: ئێوە زۆر پێمەکەنن، نازانن کە خواوەندی گەورە ئاگای لە هەموو کردەوەیەکتانە؟ ئەگەر بفەرمووێ: هیچ کردەوەیەکتان قبوڵ ناکەم، چتان لە دەست دێ؟ فەرمووی: ئەی خاک بەسەرتان، ئێوە بێ ئەمری خوای گەورە ئەکەن، ئێوە تواناتان هەیە شەڕ لە

گەڵ خوادا بکەن؟ ئێوە نازانن کەسێک بێ ئەمری خوا بکا و گوناح بکا، وەک ئەوە وایە ئیعلانی حەربی کردبێ لەگەڵ خوا.

فەمووی: قەسەم بە خوا من حەفتاکەسم لەو ئەسحابانە دیوە کە لە غەزای بەدردا بوون، بەرگ و لیباسەکەیان خوری بوو، ئەگەر ئیستا بتان دینایە، دەتانگوت شێتن. بەڵام بە پێچەوانە، ئەگەر ئەوان باشەکانی ئیوەیان بدیایە، دەیان گوت: ئەمانە هیچیان وەک ئەهلی بەهەشت ناچی و فریان بە سەر بە هەشتەوە نیە، وەئەگەر خراپەکانی ئێوەشیان چاو پێ بکەوتایە، ئەیان ووت: دیارە ئەوانە ئیمانیان بە خوا نیە!

✓ ڕۆژیک کابرایەک دەمرێ و «شیخ حەسەنیش» لەگەڵ جەنازەکەیدا دەچێ بۆ سەر قەبران، دوای ئەوەی کابرا تەسلیم بە خاک دەکەن و دای دەپۆشنەوە و مەلا لە تەلقین دەبێتەوە، «شیخ حەسەن» ئەوەندە دەگری، فرمێسک بەرپێی تەڕ دەکا، لە پاشان ڕوو دەکاتە خەلک کەو دەفەرمووێ: [اَلْقَبْرُ أَوَّلُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ اَلْاٰخِرَةِ وَ آخِرُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ اَلدُّنْيَا] ئەی خەڵکینە: بزانن کە قەبر و گۆڕ یەکەم مەنزلی ئینسانە لە مەنزڵەکانی دووا ڕۆژ و ئاخر مەنزلیشە لە مەنزڵەکانی دنیا. فەمووی: زۆر سەیرە، ئێوە شانازی بە دنیایەکەوە دەکەن، کە ئاخر مەنزڵ و جێگا خۆشەکەی قەبرەوە، لە قیامەتیش ناترسن، کە یەکەم مەنزلی قەبرە، ئەو فەرمایشت ومەوعیزەی «شیخ حەسەن» ئەوەندەی کار لە دڵی خەڵکە کە کرد، کەس خۆی بۆڕانە گیرا و دەستیان کرد بە گریان.

✓ زۆر کەس بە هۆی ئامۆژگاری کردنی «شیخ حەسەن» و لە بەرەکەتی ئەوەوە خوا هیدایەتی داوون، بۆ نموونە دەڵێن: شەمعوون ناوێکی ئاگر پەرست جیرانی «شیخ حەسەن» بوو نە خۆش کەوت، شێخ حەسەن چوو بۆ ئەحواڵ پرسی و لە لای سەریەوە دانیشت و فەرمووی: بەسە: لە خوا بترسە، بەڵکو ڕەحمت پێ بکا، ئەو دو کەلیمە لە دڵی شەمعووندا کاریان کرد و دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەی

«شیخ حەسەن» من لە بەرسێ شت موسوڵمان نابم، یەکەم دەبینم، موسوڵمانان غەیبەتی دنیا دەکەن، کەچی زۆریشی هەوڵ بۆ ئەدن. دووەم دەڵێن، مردن حەقە ڕوژی قیامەت ڕاستە، بە لام خۆیان بۆ ئامادە ناکەن. سێیەم دەڵێن خوامان زۆر خۆش دەوێ، لە قیامەتا بە خزمەتی دەگەین کەچی بە زۆری بێ ئەمری خوا دەکەن و خوالێیان تورەیە و چۆن ڕوویان دێ بچنە حزووری خوا!
«شێخ حەسەن» فەرمووی: موسوڵمان ئیمانی بە خوایەو ڕۆژیک دەبێ تۆبە بکا و خوا عەفووی کا، بەلام تۆ کە حەفتا ساڵە ئاگر دەپەرستی و منیش قەت ئەم پەرستووە، فەرقمان ناخا و وەک یەک دەمان سوتێنێ فەرمووی: بەلام گەورەیی خوا و بێ دەسەلاتی ئاگرت بۆ تاقی دەکەمەوە، «یا اَللّه» یەکی گوت و دەستی خستە ناو ئاگر، بە ئەمری خوا زەرەری پێ نەگەیشت. شەمعوون کە ئەو حاڵەتەی چاو پێ کەوت، ڕەنگی گۆڕاو ڕووی کردە «شیخ حەسەن» و گوتی: حەفتا ساڵە ئاگر دەپەرستم، تازە من چی بکەم؟ «شیخ حەسەن» فەرمووی: موسوڵمان بە. گوتی یا شێخ ئەگەر بە خەتی خۆت بۆم دەنووسی کە مردم خوا عەزابم نەدا، موسوڵمان دەبم، «شێخ حەسەن» فەرمووی: باشە، هات بەخەتی خۆی ئەمان نامەیەکی بۆ نووسی، شەمعوون زۆر گریا و شادە و ئیمامی هێنا، وەسیەتیشی کرد، گوتی: ئەگەر مردم ئەو ئەمان نامەیە بخەنە ناو گۆڕە کەمەوە. زۆری نەخایاند شەمعوون مرد، خەڵکێکی زۆر حازری جەنازەکەی بوون ونوێژیان بە جەماعەت لە سەر کرد و تەسلیم بە خاکیان کرد. ئەو شەوە تا لای بەیانی «شێخ حەسەن» خەوی لێ نەکەوت، لە بەر خوێەوە دەیفەرموو: تەماشای من چیم کرد! خۆم زەحمەتە ڕزگارم بێ، ئەوندە غەرقی گوناحم، جا چۆن تاوان بارێکی‌تر بە نامەی من عەفوو دەکرێ!

بەو خەیاڵەوە خەوی لێ کەوت. لە خەوەکەیدا تەماشای کرد، ئەوا ڕوحانیەتی شەمعوون لە بە هەشتا سەیر دەکا. لە خەوەکەیدا لێی پرسی چۆنی؟ گوتی: یا شێخ

لە چیم لێ دەپرسی؟ حاڵم زۆر خۆشە، خوای گەورە عەفووی کردم، ئەوش ئەمان نامەکەت، تازە کارم پێ نەماوە. لە حەیبەتان لە خەوەکەی ڕاپەڕی. بەڕیوایەتێک دەڵێن: کە سەیری کرد ئەو ئەمان نامەی، کە بۆی نووسی بوو، خستبوویانە قەبرەکەی شەمعزونەوە، لای دانرا بوو، «شێخ حەسەن»، کە ئەوەی چاو پێ کەوت، سوجدەی شوکری بردو، گریا و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، بە شادە و ئیمانێک لە ئاگر پەرستی حەفتا ساڵە خۆش دەبی، جا چۆن موسوڵمانی حەفتا ساڵە مەحروم دەکەی! «شێخ حەسەن» عادەتی وابوو کەسێک خراپەی لە گەڵدا بکردایە، ئەو چاکەی لە گەڵ دەکرد. دەڵێن: جارێک بۆیان گێڕایەوە کە فلان کەس غەیبەتی کردووی. شێخ هەستا زەرفێکی خورمای باش بۆ کابرا بردوو، چوو بۆلای، فەرمووی: [بَلَغَنِي أَنَّكَ أَهْدَيْتَ إِلَيَّ حَسَنَاتِكَ فَأَرَدْتُ أَنْ أُكَافِيكَ عَلَيْهَا فَاعْذِرُونِي فَإِنِّي لا أَقْدِرُ أَنْ أُكَافِيكَ عَلَى الإِتْمَامِ]

ئەی فلان کەس، هەواڵم زانی کە تۆ سەوابی کردەوە چاکە کانت بۆ من ناردووە، منیش ویستم پاداشتت بدەمەوە، بەڵام ببوورە، نەم توانی بەتەواوی پاداشتت بدەمەوە، کابرا زۆر خەجاڵەت بوو، لە سەر دەستی شێخ تۆبەی کرد کە جارێکی تر غەیبەتی کەس نەکا.

«شێخ حەسەن» فەموویەتی: قسەی چوار کەس زۆری کار تێ کردم و تا مردن لە یادم ناچن یەکەم، ڕۆژێک پیاوێکی بێ ناموسم گرت و بە تووڕەییوە گوتم بەسە تاکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: یا شێخ کتێب بۆ ئاخری دەگیرێتەوە، خوا دەزانێ ئاخری من و تۆ چۆن دەبێ.

فەرمووی دووەم، پیاوێکی سەر خۆشم دی لە ناو قوڕدا، هەر دەکەوت و هەڵدەستایەوە، ووتم: قاچت توند بگرە با نە کەوی، خێسەیەکی لێ کردم و ووتی: تۆ ئاگات لە خۆت بێ نە کەوی، ووتی: من بکەوم قوڕاوی دەبم و خۆم دەشۆمەوە، بە لام کەوتنی تۆ زەرەر بە زۆر کەس دەگەیێنێ.

فەرمووی سێیەم، تووشی منداڵێک بووم چرایە کی بە دەستەوە بوو، ووتم: ئەو ڕووناکی‌یەت لە کۆی هێناوە؟ من لە قسەکەم نەبوومەوە، با یەک هات چراکەی کوژاندەوە، کوڕە کەفەوری گوتی: یا شێخ تۆ پێم بڵێ: ڕوناکیە کە بۆ کۆی چوو؟.

فەرمووی: چوارەم، ئافرەتێک بە توڕەییەوە هات بۆ لام شکایەت لە مێردەکەی بکا، ووتم: تا زووە جارێ دەمو چاوی خۆت داپۆشە، ئافرەتە کە گوتی: زۆر سەیرە من داوای خۆشەویستی مێردەکەم‌دەکەم شعوورم لا نەماوە، خۆ تۆ داوای خۆشەویستی خوا دەکەی، چی دەبوو دڵت لای خۆشەویستەکەت بوایە و سەر و چاوی ڕووتی منت نەدی بایە فەرمووی: ئەو وەڵامانە زۆر پڕ مەعنان و زۆریان ، کار، تێ کردم. ڕۆژیک عەرزیان کرد قوربان ئەوەتی دەستت لە دنیا بەرداو قەت دڵت بەزۆری خۆش بووە؟ فەرمووی: بەڵێ ڕۆژیک لە سەربان بووم، گوێم لە ژنی دراوسێکەمان بوو، بە مێردەکەی دەگوت: ئەوە، نزیکەی پەنجا ساڵە لە ماڵی تۆدام، شت بووبێ، نەبووبێ، لە سەرما و گەرما دا سەبرم گرتووە، قەت شتی زیادم لە تۆ داوا نەکردووە، عەیب و عاری تۆم نەبردوەتە دەرەوە، لای کەس باسم نەکردوی، ناوم بە خراپە نەبردوی، بەڵام ئەوە بزانە، قەت ئەوە قبوڵ ناکەم ژنم بە سەربێنی من ئەو هەموو فەقیری و نەداری و کوێرەوەریەم بۆیە نۆشی‌وە چاوم لە تۆبێ. ئەگەر فکری ژن هێنان بکەی دەچم لای گەورەو ئیمامی موسوڵمانان، شکایەتت لێ دەکەم.

«شێخ حەسەن» فەرمووی: قسەی ئەو ئافرەتەم ئەوەندە پێ خۆش بوو، لە خۆشیان فرمێسکم بە چاواندا هاتنە خوارێ و گوتم: بزانم وێنەی ئەوە لە قورئاندا هەیە. تەماشام کرد لە سورەی نیسادا دەفەرمووی: ئایەتی ٤٧ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَ يَغْفِرُ مَا دُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ بە ڕاستی خوا، لەو کەسە خۆش نابێ کە شەریک و هاوبەش بۆ خوا قەرار بدا، بەڵام بە ئارەزووی خۆی لە گوناحی‌تر

خۆش دەبێ. فەرمووی: شەراکەت ئەوەندە خراپە..

«شێخ حەسەنی بەسری» ڕەزای خوای لێ بێ، وەکوو خاوەنی کتێبی «سَفِینَةُ آلأَولِیا» دەڵی: لە ساڵی سەت و دووی کۆچیدا لە شاری بەسرە وەفاتی کردوە و عومری موبارەکی هەشتا و نۆساڵ بووە بەڵام خاوەنی «کراماتالاولیا» دەڵێ: لە دوای نیوەڕۆی پێنجشەممەدا لە ئەووەلی مانگی ڕەجەبی ساڵی سەت و دەی کۆچیدا وەفاتی فەرمووەو، گۆڕی موبارەکی لە شاری بەسرەیە و زیارەتگای موسوڵمانانە.

ئەوە بوو، بە کورتی باسی «شێخ حەسەنی بەسری» ئومێد دەکەم بەدڵ گوێتان دابێتە فەرمایشت و ئامۆژگاریەکانی و پەند و ئامۆژگاریتان لێ وەرگرتبێ. خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت و خۆشەویستی پێغەمبەروئەولیای ئوممەتی پێغەمبەر عەفوومان کەی. خوایە هیدایەتمان بدەی بۆ پەیڕەوی لەدینی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام و پیاو چاکی ئوممەتی پێغەمبەر. خوایە لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان و زوڵمی زاڵمان بە دوورمان کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکی ئوممەتی پێغەمبەر لە ژێر ئاڵای پێغەمبەردا حەشرمان بکەی ئامین یا رَبَّ الْعالَمِینْ.

[وَ ٱلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ و رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ]

# (٤)
# مالکی کوڕی دینار

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلْعَزِيزِ اَلْغَفَّارِ، وَصَلىَ اَللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا وَ شٰافِعِنٰا وَ قٰائِدِنٰا مُحَمَّدٍ اَلْمُخْتٰارِ، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ، خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلىٰ مٰالِكِ بِنِ دِينٰار]

وەرن با لە چەند دەقیقەی داهاتوودا دەست لە قسەی دنیایی هەڵگرین و بە خەیاڵ بڕۆین بۆ مەجلیسی یەکێک لە پیاو چاکان وئەلیای خوا و هێندێک باسی ژیان و بە سەرهات و زوهد و تاعەت و خواپەرستی وکەراماتی بخوێنین و پەند وئامۆژگاری لێ وەرگرین.

ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە مالیکی ملکی ویلایەتە، شەمعی کۆڕی هیدایەتە، گوڵی مەجلیسی ئەدەب و ویقارە، «مالیکی کوڕی دینار»ە.

جا با لە پێشدا بزانین بۆچی پێی دەڵێن کوڕی دینار، هێندێک لە زانایان گوتویانە: باوکی ناوی دینار بووە، بەلاّم زۆربەی نووسەران دەڵێن: جارێک «مالیک» دەچێ بۆ سەفەرێک و سواری کەشتی دەبێ، کەشتی بەحەرەکەت دەکەوێ و دەڕوا، زۆری پێ ناچێ کەشتیەوان دەڵێ: پارەکانتان کۆ بکەنەوە، «مالیک» دەست دەکا بە باخەڵیدا، تەماشا دەکا پارەی پێ نیە، لەگەڵ کابرای کەشتی یەوان لێیان دەبێ بە شەڕ، خۆ تازە کەشتی ڕۆیشتوەو ناگەڕێتەوە، ئاخری کابرای کەشتیەوان تینی بۆ دێنێ و دەڵێ: ئەگەر دینارێک پەیدا نەکەی، دەت خەمە ناو دەریاوە، ڕاوی دەڵێ: خەریک دەبن بە چوار دەست هەڵی گرن و بیخەنە ناو دەریاوە، بە ئەمر و ئیرادەی خوا، لەو کاتەدا ماسی یەک سەر دەر دێنی و دینارێک

هەڵدەداتە ناو کەشتی یەکەوە، خەڵکە کە، کەئەوکارە ساتەیان چاوپێ دەکەوێ، دەزانن «مالیک» پیاوی خوایە و ئەوە کەرامەتە نواندی، دەس دەکەن بە دەست ماچ کردنی و داوای عەفووی لێ دەکەن. جا، لەوەرا ناوی بەسەردا برا بە «مالیکی کوری دینار.»

رۆژێک مەوعیزەو ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد. فەرمووی: خەڵکینە مەردی خوا بن لە رێگا و رێبازی شەرع لامەدەن. هەرچی دەیکەن بە ئیخلاس بیکەن، راست برۆن و راست گۆ بن.

فەرمووی: با مژدە بێ بۆ ئەو کەسانەی کە کاری چاک دەکەن و بەراستی خوا دەپەرستن و یادی خوا دەکەنەوە، کە خواوەندی گەورە پێیان دەڵێ: [أَيُّهَا الصِّدِيقُونَ تَنَعَّمُوا بِذِكْرِ اللهِ فِي الدُّنيَا فَإِنَّهُ لَكُمْ فِي الدُّنْيَا نَعِيمٌ وَ فِي الآخِرَةِ جَزاءٌ عَظِيمٌ] ئەی ئەو کەسانەی کە بە راستی ئیمانتان هێناوە راست گۆن، تا دەتوانن لە ماوەی ژیانتان لە دنیادا، لەززەت لە زکری خوا، وەرگرن، چونکە یادی خوای گەورە بۆتان دەبێتە هۆی ناز و نیعمەتی زۆر، لە دنیادا و، لە قیامەت و پاشە رۆژیشدا پاداشتی باشی لە سەر وەر دەگرن. فەرمووی: با بۆتان بگێرمەوە کە هۆی گەرانەوە و تۆبە کردنی من چۆن بوو، لە ئیخلاسی و راستیدا چیم دەست کەوت.

فەرمووی: گەنجێکی زۆر جوان بووم، حەزرەتی معاویە مزگەوتێکی زۆر گەورەی لە شاری دمیشق دروست کرد، زەوی و زارێکی زۆری لە سەر وەقف کرد، منیش گوتم: واچا کە ئیشێکی وابکەم، بەڵکو بمکەن بە موتەوەلی ئەو قافەکان، چووم، لە مزگەوت دەستم کرد بە خوا پەرستی، بۆ ئەوەی خەڵک بڵێن بەدینە، بۆ موتەوەلی دەبێ، بەڵام بە پێچەوانەی ئاواتەکەی من، هەرچی دەهاتە مزگەوت و چاوی پێ دەکەوتم دەیگوت: ئەوە بەدرۆ گۆشەی مزگەوتی گرتووە.

فەرمووی: لە پاش ساڵێک، رۆژێک بۆ تە ماشای دنیا، لە مزگەوت هاتمە دەرەوە، لە غەیبەوە گوێم لە دەنگێک بوو، گوتی: [يَا مَالِكُ مَالَكَ أَنْ لاتَتُوب؟]

ئەی مالک تۆ لە بەرچی بەڕاستی تۆبە ناکەیت و ڕوو ناکەیتە خوا؟

فەرمووی: کە گۆیم لەو ئاوازە بوو، زۆر بە سەرسامیەوە گەڕامەوە بۆ مزگەوت، لە دڵی خۆمدا گوتم: تۆ وەرە، بڕوانە من، ئەوە یەک ساڵە بە درۆ خوا پـەرستی دەکەم، ئەگەر بەڕاستی بۆ خوا بوایە باشتر نەبوو؟

فەرمووی: کوڕینە: هەرلەو کاتەدا تۆبەم کرد. ئەو شەوە بە دڵێکی زۆر پاک و دوور لە ڕیایی دەستم کرد بە خوا پـەرستی، بـۆ بـەیانی، کـە خـەڵک هـات بـۆ مزگەوت، گوێم لێ بوو هەرکەس لە بەر خۆیەوە دەیگوت بەڕاستی ئەو مزگەوتە پێویستی بە موتەوەلی هەیە و تەعمیرات و چاکردنی دەوێ.

ڕۆژی دوایی زۆر بەی پیاو ماقووڵ کۆ بوونەوە و بڕیاریاندا گوتیان: «مالیک» لە هەموو کەس باشترە بیکەن بە موتەوەلی، هاتن بۆ لام و گوتیان نابێ لە قسەمان دەرچی. فەرمووی: منیش ڕووم کردە ئاسمان و گوتم: ئەی خوای گەورە تا بە درۆ تۆم ئەپەرست کەس تەماشای نەکردم، بەڵام ئەوە چـەند ڕۆژە بـەراسـتی ڕووم کردوەتە تۆ، تازە خەریکی بەدەست دنیاوە گرفتارم کەی، بەگەورەیی تۆ قبووڵی ناکەم.

فەرمووی: خەڵکەکەم جواب کرد و لە مزگەوت هاتمە دەرەوە، هاتم بۆ بەسرا. دەفەرمووێ: دووبارە خواوەندی گەورە، تاقی کردمەوە، لە بەسرا پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند مردبوو، کچێکی زۆر جوان نەبێ، میرات گری نەبوو، ڕۆژێک کـچە دەچێتە لای شێخ سابتی بە ننانی و عەرزی دەکا: قوربان زۆر حەز دەکەم «مالیکی کوڕی دینار» مارەمکا.

فەرمووی: شێخ سابت فەرمووی: فلان ئافرەتە ئاوای بە من گوتووە: تۆ دەڵێی چی؟ ووتم: یا شێخ من دنیام سێ بە سێ تەڵاق داوە، ژنیش بەشێکە لە دنیا، جا پیاو تەڵاق دراوی خۆی سێ بە سێ چۆن مارە دەکاتەوە.

«مالیکی کوڕی دینار» فەرمایشتی زۆر خۆشمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ:

ڕۆژێک بە لای کلیسایەکدا ڕۆیشتم، تە ماشام کرد، ڕاهیبێک لە کلیسایەکەدایە، گوێم لێ گرت دەی گوت: ئەی خوای گەورە، ئەی کەسەی کە هەمووکەس پەنات بۆ دێنێ، ئەی ئەو زاتەی کە تەواوی زانایان و پیاو چاکانی ئایینی ئارەزوی دیدارت دەکەن، تۆبە، لەو کردەوانەی کە تا ئێستا کردوو من و خۆشیەکەیان ڕۆیشتووەو گوناحەکەیان ماوەتەوە.

فەرمووی: کە گوێم لەو پاڕانەوەیە بوو، زۆرم لا سەیر بوو، خۆم بۆ ڕانەگیرا و چووم بە لایەوە. سەلامم کرد، وەڵامی دامەوە، ئنجا گوتم: ئەوە چۆن موسوڵمان بوی؟

لە وەڵامدا ووتی: لە خەومدا یەکێک هاتەلام، گوتی: ئەوە تۆ تاکەی خوا ناپەرستی گوتی: تۆ نازانی کە حەزرەتی عیسایش عەبد و بەندەی خوا بوو؟

ووتی: لە خەوەکەمدا هۆشم هەبوو، پرسیارم لێ کرد و گوتم: تۆ چ کەسی؟

فەرمووی: من ئەو کەسەم کە تەوڕات و ئینجیل و عیسا و مووسا باسیان کردووە.

ووتی: گۆیم لێ بوو فەرمووی: ئەی خوای گەورە هیدایەتی بدەی. دەڵێ: ئەو دۆعایەی بۆ کردم و لە پێش چاوم وون بوو. ووتی: قەسەم بە خوا، کە وەخەبەر هاتم، دین و ئایینی ئیسلامم لە هەموو شتێ بەلاوە پیرۆزتر و خۆشەویستر بوو.

گۆی گرینە، با بۆ دڵ ڕاگرتنی جیران و دراوسێ چاولە «مالیکی کوڕی دینار» بکەین.

ساڵێک «مالیکی کوڕی دینار» خانوویەک بە کرێ دەگرێ، خانووەکە دەکەوێتە پێش ماڵە جوولەکەیەک، ئاوی، ئاو دەستی ماڵە جوولەکەکە، بە بەردەمی دەرگای ماڵی «مالیکی کوڕی دینار» دا دەڕوا، «مالیک» هەموو ڕۆژێک بە دەستی خۆی جۆگەی ئاوە پیسەکە پاک دەکاتەوە.

ڕۆژێک جوولەکەکە، لە بازار دێتەوە، تەماشا دەکا، ئەوا «مالیکی کوڕی دینار» چاکی لێ کردووە بە لاداو جۆگەی ئاوە پیسەکەی ئەوان پاک دەکاتەوە، زۆری

لاسەیر دەبی، روو دەکاتە «مالیک» و دەڵێ: ئەی «مالیکی کوڕی دینار» ئەوە چۆن تا ئێستا تووڕە نەبویت‌و سەبرت گر تووە؟ «مالیک» زۆر بە هیواشی و لە سەر خۆ سەر بەرز دەکاتەوە و دەفەرمووێ: ئاخر خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ خوا، لەو عەبدانـە خـۆش دەبـێ کـە، ڕقـی خۆیان دەخۆنەوەو ئەگەر جیران و دراوسێ ئەزیەتیشان پـێ بگـەیێنن خـۆیان ڕادەگرن. فەرمووی: جا منیش لەبەر ئەوە ئەو ئەزیەتەم قبوڵ کردووە.

کابرای جوولە کە، تۆزێک ڕاماولە پاشان گوتی: بە ڕاستی دین و ئایین ئـاوا دەبێ، کە پیاوێکی وەک تۆ، لە بەر ڕەزای خوا ئەزیەتی دین دوژمنی قبووڵ بکاو هەرهات پەلاماری دەستی «مالیکی»دا و ماچی کرد و گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاَّ ٱللّٰهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ ٱللّٰهِ) و ئیمانی هێنا و موسولمان بوو.

«مالیکی کوڕی دینار» زۆر لە خوا ترس بـووە. هـەرکاتێ لە نـوێژدا دەگـەیشتە ﴿اِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ اِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دەستی دەکرد بە گریان و زۆر دەگریا.

جارێک عەرزیان کرد، قوربان، ئەوە بۆ، کە دەگەیە سەر ئەوئایەتە دەگری؟

فەرمووی: جا چۆن نەگریم، لە بارەگای خوا، ڕوو دەکەمەخوا، بەدەم دەڵێم: ئەی خوای گەورە، تۆ دەپەرستم، بەڵام ئەگەر بیری لێ ئەکەمەوە ڕاست ناکەم، خوا پەرستی بە ڕاستی نیم، نەفس پەرەستم.

بەدەم ئەڵێم، ئەی خوای گەورە یارمەتی هەر لە تۆ داوا ئەکەم، کەچی دەیان جار پەنا بۆ خەڵک ئەبەم، با بۆ خۆ بەکەم گرتن و تەوازوعیش، چاو لە «مالیکی کوڕی دینار» بکەین.

دەڵێن جارێک ئافرەتێک پێی دەڵێ: ئەی ڕیا باز، ئەویش زۆری پێ خۆش دەبێ و بە ڕوو خۆشی یەوە دەڵێ: بە ڕاستی ئەوە بیست ساڵە دەمەوێ یەکێک بە ناوی ڕاستە قینەی خۆم بانگم کا، بەڵام تا ئیستا تۆ نەبێ کەس نەی ناسیوم.

جارێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، فەرمووی: خواوەندی گەورە دوو نیعمەتی

داوەبە ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان، تائیستا، نەی داوە بە هیچ تۆممەتێک.

یەکەمیان ئەو ئایەتەیە، کە خواوەندی گەورە، لە سورەی بەقەرەدا فەرموویەتی ﴿فَاذْكُرُونِي اَذْكُرْكُمْ﴾ ئێوە یاد و زیکری من بکەنەوە، منیش یادتان دەکەمەوە، و نیعمەتی دووەمیان ئەو ئایەتەیە کە لە سورەی غافردا فەرموویەتی ﴿اُدْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ ئێوە دۆعا بکەن و لە بەرم بپاڕێنەوە دۆعاتان گیرا دەکەم و وەڵامتان ئەدەمەوەو مەحرومتان ناکەم.

«مالیکی کوڕی دینار» دەڵێ: ئەی برای موسوڵمانان وریا بە، شەیتان بە سەهوت نەبا، ئەگەر هات و خەریکی کارێکی خێر بووی و خواکارێکی وای کرد بۆت نەکرا، ڕەخنە لە خوا نەگری و بێ ئەدەبی نەکەی.

دەفەرمووێ: زۆرم ئارەزوو لە غەزا بوو، تا ساڵێک پاشای ئیسلام بوو بەشەڕی لەگەڵ کافران و ئەمری غەزا درا، زۆرم پێ خۆش بوو، خۆم ئامادە کرد، کاتێ لەشکری ئیسلام حازر بوو، بە ئەمری خوا لە رزو تایە کم تووش بوو ئاگام لە خۆم نەما و پەکی غەزا کەم کەوت، زۆر ناڕەحەت بووم لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەگەر خوا خۆشی بویستمایە ئەو تایەم نەدەهاتێ و غەزاکەم بە نەسیب دەبوو.

فەرمووی: بەو خەیاڵەوە خەوم لێ کەوت، لە خەومدا گوتیان غەم مەخۆ، ئەگەر ئەو نەخۆشی‌یە نەبوایە و بچوویتایە بۆ غەزا ئەسیر دەکرای و تووشی خواردنی گۆشتی بەراز دەبووی، ئەو لەرزو تایە، هەدیە و دیاریەکی زۆر گەورە بوو، خوای گەورە بۆی ناردی.

فەرمووی: جا ئەوەیە مەعنای ئەو ئایەتە، کە خواوەندی گەورە لە سورەی بەقەرەدا دەفەرمووێ: ﴿وَ عَسىٰ أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَ هُوا خَيْرٌ لَّكُمْ وَ عَسىٰ أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَ هُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَ اللهُ يَعْلَمُ وَ أَنْتُمْ لاٰ تَعْلَمُونَ﴾

زۆر جاری وا هەیە شتێکتان پێ ناخۆشە، کەچی خێری تێدایە بۆ ئێوە، زۆر جاریش بەعزە شتێکتان پێ خۆشە بەڵام زەرەری هەیە بۆ ئێوە، قازانج و زەرەری

عەبد، خوا دەی زانێ، ئێوە نای زانن. ئەوە بوو، بەکورتی باسی ژیان و چەند فەرمایشت و ئامۆژگاری «مالیکی کوڕی دینار»، کە لە ساڵی سەت و حەوتی کۆچیدا وەفاتی فەرمووە: ئومێد دەکەم سودتان لێ وەرگرتبێ. خوایە عەفوومان بکەی. خوایە هیدایەتمان بدەی. خوایە لە خراپە و بێ شەرعی بە دوورمان کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکەی. ئامین.

وَ ٱلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ و رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكاٰتُهُ

# (٥)
# ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾
[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ ٱلْعٰالَمِينْ، وَ صَلىٰ ٱللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ عَلىٰ عِبٰادِ اللهِ ٱلصّٰالِحِين]

گوێ گرە خۆشەویستەکان، شەمعی عومرمان لەو چەند دەقیقەی داهاتوودا، لە کۆڕو مەجلیسی کەسێکدا هەڵدەکەین، کە دەورانێک پاشای بە لَخ و بوخارابووە، زەمانێک کلیل بەدەستی زومرەی ئەولیا بووە، گاهێ چل چرای دیوەخانەی ئەو دنیای ڕووناک کردوەتەوە، گاهێ ئەستێرەی ئاسمان شەو چرای بووە، سەردەمێک ڕاوچی نێچیری ئارەزووی نەفس بووە، دەورانێک ڕەندو دێوانە و قەلەندرە، گاهێ ڕەزو و باغ و باغاتی بە نیوەکار داوە، سەردەمێک بوەتە سەپان و باغەوان، کاتێک وەزیر و پیاوی دنیایی لەمەجلیسی دابوون، دەورانێک لە کۆڕی خواناسان و لەگەڵ ئیمامی ئەعزەم دادەنیشت، دەورانێک دەسەڵات داری دنیابوو، زەمانێک گەوهەر ناسی بازاری ئەولیا بوو.

ئەو سوڵتانی دنیا و دینە، ئەو سیمورغی قافی یەقینە، ئەو گەنجینەی عالەمی گۆشەگیرە، پاشای ئیقلیمی ئەعزەمە، «حەزرەتی ئیبراهیمی ئەدهەم»ە..

جا، با، بە ئەدەب دانیشین و بە گوێی دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«ئیبراهیمی ئەدهەم»، کوڕی سوڵتان سولەیمانی کوڕی سوڵتان مەنسوور

پاشای بەڵخ و بوخارایە.

لە کتێبی «تَذْكِرَةُ الأَوْلِيا» و «حِلْيَةُ الأَوْلِيا» و «سَفِينَةُ الأَوْلِيا» و «نَفَحاتُ الأُنْس» دا ئاوا باسی تۆبە کردنی «ئیبراهیمی ئەدهەم» دەکەن

دەڵێن: «ئیبراهیمی ئەدهەم» پاشای بەڵخ و بوخارا بووە، عالەمێک لەژێر فەرمانیدا بوو، کاتێک لە ماڵەوە دەهات بۆ بارەگا، چل کەس لەملا و ئەولایەوە ئەڕۆیشت، شەوێك لە ماڵەوە لەسەر تەختی مورەسەع بە گەوهەر و مرواری دەخەوێ، لە نیوەشەودا سەربانی کۆشکەکەی دەلەرێتەوە و هۆدەکەی تەکان ئەدا،

لە خەو ڕا دەپەڕێ و دەڵێ: ئەوە کێیە؟ لە غەیبەوە یەکێ وەڵامی دەداتەوە، دەڵێ: مەترسە ئاشنام، وشترم گوم کردووە لە وشترەکەم دەگەڕێم. «ئیبراهیمی ئەدهەم» زۆری لا سەیر دەبێ، بە سەرسامی و ترسانەوە دەڵێ: جا کابرا و شتر لە سەربان چی دەکا؟ دەنگەکە ئەڵێ: ئەی «ئیبراهیمی ئەدهەم»، ئەی غافڵ لە خوا، نوستنی تۆ لەو لێفەو دۆشەکەدا و لەو بەرگ و لیباسەدا و لەو کۆشک و تەلارەدا، لە وشتر دۆزینەوەکەی من سەیر ترە، چونکە تۆ بۆ ئەوە دروست نەکراوی.

«ئیبراهیمی ئەدهەم» کە ئەو دەنگەی بیست و ئەو وەڵامەی گوێ لێ بوو، خۆف و ترسێکی زۆری لێ نیشت و ئەو شەوە خەوی لێ حەرام بوو، خەوی لێ نەکەوتەوە.

بۆ بەیانی زۆر بەغەمگینی هات بۆ بارەگا، وەک عادەتی ڕۆژان، وەزیر و پیاو ماقووڵ هەریەکەی لە جێگای خۆی ڕاوستان. غوڵامان دەست لە سەر قەبزەی شمشێر بە سەف وەستان، لەو کاتە ناسکەدا پیاوێکی زۆر بەسام و هەیبەت پەیدا بوو، کەس توانای نەبوو بەرگری لێ بکا و نەهێڵێ بچێ بۆ لای پاشا، کابرا بێ پزس و بەسەر بەستی چوە ژوورەوە و لای «ئیبراهیمی ئەدهەم» دانیشت. «ئیبراهیمی ئەدهەم»، کە چاوی پێ کەوت، سەری سڕ، ما، چونکە تا ئەو کاتە کەس نەی توانی بوو، بێ پرس بچێتە خزمەتی.

بە ترسەوە گوتی: بۆچی هاتووی؟ کابرا زۆر بە هێواشی و لە سەر خۆ، گوتی:

بۆ ئێرە کاروان سەرانیە؟ «ئیبراهیمی ئەدهەم» ووتی: کاکە ئەوە دەڵێی چی؟ کاروان سەرای چی؟ ئەوە کۆشک و بارەگای منە. پیاوەکە تەماشای «ئیبراهیمی ئەدهەمی» کرد و گوتی: باشە، لە پێش تۆدا هی کێ بووە؟ ووتی: هی باوکم بوو. کابرا گوتی: ئەی لە پێش باوکتدا هی کێ بوو؟ گوتی: هی فلان کەس بوو. خولاسەی کەلام تا چەند کەسیان حیساب کرد پێدا ڕۆیشتن.

ئنجا کابرا گوتی: جا تۆ خوا «ئیبراهیمی ئەدهەم» پرسیار لە تۆ دەکەم، ئەوە کاروان سەرانیە، کە هەر یەکێ بێو یەکێ بڕوا؟ کابرا ئەوەی گوت و خواحافیزی کرد و هاتە دەرەوە و لە پێش چاوی خەڵک وون بوو. «ئیبراهیمی ئەدهەم» کە ئەوەشی چاو پێ کەوت، ئەوەندەی تریش ترسا و هەستا چوو بۆ ماڵەوە، نەی دەزانی چی بکا و بڵێ چی.

ڕۆژی دوایی فەرمانیدا سوارە سوار بن و تانجیان قەڵەدەر بکەن و بڕۆن بۆ ڕاو. ڕاوی دەڵێ: ڕۆیشتن دەستیان کرد بە گەڕان، «ئیبراهیمی ئەدهەم» لە سوارەکان دوور کەوتەوە، کەروێشکێکی هەستاند و دوایی کەوت، لە غارداندا گوێی لە دەنگێک بوو، بانگی دەکرد و دەی گوت:

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَ أَنَّكُمْ إِلَيْنَا لاٰ تُرْجَعُونَ﴾؟

ئایا ئێوە لاتان وایە ئێوەمان بە خۆڕایی دروست کردەوە و ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟ «ئیبراهیمی ئەدهەم» دووبارە کەوتەوە دەریای فکر و خەیاڵەوە، ئیستا گوێی هەر بەو دەنگە دەزرینگایەوە، کە لە غەیبەوە بانگیان کرد وە، [يَا إِبْرَاهِيمُ اِتَّقِ اللهَ وَ عَلَيْكَ بِالزَّادِ لِيَومِ الْفَاقَةِ]

ئەی «ئیبراهیم» لە خوا بترسە و توێشووی ڕۆژی فەقیری و دەست کورتی لە ڕۆژی قیامەتا ئامادە بکە.

کاتێ ئەو دەنگەی بیست و ئەو حاڵەتەی دی، بەتەوای حاڵی گۆڕا، گەڕایەوە ناو سوارەکان و ئەمری کرد کە ڕاو بەتاڵە.

بە ڕیوایەتێک دەڵێن: لە گەڕانەوەدا تووشی شوانێکی خۆیان بوو، بەرگ و لیباسی خۆی دانا و دای بە شوانە کە و کەپەنک و لیباسی شوانەکەی لە بەر کرد.

لەو کاتەدا، کە لیباسی پاشایەتی داکەند و لیباسی شوانی لەبەر ڕەزای خوا، لە بەر کرد، مەلائیکەی حەوت تەبەقەی ئاسمان هاتبوون تەماشایان دەکرد و دەیان گوت: گەورەیی بۆ خوا، چ سەڵتەنەتێک ڕوی کردە «ئیبراهیمی ئەدهەم» و چ ڕوتبە ومەقامێکی دەست کەوت!

لەم لاشەوە زمانی حاڵی «ئیبراهیمی ئەدهەم» ئەی ووت:

***من نە بە اختیار خود می‌روم از قفای او او بە کمندی عنبرین می‌کشدم کشان کشان***

ئەی مەلائیکەینە: خۆ وەنە بێ ئەوە لە ئازایەتی و پیاوەتی خۆمەوە بێ، بەڵکو خوای گەورە کەمەندی بەندەگی لەمل کردوم و بێ ئیختیار ڕامدەکیشێ.

ئنجا وڵاتی بەڵخ و بوخارای بەجێ هێشت و هات، تا گەییە شاری مەڕوە، ماوەیەک لەوێ مایەوە، لە پاشان چوو بۆ شاری نەیشاپور، لەوێشەوە چوو بۆ شام و هاتە عێراق و لە دواییدا چوو بۆ ماڵی بەیت بۆ خواپەرستی دەستی لە سەڵتەنەت و پاشایەتی و ژن و ماڵی هەڵگرت.

ڕوای دەڵێ، کە تەرکی دنیای کردو ووڵاتی خوێ بەجێ هێشت، کوڕێکی زۆر ساوای بوو، کاتێ کوڕە گەورە دەبێ و فام دەکاتەوە، لە دایکی دەپرسێ و دەڵێ دایە، ئەوە من کوڕی کێم و باوکم ناوی چیەو لە کۆییە؟

دایکی کوڕە دەست دەکا بە گریان و بە سەرهاتی باوکی بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەڵێن ئێستا، لە شاری مەککەیە. کوڕە کە دەڵێ: خوا یار و یاورەمان بێ، ئیمسال دەچم حەجیش ئەکەم و زیارەتی باوکیشم ئەکەم.

کاتێک مووسمی ڕۆیشتنی حەجاج دێ، ئەمر دەکا جارچی جاڕ ئەدا، کە هەر کەسێک پێی خۆشە حەج بکا، با خۆی ئامادەبکا لە سەر نەفەقەی کوڕی «ئیبراهیمی ئەدهەم». بەو بانگەوازە چوار هەزار کەس حارز دەبێ، کوڕە لە گەڵ

دایکی و خەڵکە کە بەرە و حیجاز دەکەونە ڕێ، کاتێک دەگەنە شاری مەککە و دەچن بۆ تەوافی قودوم و تەواف دەکەن، کوڕە تەماشا دەکا ئەوا کۆمەڵێک خەرقە پۆش سەفیان بەستووەو بەرەو ماڵی بەیت بە چۆکدا هاتوون:

کوڕە چوو سەلامی لێ کردن و وەڵامیان دایەوە و گوتی: کەس هەیە لە ناوتاندا ناوی «ئیبراهیمی ئەدهەم»بێ؟

ووتیان: بەڵێ «ئیبراهیمی ئەدهەم» شێخ و ئوستادی ئێمەیە، بەڵام ئیستا چۆتە دەرەوە و بە فلان ڕێگەدا دەگەرێتەوە. کوڕەکە چوە سەر ئەو ڕێگایە، کوڕە تەماشای کرد، ئەوا پیرێک کۆڵە دارێکی لە کۆڵەو ووردە بەرەو شار دێتەوە، دوورو نزیک دوای کەوت، تا کۆڵە دارە کەی فرۆشت و دای بە نان و هێنای لە پێش خەرقە پۆشەکانی دانا ودەستیان کرد بە خواردن. بەڵام هەر کوڕە تەماشای کابرای پیرەی دەکرد و پیرەش تەماشای کوڕەکەی دەکرد تا خەرقە پۆشەکان عەرزیان کرد، قوربان تۆ ئاموژگاری ئێمەت دەکرد، کە کوڕی گەنج نەزەری حەرامە، کەچی تۆ زۆر تەماشای ئەوکوڕە دەکەی فەرمووی: چیتان لێ بشارمەوە، من کاتێ ووڵاتی بەڵخم بە جێ هێشت کوڕێکی شیرە خۆرم هەبوو، ئیمرۆ وام زانی ئەو کوڕە گەنجە کوڕەکەی من بوو، بۆیە زۆرم تەماشا کرد.

ڕۆژێکی دیکە یەکێک لە خەرقە پۆشەکان چوە ناو قافڵەی حەجاجی بەڵخی یەوە، ڕووی کردە خێوەتێک، تەماشای کرد لە ناوەڕاستی خێوەتەکە داکورسی یەک دانراوە و ئەو کوڕەی، کە «ئیبراهیمی ئەدهەم» زۆری تەماشا کرد لە سەر کورسی یەک دانیشتووە قورئان دەخوێنێ و بەدەم قورئان خوێندنەکەشەوە دەگری. چوە پێشەوە دوای سەلام و وەڵام، لە کوڕەکەی پرسی خەڵکی چ ولاتێکی؟ کوڕە زۆر بە ئەدەبە وە گوتی: خەڵکی بەڵخم، گوتی: کوڕی کێی؟ دەستی کرد بە گریان و گوتی: من لە ژیانمدا تا دوێنێ باوکی خۆم نەدیوە، بەڵام بەو حاڵەش نەم وێرا خۆمی لێ ئاشکرا کەم، چونکە ئەو، کاتی خۆی، لە بەر ئێمە

ڕای کردووە.

ناوی «ئیبراهیمی ئەدهەم»بووە، خەرقە پۆش ووتی: دەهەستن با بتان بەم بۆ لای «ئیبراهیمی ئەدهەم».

کوڕەکە، لەگەڵ دایکی هەستان، لەگەڵ خەرقەپۆش چوون بۆ ماڵی بەیت، لەو کاتەدا «ئیبراهیمی ئەدهەم» لە بەرانبەر ڕوکنی یەمانیدا دانیشتبوو، کە چاوی بە کوڕ و خێزانەکەی کەوت حاڵی گۆڕا، کاتێک ژنەکەی چاوی بە «ئیبراهیمی» مێردی کەوت، چۆنی دی بوو، ئیستاش چۆنە، خۆی بۆ ڕانە گیرا و بە خۆی داداو بە گریانەوە، گوتی: ئەی کوڕی شیرینم ئەوە باوکتە، کە چەند ساڵە ئارەزووی دیداری دەکەی!

خەڵکەکە، کە ئەوکارەساتەیان زانی، غوربەتیان هەستا و دەستیان کرد بە گریان و دەت گوت: ڕۆژی حەشرە. ژنی «ئیبراهیمی ئەدهەم» دەگریا و لە بەر خۆیەوە ئەو شیعرەی دەخوێندەوەو دەیگوت:

***آنچه از من گم شده گر از سلیمان گم شدی بر سلیمان هم پری هم اهریمن بگریستی***

ئەوەی لە من وون بووە، ئەگەر لە حەزرەتی سولەیمانیش وون بوایە، تەواوی دێورو پەری بۆی دەگریان.

کوڕەکە بێ هۆش کەوت، لە پاش ماوەیەک بە هۆش هاتەوە، سەلامی لە باوکی کرد، باوکی وەڵامی دایەوە، لە باوەشی گرت و گوتی: ڕۆڵە، لە سەر کام دینی؟ گوتی: دینی ئیسلام، ووتی: قورئانت خوێندووە؟ ووتی: بەڵێ، باوکی گوتی، حەمد و سەنا بۆ خوا.

«ئیبراهیمی ئەدهەم» خەریک بوو هەستێ بڕوا کوڕەکە نەی دەهێشت. دایکی کوڕە دەگریا و هاواری دەکرد. «ئیبراهیمی ئەدهەم» بە گریانەوە ڕووی کردە ماڵی بەیت و فەرمووی: ئەی خوای گەورە فریام کەوە من بۆ تۆ تەرکی دنیام کردووە، ڕاوی دەڵێ: بە تەواوی لە پاڕانەوە کە نەبوویەوە کوڕەکە بەلادا هات و وەفاتی کرد.

عالەمەکە، کە ئەو حاڵەتەیان چاو پێ کەوت، ئەوەندەی‌تر گریان و ناڕەحەت بوون، ئنجا لە گەڵ خێزانەکەی گەردنی یەکتریان ئازاد کردو ژنەکەی گەڕایەوە بۆ وولاتی بەلْخ و بوخارا.

«ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم»، لە گەڵ ئەوەشدا، کە زاهێد و خواپەرستێکی زۆر بەڕاستی بووە، زۆر زانا و عالمیش بووە، شێخ جونەیدی بەغدادی ڕەزای خوای لێ بێ، لە بارەی «ئیبراهیمی ئەدهەم»وە فەرموویەتی: [مَفَاتِيحُ العُلُومِ اِبْـرَاهِـيمُ اَدْهَمٍ] کلیلی هەموو عیلم و زانیاریەکی تائیفەی تەریقەت، «ئیبراهیمی ئەدهەم»ە

ئیمامی حەنەفیش ڕەزای خوای لێ بێ هەر بە سەیید و گەورەی بانک دەکرد. ڕۆژێک عەرزیان کرد، قوربان ئەوە بۆ «ئیبراهیمی ئەدهەم»هەر بە سەیید و گەورە بانگ دەکەیت و ناوی دەبەی؟ ئەو سەیادەت و گەورەییەی لە چیەوە دەست کەوتووە؟ فەرمووی: «ئیبراهیمی ئەدهەم» هەر خەریکی خوا پەرستی‌یە. بەڵام ئێمە لەگەڵ خواپەرستی‌یەکەمان کاری تریش ئەکەین، کە واتە شایانی ئەوەیە بە گەورەی ناو بەرین..

ڕۆژێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، فەرمووی، ئەی خەڵکینە، ئێوە ئەگەر تەماشای ئاوێنەی ژیانی داهاتووتان بکەن، دەبینن کە ئاخر مەنزڵی دنیاتان قەبری تەنک و تاریکە، هاو دەمێکی تێدانیە، ساڵەها دەبێ بەتاک و تەنیا لەو مەنزڵەدا بەرنە سەر، ئێوە نازانن سەفەرێکی زۆر دوورو درێژتان لەبەرە، کە چی بەکەمی زەخیرەی بۆ ئامادە ئەکەن. دەتان بەن بۆ دادگاومەحکەمە، قازی ئەو دادگایە زۆر عادلە، ڕیشوەت و بەرتیل وەر ناگرێ، کەچی تاوان زیاتر دەکەن و هیچ ناترسن! فەرمووی: دەی تا فرسەت لەدەست دایە و بیر و هۆشتان هەیە و مەرگ نەبوەتە میوانتان، فریای خۆتان بکەون.

فەرمووی: خەڵکینە بە ڕاستی زۆر سەیرن! بۆ سەفەرێکی کورتی دنیایی خۆتان ئامادە ئەکەن، هیچتان لە بیر ناچێ، بە لام بۆ سەفەری دووری قیامەتی بەدەستی

خاڵی ئەڕۆن.

فەرمووی: دەفعەیەک بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتم تەماشام کرد لە سەر بەردێک نووسرابوو، ئەو بەردە، هەڵگێڕەوە و بی خوێنەوە، فەرمووی: منیش بەردەکەم ئاوەژوو کردەوە، کە تەماشام کرد لە پشتی بەردەکە نووسراوە، ئەی ئادەمیزاد، ئەی ئەو کەسەی خوا دەناسی و داوای بەهشت ئەکەی، چۆن تۆ بەوەی دەیزانی عەمەل نەکەی داوای شتێک دەکەی کە نایزانی.

فەرمووی: گرانترین و قورسترین و پڕ بەهاترین لە ترازوی کردەوەی ئینساندا ئەو کردەوانەن کە لە دنیادا، لە سەر شانی ئینسان زۆر گرانن، وەک نوێژ و ڕۆژوو زەکات و چاکە.

جارێک پیاوێک دێتە خزمەتی و عەرزی دەکا: قوربان زۆرم زوڵم لە خۆم کردووە، هاتوومە خزمەتت ئامۆژگاریەکم بکەی بیکەمە سەر مەشقی ژیانم، لەم ڕۆبە دواوە.

فەرمووی: ئەگەر بەقسەم بکەی شەش ئامۆژگاریت دەکەم. یەکەم، وەسیەت بێ ئەگەر گوناحت کرد و بێ ئەمری خوات کرد، ڕزقی مەخۆ. کابرا گوتی: جا چۆن ڕزقی خوا نەخۆم، کە هەر ئەو ڕازقە، فەرمووی: جا شورەیی نیە نان خۆری کەسێک بی و بێ ئەمری بکەی.

فەرمووی: ئامۆژگاری دووەم، ئەوەیە تکایە ئەگەر ویستت بێ ئەمری خوا بکەی، لە موڵکی خوادا مەیکە. کابرا ووتی: قوربان باکوورو باشوور ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاو موڵکی خوایە، ئەی بۆ کوێ بچم؟ فەرمووی: باشە تۆ کە بەندەیێکی زەعیفی پێت خۆشە لە موڵکی تۆدا یەکێک خەراپەی تۆ بکا، کابرا سەری بەردایەوە. فەرمووی: ئامۆژگاری سێیەم، وشیار بە ئەگەر ویستت گوناحێک بکەی لە جێگایەک بیکە خوا چاوی لێ نەبێ. کابرا ووتی: جا خۆ بە چاوی قودرەت چاوی لە هەموو شتێکە. فەرمووی: ئاخر زۆر ناشیرینە ڕزقی بخۆیت و

لە مڵکی خوادا بژیت و لە پێش چاوی ئەو گوناح بکەی. فەرمووی: ئامۆژگاری چوارەم، ئەوەیە، هەرکاتێ حەزرەتی قافیز هات گیانت بکێشی داوای مۆڵەتی لێ بکە. کابرا گوتی: ئاخر بە قسەم ناکاو. فەرمووی: دەی کەواتەتا ئیزرائیل نەهاتووە بۆ قەبزی ڕۆحت، تۆبە بکەو لە گوناح بگەڕێرەوە.

فەرمووی: ئامۆژگاری پێنجەم، ئەوەیە، ئەگەر مەلائیکە لە گۆڕهاتن بۆ پرسیار وەڵامیان مەدەرەوەو دەریان کە. کابرا گوتی: جا قوربان کوا دەتوانم دەریان کەم. فەرمووی: کە واتە هەر لە ئیستاوە وەڵامەکەیان بۆ ئامادە بکە. فەرمووی: ئامۆژگاری شەشەم ئەگەر لەمەیدانی مەحشەر هاتن و گوتیان، تۆگوناحت زۆرە، دەبێ بڕۆی بۆ جەهەنەم، بڵێ، ناچم. کابرا گوتی: قوربان هەزار شەقیشم تێ هەڵدەدەن و دەمبەن. فەرمووی: جا کە وا دەزانی گوناح مەکە. کابرا هەستا دەستی «ئیبراهیمی ئەدهەمی» ماچ کرد و لە سەر دەستی دا تۆبەی کرد و شەرتی کرد کە تا ماوە، لە ڕێبازی دین لانەدا.

ڕۆژێک عەرزیان کرد قوربان شەوو ڕۆژ لە بەر خوا دەپاڕێینەوە، کە چی دۆعامان گیرا نابێ، هوێ چیە؟!

فەرمووی: هۆی ئەوەیە، دەزانن خوا هەیە، بەڵام بە ڕاستی نای پەرەستن! دەزانن پێغەمبەر، پێغەمبەر بووە کە چی پەیڕەوی ناکەن قورئان دەخوێنن بەڵام عەمەلی پێ ناکەن! نازو نیعمەتی خوا دەخۆن، بەڵام شوکرانەی ناکەی. دەزانن بەهشت بۆ پیاوچاکانە، کەچی خۆی بۆ ئامادە ناکەن. ئەزانن دۆزخ بۆ پیاو خراپانە، خۆتان لە خراپە ناپارێزن! دەزانن شەیتان دوژمنی باوکە کوشتەتانە، عەداوەتی ناکەن! دەزانن کە هەمووتان دەمرن، خۆی بۆ ئامادە ناکەن! بە دەستی خۆتان دۆست و دوژمن دفن ئەکەن، کە چی عیبەرەت گرتوو نابن! عەیب و عاری خەڵک بەیان دەکەن، بەڵام پێ لە عەیبی خۆتان نانێن! فەرمووی: جا قەومێک ئاوا بن چۆن دۆعایان گیرا دەبێ!

جارێک عەرزیان کرد قوربان گۆشت زۆر گران بووە فەرمووی:

وَ إِذٰا غَــلاٰ شَيءٌ عَـلَيَّ تَـرَكْـتُهُ          فَيَكُونُ أَرْخَصَ مٰا يَكُوْنُ إِذٰا غَلاٰ

هەر کاتی زانیم شتگران بووە نای کڕم، کە واتە لە کاتی گرانـیدا لە هـەموو کاتێک هەرزانتر دەبێ، گۆشت گرانە مەی‌کڕن. ئیبراهیمی ئەدهەم لە ساڵی سەت‌و شەست‌و دووی کۆچی دا، لە شام وەفاتی فەرمووە. ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و ئامۆژگاریەکانی «ئیبراهیمی ئەدهەم». ئومێد دە کەم سودتان لێ وەرگرتبن.

لە بەرخوا دەپاڕێینەوە کە بۆ خـاتری گـەورەیی خـۆی و دیـانەتی «ئـیبراهـیمی ئەدهەم» عەفوومان بکا. خوایە بۆ کردەوەی چاک هیدایەتمان بدە. خوایە لە بەڵاو موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزە. ئامین.

وَ اَلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ و رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَكاٰتُهُ

# (٦)
# بیشری حــافی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُلِلّٰهِ اَلعَلِيمِ اَلكٰافِى حَمْداً يُوٰافِى. وَ صَلىٰ اَللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ اَلَّذِى هُوَ لِصُدُورِ اَلمُؤْمِنِينَ شٰافِى، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلىٰ اَلبِشْرِ اَلحٰافِىٌّ]

برای گوێ گری موسوڵمان، پێغەمبەری خۆشەویست و ڕابەری گەورەی کەشتی بەشەری یەت، لە دەریای تاریکی کوفر و گومڕاهی، بۆ قەراغی ڕووناکی و خواناسی، حەزەرتی «محمد المصطفى» (دروودی خوای لەسەر بێ)، لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: [اَلْمُؤْمِنُ مِرآةُ اَلْمُؤْمِنِ] موسوڵمان ئاوێنەی برای موسوڵمانیەتی.

جا ئەگەر بە ووردی سەرنجی ئەو حەدیسە کورتەی پێغەمبەر بدەین، بۆمان دەر ئەکەوێ، کە چەند بەقیمەتەو چەند پڕ مەعنایە، دەبینین وەک دەریایێکی بێ بنە، تۆ وەرە یەکێک لە موسوڵمانە ڕاستەقینەکان وەک ئاوێنە لە پێش چاوی دڵت ڕاگرەوە و بە دڵ تەماشای خوو و ڕەوشتی بکەو بیر لە تاعەت و عیبادەت و سەبر و تەحەممول و زوهد و تەقوا وچاکەو پیاوەتی و کەرامەتو شەرافەت و کردەوەو ژیانی ڕۆژانەی بکەوە، بە ووردی بیخوێننەوە، یان بۆت بخوێننەوە و بیکە بە سەر مەشقی ژیانت، ئەوکاتە لە مەعنای ئەو حەدیسە پیرۆزە دەگەی، کە فەرمووی موسوڵمان ئاوێنەی موسوڵمانە، تۆ دەتوانی وەک ئاوێنە لە بەر دڵتی ڕاگری، بڕوانیە کردەوەی چاکی ئەو پیاو چاکەو بزانی ئەو چۆن ژیاوە، ئەوسا تەماشا

شریتی ژیان و لاپەڕەکانی نامەی کردەوەی خۆت بکە، هەر خراپەیێکی کردووتە، بیسرەو بە کردەوەی چاک لاپەڕەکانی پڕ بکەوە.

جا با ئاوێنەی کۆڕ و مەجلیسی ئێستامان بکەینە، یەکێک لەو زاتانە کە سەردەمێک لە بەحری خواناسیدا مەلەوانێکی بێ وێنە بووە، زەمانێک لە کۆڕی خواناساندا مەی گێڕێکی مەعریفەت بووە. نموونەیێکی بەڕاستی ئاوێنەی خواپەرەستی بووە، عاشیقێکی سەر بەست و پێ پەتی بێ دەربەستی بارەگای کۆشکی خواپەرستی بووە

اِسْتَمَعْ مَاذَا يَقُولُ الْعَنَدلِيبُ حَيْثُ يَرْوَىٰ مِنْ أَحادِيثِ ٱلْعَجِيبُ

جانەی برای گوێ گر، گوی بگرە و بزانە بولبولی زمان ئەڵێ چی و باسی قسەو بەسەرهاتی چەند عەجایبت بۆ دەگێڕێتەوە ئاوێنەی ئیمرۆت بۆ دەکاتە سەر دەفتەری پیاو چاکانی سافی، «حەزرەتی بیشری حافی»، دەتۆش پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرە.

«بیشری حافی» کوڕی حارسی کوڕی «عَبْدُ الرَّحْمٰن»ی کوڕی عەتای کوڕی هامانی کوڕی «عَبْدُالله»یە. باوک و باپیری لە ئەسڵدا خەڵکی شاری مەڕوە بوون. لەوانەیە کورد بووبن، بەڵام خۆی لە بەغدا لە دایک بووەو لە وێ ژیاوە، لە ساڵی سەت و پەنجای کۆچیدا لە دایک بووە، بە قەولی زانایانی ئەهلی تەسەووف بووەتە یەکێک لە ئەوتادەکانی عیراق.

پیاوێکی زۆر زاهید و عابید و لە خواترس بووە، کە ڕووی کردۆتە خواپەرستی، بە ڕاستی خواپەرست بووە، هەرچەند لە کاتی گەنجیدا زۆر خود پەسند و لە دیانەت دوور بووە، بەڵام خواوەندی گەورە لە سورەی ئەنعامدا دەفەرموێ: ﴿اَللّٰهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ خوا خۆی لە هەموو کەس زاناترە بەوەی کێ بکاتە پیاوی چاک و کێ دەکا.

ئیمامی ئەحمەد ڕەزای خوای لێ بێ «بیشری حافی» زۆر خۆش ویستووەو

زۆری هات و چۆ بۆلای کردووە. ڕۆژێک قووتابیەکانی عەرزی ئیمامی ئەحمەد دەکەن و دەڵێن: قوربان خۆ جەنابت لە تەواوی عیلمەکاندا و لە شەرع و تەفسیر و حەدیس زانیدا، لە «بیشری حافی» عالمتر و زاناتری، ئەی بۆچی بەزۆری تۆ دەچی بۆ لای ئەو، ئەوەندەهات و چۆی دەکەی؟

فەرمووی: ڕاست دەکەن من لە زانیاریدا لەو زاناترم، بەڵام ئەو لە من باشتر خوادەناسێ دەچمە خزمەتی تا خواناسی لێ فێربم وباشتر خوا بناسم.

ئا ئەو «بیشری حافی»یە، لە تافی لاویدا، لە دیانەت دوور بوو، بە زۆری مەست بوو، ئاگەی لە دنیا نەبوو، بە لام ﴿لاٰ تَدْرِی لَعَلَّ اللهَ یُحْدِثُ بَعْدَ ذٰلِکَ أَمْراً﴾ خواوەندی گەورە لە سورەی تەلاقدا دەفەرمووێ: تۆ نازانی خوا چ بەسەر ئینسان دێنی، ئەو دوکان و بازاڕەی کە تا دوێنێ دات نابوو، ئیمرۆ دە پێچرێتەوە و بازاڕێکی دێ دادەنرێ، زۆر کەس ئەووەڵ شەڕی ئاخر باشەو، زۆریش ئاخر شەڕ، خوای گەورە لە وانەمان حیساب کا، کە ئاخر خێرن.

ئینسان نازانێ ئاخری چۆن دەگۆڕێ و چی بەسەر دێ، هیدایەت بە دەست خوایە، ئەگەر ئارەزوو بکات، هۆیەکی بۆ دەرەخسێنێ و ئەگەر لە ڕێگەش لابدا، دەی هێنێتەوە سەر ڕێگا.

ڕاوی دەڵێ: «بیشتری حافی» زۆر خۆی بە زل دەزانی و عەزەمەتی دەنواند، ڕۆژێک پیاسەی دەکرد، تەماشای کرد کاغەزێک کەوتوە، هەڵێ گرتەوە، کە خوێندیەوە نووسرا بوو ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِیمِ﴾ بە خوێند نەوەی موچرکێکی پێداهات و دڵی گۆڕا، شوشە عەترێکی پێ بوو، هەمووی بە کاغەزە کەداکرد و زۆر بە حورمەت لە شۆینێکی پاکی دانا، یەکێ لە پیاو چاکانی بەغدا ئەوشەوە خەوی دی، لە خەوەکەیدا پێیان گوت، بەیانی بچۆ بە«بیشر» بڵێ: [طَیَّبْتَ اِسْمَنٰا فَطَیَّبْنٰاکَ] خوای گەورە دەفەرمووێ: تۆ ئێمەت بۆن خۆش کرد، ئێمەش ئەوا تۆمان بۆن خۆش کرد، [طَهَّرْتَ اِسْمَنٰا فَطَهَّرْنٰاکَ فَبِعَزَتِی لَاُطَیِّبَنَّ اِسْمَکَ فِی الدُّنْیٰاوَ

الآخِرَة ] تۆ ناوی ئێمەت پاک کردەوە، ئەوا ئێمەش تۆمان پاک کردەوە، بەعیززەت و جەلالی خۆم قەسەم، ناوی تۆ لە دنیا و قیامەت لە ژەنگی گوناح پاک دەکەمەوە.
پیاو چاکەکە، ئەو خەوەی دی، لە خەو ڕاپەڕی گوتی: تەماشا چ خەونێکم دی! «بیشر» پیاوێکی زۆر خراپە چۆن بەو پایە دەگا؟

نووستەوە، دووبارە عەینی خەوی دیەوە، ئەو شەوە سێ جار ئەو خەوەی دی، بەیانی فەرمووی: «بیشر»م بۆ بانک بکەن، چوون بۆ ماڵی «بیشر»، هاتنەوە گوتیان قوربان چیت بۆ بانگ بکەین؟ ئیستا ئارەق بەری نەداوە، هەستا تەشریفی خۆی چو بۆ ماڵی «بیشر»، لە دەرگای دا و فەرمووی: بە «بیشر» بڵێن، پیاوێک هاتووە پەیامێکی پێیە، «بیشر» بە پێی پەتی هاتە دەرەوە، پیاو چاکە کە خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، «بیشر» زۆر گریا و تۆبەی کرد، شەرتی کرد، کە تا ماوە پێڵاو لە پێ نەکا. ڕووی کردە تاعەت و خواپەرستی، دەستی لە ژیان و ڕابواردنی دنیا هەڵگرت، تا وەفاتی کرد لە خوا غافڵ نەبوو.
گەڕانەوەو تۆبەی کردن ئاوا دەبێ، ئەو پیاوە بەدەعیەو دەمارە، کە نازی بەسەر ئەرزدا دەکرد، تا وەفاتی فەرموو هەر بەپێی پەتی گەڕاو پێڵاوی لە پێی نەکردەوە.

ڕۆژێک عەرزیان کرد قوربان ئەوە بۆ قەت پێڵاو لە پێ ناکەی فەرمووی: ئەو ڕۆژەی تۆبەم کردو ڕووم کردە بارەگای خوا و هاتمە سەر سفرەی کەرەمی، پێم پەتی بوو، جا ئیستا بەبێ ئەدەبی دەزانم، پێڵاو لە پێکەم، جا لە وەوە ناویان نا «بیشر حافی» ـ واتە «بیشر»ی پێ خواس و پێ پەتی.

«بیشری حافی» لە گەڵ ئەو زوهد و تاعاتەشیدا ئامۆژگاری خەڵکی زۆر دەکرد دەیفەرموو: تا دەتوانن کار و کاسبی بکەن، ڕەنجی شانی خۆتان بخۆن، منەتی کەس هەڵمەگرن، دەستی فەقیر و هەژار بگرنەوە، چاوتان لە جیران و دراوسێ بێ.
زۆر جار دەیفەرموو: دوو پارو، کەمتر بخۆن و منەتی خەڵک هەڵمەگرن، تا

دەتوانن لە خۆشی و ناخوشیدا ئاگاتان لە برای موسوڵمانتان بێ.

«بیشری حافی» زۆری بەزەیی بە خەڵکدا هاتوەتەوە، یەکێک لە پیاوچاکان دەفەرمووێ: ڕۆژێک زۆر سەرما بوو، تووشی «بیشری حافی» بووم. چیوای لیباس لە بەردا نەبوو، لەسەرمان هەڵدەلەرزی، عەرزم کرد قوربان، ئەوە بۆ بەو سەرمایە لێرە وەستاوی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر دەبینم دەست کورت و نەدار و فەقیر و هەژار لەم کاتەدا زۆرن، منیش ئەوەندەم ماڵی دنیا نیە بەشیان بدەم، جا ویستم هیچ نەبێ لەو سەرمایەدا هاو بەشیان بکەم، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە حەدیسدا فەرموویەتی: موسوڵمان دەبێ لە خۆشی و ناخۆشیدا شەریکی برای موسوڵمانی بێ.

هەروەها جارێکی‌تر ڕوو دەکاتە مورید و مەنسوبەکانی و دەفەرمووێ: ئەی ئەو کەسانەی گوێتان لە دەنگی منە، داواتان لێ دەکەم کار و کاسبی زۆر بکەن و بێ‌کار دامەنیشن، چونکە بێ کاری و تەنبەڵی زەرەر بە خۆتان و خاک‌و وەتەن و برای هاو وەڵاتیتان دەگەیێنێ. فەرمووی: هیچ نەبێ ئێوە تەماشای ئاو بکەن و پەندی لێ وەرگرن، ئاو بەو پاک و خاوێنی و جوانیە، ئەگەر ماوەیەک ڕاوەستێ و لە جێگای خۆی وەمێنێ و جاری نەبێ، زوو بۆگەن دەکا و دەگۆڕێ، کەس ناتوانێ بەکاری بێنێ و سوودی لێ وەرگرێ.



«بیشری حافی» لە ئاخریدا، لە خواناسیدا، گەیشتبوە پایە و مەقامێک، کە چاوی بەزۆری هەر خوای ئەدی و گوێی بە حەقیقەت هەر زکری خوای دەبیست و دڵی هەر جێگای نووری خوا بوو. ئەو حەدیسەی پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) لەودا هاتبوەدی کە دەفەرمووێ: [المؤمِنُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللهِ] واتە ئینسانی موسوڵمانی تەواو‌و کامیل بە نووری کەرەم و ڕەحمەتی خوا شت دەبینێ. گەیشتبوە ئەو حاڵەتە زۆر جار ئەو شیعرە فارسی‌یەی دەخوێندەوە و دەیفەرموو:

***هر چه جر ذکر خـدای احسـن است　　گر شکر خوردن بود جان کندن است***

یاد و زیکری و تاعەتی خوا نەبێ، قەند خواردنیشم پێ وەک گیان کێشان وایە.
ڕۆژێک عەرزیان کرد قوربان سوڵتان و خەلیفەی وەخت زۆر زاڵمە و زوڵم لە خەڵک زۆر دەکاو تەشریفت بچێ ئاموژگاری بکا، بەڵکو بەقسەی جەنابت لە خوابترسێ و دەست لەو زوڵمە هەڵگرێ.
لەوەڵامدا فەرمووی: من خواوەندی گەورە زۆر لەوە بەگەورەتر دەزانم، کە بچم ناوی لای کەسێک بەرم، کە زاڵم بێ و زوڵم لە خەڵک بکا و لە خوا نەترسێ.
فەرمووی: شەوێک لە خەومدا بە خزمەت پیغەمبەر گەیشتم، عەرزم کرد ئەی ڕەسولی خوا ڕۆحم فیدات بێ، ئامۆژگاریەکم بکە، فەرمووی، دوو قسەت پێ دەڵێم بەخەڵکیان بڵێ و خۆشت عەمەلیان پێ بکە. یەکەم، ئەگەر خوای گەورە سەروەت و سامان و دەسەڵاتی دانێ، چاوتان لە فەقیر و هەژار ودەست کورتی ئۆممەتم بێ، زوڵمیان لێ مەکەن، سەوابی زۆرتان دەست دەکەوێ. دووەم، ئەگەر خۆتان نەدار و دەست کورت و هەژار بوون، قەناعەت بکەن و بە بەشی خۆتان ڕازی بن و چاوتان لە کەرەم و لوتفی خواوەندی گەورە بێ، چونکە ئەوەی تۆی دەست کورت کردووە، ئاگای لە هەموو شتێک هەیە، نە دوڵەمەندی دەبێتە هۆی ئەوەکە خوا خۆشی بوێن، نە فەقیری مەعنای ناخۆش ویستنە، ئەو شیعرە فارسی یەی شێخی سەعەی (ڕەزای خۆای لێ بێ) بەیانی ئەو فەرمایشتەی حەزرەت دەکا، کە فەرموویەتی:

***چون شادمانی و غم دنیا مقیم نیست فرعون کامران و أیوب مبتلا***

واتە چونکە خۆشی و ناخۆشی دنیا، تا سەرنیە، دەبینی فیرعەون دوای خوایەتی دەکرد ئەوەندە زاڵم بوو، کە چی لە ماوەی چوار سەت ساڵ عومردا نە خۆشیش نەکەوت و سەری نەئێشا، تا لە دەریای نیلدا خنکا، بەڵام حەزرەتی ئەیوب، کە پێغەمبەری خوا بوو، ماوەی چەند ساڵ نەخۆش کەوت، خۆ ئەگەر بە خۆشەویستی بووایە، دەبوو خۆشەویستانی خوا، بە تایبەتی پێغەمبەران قەت

تووشی بەڵا و مووسیبەت نەبوونایە.

«بیشری حافی» کەشف و کەڕاماتی بووە، بە چاوی باتینی شتی دیوە، لە مەوعیزەیێکدا فەرمووی: ڕۆژێک بە لای گۆڕستانێکدا ڕۆیشتم، تەماشام کرد ڕوحانیەتی مردووەکان کۆ بوونەوە، وەک شتێک لە بەینی خۆیاندا، دابەش بکەن، وابوو، لە دڵی خۆمدا گوتم: خۆزگە دەمزانی بۆ واکۆ بوونەوە؟

فەرمووی: وەک لە غەیبەوە بانگم کەن، گوێم لە دەنگیک بوو، گوتی: ئەی «بیشری حافی» لەم ڕۆژانە دا موسوڵمانێک سێ فاتیحای هەدیەی ڕوحی ئەو مردووانە کردووە، ئەوە سەوابەکەی بەش دەکەن، بۆیە واکۆ بوونەوە.

«بیشری حافی»، کە دەهاتە سەرباسی پیاو چاکان، دیفەرموو:

| | |
|---|---|
| ***مـتقی را بـود چـهار نشـان*** | ***حفظ أحكـام شـرع أول دان*** |
| ***ثانياً هر چه دسترسش بـاشد*** | ***بر فـقيران و بـیکسان پـاشد*** |
| ***عـهد را بـا وفـا کـند پـیوند*** | ***هر بلا آیـدش بـود خـرسند*** |

پیاوی خوا دەبێ چوا شەرتی تێدا بێ یەکەم، نابێ لە شەرع لابدا. دووەم، دەبێ لە قەدەر توانا چاکە لە گەڵ خەڵک بکا. سێیەم، دەبێ عەهد و پەیمان نەشکێنێ و وەفا بە وەعدە بکا. چوارەم، دەبێ بەقەزا و قەدەر ڕازی بێ.

ڕاوی دەڵێ لەو ڕۆژەدا، کە تەوبەی کرد، تا ڕۆژی وەفاتی لەبەر شەرافەت وکەڕامەتی «بیشر حافی»، وەڵاغە بەرزە لە جادە و کۆڵان و شەقامەکانی شاری بەغدادا تەرسیان نەدەکرد، مەبادا «بیشری حافی» بەسەری دابڕواو قاچی پیس بێ. شەوێک هێسری کابرایەک لە شەقامێکی بەغداد تەرسی کرد کابرا بە هەر دوو دەستان بە سەری خۆیدادا و گوتی: هاوار بەماڵم «بیشری حافی» وەفاتی کرد.

گوتیان بە چیا دەزانی؟ ووتی: تا ئیستا هێسری من لە سەر شاریعەکانی بەغدادا تەرسی نەکردووە، بەوەدا دەزانم «بیشری حافی» وەفاتی فەرمووە، زۆری پێ نەچوو خەبەریان هێنا کەوەفاتی کردووە، شەوی چوار شەممەی دەی مانگی

موحەڕەمی دوسەت و بیست وحەوتی کۆچی بوو. شێخی مەناوی دەفەرموێ: «بیشری حافی»، لە زەمانی خوێدا گەورەی ئەولیا و خواناسانی ڕاستە قینە بوو.

ئیمامی یافیعی دەفەرمووێ: ڕوتبە و مەقامی ویلایەت بـە خـۆڕایـی دەست یئنسان ناکەوێ، «بیشری حافی»، لە ڕۆژی گەڕانەوە و تۆبەی دا تا وەفاتی کرد، دەستی بۆ لووقمەی حەرام درێژ نەکرد.

«بیشری حافی» دەیفەرموو: تا دەتوانن بـاسی بـە سـەرهات و فـەرمایشتی زانایان و پیاو چاکان بخوێنن، چونکە زۆر زانا و پیاوچاکی وا بـوون وەفـاتیان کردووە؟ بە لاّم یاد کردنەوەیان دڵ زیندوو دەکاتەوە، بە پێچەوانە زۆری واهەن زیندوون، بە چاو پێ کەوتنیان دڵی ئینسان ڕەش دەبێ و قەسوەتیان دڵ ناخۆش دەکا. دەی فەرموو: ئاگاداربن کات بە فێڕۆ مەدەن، ماوەی ژیان زۆر کەمە، ڕۆژی دوێنێتان مردو ڕۆیشت، ئیمرۆژتان لە سەرە مەرگ دایە، بـە یـانیشتان لە دایک نەبووە.

ئەوەبوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و ئامۆژگاریە جوانەکانی «بیشری حافی». ئومید دەکەم سودتان لێ وەرگرتبن. لە بەر خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی «پێغەمبەر» و عەبدایەتی بیشری حافی عەفوومان بکا. خوایە لە شەڕی شەیتان و بە لاّی ناگەهان و زوڵمی زاڵمان بمان پارێزی. خوایە لە ڕۆژی قیامەتا، لە ژێر ئالاّی پێغەمبەردا، لە گەڵ پیاو چـاکـان حەشرمان بکەی. ئامین.

وَ اَلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ و رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَكاٰتُهُ

# (٧)
# زوننونی میسری

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُلِلّٰهِ اَلَّذي هُوَ مَظْهَرُ اَلْحَقِّ وَ مُبْدِيه. و صَلیٰ اَللّٰهُ عَلیٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ ذَوِي الرُّوحِ اَلَّذكِّيَ. وَ عَلیٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أوْلِيٰائِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ، خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلیٰ ذُوالنّونِ المِصْريِّ]

با لەم کاتەماندا، ماوەیک بچینە مەجلیسی پێشەوای ئەهلی مەلامەت، شەمعی جەمعی قیامەت، بورهانی مەوهیبەت وتەجرید، سوڵتانی مەعریفت و تەوحید، زانای ناو زانایان، پیری دیوانەی خوا پەرستی، شابازی کەلاوەی مەیخانەی مەستی، شەیدای ئاسمانی یەکتا پەرستی، سەرچاوی نیلی دەریای سەربەستی، بەڵگەی حەدیسی [اَلْفَقْرُ فَخْرِي] چرای ئەم کۆڕە، «زوننونی میسری». جا تکایە بە دڵ گوێ بگرن و پەند و ئامۆژگاری لێ وەر گرن.

«شێخ زوننونی میسری» زۆر دانا و زانا بووە، زۆر لە خواترس و بە دین بووە، ئەوەندە بەئەدەب بووە، قەت بە چوارمەشقی دانەنیشتووە، جارێک عەرزی دەکەن، دەڵێن: قوربان ئەوە بۆ ئەوەندە خۆت ئەزیەت دەدەی، هەمیشە لە سەر چۆک دادەنیشی؟ لە وەڵامدا دەڵێ: تەماشا دەکەم دەست و پێوندی، پاشای دنیایی بە چوارمەشقی دانانیشن، جا چۆن من شەرم نەکەم لای خوای خۆم، کە پاشای پاشایانە، بە چوار مەشقی دانیشم!

«شێخ زوننونی میسری» قووتابی و شاگرد و فەقێی ئیمامی مالک بووە و بەزۆری

دەرسی لای ئەو خوێندووە.

ڕاوی دەڵێ: هۆی تۆبە کردنی «شێخ زونونی میسری» و دەست هەڵگرتنی لە دنیا و ڕوو کردنە خواپەرستی، بە یەک جاری، لە ئەووەڵەوە، ئەوە بووە.

ڕۆژێک لە پاش دەرس خوێندن، فەقێکانی عەرزی دەکەن، قوربان دەڵێن، لە فلان جێگا عابیدێک هەیە زۆر بەناو بانگە، لە خواپەرستیدا، ئەویش دەفەرمووێ: ڕۆژێک دەچم بزانم چۆن خوا دەپەرستێ!

ڕۆژێک دەچێ، کە تەماشا دەکا ئەوا پیاوێک خۆی بەدارێکەوە هەڵواسیوە، دەڵێ: ئەی بەدەن و گۆشت و ئیسقانی من، ئەگەر بەقسەم نەکەن و خواپەرستی‌تان زۆر پێ خۆش نەبێ، ئاوا عەزابتان ئەدەم، تا دەمرن، لە برسان.

«شێخ زونون»، کە ئەو حاڵەتەی چاو پێ دەکەوێ، خۆی بۆ ڕاناگیرێ و دەست دەکا بە گریان، عابیدەکە، کە گوێی لە دەنگی گریان دەبێ، بانگی دەکا و دەڵێ: ئەوە کێیە؟ بەزەیی بە کەسێکدا دێتەوە، کە زۆر بێ شەرمە و، جورم و خەتای زۆرە.

«شێخ زونون»، کە ئەو قسەیە دەبیستێ، ئەوەندی تریش دەگری و دەچێتە پێشەوە، سەلام دەکا و، دەڵێ: ئەوە چ حاڵەتێکە؟

عابیدەکە دەڵێ ئاخر ئەندامەکانم بە دڵی من خوا ناپەرستن. «زونون» دەڵێ: گوتم: دەبێ ئەو عابیدە چ گوناحێکی گەورەی کردبێ ئاوا، لە خۆی دەکا؟ ئنجا ووتم: ئەی عابید بە ڕاستی دیارە، کە خوا پەرستی. گوتی: ئەگەر پێت خۆشە چاوت بە لە من باشتر بکەوێ، بچۆ سەر ئەو کێوە. فەرمووی: چوومە سەرکێوە کە، تەماشام کرد: پیاوێک قاچێکی لە ژووری ئەشکەوتێک دایە و ئەوی‌تری لە دەرەوەیە و قاچەکەی بڕاوەتەوە، زۆرم لا عەجایب بوو، چووم دوای سەلام کردن، گوتم: ئەوە چ حاڵەتێکە بە سەر خۆتا هێناوە؟ لە وەڵامدا ووتی: ڕۆژێک هاتمە دەرەو، تەماشام کرد ئافرەتی ئاوایی هاتبوون بۆ ئەم کێوە، ئافرەتێکی زۆر جوانیان لێرە نزیک بوەوە، بە ڕاستی بە چاو پێ کەوتنی فکرم گۆڕاو دڵم

چوەسەری، لەو کاتەدا، وەک لە غەیبەوە بانگم لێ کەن، گوێم لێ بوو، گـوتیان: ئەوە شەرم ناکەی؟ لە پاش سیی ساڵ خواپـەرستی خـەریکی تـازە بـە قسـەی شەیتان هەڵخەڵەتییێ، فەرمووی: منیش لە ترسی ئەو عیتابە، ئەو پێیەی، کە بـۆ تەماشا کردنەکەم بردە دەرێ، بڕیمەوە و بەو حـاڵە مـاومەوە بـزانـم خـوا چـی دەفەرمووێ؟

دەڵێ: ئەنجا کە ئەوەم دی، وەک بچمە دنیاییێکی دی و هەر لەوێ تۆبەم کرد و گەڕامەوە تەرکی دنیام کرد.

جا بە ڕاستی ئینسان کەتەماشای کتێبی «حِلْيَةُ الأَوْلِيا» دەکا و چاوی بە دۆعا و پارانەوەی «شێخ زونونی میسری» دەکەوێ، کە چۆن لە بەر خوا پاڕاوەتەوە و چ دۆعایەکی کردووە، سەری سڕ دەمێنێ.

لە فەرمایشتێک دا، دۆعا دەکا و دەڵێ:

[اَللّٰهُمَّ اجْعَلْنا مِنَ الَّذِينَ فَتَحُوا بابَ الصَّبْرِ وَ رَدَموا خَنادِقَ الْجَزَعِ، وَ جازُوا شَدِيدَ الْعِقابِ، وَ عَبَرُوا جِسْرَ الْهَوىٰ] [فَإِنَّهُ تَعالىٰ يَقُولُ:] ﴿وَ أَمّا مَنْ خافَ مَقامَ رَبِّهِ وَ نَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوىٰ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوىٰ﴾ ئەی خوای گەورە، بمان گـێڕە بـە یەکێک لەو کەسانەی، کە دەرگای خۆ ڕاگری و سەبریان کردوەتەوە، خەندەقی نارەزا بوونیان ڕوخاندووە، دوور کـەوتوونەوە لە عـەزابـی سـەخت و عـیقابی شەدیدی تۆ، بەسەر پردی هەوای نەفسدا پەڕیونەوە، فەرمووی: چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: کەسێک، لە ڕۆژی مووحاسەبە بترسێ و بە قسەی شەیتان و هەوای نەفس هەڵنەخەڵەتێ، ئەوە بە ڕاستی بەهەشت جێگایەتی.

[اِلٰهِي اِنِّي لاٰ أُطِيقُ اِحْصاءَ نِعَمِکَ، فَکَيْفَ أُطِيقُ شُکْرَکَ عَلَيْها وَ قَدْ قُلْتَ وَ قَوْلُکَ الْحَقُّ]

﴿وَ اِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللهِ لاٰ تُحْصُوها﴾ ئەی خوای گەورەی من و هەموو عالەم، من توانام نیە تەواوی نیعمەتی تۆ حیساب کەم، جا کەواتە چۆن دەتوانم شوکرانەی

نیعمەتی تۆ بکەم؟ لە کاتێکدا خۆشت لە قورئاندا، فەرمووتە: ئەگەر بتان ئەوێ هەموو نیعمەتەکانی خوا حیسابکەن ناتوانن، چونکە ئەوەندە زۆرن لە حیساب نایەن.

بۆ نموونە شێخی سەعدیش ڕەزای خوای لێ بێ لەو بارەوە فەرموویەتی:

***عطا نیست هر موی از او بر تنم          چگونه به هر موی شکری کنم؟***

واتە هەر تاڵە مووییێک، کە بە، لەشمەوەیە نیعمەتێکە، لە نیعمەتەکانی خوا، جا چۆن دەتوانم لە بەرانبەر هەر تاڵە موویێکدا شوکرێکی بکەم، تا دەگا بەو هەموو ناز و نیعمەتە.

«شێخ زوننونی میسری» زۆر جار دەیفەرموو: وریا بن بە هۆی عیبادەت، یا زانیاری، یا ماڵی دنیاوە، لە خۆتان بایی نەبن و خۆتان لێ نەگۆڕێ، بە تایبەتی وا مەزانن کە، کەس لە ئێوە باشتر نیە.

فەرمووی: ڕۆژێک شتێکی زۆر سەیر لە منی ڕودا، با بۆتان وەگێڕم: جارێک بە قەراغ دەریای نیلدا دەڕۆیشتم، تەماشام کرد، باڵە خانێکی زۆر گەورە وەدیار کەوت، منیش چوومە سەر بەحر، دەست نوێژ تازەکەمەوە، لە باڵەخانەکە نزیک کەوتمەوە، کەڕوانیم ئافرتێکی زۆر جوان لە هەیوانی باڵەخانەکەبوو، ویستم تاقی بکەمەوە، ووتم: تو ژنی کێی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەی «زوننونی میسری»، کە لە دوورەوە دیار کەوتی، ووتم: شێتی، کە نزیک بوویتەوە وەمزانی عالم و زانای، کە نزیکتر کەوتیەوە، گوتم: عارفی، بەڵام کاتێ زۆر باش تێت فکریم بوّم، دەر کەوت، نەشێتی، نە زانای، نە عارفی. ووتم: باشە چۆن دەزانی کە ئەمانە نیم؟ ووتی: ئاخر ئەگەر شێت بووی تایە، ئاوا بەرێک و پێکی دەست نوێژت نەئەگرت، ئەگەر زانا و عالمی تەواویش بووی. تایە، تەماشای ئافرەتی نامەحرەمت نەدەکرت، ئەگەر عاریفش بوویتایە چاوت غەیری خوای نە ئەدی، ئەوەی گوت و چوە ژوورەوە، دەفەرمووێ: لە داخان وەخت بوو شێت بم و

ئاگرم تێ بەر بوو.

ڕاوی دەڵێ: هەر لەو داخانە «زونونونی میسری» چوو سواری کەشتی بوو، ویستی وولاتی میسر بەجێ بێڵێ، سواری کەشتی دەبێ و کەشتی بەحەرەکە دەکەوێ و دەڕوا، لە کەشتی‌یەکەدا، بازرگانێک گەوهەرێکی لێ وون دەبێ، شکیان دەچێتە سەر «زونونونی میسری» هۆیەکەشی بە زۆری ئەوە بوو، تا ئەو کاتە زۆربەی خەڵک بە دێوانە و شێتیان دەزانی، دەفەرمووێ: منیش زۆر نارەحەت بووم، ڕووم کردە ئاسمان و دەستم کرد بە گریان، ووتم: ئەی خوای گەورە، خۆت دەزانی چ بوختانێکم بۆ دەکەن، لەو کاتەدا بە ئەمری خوا ماسی یەک سەر لە بەحرەکە دێنێتە دەرێ و گەوهەرێک هەڵدەداتە ناو کەشتی‌یەکەوە،کە ئەوەیان چاو پێ دەکەوێ، خۆ داوێنە سەر دەست و پێیانی و داوای لێ بوردنی لێ ئەکەن، جا لە وەڕا، ناوی دەنێن «زونونونی میسری» ئەگینا لە ئەسڵدا ناوی «سەوبانی کوڕی ئیبراهیمە».

هەر وەکو ئێستا بە هۆی کۆلکە شێخانەوە زۆربەی خەڵک باوەڕیان بە ئەولیا و مەشایخ نەماوە، ئەو کاتەش زۆری وابوون، باوەڕیان بە پیاو چاک نەبووە، بە تایبەتی کوڕێک زۆر باسی پیاو چاکانی دەکرد و دەیگوت: پیاو چاک قەت هەر نەبوون.

ڕۆژێک «زونونونی میسری» بانگی ئەو کوڕە دەکا ودەفەرمووێ: بچۆ لەو نانەوەخانە، بایی دینارێکم نان بۆ بکڕە و ئەو ئەنگوستیلەی لا دابنێ، تا لە پاشان دنیارەکەی بۆ دەنێرین، کوڕە کە چوو گوتی: کاکی نانەوا، بایی دینارێکم نان بدەیێ، بەڵام پارەم پێ‌نیە، با ئەو ئەنگوستیلەت بە ئەمانەت لابێ، تا پارەکەت بۆ دێنین نانەواکە تەماشای ئەنگوستیلەکەی کرد و گوتی: ئەوە هەر درهەمێک دێنی، چۆن بارمتەی دینارێک بێ، نانەکەی نەدا بە کوڕە کەو هاتەوە بۆلای شێخ و قسەی نانەوای بۆ گێرایەوە، شێخ فەرمووی: باشە بچۆ بۆلای فلان سەرافەو بڵێ

ئەو ئەنگوستیلە بایی چەندە چەند دێنی؟ کە چوو سەڕڕاف وەزنی کرد گوتی: بایی هەزار دینارە، ئەگەر ئەی دەی با لێت بکڕم، کوڕەکە هاتەوە بۆ لای شێخ و قسەی کابرای سەڕڕافی بۆ گێڕایەوە شێخ فەرمووی: کوڕم جا بزانە کە زانیاری تۆش و ئەوانەی وەک تۆش ئینکاری پیاو چاک دەکەن، وەک زانیاری نانەوا کە وایە بە ئەنگوستیلە کە، هەر وەکو ووتویانە:

*قدر زر زرگر شناسد قــدر گــوهر گــوهری*

«شێخ زوننون» زۆری ئامۆژگاری خەڵک دەکرد، ڕۆژێک فەرمووی: مەردی خوا بن لە خوا غافڵ مەبن، فەرمووی: با بۆتان بگێڕمەوە: جارێک لە سەفەر ڕێگام کەوتە و لاتێک، دانیشتووەکانی هەموو گاور بوون، بەیانی، کە لەو خەو هەستام، بە فرێکی زۆر باری بوو، بە ناچاری کەوتمە ڕێ، لە ڕێگەدا تەماشام کرد، پیاوێک عومری لە دەورووبەری چل ساڵی دا بوو، لە سەر بەفر هەرزنی دەچاند، زۆرم لا سەیر بوو، چووم بە لایەوە ووتم: ئەرێ کابرا، تۆ بەو بەفرە چۆن تۆو دەچێنی؟

لەوەلامدا ووتی: ئاخر ئیمرۆ بە فرێکی زۆر باریوە، تەیر و باڵندە هیچیان دەس ناکەوێ بیخۆن، جا ووتم: دانیان ئەدەمێ بەڵکو بە هۆی ئەوەوە خوا ڕەحمم پێ بکا. دەفەرمووێ: منیش گوتم: جا تۆ کە لە خوا بێگانەی چۆن خوا لێت قبووڵ دەکا؟ کابرا گوتی: خۆ ئەگەر لێشم قبووڵ نەکا چاوی لێمە چی دەکەم؟ ووتم: بەڵێ، کابرا گوتی: جامنیش ئەوەندم بەسە.

فەرمووی ڕۆیشتم ئەو ساڵە چووم بۆ حەج، کاتێ تەوافی ماڵی بەیتم دەکرد، چاوم بە کابرا کەوت تەوافی دەکرد، یەکترمان ناسیەوەو گوتی: تۆ دەزانی خوا، تۆو چاندنەکەی لێ وەرگرتم و هیدایەتی دام موسوڵمان بوومو ئەوە حەج دەکەم.

دەفەرمووێ: گوتم: حەمد و سەنای بۆ خوا، بەڵام لە دڵی خۆمدا ووتم: ئەی خوای گەورە، گاورێک بە هۆی چەند مست هەرزنەوە و دەبخشی؟ فەرمووی: گوێم لە دەنگیک بوو فەرمووی: بێ دەنگ بە، خوا، فەعالی لیما یوریدە، کاری

خوا و لێک دانەوەی تۆو وەک ئەرز و ئاسمان لێک دوورن.
جا ئەوەیە کە پێشینیان گوتویانە، تۆ چاکە بکە و بە ئاویدا بدە.
شێخ «زونونی میسری» کاتێک دەچوە سەر بەر ماڵ و ڕووی دەکردە قبیلە، دەگریا و دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە، نازانم لە سەر کام پێیە لە بارەگای تۆدا ڕاوەستم؟ یان بە کام چاو تەماشای قبیلەی تۆ بکەم؟ یان بە چ زمانێک ڕاز و نیازی خۆم دەربڕم؟ ئنجا نوێژێ دا دەبەست.

ئاخری کەوتە حاڵەتێکەوە، زۆر جار ئاگای لە خۆی نەدەما، وای لێ هات زۆربەی خەڵک بەشێت و بێ دینیان دەزانی، شتی وای دەکرد زۆر دوور بوو لە عەقڵی خەڵکی سادە.

ئاخری لای خەلیفەی بەغدا، کە لەو کاتەدا جەعفەری «اَلْمُتَوَکِّلُ» بوو، شکایەتیان لێ کرد و بردیان بۆ بارەگای خەلیفە، لەو کاتەشدا خەلیفە بە سواری دەهات بۆ بارەگا، پیاوەکانی خەلیفە گوتیان: ئەوە خەلیفەیە، کە نزیک بووەوە سەلامی لێ بکە، «شێخ زونون» گوتی: دەبێ خەلیفە سەلام لە من بکا، چونکە شەرعەن دەبێ سوارە سەلام لە پیادە بکا. خەلیفە هات و دابەزی و سەلامی کرد، پیاوەکانی ڕوویان کردە خەلیفە و گوتیان: قوربان ئەوە «شێخ زونونی میسری»یە، هێناومانە بۆ خزمەتت، چوونە ژووری بارەگا و یەکێک لە وەزیران ڕووی کردە شێخ ووتی: خەلیفە زۆری پێ خۆشە چەند قسەیەک بکەیت و گوێت لێ ڕاگرێ، شێخ دەستی کرد بە مەوعیزە قسەکانی ئەوەندە بە تەئسیر بوون، خەلیفە و تەواوی دانیشتوانی مەجلیسەکە، دەستیان کرد بە گریان، خەلیفە هەستا دەستی شێخی ماچ کرد و بوو بە یەکێک لە موریدانی شێخ و زۆر بە حورمەت ڕەوانەیان کرد.

وا مەشهوور بوو، کە «شێخ زونون» ئیسمی ئەعزەم دەزانێ، جارێک پیاوێک دەچێتە خزمەتی و دەڵێ: قوربان ناڕۆم تا ئیسمی ئەعزەمم فێر نەکەی، شێخ دەفەرمووێ: دانیشە، ساڵێک و شەش مانگ کابرا لە خزمەت شێخدا دەمێنێتەوە،

ڕۆژێک شێخ دەفەرمووێ: هەستە ئەو زەرفە بەرە بۆ ماڵی فلاّن کەس وەرەوە، کابرا لە ڕێگەدا دڵی دەکەوێتە وەسوەسەو دڵێ: دەبێ شێخ چی بۆ ئەوماڵە ناردبێ؟ بە سپاوی سەر زەرفەکە هەڵدە داتەوە، لە پڕ لە ناو زەرفەکە مشکێک دەر دەپەڕێ، کابراکەوای چاو پێ دەکەوێ زۆر توورە دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ لای شێخ، دەڵێ: قوربان ئەوە ساڵێک و شەش مانگە لە خزمەت جەنابت دام، بێ ئەدەبیم نەکردووە، کەچی گاڵتەم پێ دەکەی.

شێخ زۆر بە هێواشی و بەسەر خۆ فەرمووی: گاڵتەم پێ نەکردی، تاقیم کردیەوە، ووتم: بزانم دەتوانی ئیسمی ئەعزەمی لا ئەمانەت بێ؟ بەلاّم بۆم دەرکەوت، تۆ نیو سەعات خۆت بۆ ڕانەگیرا، خەیانەتت لەو زەرفەدا کرد، جا چۆن من دەتوانم ئیسمی ئەعزەم بە تۆ بڵێم؟ کابرا زۆر خەجاڵەت بوو، خواحافیزی کرد و ڕۆیشت، «شێخ زونونی میسری» ئاوا خەڵکی تاقی کردەوتەوە

ڕۆژێک فەرمووی: ئەوەی ئیمانی بە دوا ڕۆژ زەعیف بێ و ئەوەی بەقسەی شەیتان لە دین لابدا و ئەوەی مردن لە بیر خۆی بەرێتەوە وە ئەوەی بۆ ڕەزای خەڵک بی ئەمری خوا بکا و ئەوەی یادی خوو ڕەوشتی پیاوچاکان نەکاتەوە، بەلاّم باسی دەوڵەمەندی و ڕابواردنیان بکا، ئەوە ئەو کەسە زوو بە فەساد دەچێ و زوو فاسید دەبێ.

«شیخ زونونی میسری» لە ساڵی دووسەت و چلی کۆچیدا لە شاری بەغدا وەفاتی فەرموو: ڕاوی دەڵێ: کاتێ جەنازەکەیان برد بۆ سەرقەبران زۆر گەرما بوو، بە ئەمری خوا، کۆمەڵێکی زۆر تەیر و باڵندە لە نگەریان لە سەر جەنازەکەی گرت، تا چوینە سەر قەبران هەتا ولێ نەدا.

ئەوە بوو بە کورتی باسی «شێخ زونونی میسری»، ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن، لە ژیانی ڕۆژانەتاندا فەرمایشتە جوانەکانی بکەنە سەر

مەشق، تا خواوەندی گەورە بە لوتف وکەرەمی خۆی بمان خاتە سەر ڕێگای ڕاست. خوایە عەفومان کەی. خوایە وەبەر شەفاعەتی پێغەمبەرمان خەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکەی. خوایە لە بەڵاو موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین.

وَ اَلسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ و رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٨)
# بایەزیدی بوستامی

﴿بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾
[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينْ؛ وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ الطّاهِرِينَ، وَ عَلىٰ أَصْحابِهِ وَ أَوْلِيائِهِ وَ أَتْباعِهِ إِلىٰ يَوْمِ الدِّينْ]

گویٚ گری بەڕێز، حەمد بۆ خوا، کە عومر، وەفای کردووەو ئیستا لەم مەجلیسە دانیشتوین.

جا، با لەم ئامۆژگاریەدا بچینە خزمەت ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ویلایەت، چرای تاریکی ڕێگای هیدایەت، عاشقی مەعنەوی یەزدانی، خواناسی بارەگای سوبحانی، پیری مەی خانەی عیرفانی، ئوستادی زۆربەی ڕوحانی، دڵ ئاوێنەیەکی نوورانی، ساقی مەجلیسی زومرەی ڕەببانی، سەر حەلقەی خەتمی سۆفیانی نامی، هەڵبژێراوی دنیایی ناکامی، «شێخ بایەزید»ی ناز ناو «بوستامی»...

«شێخ بایەزیدی بوستامی» ناوی تەیفورە کوڕی عیسای کوڕی ئادەمی کوڕی سروشان و خەڵکی شاری بوستام بووە، زاناترینی ئەولیا بووە لە زەمانی خۆیدا، خوا پەرستێکی زۆر ڕاستەقینە بووە، بە خزمەت سەت و سێزدە ئەولیا گەیشتووە. چاوی بە «ئیمام جەعفەری سادق کەوتووە، کەشف و کەراماتی زۆر بووە، تەریقەتی بۆ خزمەت کردنی شەریعەت بە کار بردووە.

«بایەزیدی بوستامی» دەوڵەتی مادەرزادی بووە، دایکی گێڕایەتەوە و گوتویەتی، زۆرم لا سەیر بوو، کە «بایەزیدم» لە سکدا بوو، ئەگەر شتێکی شوبهە

دارم بخواردایە، تا ئەو لووقمەم فڕێنەدا بایەوە «بایەزید» لە سکمدا هیچی نەدەخوارد و بە ئاشکرا هەستم پێ دەکرد. کورد واتەنی دەڵێن: چێشتی خۆش لە ئەنگۆرێڕا دیارە. «شێخ بایەزید»، کە عومری دەگاتە حەوت هەشت ساڵ، دایکی دەبەر خویندنی دەنێ، قورئان دەخوێنێ تا دەگاتە ئەو ئایەتەی سورەی لوقمان، کە دەفەرموێ: ﴿اَنْ اَشْكُرْلِى وَ لِوَالِدَيْكَ﴾ شوکرانەی خواو شکورانەی باوک‌و دایکت بکە، کە لە مەعنای ئەو ئایەتە حاڵی بوو، سیپارەکەی دانا و ئیجازەی لە مامۆستا وەرگرت و چووە ماڵەوە، دایکی گوتی: ئەوە بۆ بەوبێ وەختیە هاتویەوە؟ چ قەوماوە؟ یان مامۆستا دەری کردوی؟ گوتی: ئەی دایکە ئەوانە هیچیان ڕوویان نەداوە، بەڵام ئیمڕۆ لە سورەی لووقماندا گەیشتمە ئایەتێک دەیفەرموو: دەبێ شکورانەی خواش و شوکرانەی دایک و باوکیشت بکەی، منیش بیرم لێ کردەوە کە کوێخایی دوو ماڵم پێ ناکرێ، یان دەبێ خزمەتی تۆ بکەم و لە خوا دوور کەومەوە، یان ئازادم بکە تا بە تەواوی ڕوو بکەمە خوا پەرستی. دایکی ناوچاوانی ماچ کردوو گوتی، ئەی کوڕی خۆم، ئەوا بە شاهیدی خوا ئازادم کردی، بڕۆ دەرسەکانت بخوێنە، ئنجا بە یەک دڵی چوە مزگەوت و دەستی کرد بە خوێندن تا بوو بەو «بایەزید».

مەولانای جامی (ڕەزای خوای لێ بێ) لە کتێبی «نَفَحَاتُ الأُنس» دا، دەفەرموێ: «شێخ بایەزید» بە زۆری لای مەلایەکی کوردی خوێند وە. تەنانەت بۆ ڕێز و حورمەتی مامۆستاکەی، وەسیەتی کردووە، کە مرد گۆڕەکەی لە دوای گۆڕی مامۆستاکە یەوە هەڵکەنن، تا گۆڕی ئوستادەکەی وەک حاڵی حەیات هەر لە پێشیەوە بێ.

دووبارە دەفەرموێ: «بایەزیدی بوستامی» لە ئاییندا خاوەن ڕەئیی بووە، لە تەریقەتیشدا، تا ئەو نەهاتە بازاری شاری تەریقەتەوە، کەس بە دووکان و کووچەی شاری تەریقەتی نەدەزانی .

«بایەزیدی بوستامی» بوو، کە ئالآی تەریقەتی لە هەموو شار و دێهات و چۆڵ و سەحرایەک هەڵدا، «بایەزیدی بوستامی» بوو، پیرەوانی پێغەمبەری لە ئەسراری غەیبی ئاگادار کردو و دەرگای خواناسی و پەیرەوی شەریعەتی خستە سەر پشت.

بە گاڵتە نیە، کە گەورەی تائیفەتەین، شێخ جونەیدی بەغدادی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەبارەی «بایەزیدی بوستامی» فەرموویەتی: «بایەزیدی بوستامی» لە ناو ئێمەدا، وەک حەزرەتی جوبرەئیلە لە ناو مەلائیکەدا.

فەرموویەتی: باغی بەرەی ئادەمیزاد، بە دوو سەت ساڵ ئنجا دەتوانێ گوڵێکی وەک «بایەزید» وەبەر بێنی.

*«چو خورشید تابان دهد فیض نور    نه نزدیک محروم ماند نه دور»*

«بایەزید» وەک ڕۆژی ڕووناک وایە، دوور و نزدیک لە نوور و ڕووناکی ئەو بێ بەش و مەحروم نیە.

جا ئەو «بایەزیدی بوستامی»یە، دەفعەیەک دەچێ بۆ لای پیاوچاکێک، کاتێ لە ساباتی شێخ نزیک دەبنەوە، شێخ تف بەرەو قبیلە فڕێ دەدا «بایەزید» کەوای چاو پێ دەکەوێ، دەگەڕێتەوە و ناچێ بۆ لای.

عەرزی دەکەن، قوربان ئەوە بۆگەڕایەوە؟ دەفەرموۆی: ئەگەر گوتیان: فلآن کەس بە کەرامات، بە حەوادا دەفڕێ، یان بەرماڵی لەسەر ئاو دەگەڕێ، پێی بە سەهوو نەچن، تەماشای کردەوەی بکەن، ئەگەر کردەوکانی شەرعی بوون بێ شەرعیتان لێ نەدی، ئەوە پیاوی چاکە، دەنا باوەڕی پێ مەکەن، فەرمووی: ئەگەر ئەو پیاوە پیاوی خوا بوایە بەڕاستی، تفی بەرەو قبیلە فڕێ نەئەدا!

وا مەزانن کە «بایەزید» ئەو ڕوتبەو مەقامەی هەروا بە خۆڕایی دەست کەوتووە، ماوێکی زۆر لە خزمەت ئیمام جەعفەری سادقدا دەمێنێتەوە، ڕۆژێک ئیمام جەعفەر دەفەرمووێ: ئەو کتێبەم بۆ بێنە لە سەر ئەو تاقەیە، دەڵێ قوربان کام

تاقە؟ ئیمام جەعفەر دەفەرموێ: تا ئێستا ئەو تاقەت نەدیوە؟ ئەویش دەڵێ: قوربان جا چۆن لە خزمەت جەنابت سەر بەرز دەکەمەوە، تا تاقەکە ببینم؟ ئیمام جەعفەر ئافەرینێکی دەکا و دەفەرمووێ: «بایەزید» بچۆ خەریکی کاری خۆت بە.

ئنجا دەستی ئیمام جەعفەر ماچ دەکا و دێ دەست دەکا بە ئیرشادی خۆی.

ئەدەب و حەیا و حورمەتی «شێخ بایەزید» ئەوەندە زۆر بووە، لام وایە ئەگەر هێندێکتان بۆ باس بکەم سەرتان سڕ بمێنی.

ساڵێک دەچێ بۆ حەج و کە لە حەج دەبنەوە، ڕو دەکاتە موریدەکانی و دەفەرمووێ: ئیمساڵ ناچین بۆ زیارەتی پێغەمبەر. عەرزی دەکەن قوربان جا ئێمە ئەو هەموو ڕێگا دوور و درێژەمان بڕیوە، چۆن دەبێ بە خزمەت پێغەمبەر نەگەین؟

دەفەرمووێ: ئاخر زۆرم لا بێ ئەدەبیە بە هۆی حەجەوە زیارەت پێغەمبەر بکەین، ئەگەر عومر وەفای کرد ساڵێکیتر لە پێشدا دەچینە خزمەتی پێغەمبەر ساڵی دوایی خوا یارمەتی دان و چوونە خزمەت پێغەمبەر.

ڕاوی دەڵێ: لە ڕێگەدا تووشی کەللە سەرێک بوون، لە سەری نووسرابوو **﴿صُمٌ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لاٰ يَعْقِلُونْ﴾** ئەوانە کەڕو لاڵ و کوێران هیچ نازانن. «شێخ بایەزید» کە خوێندیەوە نەعرەتەیێکی لێ داو دەستی کرد بە گریان و ماچ کردنی کەللە سەرە، کە ئنجا ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: سەری سۆفی و مورید دەبێ وەک ئەوکەللە سەرە وابێ، چاوی نامەحرەم نەبینێ، زمانی بە خراپە نەگەڕێ و، گوێی خەراپە نە بیسێ.

ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: **[اَللّٰهُمَّ اِنَّکَ خَلَقْتَ هٰذَا الخَلْقَ بِغَیْرِ عِلْمِهِمْ، وَ قَلَّدْتَهُمْ اَمٰانَةً مِنْ غَیْرِ اِرٰادَتِهِمْ، فَأِنْ لَمْ تَعِنْهُمْ فَمَنْ یَعِنْهُمْ؟]**

ئەی خوای گەورە تۆ ئەو خەڵکەت دروست کردووە، بێ ئەوەی ئاگادار بن، بێ پرس بە خۆیان باری ئەمانەتت لە سەر شانی داناون، جا ئەگەر خۆت یارمەتیان

نەدەی، کێ یارمەتیان بدا؟

عەرزیان کرد قوربان، لە بەهشتا کەس خوا دەبینی؟

فەرمووی: [إِنَّ لِلّٰهِ خَوٰاصَّ مِنْ عِبٰادِهِ لَو حَجَبَهُمْ فِي الْجَنَّةِ عَـنْ رُؤْيَـتِهِ لاَ سْـتَغٰاثُوا بِالْخُرُوجِ مِنَ الْجَنَّةِ كَمٰا يَسْتَغِيثُ أَهْلُ النّٰارِ بِالْخُرُوجِ مِنَ النّٰارِ]

بەڵێ بەتایبەتی لە ناو بەندەگاندا چەند عەبدێک هەن، ئەگەر چاویان بە خوا نەکەوێ، داوای هاتنەدەرەوە دەکەن لە بەهەشتدا، هەر وەک دۆزەخی داوای هاتنە دەرەوە دەکەن لە دۆزەخ.

ئەڵێن جارێک عەرزیان کرد قوربان ڕاستە دەڵێن: کەشف و کەرامات هەیە؟ فەرمووی: ئەوە بۆ زۆرتان لا عەجایب و سەیرە، پیاوی خوا کەڕاماتی هەبێ؟ بەسەر ئاودا بڕوا، یان بەهەوادا.

ئەی بۆ لاتان سەیر نیە، باڵندەیەک گۆشتی مردارەوە بوو دەخواو، بە هەوادا دەفڕێ؟ تەنانەت تەختە دارێک بەسەر ئاودا دەڕوا، خۆ ئەگەر ئینسان خوابناسێ زۆر لە باڵندەلای خوا خۆشەویستترە، فەرمووی: بەڵام ئینسان نابێ بە کەڕامات خوی لێ بگۆڕێ.

[إِنَّ فِى الطّٰاعٰاتِ مِنَ الافٰاتِ مٰا لاٰ تَحْتٰاجُونَ اِلىٰ أَنْ تَطْلُبُوا المَعٰاصِي] فەرمووی: چونکە بەڕاستی عیبادەت ئەگەر بۆ خوا نەبوو، زیایی تێدا کرا، ئەوە، ئەوەندەی ئافەت و بەڵا، بە دوادا دەبێ، کە قەت پێویست ناکا ئەو کەسە گوناح بکا، چونکە عیبادەتەکەی گوناحە.

پیاوێک گوتی: شێخ، زۆر حەز دەکەم، لەو کەوڵە پارچەیەکم بۆ بەرەکەت بۆ لێ وەکەی، «شێخ بایەزید» فەرمووی: نەک پارچەیەک لەو کەوڵە، ئەگەر پارچەیێکیشت لە پێستی خۆم بۆ لێ وەکەم هیچ بەرەکەتت پێ ناگا، تاکردەوەی خۆت وەک کردەوەی بایەزید نەبێ.

فەرمووی: ئەوەش بزانن کە ڕەفاقەتی پیاوی چاک و یادی پیاو چاکان لە کاری

چاک چاکترە، ڕەفاقەتی پیاو خراپ و یادی پیاو خراپان لە کاری خراپ خراپترە، فەرمووی: پیاوی باش دەبێ وەک بەحر سەخی بێ و وەک ڕۆژ بە رەحم بێ، نووری دنیا دابگرێ، وەک زەوی خۆی بەکەم بگرێ.

یەکی لە پیاو چاکان دەفەرمووی: لە پاش وەفاتی بە خزمەتی «بایەزید بوستامی» گەیشتم، لە خەومدا ووتم: قوربان چۆنت وەلامی مەلائیکەی خوا دایەوە؟

فەرمووی: کاتێک مەلائیکەی خوا هاتن بۆ پرسیاری قەبر و گوتیان: خوات کێیە؟ عەرزم کردن: با منیش بلێم: خوام اللهیە، ئەگەر ئەو بە عەبد و بەندەم نەزانێ چ فائیدە؟

بچن عەرزی بارەگای ئەقدەس بکەن، داخۆ بەعەبد و بەندەم قبوڵ دەکا؟ دەفەرمووێ: مەلائێکەتەکان ڕۆیشتن و نەهاتنەوە و لە سوئالی قەبر ڕزگارم بوو. لە زمان «بایە زید بوستانی» یەوە، حیکایاتی زۆریان گێڕاوەتەوە، بۆ نموونە دەڵێن: فەرمویەتی: ڕۆژێک بە تەنها لە خەڵوەتا بووم، لە غەیبەوە گوتیان: بچۆ بۆ دێر و کلیسای «سەمعان»، کارێکی گرنگمان بە دەستەوەیە.

گوتم: [أَعُوذُ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمْ] ئەوە کاری شەیتانە، شەوێ لە خەومدا گوتیان دەبێ بچی، ناچار بەیانی خۆم گۆڕی و چووم، کلیسا پڕ بوو، زۆری پێ نەچوو ڕاهیبی گەورە هات، تەماشای خەڵکەکەی کرد و بێ دەنگ دانیشت. گوتیان قوربان بۆ دەنگ ناکەی ئێمە لەبەر فەرمایشتی تۆ لێرە کۆ بوینەوە، گوتی: ئاخر موسوڵمانێکتان لە ناو دایە هاتووە تاقیمان دەکاتەوە. گوتیان: هەر ئێستا دەیکوژین. ووتی: ئیمتیحانی دەکەم ئەگەر وەڵامی دامەوە، ئەوە باشە، دەنا دەی کوژین. هەستایە سەر پێ و گوتی: ئەی محمدی! تۆ محمد خۆت ئاشکرا بکە. ناچار هەستامە سەر پێ. گوتی: چەند پرسیارت لێ دەکەم، ئەگەر زانیتن چی بڵێی بە قسەت ئەکەین، دەنا دەتکوژین. ووتم: زۆر باشە، خوا شاهید بێ لە

بەینماندا. گوتی: ئەوە چیە؟ یەکە نابێ بە دوە، دووە نابێ سێ، سێیە نابن بە چوار، چوارن نابن بە پێنج، پێنجن نابن بە شەش، شەشن نابن بە حەوت، حەوتن نابن بە هەشت، هەشتن تابن بە نۆ، نۆن نابن بە دە، دەن نابن بە یازدە، یازدەن نابن بە دوازدە، دوازدەن نابن بە سێزدە، سیزدەن نابن بە چواردە، چ قەومێک بوو درۆشیان کرد و دەچنە بەهەشت؟ و چ قەومێک بوو ڕاستیان گوت و دەچنە جەهەننەم؟ کام چواردە شتە بوو لە گەڵ خوا قسەیان کرد؟ و کام قەبرە بوو بە جەنازە کەوە ڕۆیشت؟ کام شتەیە خوا خۆی دروستی کردووە، کەچی خۆی دەی کرێتەوە؟ کام شتەیە خۆی دروستی کردووە، کەچی دەی کەرهێنی، کام چوارگیان لەبەرەن، کە لە پشتی باوک و سکی دایک نەبوون کام دارەیە دوازدە لقی هەیە، هەر لقەی سێ پەلکە گەڵای پێوەیە، هەر پەلکەی پێنج گوڵی دەر کردووە، دوانی لە بەر هەتاوە و سیانی لە سێبەرە؟ چ سەر چاوێکەیە، چوار جۆگەی ئاولێی دێنە دەر تامو ڕەنگیان جیاوازە؟ «شێخ بایەزید» فەرمووی: ئەگەر وەڵامی هەمو پرسیارەکانم دایەوە چی بڵێم بە قسەم دەکەن؟ گوتیان بەڵێ، فەرمووی: خوا یەکە نابێ بە دوو، دوون نابن بە سێ، شەوو ڕۆژن، سێن نابن بە چوار، عەرش وکورسی و قەڵەمی قودرەتی خوان، چوارن نابن بە پێنج، تەورات و ئەنجیل و زەبوور و قورئانن، پێنج فەرزەی نوێژ نابن بە شەش، شەشن نابن بە حەوت، ئەو شەش ڕۆژەن کە خوا کەون و کائیناتی تێدا دروست کردن، سەبعەی سەییارە نابن بە هەشت، هەڵگری عەرشی خوا لە ڕۆژی قیامەتا هەشتن، نۆ نابن بە دە، ئەو نۆ دەستە بوون، کە لە مەدینەدا مونافیق بوون، دەنن نابن بە یازدە، ئەو دە ڕۆژەن، کە لە سەر حاجی واجب دەبن، یازدە براکانی حەزرەتی یوسف نابن بە دوازدە، دوازدە مانگەیە، سێزدە ئەو سێزدە کەسە بوو کە حەزرەتی یوسف لە خەودا چاوی پێ کەوتن، ئەو قەومەی درۆیان کرد ودەچنە بەهەشت براکانی حەزرەتی یوسف بوون، ئەوەی ڕاستیان گوت و دەچنە جەهەننەم ئەوە ئیشارەیە

بۆ ئایەتی ﴿وَ قالَتِ الیَهُودُ لَیْسَتِ النَّصاریٰ عَلیٰ شَيءٍ وَ قالَتِ النَّصاریٰ لَیْسَتِ الیَهُودُ عَلیٰ شَيءٍ﴾، ئەو چواردە شتەی قسەیان لە خزمەت خوا دامکرد چواردە کوورەی ئەرز و ئاسمان بوون، ﴿قالَتا أتَیْنا طائِعِینْ﴾، قەبرە کە ماسی حەزرەتی «یونس» بووە، ئادەم و حەووا و بەرانی ئیسماعیل پێغەمبەر و شتری حەزرەتی سالّح بێ باوک و دایک بوون، ئەوەی خوا دروستی کردووەو دەی کرپێتەوە نەفسی ئینسانی موسولّمانە، ئەوەی دەشی کەرهێنێ زەرەی کەرە، دارەکەش دوازدە مانگەی سالّە، سەرچاوکەش سەرە، ئنجا «شێخ بایەزید» ڕووی کردە راهیب و گوتی: کلیلی دەرگاری بەهەشت چیە؟ کابرا بێ دەنگ بوو، گوتیان ئەوە بۆ وەلاّمی نادەیەوە؟ ڕاهیب گوتی: ئەگەر ڕاستییەکەی بلّێم بەقسەم دەکەن؟ وتیان بەلّێ: گوتی: بلّێن: [لا اِلَهَ اِلاَّ اللهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ]، هەموویان موسولّمان بوون، کلیسا کەیان کردە مزگەوت. ئەوە بو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهاتی «بایەزید بوستامی»، ساخوا بۆ خاتری گەورەیی خۆی عەفوومان کا. هیدایەتمان بدا. لەگەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکا. لە بەلاّو موسیبەت بمان پارێزی. ئامین.

وَ اَلسَّلامُ عَلَیْکُمْ و رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَکاتُهُ

# (٩)
# عبداللەی کوڕی موبارەک

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾
[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ اَلْعٰالَمِينَ، وَ صَلّٰى اَللّٰهُ وَ سَلَّمَ عَلٰى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلٰى آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَتْبٰاعِهِ أَجْمَعِين]

ئاوێنەی تێ ڕوانینی ئەم مەجلیسەمان، گڵۆپی ڕووناک کەرەوەی بیر و هۆشمان، ئەستێرەیێکی گەشی ئاسمان ویلایەت، پێشەوای موجاهیدینی بەحەقیقەت، ئیمامی عیلم و شەریعەت، دێوانەی ڕێگای مەعریفەت، مەلەوانی بەحری تەریقەت. «عبداللەی کوڕی موبارەک»ە. جا بابە ئەدەب دانیشین و بە دڵ گوێ بگرین، بزانین ئەوزاتە کێیە و چۆن پێگەیشتووە و پایەی زانیاری چەند بوەو پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

لە بارەی لەدایک بوونیەوە، ڕاوی دەڵێ: لە شاری مەڕوەدا زانایەک دەبێ کچێکی زۆر بەدین و جوانی دەبێ، زۆر بەی دەوڵەمەند و پیاو ماقووڵی شار، حەزی لێ ئەکەن و بە تەمای دەبن، زاناکەش لەو بەیندا تێمابوو، نەیدەزانی بیدا بە کامیان، گاورێک دراوسێیان دەبێ، ڕۆژێک بانگی دەکا و دەڵێ: پرسێکت پێ دەکەم، ئەڵێ: فەرموو، زاناکە دەڵێ: من کچێکی زۆر بە دین و جوانم هەیە، ئێستاش زۆر کەس داوا کەریەتی، بە عەقڵی تۆ بیدەم بە کێ باشە؟

گاورەکە دەڵێ: جا خۆ قوربان من موسوڵمان نیم، تۆ چۆن پرس بە من دەکەی؟ زاناکە دەڵێ: چونکە دەزانم تۆ پیاوێکی ئەمینی و ئەوە چەند ساڵە

هاومالین، خەیانەتم لێ نەدیوی، جا لەبەر ئەوە تۆ چی بلێی بەقسەت دەکەم، هەروەها پێغەمبەری ئێمەش (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرمویەتی: تەکبیر و ڕاوێژ بە ئینسانی ئەمین بکەن. گاورە کە گوتی: مامۆستا، لە ئافرەت بە مێرداندا، هاو کوفی شەرتە، ئنجاکەفائەت و هاوشانی لام وایە لە دینی ئیسلامدا بە تەقوا و دیانەتە، لای ئێمەش بە ئەسڵ و نەسەبە، بەڵام لە لای خەڵکی ئێستا و ئەهلی دنیا بە ماڵ و سەروەت و ڕوتبەو مەقامە، جا بۆ خۆت سەر پشکبە، ئەگەر بە دینی خۆتان ڕەفتار دەکەی، ئەوە بیدە بە پیاوێکی بەدین، ئەگەر بە مەزەبی ئێمەش دەکەی بیدە بە پیاویکی خاوەن حەسەب ونەسەب، ئەگەر چاویش لە خەڵک دەکەی، بیدە بە پیاوێکی دەوڵەمەندی پارەدار، زاناکە قسەی گاورەکەی زۆر پێ خۆش بوو، گوتی: دیارە ئایینی ئیسلام هاوشانی لە دیندا پەسند کردووە. غوڵامێکی بوو ناوی موبارەک، بوو، زۆر موسوڵمان و بە دین بوو، گوتی: بەلامەوە کەس لە موبارەک موبارەکتر و بە دینتر نیە، بانگی کرد، ئازادی کرد و کچەکەی لێ مارە کرد، ئافرەتەکە حامیلە بوو، لە پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و چەند دەقیقە کوڕێکی بوو، ناویان نا «عبداللە»، ئەو «عبداللە»یە گەورە بوو، بوو بەو «عبداللە»یە، کە ئێستا لە ناو خەڵکدا مەشهورە بە «عبداللەی کوڕی موبارەک» و یەکێک لە پێشەوا بەرزەکانی ئایینی ئیسلام و ئیمرۆ بوەتە شەمعی مەجلیسەکەمان.

«عبداللەی کوڕی موبارەک» (خوای لێ ڕازی بێ)، هەر بە منداڵی نیشانەی پیاوچاکی لە ناو چاوانی دەر ئەکەوت، زۆر زیرەک بووە، خوێندنی زوو تەواو کردووە، لە شاری مەڕوە لە دایک بووە، لە پاشان چوەتە شاری بەغدا، لە وێ بوەتە قوتابی و شاگردی ئیمامی ئەعزەم، خوێندنی تەواو کردووە، لە هەموو عیلمێک دا دەستێکی باڵای بووە، زۆر زانا و بلیمەت بووە، زاناکان ناویان نابوو شاهەنشای زانایان، عولەمای زاهیری و عولەمایی باتینی زۆریان خۆش دەویست.

«عبداللهی کوڕی موبارەک» لای پیاوە گەورەکانی ئەو سەر دەمە، ئەوەندە موحتەرەم بووە. ڕۆژێک دەچێتە مەجلیسێک سەفیانی سەوری و شێخ فوزەیلی کوڕی عەیاز لە وێ دەبن. سەفیانی سەوری دەفەرمووێ: یا خوا بە خێر بێی، ئەی یەکە پیاوی ڕۆژ هەڵات. شیخ فوزەیلیش دەفەرمووێ: یاخوا بەخێر بێی ئەی یەکە پیاوی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا.

ڕاوی دەڵێ: هۆی تۆبە کردن و گەڕانەوەی یە کجاری «عبداللهی کوڕی موبارەک» بۆلای خوا ئەوە بووە.

ئەڵێن: کاتێک خوێندنی تەواو کردووەو ئیجازەی عیلمی وەرگرتوە، دڵی چوەتە سەر ئافرەتێک، شەوێک لە شەوەکانی زستاندا زۆر سەرما دەبێ، لەگەڵ ئافرەتەکە بڕیار ئەدەن کە ئەو شەوە چاویان بە یەکتر بکەوێ، «عبدالله» لە سەر بەڵێنی خۆی دەچێتە ئەو جێگایە کە دیاری‌یان کردبوو، لەوی چاویان بە یەکتر بکەوێ، تا لای بەیانی چاوەڕوان دەبێ ئافرەتەکە نایە، مەلا بانگی بەیانی دەڵێ، «عبدالله» دەچێ بۆ مزگەوت نوێژی بەیانی دەکا، لە پاشان بیر لە کردەوە وبەسەرهاتی شەوی دەکاتەوە کە چ کارێکی خراپی کردووە، زۆر پەشیمان دەبێتەوە، ڕوو دەکاتە نەفسی خۆی و دەڵێ: دەک دواەشێی پیاو، تۆ لە ئیوارەوە تا بەیانی بە هەوای نەفس بۆ ئارەزوی چاو پێ کەوتنی ئافرەتێک، لە بەر ئەو سەرمایەدا دەوەستی، بە لام ئەگەر بە چەند جار، جارێک ئیمامی مزگەوت لە پاش فاتیحا سورەتێکی تۆزێک درێژ بخوێنی، خۆت بۆ ڕاناگیرێ و هاوارت لێ پەیدادەبێ و لەمەلا تورە دەبی.

هەر لە سەر بەرماڵە کە تۆبەی کرد و شەرتی کرد کە تاماوە دوای هەوای نەفس نەکەوێ و ڕوو بکاتە عیبادەت و خواپەرستی و پیاوەتی، یارەبی ئەوەی موسوڵمانە وەک ئەو تۆبە بکا و لە خراپە بگەڕێتەوەو ئاخری ئەو «عبداللهی موبارک»ە، بوو بەو پیاوە کە زاتێکی وەک وەلی خوا، شێخ سەفیانی سەوری لە

مەدحیدا دەڵێ: ئەگەر من خۆم زۆر نارەحەت کەم و بم هەوێ لە ساڵێکدا سێ ڕۆژ وەک «عبداللەی موبارەک» بم، هێشتا ناتوانم و نای گەمێ.

«عبداللەی» موبارەک دوای نوێژ و عیبادەت بە زۆری وەختی خۆی بە موتالاّی کتێبەوە بردوەتە سەر. ڕۆژێک لە مزگەوت نوێژ دەکا و دوای دۆعا و پاڕانـەوە تەشریفی هەڵدەستێ دەڕوا، خەڵکە کە عەرزی دەکەن، قوربان ئەوە بۆ لەگەڵمان دانانیشی؟ لە وەڵامیاندا دەفەرمووێ: دەچم بۆ خزمەت ئەسحابی پێغەمبەر و پیاو چاکان لە گەڵ ئەوان دادەنیشم، عەرزی دەکەن. دەڵێن قـوربان، جـا ئـەسحابی پێغەمبەر کوا ماون؟ تا لە گەڵیان دانیشی! دەفەرمووێ: ئێوە نازانن، دەچم ژیان و بە سەرهات و ئاسار و فەرمایشتەکانیان دەخوێنمەوە، هەر وەک لە خزمەتیاندا بم وایە. گەڕایەوەو فەرمووی: باشە هەر بە خۆتان نەڵێم: مـن چـۆن لە گـەڵ ئـێوە دانیشم کە بە زۆری قسەی مەجلیسەکەتان باسی خەڵک و غەیبەت کردنە.

فەرمووی: گوێ بگرن. [**أَنَا أُحِبُّ الصَّالِحِينَ وَ لَسْتُ مِنْهُمْ، وَ أَبْغَضُ الطَّالِحِينَ وَ أَنَا شَرٌّ مِنْهُمْ**] من پیاو چاکم خۆش دەوێن. هەر چەند زۆر بەداخـەوە خـۆم لە پیاوچاکان نیم، هەروەها پیاو خراپیشم ناخۆش دەوێن، با خۆشم لەوان خراپتر بم.

«عبداللەی کوڕی موبارەک هەر وەک زانا و عالم بووە، زوهد و تەقوا و کەشف و کەڕاماتیشی زۆر بووە.

ڕاوی دەڵی: پیاوێک بە ناوی سەهل زۆری خۆش دەوێ و موریدی دەبـێ. ڕۆژێک ئەو پیاوە دێتە خزمەتی، کەچی لە مـەجلیسی «عـبداللەی مـوبارەک» لە خۆوە تورە دەبێ و هەڵدەستێ دەچێتە دەرەوەو، دەڵێ: تـۆبە، تـازە جـارێکی‌تر نایەمەوە مەجلیسی تۆ. «عبدالله» دەفەرمووێ: ئابانگی بکەن بزانم بۆچی تورە بوو ڕۆیشت.

بانگی دەکەنەوە و پرسیاری لێ دەکا، کە لە چی تورە بووە؟ چی بێ شـەرعی چاو پێ کەوتووە؟ ئەویش دەڵێ: قوربان چۆن. تورە نابم! تۆ بۆچی ئەو کـەنیزە

کانه‌ت وا بێ ئه‌ده‌ب فێر کردون، هاتوونه سه‌ربان ته‌ماشای من ده‌که‌ن. کابرا ئه‌وه‌ی گوت و ڕۆیشت. «عبدالله‌ی موباره‌ک» ڕووی کرده خه‌ڵکه‌که‌و فه‌رمووی: کوڕینه خۆتان حارز بکه‌ن. سه‌هل وه‌فاتی کرد، کۆمه‌ڵیکتان بچن قه‌بری بۆ هه‌ڵکه‌نن و ئێمه‌ش له‌گه‌ڵ جه‌نازه‌که‌یدا دێین. خه‌ڵک ئه‌و فه‌رمایشته‌ی «عبدالله‌ی موباره‌ک»یان زۆر به‌لاوه سه‌یر بوو، ئه‌وان له‌و گفتوگۆیه‌دا بوون، خه‌به‌رهات که سه‌هل وه‌فاتی کردووه.

عه‌رزیان کرد قوربان ئه‌وه چۆنت زانی فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ر (سه‌لات و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێ)، له حه‌دیسدا فه‌رموویه‌تی، ئینسانی به دین و موسوڵمان له کاتی مردنیدا جێگا و مه‌قامی خۆی و حۆری به‌هه‌شتی چاو پێ ده‌که‌وێ، فه‌رمووی: جاکه سه‌هل توڕه بوو گوتی: که‌نیزه‌که‌کانت له سه‌ر بانه‌وه ته‌ماشایان ده‌کردم من بۆم مه‌علووم بوو، ئه‌و که‌نیزه‌کانه‌ی ئه‌و له‌سه‌ر بانی ئێمه چاوی پێ که‌وتوون، ئه‌وه حۆری به‌هه‌شت بوون خۆیان نیشانداوه، ئه‌گینا من هیچ قه‌ره‌واش و که‌نیزه‌کم نین تا ته‌ماشای خه‌ڵک که‌ن.

له ڕیوایه‌تێکی تردا ده‌ڵێن «عبدالله‌ی موباره‌ک» فه‌رموویه‌تی: ساڵێک چووم بۆ حه‌ج، له ماڵی به‌یت شه‌وێک چاوم له سه‌ریه‌ک نان و خه‌وم لێ که‌وت، به ئه‌مری خوا، له خه‌وه‌که‌مدا، دوو مه‌لائێکه له ئاسمانه‌وه هاتنه خواره‌وه، یه‌کێکیان به‌وی تری گوت: ده‌زانی ئیمساڵ چه‌ند هه‌زار که‌س هاتووه بۆ حه‌ج؟ ووتی: به‌ڵێ شه‌ش هه‌زار که‌س هاتووه بۆ حه‌ج. گوتی: باشه ده‌بێ ئیمساڵ حه‌جی چه‌ند که‌س قبول بووبی؟ له وه‌ڵامدا ئه‌وی‌تریان ووتی خواوه‌ندی گه‌وره ئیمساڵ حه‌جی که‌سی قبوڵ نه‌کردووه.

«عبدالله» ده‌ڵێ: منیش له خه‌وه‌که‌مدا زۆر ناڕه‌حه‌ت بووم، ووتم: جا وه‌ره ته‌ماشاکه! ئه‌و خه‌ڵکه له هه‌موو گۆشه‌و که‌ناری دنیاڕا ماڵ و سه‌روه‌تێکی زۆریان خه‌رج کردووه، ماندوو بوونێکی زۆریان دیوه، له ولاتی دووره‌وه هاتوون، چۆن ده‌بێ ئه‌و هه‌موو زه‌حمه‌ته‌یان به فیڕۆ بڕوا!

دەفەرمووێ: لە خەوەکەمدا. من لەو خەیاڵەدا بووم، مەلائیکەتەکە ووتی: بەڵام کاریی خوا زۆر سەیرە، لە شاری دیمشق کابرا یەکی پینەچی هەیە، ناوی عەلی یە کوڕی مووەفەقە نەهاتووە بۆ حەج، کەچی خواوەندی گەورە حەجی بۆ نووسیووەو، لە بەرخاتری ئەویش حەجی هەموو حاجی قبوڵ کردووە. «عبداللە» دەفەرمووێ: منیش لە خۆشی ئەو مژدەیە، لە خەوەکەم ڕاپەڕیم و شەرتم کرد کە لە حەج بوومەوە بچم بۆ شام و زیارەتی ئەو پیاوە بکەم. دەفەرمووێ: کە گەڕامەوە چووم بۆ دیمشق لە ماڵی عەلی کوڕی مووەفەقم پرسی، نیشانیان دام و چووم لە دەرگام دا، پیاوێک هات دەرگاکەی کردەوە، دوای سەلام و بەخێر هاتن، گوتم: ناوت چییە؟ ووتی: عەلی گوتم: کوڕی کێی؟ ووتی کوڕی مووەفەق ووتم ڕۆژانە چ کارێک دەکەی؟ ووتی: پینەچیم. فەرمووی: ئەوەی لە ماڵی بەیت لە خەودا دیم. بۆم گێڕایەوە عەلی ڕووی تێ کردم و ووتی: عەیب نەبێ جەنابت ناووت چیە؟ ووتم: «عبداللەی کوڕی موبارەک»

دەفەرمووێ: نەعرەتەیێکی لێ داو بێ هۆش کەوت. کاتێک وە هۆش هاتەوە، گوتم: پێم بڵێ لە پێش کاتی حەجدا چیت کردووە؟ ووتی: ئەی «عبداللەی موبارەک، ماوەی سی ساڵ بوو ئارەزووی حەجم بوو، بە پینە چی گەری سێ سەت درهەمم کۆ کردبوەوە، خەیاڵی حەجم بوو، خێزانەکەم حامیلە بوو، مەگیرانێ و بێزوی دەکرد، لە ماڵی جیران و دراوسێکەمان بۆنی چێشتێکی کرد، ئارەزووی چوە سەرو گوتی: ئەبی بچی لەماڵی ئەو دراوسێیە، هێندێکم چێشت بۆ بێنی، منیش هەستام چووم بە خاوەن ماڵەکەم گوت: کابرا زۆر نارەحەتبوو، ووتی جا چیت عەرز کەم. ئەگەر ڕاستیت ئەوێ ئەوە چەند ڕۆژ بوو منداڵەکان هیچیان نەخواردبوو، تەماشام کەرد کەرێک مردار ببووە، چووم نەختێکم گۆشت لێ کردەوە، ئیستا ئەوەیە بۆمان لێ ناون، بە داخەوە بۆ ئێوە بە حەڵاڵی نازانم تا بۆتان تێکەین.

ووتی: کەئەوەم لە کابرا بیست ئاگرم تێ بەر بوو، بە پەلە چوومەوە ماڵەوەو

پارەکەم هێنا دام بە کابرا، کابرا دۆعای بە خێری زۆر بۆ کردم. «عبداللهی موبارەک» دەڵێ: هەر دووکمان شوکرانەی خوامان کردو خواحافیزی مان لە یەکتر کرد و وتم: [صَدَقَ ٱلْمَلَکُ فِی ٱلرُّؤْیا، وَ صَدَقَ ٱلْمَلِکُ فِی ٱلحُکْمِ وَ ٱلقَضاء]
ئەو مەلائیکە لە خەوەکەمدا ڕاستی کرد و ئەوی تریشان حوکم و قەزاوەتەکەی ڕاست بوو.

جارێک عەرزی «عبداللهی کوڕی موبارەک»یان کرد، گوتیان: قوربان کام سیفەت و خەسڵەتە بۆ ئینسان زۆر بە سوودە؟ فەرمووی: عەقڵی تەواو زۆر سیفەتێکی بە نرخە. گوتیان: ئەی ئەگەر عەقڵی تەواو نەبوو؟
فەرمووی: دۆستی بەڕەحم و برادەری چاک. گوتیان: ئەی ئەگەر برادەری چاک نەبوو، فەرمووی: بێ دەنگی.

گوتیان: ئەی ئەگەر پیاو خۆی بۆ ڕانەگیرا و قسەی زۆر کرد، فەرمووی: هەر کەسێک یەکێک لەو خەسڵەتانەی تێدا نەبوو تا زووتر بمرێ باشترە. «عبداللهی موبارەک» دەفەرمووێ: ئامۆژگاری و قسەی باشتان لە هەر کەسێک بیست لە گوێی گرن.

فەرمووی: من دوو ئامۆژگاریم لە کوڕێکی گەنج و گاورێک بیستن وەک ئاڵقە کردوومنە گوێ. یەکەمیان، ساڵێک، زستانی زۆر سەقەت و سەرما بوو، بە بازاری شاری نەیشاپووردا دەڕۆیشتم، کوڕێکی گەنجم دی تەنها کراسێکی لە بەردا بوو، لە سەرمان هەڵدەلەرزی، گوتم: ئەوە بۆ بە گەورەکەت ناڵێی کەوایەکت بۆ بکا؟ کوڕەکە تەماشای کردم و گوتی: تۆ زۆر سەیری! بۆ گەورەکەم نازانێ کەسەرمایە و چاوی لە من نیە ونامبینێ!

دەفەرمووێ: قسەی ئەو کوڕە ئامۆژگارییەکی زۆر گەورە بوو بۆ من و هەموو ئینسانێکی موسوڵمان، کە ئەگەر هات و شتێکمان نەبوو گلەیی لە خوا نەکەین و ئیعتیراز نەگرین و بزانین کە خواوەندی گەورەی ئێمە ئاگای لە هەموو شتێک هەیە. فەرمووی: دووهەمیشیان ئەوە بوو، جارێک خوای گەورە بە سەری

کردمەوە موسیبەتێکم بە سەرهات، خەڵک هاتن بۆ دڵخۆشی دانەوەم، گاورێکی دراوسێمان گوتی: ئەی «عبداللهی موبارەک»، پیاوی عاقڵ و پیاوی خوا، ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی ئەووەڵی موسیبەتدا، ئەوە بکا کە ئینسانی نەزان لە ڕۆژی سێیەمدا دەیکا، فەرمووی: قسەی ئەو گاورەش ئامۆژگارێیکی زۆر بە سود بوو، حەدیسێکی پێغەمبەری خستمەوە یاد کە فەرموویەتی: ئینسانی موسوڵمان دەبێ لە ئەووەڵی موسیبەتدا، خۆڕاگربێ تا سەوابی زۆری دەس کەوێ.

ڕۆژێک فەرمووی: لە بەینی چوار هەزار قسەدا چوار قسەتان بۆ هەڵدەبژێرم: یەکەم، زۆر باوەڕ بە ئافرەت مەکەن. دووەم، بە ماڵ و سەورەتی دنیا مەغرور مەبن. سێیەم، لە قەدەر توانای مەعیدەتان بخۆن، قەت لەوە زیاتر مەخۆن. چوارەم، ئەوەندە عیلم فێر بن کە ئیستفادەی لێ بکەن.

فەرمووی ئینسانی عاقڵ، دەبێ بە تایبەتی ڕێز و ئیحتڕامی سێ تەبەقە بگرێ. یەکەم، دەبێ حورڕمەتی عالم و زانای لابێ، چونکە ئەوەی حورڕمەتی عالمی لا نەبێ قیامەتی دەڕوا. دووەم، دەبێ ڕێزی ئامێر و گەورەی وەختی لابێ، چونکە ئەگەر موخالەفەی بکا ئیستیفادەی لێ ناکا. سێیەم، دەبێ حورڕمەتی ڕەفیق و برادەرو هاوڕێی لابێ، ئەوەی حورمەتی هاوڕێی لانەبێ پیاوەتی نامێنێ.

دەڵێن: لە کاتی گیان دەرچوونیدا، چاوی هەڵێنا و پێکەنی و گوتی: ﴿لِمِثْلِ هٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ﴾ بۆ وێنەی ئەو شوێنە خواپەرستان خوا پەرستی دەکەن. ئەوەی فەرموو: لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی سەت و هەشتاد و یەکی کۆچی لە عومری هەشتاوەیەک ساڵیدا لە شاری هیتی، عیراق وەفاتی فەرموو: ئەوەبوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتی «عبداللهی موبارەک» ئومید دەکەم، سوودی بووبێ. خوایە تاعەت و عیبادەتمان قبول کەی. خوایە لەگەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکەی. خوایە لە بەڵا و موسیبەت بە دوورمان کەی. ئامین.

وَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ و رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (١٠)
# سەفیانی سەوری

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ عَلىٰ نِعْمَةِ ٱلأِيمٰانِ. وَ صَلىٰ ٱللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا وَ قٰائِدِ سَفِينَةِ ٱلحَيٰاةِ إِلىٰ سٰاحِلِ بَحْرِ ٱلْعِرْفٰانِ، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَوْلِـيٰائِهِ وَٱلْمُسْـلِمِينَ وَٱلْمُسْـلِمٰاتِ إِلىٰ آخِـرِ ٱلزَّمٰانِ]

موسوڵمانینە گوڵی مەجلیسی ئیمرۆمان و نێرگسی بۆن خۆش، بۆ زاخاوی بیر و هۆشمان، دەکەینە یەکێک لە ئەولیا و زانا و پیاو چاک و خواناسەکان، کـە لە زەمانی خۆیدا مانگی ڕووناکی ئاسمانی خواپەرستی بوو، شـەمعی هـەڵکراوی ڕێگای تاریکی بوو، ئەستێرەی گەشی دڵ بێداران بوو، گڵۆپی سەرزەوی ئایین زانان بوو، سەوڵ لێ دەری کەشتی عیرفان بوو، خاوەنی فتوای زۆر بەرز و جوان بوو، لە ڕیزی گەورەی موجتەهیدان بوو، تەیری باڵداری عیلم و عـیرفان بـوو، تاجی سەر سەری ئیمانداران بـوو، بـەخشندە و سـەخی، تـەبیعەت هـەوری، مەشوورە بە «شێخ سەفیانی سەوری». جـا، بـا لەم چـەند دەقـیقەی داهـاتووی عومرماندا بە دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و فەرمایشتە بەرزەکانی ئـەو پـیاو چاکەو بیان کەینە سەرمەشقی ژیانمان و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

یەکێک لە زاناکان کە مەشهوورە بە ئەوزاعی فەرموویەتی: ئەگەر پێم بڵێن لە ناو زانایاندا یەکیەک هەڵبژێرە کە بە تەواوی مەعنا، عەمەل بە قورئان و حەدیس بکا، «سەفیانی سەوری» هەڵدەبژێرم.

هەروەها عبداللەی کوڕی مەهدی دەفەرمووێ: بە ڕاستی من لە ژیانی خۆمدا، لە ئیمامی مالیک عاقڵتر و لە سەفیانی سەوریم عالمتر نەدیوە.

ئەم «سەفیانی سەوری‌یە» قوتابی و شاگردی ئیمامی حەنەفی بووە، لە خزمەت ئەو دەرسی خوێندووە، ئەم فەقێ و قوتابیەی ئیمامی حەنەفی‌یە، ئاخری بوو بە یەکێک لە زانا بەرزەکانی ئیسلام و زوهد و تەقوا و وەرع و پەرهێزگاری و تەوازوعی گەیشتە ڕادەیەک، لە ناو عالەمدا ناوبانگی دەرکرد، لە شەریعەت و تەریقەتدا بێ وێنە بوو.

ئەحمەدی کوڕی یونس دەفەرمووێ: [مٰا رَأَیْتُ أَحَداً أَعْلَمَ مِنْ سُفْیٰانَ وَ لاٰ أَوْرَعَ مِنْ سُفْیٰانَ وَ لاٰ أَفْقَهَ مِنْ سُفْیٰانَ، وَ لاٰ أَزْهَدَ مِنْ سُفْیٰانَ] واتە لە ژیانی خۆمدا، نەم دیوە لە «سەفیانی سەوری» عالمتر و بە دین‌تر و شەرع زانتر و زاهیدتر.

یەکێ‌تر لە زانایان فەرموویەتی: لەوانەی کە حەدیسیان ڕیوایەت کردووە، هیچیان لە «سەفیانی سەوری» گەورەتر نەبوون.

«سەفیانی سەوری» هەر وەک زانا بووە، واعیزێکی زۆر بێ وێنەو کەم نەزیریش بووە، تەنانەت ئامۆژگاری زانایانیشی کردووە.

لە فەرمایشتێکدا دەفەرمووێ: [زَیِّنُوا اَلْعِلْمَ بِأَنْفُسِکُمْ وَ لاٰ تَزَیَّنُوا بِالْعِلْمِ] ئەی زانا و عالم و خوێندەوار، وریا بن، بە هۆی زانیاریەوە، خۆتان لێ نەگۆڕێ، بە خوو ڕەوشت و ڕووی خۆشتان عیلمەکەتان جوان بکەن، نەک نەفسی خۆتان بە عیلم، واتە کردەوەی چاک بکەن، با زاناو عالمیش بن، ئەگەر کردەوەی چاکتان نەبوو بە هۆی عیلمەوە جوان نابن و نابنە پیاوی چاک. [اَلْأَعْمٰالُ السَّیِّئَةُ دٰاءٌ، وَالْعُلَمٰاءُ دَوٰاءٌ، فَإِذٰا فَسَدَ اَلْعُلَمٰاءُ فَمَنْ یَشْفِی اَلدٰاءَ؟] دەفەرمووی: کردەوەی خراپ دەرد و نەخۆشی‌یەو، عالمیش دەوایە، جا ئەگەر عالم فاسید بوو، مەعنای وایە دەواو دەرمانە کە فاسید بووە، کە دەواش فاسید بوو کێی شیفای دەردمان بدا؟

لە نامەیەکدا، کە بۆ یەکێک لە حاکمەکانی ئەو سەردەمەی نووسیوە،

دەفەرمووێ: [أَمّا بَعْدُ فَإِنَّکَ فِي زَمانٍ کانَ أَصْحابُ النَّبِيِّ صَلیٰ اللهُ عَلَيْهِ وَ عَلیٰ أَصْحابِهِ يَتَعَوَّذُونَ أَنْ يُدْرِکُوهُ، وَ لَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ ما لَيْسَ لَنا، وَ لَهُمْ مِنَ الْقَدَمِ ما لَيْسَ لَنا، فَکَيْفَ بِناحِينَ أَدْرَکْناهُ عَلیٰ قِلَّةِ عِلْمٍ وَ قِلَّةِ صَبْرٍ وَ قِلَّةِ أَعْوانٍ عَلَیٰ الْخَيْرِ، وَ فَسادِ النّاسِ؟] لە پاش حەمد سەنای خوا و سەلات و سەلام لە سەر پێغەمبەر، بزانە کە تۆ لە زەمانێکدا کار بە دەستی و کەوتوویە زەمانێکەوە، کە ئەسحاب و یارانی پێغەمبەر هەمیشە دۆعایان دەکرد و دەیان فەرموو: یا خوا تووشی ئەو زەمانە نەبین، لە کاتێکدا ئەوان لە ئێمە عالمتر بوون و، ئەوان لە ئێمە لە پێشتر بوون و سەبر و حەوسەڵەیان زیاتر بووە.

نووسی بووی، ئەی خاک بە سەری ئێمە کە، کەوتووینە ئەو زەمانەوە، بەو بێ عیلمی و کەم سەبری و کەم پیاو چاکی و ناو ئەو خەڵکە فاسیدەوە.

«سەفیانی سەوری» لە حەق گوتندوا، و لە ئامۆژگاری لە دیندا، شەرمی لە کەس نەکردووە.

جارێک هارونە ڕەشید، کە خەلیفەی بەغدا بوو، نوێژی دەکرد. بەڵام لە نوێژە کەیدا ڕیشی زۆر دەجوڵاند، کە لە نوێژە کەی بووە، «سەفیانی سەوری» ڕووی کردە هارونە رەشید و فەرمووی: ئەی خەلیفە ئەوە نوێژ نەبوو تۆ کردت. فەرمووی: ئەی خەلیفە لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەی خراپ لە پێش چاوی خەڵک دەی‌پێچنەوە و بەدەم و چاوتی دا دەدەنەوە. خەلیفە زۆری پێ ناخۆش بوو، تورە بوو گوتی: ئەی «سەفیانی سەوری»، لە سەرخۆ قسە بکە، «شێخ سەفیان» فەرمووی: من چۆن دەست لە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە هەڵدەگرم! خەلیفە ئەوەندەی تریشی لێ گران هات، ڕۆژی دوایی خەلیفە دەستووری دا، کە «سەفیانی سەوری» لە دار بدەن، تا کەسی دی جارێکی‌تر نەتوانێ قسە بە خەلیفە بڵێ. «سەفیانی» سەوری ئاگای لەو خەبەرە نەبوو، لەو کاتەدا دوو پیاوی گەورەی بە دینی لە خزمەتدا بوو، سەری لە سەر ڕانی یەکێ لەو دوو پیاوانە بوو، خەوی لێ

کەوتبوو، کاتێ دوو پیاوەکە ئەو هەواڵەیان بیست، زۆر ناڕەحەت بوون، لە بەینی خۆیاندا گوتیان، نازانین وە خەبەری بێنین، یا نا، «سەفیان» وە خەبەر هـاتبوو، گوێی لە گفتوگۆیە کەیان بوو، هەستا و فەرمووی: ئەوە بـاسی چـی ئـەکـەن؟ ئەوانیش هەواڵەکەیان پێ گوت. فەرمووی: گـیان و ژیـان لە لای مـن ئـەوەندە خۆشەویست نین، ئەگەر لە داریشم بدەن من ئامۆژگاری خۆم هەر دەکەم، هەستا دەس نوێژی تـازە کـردەوە و دو ڕکـات نـوێژی کـرد و ڕووی کـردە ئـاسمان، فەرمووی: ئەی خوای گەورە، خۆت دەزانی هارونە ڕەشید خەریکە لە سەر ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە لە دارم بدا، جا خۆت کەیفی خۆتە، یەکێ لە دوو پیاوە گەورەکان، کە لە خزمەتی بوون ناوی سەفیانی کوڕی عویەینە بوو، دەفەرمووی: هێشتا بە تەواوی لە دۆعا کردن نەبووەوە، کە بە ئەمری خوا کۆشکی خەلیفە کەوتە لەرزین و خەریک بوو شاری بەغدا بە بوومەلەرزە لە بەین بچێ، خەلیفە کەوای چاو پێ کەوت گوتی: بۆ خاتری خوا «سەفیانی سـەوریم» بـۆ بـانگ بکـەن بـا گـەردنی خـۆمی پـێ ئـازاد بکـەم. چـوون زۆر بـە ئـیحتیرام، «شـێخ سـەفیانی سەوری»یان هێنا بۆلای هارونە ڕەشید و گەردنی خۆی پێ ئازاد کرد و ئاخری هارونە ڕەشید بوو بە یەکێک لە موریدەکانی.

ڕۆژێک خەبەریاندا بە خەلیفە، کە «سەفیانی سەوری» زۆر نەخۆشە، خەلیفە دوکتۆرێکی گاوری زۆر باشی لابوو، ناردی بۆلای «سەفیانی سەوری» تا تەداوی بکا.

کە چوو فەحس و موعایەنەی کرد، گوتی: ئەو پیاوە لە ترسی خوا جگەری بووە بە خوێن. گوتی: خەڵکینە بە ڕاستی دینێک پیاوی وای هەبێ دینێکی زۆر ڕاستە، دوکتۆرە کە، لە سەر دەستی «سەفیانی سەوری» تۆبەی کرد و موسوڵمان بوو. خەلیفە، کە ئەو هەواڵەی زانی، ووتی: [سُبْحَانَ اللهِ] من لام وابوو دوکتۆرم بۆلای نەخۆش ناردووە! کە چی نەخۆشم ناردووە بۆلای دوکتۆر! بە ئەمری خوا

«سەفیانی سەوریش»، لە نەخۆشی یەکەی ڕزگاری بوو چاک بوەوە.

دەڵێن ڕۆژێک هارونە ڕەشید و سیتتە زوبەیدەی ژنی ناکۆکیان دەکەوێتە بەین، هارونە ڕەشید دەڵێ: ژنت بە سەر دێنم، سیتتە زوبەیدەیش دەڵێ بۆت دروست نیە ژنم بە سەر بێنی! دەڵێ باشە کێ دەکەی بە قازی و حەکەم بێ لە بەینماندا من پێی ڕازیم، هارونە ڕەشید دەڵێ: باشە «سەفیانی سەوری» ئەکەین بە حەکەم. ناردیان «سەفیانی سەوری» هات، هارونە ڕەشید دوای بەخێر هاتن، ڕووی کردە «سەفیانی سەوری» و گوتی: ستتە زوبەیدە لای وایە من بۆم دروست نیە وەک هەموو موسوڵمانێک دوو ژنم هەبێ و ژنی بە سەربێنم! ووتی: بەڵام جەنابت ئاگاداری، کە خوای گەورە لە سورەی نیسادا، فەرموویەتی:

﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَ ثُلَاثَ وَ رُبَاعَ﴾ ئەوەندەی پێتان خۆشە ژن مارە بکەن تا دەگەنە دوو و سێ و چوار، واتە تا چوار ژن دروستە. «سەفیانی سەوری» فەرمووی: ئاخر ئەی خەلیفە، تۆ ئایەتەکەت بە تەواوی نەخوێندەوە، خواوەندی گەورە لە دوای ئەوە، دەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾ ئەگەر هات و دەترسان لە وەی لە بەینیاندا دادگەر نەبن، نابێ لە ژنێک زیاتر بێنن؟ فەرمووی: ئەی خەلیفە، کە واتە حەق بە دەست تۆ نیە، ستتە زوبەیدە ڕاست دەکا، تۆ حەقی دو ژنت نیە، چونکە ناتوانی لە بەینیاندا دادگەر بی.

هارونە ڕەشید قەزاوەتەکەی زۆر پێ خۆش بوو، ئەمری کرد هەزار دیرهەمیان دا، بە «سەفیانی سەوری» بەڵام پارەکەی وەر نەگرت.

دەفعەیەک «سەفیانی سەوری» نانی دەخوارد، سەگێکی لە بەردەمدا کەوتبوو جارجار پاروە نانێکی بۆ دەهاویشت، عەرزیان کرد قوربان زۆرمان لا سەیرە جەنابت قەت لە گەڵ منداڵەکانت نان ناخۆی، کە چی ئەو سەگە لە بەر دەمتایە نان دەخۆی و دەری ناکەی. فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن ئەو سەگە چەند بە وەفایە،

پاروەنانێکی بۆ داوێم تا بەیانی پاسەوانی ماڵەکەمان دەکا و هیچ زەرەریشی بۆمان نیە، بەڵام ماڵ و منداڵ و خێزانی ئەم زەمانە بە زۆری ئینسان لە خواپەرستی دوور دەخەنەوە، جا هەر لە بەر ئەوەیە کە خواوەندی گەورە ماڵ و منداڵی بە فیتنە ناو بردووە و فەرموویەتی: ئاگاتان لە خۆتان بێ ماڵ و منداڵ لە دین لاتان نەدەن. ئەو زەمانە «سەفیانی سەوری» وای فەرمووە: دەبێ ئەولادی ئێستا چۆن بن؟ پەنا بە خوا! کاتی خۆی ئامۆژگارییێکی زۆر بە نرخی لە نامەیەکدا بۆ عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی سەلیم ناوێک نووسیوە، کە لەو سەردەمدا، کار بە دەستێکی زۆر گەورە بوو، جا با گوێی بۆ بگرین و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین. [یا أَخِي لا تَغبِطْ أَهْلَ الشَّهَواتِ بِشَهَواتِهِمْ وَ لا ما يَنْقَلِبُونَ فِيهِ مِنَ النِّعْمَةِ فَإِنَّ أَمامَهُمْ يَوْماً تُزِلُّ فِيه الاقْدامُ، وَ تَرْعَدُ فِيهِ الاجْسامُ، وَ تَتَغَيَّرُ فِيهِ الالْوان، وَ يَطُوْلُ فِيهِ القِيامُ، وَ يَشْتَدُّ فِيهِ الحِسابُ، وَ تَتَطايَرَ فِيهِ القُلُوبُ حَتّىٰ تَبْلُغَ الحَناجِرَ]

ئەوە چەند دێرێکی زۆر بە سوودن لە نامە درێژەکەیدا، ئامۆژگاری دەکا و دەڵێ: ئەی برای دینی، قەت ئارەزووی ڕابواردنی ئەو کەسانە مەکە، کە ناز و نیعمەتیان زۆرە و شەهوەت پەرستن، وا مەزانە، کە تا سەر ئاوای دەخۆن، لات ڕوون و ئاشکرا بێ، کە تووشی ڕۆژێک دەبن. کوڕم دەوێ خۆی تێدا ڕاگرێ.

زۆر کەسی تێدا هەڵدە خلیسکێ، زۆر کەس دەخاتە لەرزە، زۆر کەس لە ترسان ڕادەچڵەکێنێ، زۆر کەس ڕەنگی ڕووانی دەچێ، لەو ڕۆژەدا، خەڵک لەو ڕۆژەدا زۆر ڕادەوستن، چاوەڕوانی فەرمانی خوای گەورە دەکەن، موحاسبەی ئەو ڕۆژە زۆر بەشیدەتە، دڵ لە جێگای خۆی قەرار ناگرێ و ڕۆح دەگاتە سەر قورگی ئینسان، هەر ئەوە تا نایەتە دەرێ. [يا أخي فَيا لَها مِنْ نَدامَةٍ عَلىٰ ما أَصابُوا مِنْ هٰذِهِ الشَّهَواتِ] فەرمووی: ئەی برای دینی، تۆ نازانی چەند پەشیمان دەبنەوە لەو شەهوەت پەرستیە.

[يا أَخِي اِجْعَل كَسْبَكَ فِيْما يَكُونُ لَكَ، وَ لا تَجْعَلْ كَسْبَكَ فِيْما يَكُونُ عَلَيْكَ، فَإِنَّ

اَلَّذِي يُقَدِّمُ مٰالَهُ وَ يُعْطِي حَقَّ اللهِ مِنْهُ فَمٰالُه لَهُ وَ أَفْضَلُ مِنْهُ، وَ اَلَّذِي يُخَلِّفُ مٰالَهُ يَضِيعُ حَقَّ اللهِ فِيهِ فَمٰالُهُ وَبٰالٌ عَلَيهِ يَوْمَ اَلقِيٰامَةِ ]

فەرمووی: ئەی برای موسوڵمان وەسیەت بێ لێت، تا ماوی لە دنیادا، کاسبیەک بکە، کە سوودی بۆ خۆت و خەڵک بێ، کاسبیەک مەکە، کە ئاخری ببێتە تەوق و بچێتە گەردنت، ئەو کەسانەی زەخیرەی دوا ڕۆژیـان لە پـێش خـۆیاندا بـە ڕێ دەکەن و حەقی خوا، لە ماڵەکەیاندا ناهێڵنەوە، ئەوە لە قیامەتا دەستی دەکەوێتەوە و فریای دەکەوێ و خوای گەورە زیاتریشی ئەداتەوە، بەڵام ئەوانەی ماڵی زۆریان لە پاش بەجێ دەمێنێ و حەقی خوای لێ نادەن و چاکەی بە سەرەوە ناکەن، ئەوە ئەو ماڵ و سەروەتیان دەبێتە تەوقی غەزەب لە ڕۆژی قیامەتا.

[وَ اِيّٰاکَ أَنْ، تَزْدٰادَ بِحِلْمِه عَنْکَ جُرئَةً عَلىٰ اَلمَعْصِيَّةِ فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَرْضَ لأنـبِيٰائِهِ اَلمَعْصِيَّةَ وَ الحَرٰامَ وَ الظُّلْمَ، فَقٰالَ: ] ﴿يٰا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبٰاتِ وَاعْمَلُوا صٰالِحاً اِنِّي بِمٰا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾

دەفەرمووێ: دەخیلە بە هۆی حیلمی خواوە لە خۆت بایی نەبی، لات وانـە نەبێ ئەگەر گوناحیش بکەی، خوا کاری بە سەرتەوە نیە خوای گەورە تەنانەت ڕازی نەبووە، کە پێغەمبەرە کانیش گوناح بکەن و حەرام بخۆن و زوڵم بکەن، جا چۆن ڕێگای تۆ ئەدا!

فەرموی: ئەوەتا خواوەندی گەورە لە سوورەی المـؤمنون دا، دەفـەرمووێ، ئەی کۆمەڵی پێغەمبەران، ماڵی حەڵاڵ بخۆن و کاری چـاک بکـەن، چـونکە بـە ڕاستی خوا ئاگای لە کردەوەتان هەیە.

[يٰا أَخِي لاٰ تَتَهٰاوَنْ بِالذَّنْبِ اَلصَّغِيرِ وَانْظُرْ مَنْ عَصَيْتَهُ؟ عَصَيْتَ رَبّاً عَظِيماً يُعٰاقِبُ عَلىٰ الصَّغِيرِ وَ يَتَجٰاوَزُ عَنِ الكَبِيرِ ]

ئەی برای دینی وەسیەت بێ، قەت گوناحی بچوک بە کەم مەگرە و گاڵتەی پێ مەکە، تۆ بڕوانە و بزانە بێ ئەمری کێت کردووە؟ بێ ئەمری خوایەکی زۆر خاوەن

دەسەڵاتت کردووە، دەتوانێ لە سەر گوناحی بچوکیش عەزابت بداو لە گوناحی گەورەش خۆش بێ.

[يٰا أَخِي كُنْ حَذَرَاً عَلىٰ مٰا زَلَّ مِنْکَ وَ مَضىٰ، لاٰ تَدْرِي مٰاذٰا يَفْعَلَ بِکَ رَبُّکَ فِيهِ، وَ مٰا بَقِىَ مِنْ عُمْرِکَ لاٰ تَدْرِي مٰاذا يُحْدِثَ لَکَ فِيهٰا]

ئەی برای موسوڵمان بترسە لەو کردەوانەی تا ئێستا کردووتن و ڕابواردن، چونکە نازانی خوای گەورە چیت لە گەڵ دەکا، لە سەر ئەو کردەوانەت، هەروەها لە عومری داهاتووشت بترسە و ئاگات لە خۆت بێ، خوا دەزانێ چۆن دەڕواو چیت بە سەر دێ.

فەرمووی: پێغەمبەرێکی وەک حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل (عَلىٰ نَبِيِّنٰا وَ عَلَيْهِ السَّلاٰمُ) بەو هەموو گەورەیی خۆیەوە، لە خۆی دەترسا و لە بەر خوا دەپاڕایەوە، وەک خوای گەورە لە سورەی ئیبراهیمدا دەفەرمووێ: ئیبراهیم دۆعای کرد و وتی: ﴿وَاجْنُبْنِي وَ بَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الأَصْنٰامَ﴾ ئەی خوای گەورە، خۆم و ئەولادەکانم لە کوفروو بت پەرستی بپارێزە. لە سورەی یوسف دا دەفەرمووێ: حەزرەتی یوسف لە بەر خواپارایەوە و گوتی: ﴿تَوَفَّنِي مُسْلِمَاً وَالْحِقْنِي بِالصّٰالِحِينَ﴾ ئەی خوای گەورە بە ئیمانەوە بمرم و لە پیاو چاکانم حیساب کە. لە سورەی قەسەس دا دەفەرمووێ: حەزرەتی مووسا دۆعای کرد و گوتی: ﴿رَبِّ بِمٰا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيراً لِلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەی خوای گەورە بە هۆی ئەو ناز و نیعمەتەوە، کە داوتە بە من، ئاگات لێم بێ، تووشی ئەوە نەبم یارمەتی پیاو خراپان بدەم. فەرمووی: ئەوانە پێغەمبەر بوون، لای خوا خۆشەویست بوون، بێ ئەمری خوایان نەدەکرد، لە گەڵ ئەوەشدا، ئاوا لە خۆیان دەترسان و لە بەر خوا دەپاڕانەوە! جا، دەبێ ئێمە هەر یەکە بە کۆڵێ گوناحەوە چۆن لە بەر خوا نەپارێینەوە؟

فەرمووی: [اَلْبِدْعَةُ أَحَبُّ إِلىٰ إِبْلِيسَ مِنَ المَعْصِيَةِ، اَلْمَعْصِيَةُ يُتٰابُ مِنْهٰا، وَالبِدْعَةُ لاٰ يُتٰابُ عَنْهٰا]

ئاگاتان لە خۆتا بێ، بە ناوی دینەوە شتێک نەکەن لە دین نەبێ و بیدعەت، بێ، چونکە شەیتان زۆری پێ خۆشە موسوڵمان شتی بیدعەت بکا و گوناح نەکا، لە بەر ئەوەی گوناح تۆبەی لێ دەکرێ، بەڵام ئەوی بیدعەت دەکا، بیدعەتەکە، بە دین دەزانێ، تۆبەی لێ ناکا.

«سەفیانی سەوری»، لە ڕۆژی سی مانگی شەعبانی ساڵی سەت و شەست و یەکی کۆچیدا، لە شاری بەسرا، لە عومری شەست و سێ ساڵیدا وەفاتی فەرموو. ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و فرمایشتە بە نرخە کانی شێخ «سەفیانی سەوری»، خوایە بۆ خاتری پێغەمبەرو «سەفیانی سەوری» عەفوومان کەی. تاعەت و عیبادەتمان قبوڵ کەی. لە بەڵا و موسیبەت بمان پارێزی. ئامین.

وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (١١)
# شەقیقی بەڵخی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾
[اَلْحَمْدُ للهِ حَقَّ حَمْدِهِ، وَالصَّلاٰةُ وَالسَّلاٰمُ عَلىٰ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِـهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ اِلىٰ يَوْمِ لِقٰائِهِ]

خاوەن مەجلیسی ئیمڕۆمان، دووبارە یەکێکە لە پیاو چاکان و ئەولیای خوا، کە لە زەمانی خوێدا مەلەوانی بەحری شەریعەت بوو، پەیکی سەحرای تـەریقەت بوو، سەرقافڵەی زاهیدان بوو، پێشەنگی عابیدان بوو، مامۆستای حاتەمی ئەسەم بوو، خەلیفەی ئیبراهیمی ئەدهەم بوو، ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە، «شـێخ شـەقیقی بەڵخی‌یە»، جا با بە ئەدەب لە خزمەتیدا دانیشین و گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«شێخ شەقیقی بەڵخی» یەکێک بووە، لە پیاو چاکە قەدیمەکان و خاوەن عیلم و عیرفان و زوهد و تاعەت و کەشف و کەرامات بووە، لە هەموو زانیارێکی ئەو سەر دەمەدا دەستێکی باڵای بووە، بە خزمەت ئیمام مووسای کازم گەیشتووە، لە سەر مەزهەبی ئیمام حەنەفی بووە، لە ئەوەڵەوە بازرگانی کردووە، لە پاشان کـە گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا خەرقە و ئیجازەی لە ئیبراهیمی ئەدهەم وەرگرتووە.

ڕاوی دەڵێ: هۆی گەڕانەوەی «شێخ شەقیقی بەڵخی»، بۆ لای خوا، ئـەم چـەند خاڵانەی دواوە بوون:

یەکەم، دەفـەرمووێ: دوای ئـەوەی خـوێندنم تـەواو کـرد، دەسـتم کـرد بـە

کەسابەت، جارێک لە بەڵخ و بوخاراوە بۆ بازرگانی چووم بۆ تورکستان، ڕۆژێک چوومە عیبادەت گایە کیان، تەماشام کرد عالمەکەیان لەوێ بوو، لە بەر بتێک دەپاڕایەوەو دەگریا، چووم بە لایەوە زۆرم لا سەیر بوو، گوتم: ئەوەی تۆ دەیپەرستی بە تاڵە، ئەو بتە، شتێکی بێ گیانە و ناتوانێ نە سوودت پێ بگەیێنێ و نەزەرەت لێ بدا، بۆ لەبەر ئەو خوایە ناپاڕێیتەوە، کە هەمیشە زیندووەو زانا و قادرە بە سەر هەموو شتێکدا، وەرە ئەو بپەرستە و شەرم لە خوا بکە، شەریکی بۆ قەرار مەدە.

دەفەرمووێ: کابرای زانا تۆزێ داما و لە پاشان گوتی: ئەگەر وەک تۆ دەڵێی، ڕاست بێ، ئەی بۆ تۆ لە ولاتی بەڵخ و بوخاراوە گەیشتویە ئێرە؟ ووتی: بەڵام وا دیارە تۆ قەول و فیعلت وەک یەک نیە، چونکە ئەگەر باوەڕت بە قسەی خۆت بوایە، نەدەهاتی بۆ ئێرە، چونکە ئەو خوایەی، کە ڕازقە، دەیتوانی لەوێ ڕزقت بدا و وە دوای نەکەوی، فەرمووی: قسەی ئەو عالمە وشیاری کردمەوە، بەڵام، لە دڵی خۆمدا ووتم: وا نیە: پێغەمبەری خۆشەویستمان (درووودی خوای لەسەر بێ)، لە حەدیسێکدا فەرموویەتی: [اَلْجَالِبُ مَرْزُوقٌ] ئەوەی بچێ لە ولاتان شت بکڕێ و بیهێنێتەوە بۆ ولاتی خۆی و بە نرخێکی مام ناوەندی بە خەڵکی بفرۆشێ، خوا ڕزقی زیاد دەکا، گوێم نەدایە، خریدی خۆم کرد و گەڕامەوە. لە ڕێگەدا، لە گەڵ گاورێک بوومە ڕەفیق، گاورەکە گوتی: خەریکی چی؟ ووتم: بازرگانی دەکەم، گوتی: ئەی «شەقیقی بەڵخی»، لە سەهوداى، چونکە ئەگەر دوای ئەو ڕزقە کەوتووی، کە بۆی داناوی، ئەوە نەشچی هەر پێت دەگا، ئەگەر بەدوای ڕزقێ کیشدا دەگەڕێی، کە بۆی دیاری نەکردووی، ئەوە عومر بە زایع دانە، قەت تووشی نابی. دەفەرمووێ: لە دڵێ خۆمدا گوتم: بە ڕاستی قسەکەی زۆر جوانە و زۆر بە سوودە، پێغەمبەری خۆشەویست فەرموویەتی: [اَلْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَاطْلُبْهَا وَ لَوْ كَانَ عِنْدَ الْكَافِرِ]

زانیاری وەک شتێک وایە، کە لە ئینسانی موسولمان وون ببێ، لای هەر کەسێک دۆزیتەوە، هەڵی گرەوە با لای کافرێکیش بێ.

بەڵام دووبارە گوتم: نەخەیر وانیە، حەزرەت لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: [أَفْضَلُ المَکَاسِبِ التِّجَارَةُ] گەورەترین کار و کاسبی تیجارەت و بازرگانیە، ئەگەر خراپ بوایە پێغەمبەر وای نە دەفەرموو: گوێم نەدایە و هاتمەوە بۆ بەڵخ.

دەفەرمووێ: هەر چەند قسەی ئەو دوو پیاوە زۆریان وریاکردمەوە، بەڵام هەر لە سەر ئەو وەزعە مامەوە، تا ساڵێک گرانیەک کەوتە بەڵخ و بوخاراوە، وای لێ هات زەلام، زەلامی دەخوارد.

لەو گرانیەدا، ڕۆژێک لە بازار تووشی غوڵامێک بووم، زۆر کەیف خۆش بوو، هەر پێدەکەنی، دەفەرمووێ، منیش زۆرم بەلاوە سەیر بوو، لە لایەک پیاو پیاوی بخوا و ئەمیش ئاوا کەیف خۆش بێ و پێ بکەنێ! چووم بە لایەوە ووتم: ئەرێ کابرا ئێستا کەی وەختی شادی و پێکەنینە؟ تۆ نابینی خەڵک لە چ ژیانێک دایە؟ گوتی: جا من چ باکم هەیە، من غوڵام و پیاوی فلان خاوەن دێیەم، ئەوەندەی گەنم هەیە، قەت ناهێڵێ برسیمان بێ «شێخ شەقیقی بەڵخی» دەفەرمووێ: کە ئەو قسەم لە غوڵامەکە بیست، بێ هۆش کەوتم: کاتێک بە هۆش هاتمەوە، سەرم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، گوتم: ئەی خوای گەورە، ئەو غوڵامە بە ئاغاکەی خۆی دەنازێ، کە خاوەنی دێیەک و چەند تەغار گەنمە، خۆ من خۆم بە عەبدی تۆ دەزانم و تۆش [مَالِکُ المُلْک]ی و ڕۆزی دەهندەی ئێمەی، کە واتە بۆ دەبێ خەفەت بۆ ژیانی کاتی دنیا بخوێن. دەفەرمووێ: قسەی ئەو غوڵامە بە تەواوی کاری تێ کردم و بوو بە، هۆی تۆبە کردن و گەڕانەوەی یەک جاریم، بۆ بازاری خوا پەرستی.

دەڵێن تا وەفاتی فەرموو، هەر دەی فەرموو: من شاگرد و قوتابی ئەو غوڵامەم.

«شێخ شەقیقی بەڵخی» زاتێکی زۆر موبارەک و واعیزێکی زۆر گەورە بووە، فەرمایشتەکانی دەبێ وەک ئاڵقە لە گوێ بگرین.

ڕۆژێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: کوڕینە، من زۆرم خوێندو موتالای کتێبانم زۆر کرد، کاسبیم زۆر کرد و دنیا زۆر گەڕام، چاوم بە زۆر کەس کەوت و بە خزمەت زۆر زانا و پیاو چاک گەیشتم، لە ئاخریدا بۆم دەرکەوت، کە ڕەزای خوا، لە چوار شت دایە و ئەوەی ئەو چوار سیفەتەی تێدا نەبێ، لە وانەیە، خوای گەورە، لەو کەسە ڕازی نەبێ.

یەکەم، ئەوەیە، دەبێ لە ڕزق و ڕۆزی ئەمین بی، لات وابێ، کە تا ماوی خوای گەورە بێ ڕزقت ناکا دووەم، دەبێ هەر کار و فەرمان و چاکە و کردەوە یەک کە دەیکەی، لە دەرەجەی یەکەمدا، بۆ ڕەزای خوای بکەی سێیەم، دەبێ بزانی کە شەیتان دۆستت نیە و دوژمنتە و بە قسەی نەکەی. چوارەم، دەبێ تا نۆبەت نەگەیوەتە سەر و مردن نەبووە بە میوانت خۆت بۆ سەفەری دوور و درێژی مردن ئامادە بکەی.

شێخ حاتەمی ئەسەم، (ڕەزای خوای لێ بێ)، کە فەقێ و شاگردی «شێخ شەقیقی بەڵخی» بوو، دەفەرمووێ: جارێک مامۆستام «شێخ شەقیق» فەرمووی: دنیا و قیامەت زۆر لێک دوورن، دەبێ ئینسان ئاگای لە خۆی بێ، هەر وەک بۆ دنیا هەوڵ ئەدا، بۆ قیامەت زیاتر هەوڵ بدا، فەرمووی: بیست ساڵ خەریکی قورئان بووم تا توانیم دنیا و قیامەت لێک جیا بکەمەوە، بە هۆی ئەو ئایەتە پیرۆزەوە، کە خواوەندی گەورە، لە سورەی قەسەس‌دا ئایەتی «٦٠» فەرموویەتی: **﴿وَ مٰا أُوتِيتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَمَتَاعُ الحَيَاةِ الدُّنْيٰا وَ زِينَتُهٰا، وَ مٰا عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ وَ أَبْقىٰ أَفَلاٰ تَعْقِلُونْ﴾** هەر ناز و نیعمەتێک، لە دنیادا، هەتانە و شانازی پێوە دەکەن، ئەوە تا ماون لە دنیا سوودی لێ دەبینن و کە مردن دەبڕێتەوە، بەڵام سەواب و پاداشتی تاعەت و عیبادەت و کردەوەی چاکەو پیاوەتی، کە لای خواوەندی گەورەیە، لە ماڵی دنیا چاکترە و

قەت نابڕێتەوە، دەی، ئەی بەرەی ئادەمیزاد، بۆ بیر ناکەنەوە و عەقڵ پەیدا ناکەن؟ بۆ قیامەت بە دنیا دەفرۆشن؟ ڕووی کردە خەڵک و سوور هەڵگەڕاو تووڕە بوو، بە تووڕەییەوە فەرمووی: خەڵکینە، ئێوە زۆر سەیرن! من نازانم ئێوە چین؟

ئەگەر مردون بۆ ڕزقی زیندووان دەخۆن؟ فەرموو: ئەوە گۆڕستان، ئەگەر منداڵن نافامن؟ فەرموو: ئەوە مەکتەب و قوتابخانە، بڕۆن شت فێر بن، ئەگەر شێتن، فەرموون: ئەوە شێت خانە، ئەگەر کافرن، چی دەکەن لە وڵاتی ئیسلامدا؟ ئەگەر موسوڵمانن، دەفەرموون: خوا پەرستی بکەن، فەرمووی: بەڵام وادیارە زۆربەتان، هەر بە ناو موسوڵمانن، خوا پەرست نین، مەخلوق پەرستن، جا بە ڕاستی کوڕینە ئەو فەرمایشتەی «شێخ شەقیقی بەڵخی» لە زۆربەی خەڵکی ئێستا دا دێتە دی.

بە داخەوە زۆر کەس هەر بە تەسکەرە و بە ناو موسوڵمانە، کردەوەی لە گەڵ نیە.

«شێخ شەقیقی بەڵخی»، لە حەق گوتندا شەرمی لە کەس نەکردووە، جارێک لە سەفەری حەجدا، ڕێگای دەکەوێتە بەغدا، هارونە ڕەشید خەبەری هاتنی دەزانێ، دەنێرێ بە دوای دا و دەچێ بۆلای. هارونە ڕەشید بە خێر هاتنی دەکا و دەڵێ: جەنابت «شێخ شەقیقی بەڵخی» زاهیدی؟ دەفەرمووێ: بەڵێ: ناوم«شەقیقە»، بەڵام شێخ و زاهید نیم، هارونە ڕەشید کە قسەی لە گەڵ دەکا، دەزانێ زاتێکی زۆر پیرۆزە و زانایێکی زۆر حەق گۆیە، دەڵێ: دەبێ ئامۆژگاریم بکەی. «شێخ شەقیق» دەفەرمووێ: ئەی هارونە ڕەشید، دەزانی خواوەندی گەورە، تۆی کردووە بە خەلیفەی ئیسلام، لە جێگای حەزرەتی ئەبوبەکری سدیق دای، ناوی، مەعنای وایە خوا ڕاستی لە تۆ دەوێ، تۆ لە شوێنی حەزرەتی عومەری، عەداڵەتی لە تۆ دەوێ، تۆ لە جێگای حەزرەتی عوسمانی شەرم و حەیای لە تۆ دەوێ، تۆ جێ‌نشینی حەزرەتی عەلیت، دەبێ ئازا و ڕەشید بی.

فەرمووی: بزانە خواوەندی گەورە ماڵێکی دروست کردووە، ناوی ناوە، دۆزخ و تۆی کردووە بە دەرگەوانی، خواوەندی گەورە، ماڵی دنیا و شیر و کوتەک و دەسەڵاتی داوە بە تۆ، لە تۆی دەوێ، کە خەڵک لە ئاگری جەهەننەم دوور خەیتەوە و بە ماڵی دنیا خەڵک دڵخۆش بکەی، ئەگەر بێ ئەمری خوایان کرد، تەنبێیان بکەی، ئەگەر بە ناحەق یەکێکیان کوشت، بیان کوژیەوە، فەرمووی بەڵام ئەی هارونە ڕەشید، ئاگادار بە، ئەگەر ئەوانە نەکەی، ئەوە تۆ پێش ڕەوی دۆزەخیان دەبی، فەرمووی: ئەی خەلیفە، تۆ وەک سەرچاوەیت و کار بە دەست، وەک جۆگەلە وان، ئەگەر سەرچاوە لێڵ نەبێ، ئەوە ئاوی جۆگە، هەر ڕوون و جوانە، بەڵام ئەگەر سەرچاوە لێڵ بوو، ئەو ئاوی جۆگە، بە لێڵی ناوەستێتەوە، قوڕاویش دەبێ.

جا گوێ گرینە بە ڕاستی وایە، هەمیشە بچوک چاو لە گەورە دەکا، ئەگەر ئامیری وەخت باش بوو، ئەوە بە زۆری کار بە دەست باش دەبن، ئەگەر مامۆستا بە ئەدەب و موحتەرەم بوو، قووتابی بە ئەدەب دەبێ، ئەگەر گەورەی ماڵ باش بوو، خێزانی ئەو ماڵە زۆر باش دەبن، هارونە ڕەشید قسەو ئامۆژگاریەکەی «شێخ شەقیقی» زۆر پێ خۆش بوو، زۆر بە حورمەتەوە لە بەغدا بە ڕێی کرد، چوون بۆ مەککە و حەجیان کرد، ڕۆژێک لە ماڵی بەیت، تووشی ئوستادی تەریقەتی بوو، کە ئیبراهیمی ئەدهەم بوو، بە یەکتر شاد بوونەوەو دەستیان کرد بە قسە کردن، لە بەینی گفتووگۆدا «شێخ شەقیق» گوتی: قوربان وەسیلەی ژیانت لێرە چۆنە؟ ئیبراهیمی ئەدهەم فەرمووی: ئەگەر خواوەندی گەورە ڕزقێکی نارد، ئەوە شوکرانەی خوا دەکەین و ئەگەر نەشی نارد، خۆمان ڕادەگرین و سەبر دەکەین، «شێخ شەقیق» گوتی: قوربان جا خۆ بێ ئەدەبی نەبێ لە خزمەتدا، سەگەکانی بەلْخ و بوخاراش ئاوان، ئەگەر پاروەنانێکیان بۆ بهاوی، ئەوە کلکە سوتەت بۆ دەکەن و ئەگەر هیچیشیان بۆ نەهاوی، دەنگ ناکەن. ئیبراهیمی ئەدهەم، قسەکەی زۆر پێ

خۆش بوو، فەرمووی: ئەی تۆ چۆنی؟ فەرمووی: ئەگەر خوا ڕزقێکی نارد، دەی‌دەم بە، لە خۆم موستەحەقتر و ئەگەر نەش بوو شوکرانەی خوا دەکەم، ئیبراهیمی ئەدهەم، هەر هەستا و ناوچاوانی «شێخ شەقیقی» ماچ کرد و فەرمووی: [أَنْتَ الأُسْتٰادُ وَاللهِ] قەسەم بە خوا ئێستا تۆ ئوستادی منی.

«شێخ شەقیق» ڕۆژێک، لە مەجلیسێکی گەورەدا ئامۆژگاری دەکرد، فەرمووی: خەڵکینە شەوێک لە خەودا پێیان گوتم: ئەی «شەقیق» بە خەڵک ڕابگەیێنە، کە هەر کەسێک لای وابێ، کە خواوەندی گەورە ڕازقە و ڕۆزی دەریەتی، ئەوە، ئەوکەسە لە دنیادا، هەمیشە ڕووی خۆش دەبێ و دڵی فراوان دەبێ و سەخاوەتی زۆر دەبێ و لە وەسوەسەی شەیتان دوور دەکەوێتەوە، ڕووی کردە کۆمەڵێک لە دانیشتوانی مەجلیسەکەو فەرمووی: [أَرَأَيْتُمْ اَنْ أَمٰاتَكُمُ اللهُ اليَوْمَ و يُطٰالِبُكُمْ بِصَلاٰةِ غَدٍ؟ قٰالُوا: لاٰ يَوْمَ لاٰ نَعيشُ فِيهِ كَيْفَ يُطٰالِبُنٰا بِصَلاٰتِهِ؟] خەڵکینە، ئەگەر وا فەرز کەین ئەم ڕۆ خوا بتان مرێنێ، داوای نوێژی سبەینێ‌تان لێ دەکا؟ لە قیامەتا پێتان دەڵێ: بۆ ڕۆژێ دوای مردن نوێژتان نەکرد؟ گوتیان نەخەیر، جا چۆن ڕۆژێک تێیدا نەژیابین داوای نوێژی ئەو ڕۆژمان لێ دەکا! شێخ فەرمووی: [فَكَمٰا لاٰ يَطٰالِبُكُمْ بِصَلاٰةِ غَدٍ فَأَنْتُمْ لاٰ تَطْلُبوا مِنْهُ رِزْقَ غَدٍ، عَسىٰ أَنْ لاٰ تَصِيرُونَ اِلىٰ غَدٍ] ئنجا کە وایە، هەر وەکو خواوەندی گەورە، داوای نوێژی بەیانی ئمیرۆ ناکا، ئێوەش ئیمرۆ داوای ڕزقی بەیانی لە خوا مەکەن، چوزانن، دەگەنە بەیانی و تا بەیانی کێ دەمرێ و کێ دەژی.

فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی دەست کورت و فەقیرن، دڵتان بۆ خۆتان نەمێنێ، فەقیری سێ شتی زۆر خۆشە، یەکەم، ئینسانی فەقیر بە زۆری دڵی فاریغە، هەرچی بی بخوا، بە دڵیەوە دەنووسێ. دووەم، لە حیسابی ڕۆژی قیامەت بە قەت دەوڵەمەند ناترسێ. سێیەم، نەفسی ڕەحەتەو باری گران نیە، بەڵام دەوڵەمەند هەمیشە ماندووە دڵی لە عەزاب دایە، حیسابی دوا ڕۆژی زۆر سەخت

و گرانە، بە تایبەتی ڕووی موبارەکی کردە یەکێک و فەرمووی:

[أِصْحَبِ النَّاسَ كَمَا تَصْحَبُ النَّارَ، خُذْ مَنْفَعَتَهَا وَاْحْذَرْ أَنْ تُحْرِقَكَ] مـن نـاڵێم هات و چۆی خەڵک مەکە، ڕەفاقەتی خەڵک بکە و کارت بە خەڵک بێ، هەر وەک چۆن کارت بە ئاگرە، سوودیان لێ وەرگرە و خۆت لە زەرەریان بپارێزە، هـەر وەک چۆن سوود لە ئاگر وەردەگری و خۆت دەپارێزی لە وەی بت سووتێنی.

فەرمووی: دەبێ، بە دایمی ئینسانی موسوڵمان، بیر لە کـردەوەی ڕابـردووی بکاتەوە و لە خوا بترسێ، داخۆ چی لێ وەرگرتووە و لە داهاتووش بترسێ، داخۆ تووشی چی دەبێ و چۆن دەگوزەرێ.

فەرمووی بە هیلاک چوونی خەڵک، بە زۆری، لەوەدایە گوناح دەکـەن، بـە ئومێدی تۆبە و تۆبەش ناکەن، دەڵێن: جارێ لە کوێمانە؟ هێشتا هەر گەنجین!

فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە تۆبە لە گوناح بکەن و بترسن لەو ڕۆژەی کە پێتان بڵێن: ﴿اِقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾ نامەی عەمەلت وە خوێنەو خۆت و حیسابی کردەوەی خۆت بکە، جا چەند نـاخۆشە، پـیاو نـامەیەک وە خوێنی ئیعدامی خۆی تێدابێ.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهاتی «شێخ شەقیقی بەڵخی»، کـە لە ساڵی سەت و نەوەت و چواری کۆچیدا، لە وڵاتی «خەتلان» شەهید کرا.

جا با بەو دۆعایەی «شێخ شەقیق» لە بەر خوا وە پاڕێین، کە دەیفەرموو: [اَللّٰهُمَّ اعْطِنَا الأِيمَانَ، وَ عَافِنَا مِنَ الْبَلاٰيَا، وَاسْتُرْ عُيُوبَنَا، وَاجْعَلْ نِعَمَكَ مُتَوَالِيَةً عَلَيْنَا يـا رَبَّ الْعَالَمِينْ] ئامین.

وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (١٢)
# حاتەمی ئەسەم

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

﴿اَلْحَمْدُ للهِ اَلعَلِيمِ الأَعْلَمِ وَ صَلیٰ اَللهُ عَلیٰ شافِعِنٰا وَ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ الأَعْظَمِ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، اَلمُكَرَّمِ، وَ عَلیٰ أَوْلِيٰائِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ خُصُوصاً عَلیٰ وَلیِّ اللهِ اَلحٰاتَمِ الأَصَمّ﴾

حەمد و سەنا بۆ خوای گەورە، کە موڵەتی داوین درێژە بە ژیانمان بدەین، جا، با لە چەند دەقیقەی داهاتوودا، بچینە سەر خەرمانی پڕ پیت و بەرەکەتی ئەستێرەیێکی گەشی تری خوا پەرستی، پیرێکی دانا لە نوکتەزانیدا، مەلایەکی زانا لە ئامۆژگاری‌دا، عالم بە عیلم و شەریعەت، ئاگاداری ڕێگای تەریقەت، گوێی لە عاستی غەیبەت و خراپەدا، کەڕ بوو، بەڵام لە ڕاستی و ڕاستگۆییدا حاتەم بوو، شاگردی شێخ شەقیقی بەڵخی بوو، دڵی وەک ئاوێنە دوور لە تەڵخی بوو، ئەو زاتە بەرز و پیرۆز و موکەڕڕەمە جەنابی «حاتەمی ئەسەم»ە.

ئنجا با زۆر بە ئەدەب دانیشین و گۆی بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەر هات و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«حاتەمی ئەسەم» غەیری ئەو حاتەمەیە، کە لە ناو خەڵکدا، بە سەخی بە ناو بانگە، بەڵکو «حاتەمی ئەسەم»، زانایەکی زۆر بەرزو پیاو چاکێکی زۆر گەورە بووە، دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کردووە، خەرقەی تەریقەتی لە شێخ شەقیقی بەڵخی وەرگرتووە، لە سەر مەزهەبی ئیمامی حەنەفی بووە، ئەوەندە ڕاست گۆ

بـووە، شـێخ جـونەیدی بـەغدادی (ڕەزای خـوای لێ بـێ) لە تـەعریفی دا فەرموویەتی:

«حاتەمی ئەسەم» سدیقی زەمانی ئێمەیە، واتـە حـەزرەتی ئـەبوبەکـر لە نـاو ئەسحابدا چۆن بە ڕاستگۆ بەناو بانگ بوو، «حاتەمی ئەسەم»یش، لە ناو ئێمەدا ئاوایە.

«حاتەمی ئەسەم» لای خواوەندی گەورە، زۆر خۆشەویست بووە، جا لە بەر ئەوەی هەر دۆعایەکی بکردایە بە ئەمری خوا زوو گیرا دەبوو.

دەڵێن: دەفعەیەک، لە پاش ئامۆژگاری و مـەوعیزە فـەرمووی: ئـەی خـوای گەورە، داوا دەکەم، کە هەر کەسێک لەم مەجلیسەدا، لە هەموانمان گوناح بارترە عەفووی کەی، ڕاوی دەڵێ: ئەو ساڵە ساڵی گرانی بوو، خەڵک زۆر فەقیر و دەست کورت بوو، کابرایەک، لە بەر دەست تەنگی، بە شەوفێر ببوو، دەچـوو قـەبری تازەی هەڵدەکەندەوە و کفنی مردووەکەی لێ دەکردەوە، ئەو پیاوە لەو کاتەدا، لە مەجلیسی ئامۆژگاریەکەدا بوو، ئاگای لە دۆعاکەی شێخ بـوو، بـەڵام کـە شـەو داهات، خۆی بۆ ڕانەگیرا و ڕۆیی بۆ گۆڕستان، زانیبوی کە ئەو ڕۆژە کـوڕێک مردووە، چوو گۆڕەکەی هەڵداتەوەو کفنەکەی لێ وەکا. کابرا نە لە خـوا، نـە لە خەڵک، نەدەترسا، خەریکی گۆڕ هەڵکەندن بوو، لە غەیبەوە گوێی لە دەنگێک بوو، بانگیان کرد، ئەی فلاّنی کوڕی فلاّن، ئاخر تۆ ئیمڕۆ لە مـەجلیسی «شـێخ حاتەمی ئەسەمدا» نەبوی؟ دۆعای بۆ کردی، خوا دۆعاکەی گیرا کرد و عەفووی کردی، ئەی بۆ دوبارە دەستت بە کفن دزی کردەوە؟ کابرا، کە ئەو دەنگەی بیست، کە تا ئەو کاتە لە کەس نەدەترسا، ترسێکی وای لێ نیشت، لە ترسا ئاگای لە خۆی نەما، فەوری گەڕایەوە بۆ ماڵ و تۆبەیێکی نەسوحی کردو بـوو بـە یـەکێک لە موریدەکانی «شێخ حاتەمی ئەسەم».

«شێخ حاتەم» بە هەموو جورێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، وە هەرچی دەی

کرد، خاڵی لە حیکمەت نەدەبوو.

جارێک موسوڵمانێک دەچێ دەعوەتی دەکاو دەڵێ: قوربان، دەبێ لە خزمەتتدابین. ئەویش دەفەرمووێ: بەڵێ باشە، بەڵام بە سێ شەرت دێم بۆ سەر دەعوەتەکات. یەکەم، هەر جێگایەک خۆم پێم خۆش بوو لە وێ دادەنیشم، دووەم، هەرچی خۆم بە دڵم بوو ئارەزوم لێ بوو ئەوە دەخۆم، سێیەم، دەبێ هەرچی پێم گوتی: بیکەی، کابرا گوتی: قوربان زۆر باشە، هەستان چوون بۆ ماڵی کابرا. شێخ لە لای خوارەوەی مەجلیسەکە دانیشت، دانیشتوانی مەجلیسەکە زۆریان پێ ناخۆش بوو، گوتیان یا شێخ بۆ خاتری خوا ئەو شوێنە جێگای جەنابت نیە، فەرمووی: لێم گەڕێن، بەو شەرتە هاتووم، کە هەر جێگایەک خۆم پێم خۆش بوو، لە وێ دانیشم، ئێرەم پێ خۆشە.

کاتێک سفرە ڕاخراو نان هات و خاوەن ماڵ گوتی: [بِسْمِ اللهِ] فەرموون: شێخ لە ناو فەقیانەکەیدا، دوو کولێرەی دەرهێنا و دەستی کرد بە خواردنیان، دوبارە عەرزیان کرد قوربان جا چۆن وا دەبێ؟ فەرمووی: دەنگ مەکەن بەو شەرتە هاتووم. نان خورا و سفرە هەڵگیرایەوەو. ئنجا ڕووی کردە خەڵکەکەو بە خاوە ماڵەکەی ووت، تاوەیەکم بۆ بێنە بەڵام با زۆر گەرم بێ، خاوەن ماڵ چوو تاوەیێکی زۆر گەرمی هێنا، شێخ هەستا پاژنە پێیێکی بە تاوەگەرمەکەدا ناو، فەرمووی: دو کولێرەم خواردووە، ئنجا ڕووی کردە خەڵکەکە، فەرمووی: خەڵکینە باوەڕتان بەوە هەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا، خواوەندی گەورە حیسابی ئەو ناز و نیعمەتەتانا، لە گەڵ دەکا؟ گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: دەوا فەرزکەن کە ئێرە مەیدانی مەحشەرە و یەک لە دوای یەک بە پێی پەتی، پێ لەو تاوەیە بنێن و هەرچی خواردووتانە حیسابی بکەن. گوتیان قوربان ناتوانین. فەرمووی: ئەی باشە، سبەینێ لە ڕۆژی قیامەتدا، چۆن دەتوانن وەڵامی ئەو ئایەتانە بدەنەوە، کە خواوەندی گەورە، لە سورەی تەکاسر دەفەرمووێ:

﴿ثُمَّ لَتُسْئَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتا پرسیاری ئەو ناز و نیعمەتەتان لێ دەکرێتەوە، کە ببوو بە هۆی دوور کەوتنەوەتان لە ئایین و خواپەرستی. خەڵکەکە دەستیان کرد بە گریان و دەستی شێخیان دووبارە ماچ کردەوە و ئامۆژگاریەکەیان زۆر پێ خۆش بوو.

فەرمووی: ئەی خەڵکینە دنیا وەفای بۆ کەس نەبووە و نایشی بێ، ئاگاتان لە خۆتان بێ، شەیتان بە سەهوو تان نەباو هەڵتان نە خەڵەتێنێ.

فەرمووی: شەیتان هەموو بەیانیەک دێتە لای من و دەڵێ: ئیمرۆ چی دەخۆی؟ لە وەڵامیدا دەڵێم: مەرگ دەخۆم، ئەڵێ: چی لە بەر دەکەی؟ کەواکەت دڕاوە! دەڵێم: کفن لە بەر دەکەم، ئەڵێ: ئەی لە کوێ، ڕا دەبوێری؟ دەڵێم: لە ناو گۆڕدا. گوێ گری خۆشەویست، ئەو فەرمایشتەی شێخ، خۆ مەعنای وانیە، کە شەیتان بە ئاشکرا چوتە لای، بەڵکو مەعنای وایە ئاگاتان لە خۆتان بێ، ئاوا دێتە لاتان و بەو خەیاڵانەوە مەشغوولتان دەکا.

فەرمووی: تا چاکە نەکەن، چاکەتان نایەتە ڕێ، چونکە تا، توو نەچێنی، درەو ناکەی، مەگەر تووکی سەرت، فەرمووی: تەماشا بکەن خواوەندی گەورە، لە هەوا ڕزق بۆ باڵندە دەنێرێ و لە ژێر خاکدا، کرم بێ ڕزق ناکا. فەرمووی: خوای گەورە لە سورەی منافقون‌دا فەرموویەتی:

﴿وَلِلّٰهِ خَزَائِنُ السَّمٰواتِ وَالأَرْضِ وَ لٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لاٰ يَفْقَهُونْ﴾ خەزنەی ئەرزو ئاسمان بە دەست خوایەو کەس لە ڕاستیدا، خاوەنی هیچ نیە، بەڵام ئەوانەی دوور لە ئیمان و باوەڕن و مونافیقن، نازانن.

سەیری ئەو ئامۆژگاری‌یە جوانەی بکەن. ڕۆژێک یەکێک دەچێتە خزمەتی و عەرزی دەکا دەڵێ: قوربان، دەڕۆم بۆ سەفەرێک، هاتوومە خزمەتت ئامۆژگاریەکم بکەی. ئەویش لە وەڵامیدا دەفەرمووێ: کاکە، ئەگەر یار و یاوەرت دەوێ، ئەوە خوات بەسە یار و یاوەرت بێ، ئەگەر هاوڕێت دەوێ: ئەو دوو

مەلائیکەی سەر شانت بەسن، ئەگەر دەت هەوێ شتێکت پێ بڵێم: پێی عیبرەت گرتوو بی، ئەوە دنیا بەسە بۆ پەند و عیبرەت لێ وەرگرتن، وە ئەگەر مەوعیزەت دەوێ، مردنی کەس و کاری ئینسان گەورەترین مەوعیزەیە، ئەگەر ئەوانەشت پێ باش نین، مردن و دۆزەخ بۆ تۆ، لە هەموو شتێک باشترە. فەرمووی: بەڵام ئاگادار بە، [إِذا أَرَدْتَ أَنْ تَعْصِيَ مَوْلاكَ، فَاعْصِهِ فِي مَوْضِعٍ لا يَراكَ] ئەگەر دەت هەوێ بێ ئەمری خوای خۆت بکەی، لە جێگایەک بێ ئەمری بکە. کە چاوی لێت نەبێ، جا کوێ هەیە کە خوای گەورە چاوی لێ نەبێ؟ چاوی قودرەتی لە هەموو جێگایەکەوە هەموو شتێک و هەموو کردەویەک دەبینێ.

ڕۆژێک لە گەڵ ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکەوێتە گفتووگۆ، گوتی: ئەی ئیمامی حەنبەل تۆ بۆ ڕزق هەوڵ ئەدەی؟ فەرمووی: بەڵێ «شێخ حاتەم» گوتی: باشە پرسیارت لێ دەکەم، لە پێش کاتی گەیشتنی ڕزق کەدا، هەوڵی بۆ ئەدەی، یان لە دواکاتی گەیاندنیدا؟ ئیمام ئەحمەد پرسیارەکەی زۆر پێ وورد و عاقلانە بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر بڵێم: لە پێش وەختی گەیشتنیدا هەوڵی بۆ ئەدەم، دەڵێ: باشە عومری خۆت بۆ بە فیڕۆ ئەدەی؟ ئەگەر دەڵێم: لە دواکاتی گەیشتنی هەوڵی بۆ ئەدەم، لە وەڵامدا ئەڵێ: باشە شتێک کە وەختی بەسەر چوویێ بۆ خۆتی پێوە ماندوو ئەکەی، ئەگەر بشڵێم: لە وەختی گەیشتنی ڕزقەکەدا هەوڵی بۆ ئەدەم، ئەڵێ مادام وەختی گەیشتنی هاتبێ، هەوڵی تۆی بۆ چیە؟

ئیمام ئەحمەد فەرمووی ئەی «شێخ حاتەم»

[عَلَيْنا أَنْ نَعْبُدَهُ كَما أَمَرَنا وَ عَلَيْهِ أَنْ يَرْزُقَنا كَما وَعَدَنا] ئێمە، کە عەبد و بەندەی خواین، لە سەرمان لازمە چون ئەمری پێ کردوین عیبادەتی خوا بکەین، خواوەندی گەورەش چۆنی وەعدە پێداوین، ڕزقمان بدا، بیدا «شێخ حاتەم» وەڵامەکەی ئیمامی ئەحمەدی زۆر پێ جوان بوو.

جارێک لە مەوعیزەیەکدا فەرمووی:

[مَنْ اِدّعیٰ ثَلاٰثاً بِغَیْرِ ثَلاٰثٍ فَهُو کَذّٰابٌ، مَنْ اِدَّعیٰ حُبَّ اللهِ بِغَیْرِ وَرَعٍ عَنْ مَحٰارِمِهِ فَهُوَ کَذّٰابٌ، وَ مَنْ اِدَّعیٰ حُبَّ الجَنَّةِ مِنْ غَیْرِ اِنْفٰاقِ مٰالِهِ فَهُوَ کَذّٰابٌ، وَ مَنْ اِدَّعیٰ حُبَّ النَّبِیِّ ﷺ مِنْ غَیْرِ حُبِّ الفُقَرٰاءِ فَهُوَ کَذّٰابٌ]

هەر کەسێک داوای سێ شت بێ سێ شت بکا ئەوە درۆزنە، ئەوەی بڵێ: خوام خۆش دەوێ، بەڵام لە حەرام خۆی نەپارێزێ، ئەوە درۆ دەکا. ئەوەی بڵێ: بەهەشتم پێ خۆشە و ماڵی دنیا، لە ڕێگای خوادا خەرج نەکا و خێر و چاکە نەکا، ئەوە درۆ دەکا. هەر کەسێک بڵێ: پێغەمبەرم خۆش دەوێ و فەقیری ئۆممەتی پێغەمبەری خۆش نەوێ، ئەوە درۆ دەکا. مەعنای وایە، ئەوەی خوای خۆش بوێ، دەبێ لە حەرام خۆی بپارێزی و، ئەوەی پیێ خۆشە، لە قیامەتا بچێتە بەهەشت. دەبێ خێر و خێرات بکا و ئەوەی پێغەمبەری خۆش دەوێ ئاگای لە فەقیری ئۆممەتی پێغەمبەر بێ.

ڕۆژێک باسی تۆبەی دەکرد، فەرمووی: تۆبە کردن ئەوەیە، کە تۆ لە خەوی غەفڵەت وە خەبەر بێیت و یادی خراپی و گەورەیی ئەو گوناهانە بکەیتەوە کە تا ئێستا کردووتن، هەروەها بیر بکەیتەوە لەو خوا گورەیە، کە چۆن بە لوتف و کەرەم و مەرحەمەتی خۆی، لە گەڵ ئەوەشدا کە ئاگادار بوو، بەسەر کردنی گوناحەکانتدا، بەڵام جاڕی لێ نەدایت و لێی ئاشکرا نەکردی، تا لە ناو خەڵکدا ئابڕوت بەرێ. فەرمووی: ئنجا دوای ئەوە، ئەگەر بتەوێ بە ڕاستی تۆبە بکەی، دەبێ، چۆن کە شیر لە گوانی مەڕو بزن دۆشراوهاتە دەرەوە، تازە جارێکی‌تر ناچێتەوە ناو گوانەکەوە، تۆش ئاوا تۆبە بکەیت و جارێکی‌تر نەگەڕێیتەوە سەر ئەو گوناحە. فەرمووی: ئەو تۆبە ڕاستی‌یەش چوار عەلامەت و نیشانەی هەیە، یەکەم، ئەگەر زمانی لە غەیبەت و بوهتان و قسەی خراپ پاراست، ئەوە تۆبە کردنەکەی، ڕاستە. دووەم، ئەگەر لەو کۆمەڵە دوور کەوتەوە، کە تا دوێنێ خراپەی لە گەڵ دەکردن و شەریکی گوناح کردنی بوون، ئەوە تۆبەکەی ڕاستە. سێیەم،

ئەگەر ئەو گوناحانەی ڕابردوی وەبیر کەوتەوە، لە بەر خوێەوە خەجاڵەت بوو شەرمی لە خوا کرد، ئەوە تۆبەکەی ڕاستە. فەرمووی: عەلامەت و نیشانەی چوارەمیش، ئەوەیە، ئەو کەسە خۆی ئامادە بکا بۆ مردن، نیشانەی خۆ ئامادە کردنیش بۆ مردن ئەوەیە، قەت لە کاری خوا ناڕازی نەبێ.

فەرمووی: جا هەر گوناح کارێ بەو جۆرە تۆبە بکا، ئەوە خواوەندی گەورە چوار شتی خەڵات دەکا. یەکەم، بە مەفادی ئەو ئایەتە کە خوای گەورە لە سوورەی «بەقەرە»دا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَ يُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾ واتە بە ڕاستی، خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ، کە تۆبە لە گوناح دەکەن و خۆیان لە ژەنگی گوناح پاک دەکەنەوە. مەعنای وایە، خوا خۆشی دەوێ، فەرمووی: خەڵاتی دووەمی، ئەوەیە، لە ژنگی گوناح پاک دەبێتەوە. خەڵاتی سێیەمی، ئەوەیە، کە تازە جارێکی‌تر شەیتان زەفەری پێ نابا. خەڵاتی چوارەمی، ئەوەیە لە پێش مردنیدا، مژدەی بۆ دێ، کە لە ئاگری دۆزەخ بە دور دەبێ، بە مەفادی ئەو ئایەتە، کە خوای گەورە لە سورەی فوسیلەتدا دەفەرمووێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمِ الْمَلٰائِكَةُ أَلاَّ تَخَافُوا وَ لاٰ تَحْزَنُوا وَ أَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾ ئەوانەی تۆبە دەکەن و باوەڕیان بە خوایە و بەردەوامن لە سەر کردەوەی چاکە، لە پێش سەرمەرگیاندا مەلائیکەی خوا دێن پێی دەڵێن مەترسەو و خەم مەخۆ، مژدە بێ کە تۆ ئەهلی بەهەشتی و لە دۆزەخ بە دووری. جا چ خەڵاتێک لەو خەڵات و جائیزە گەورەتر، خوا بە نسیب مان بکا.

فەرمووی: لە پێنج شتدا نەبێ، پەلە کردن خراپە و لە شەیتانەوەیە. یەکەم، ئەگەر میوانتان هات زوو نانی بۆ دانێن. دووەم، کە یەکێکتان مرد زوو بینێژن. سێیەم، ئەگەر ئافرەتتان بلوغی بوو، زوو بە مێردی بدەن. چوارەم، ئەگەر قەرزدار بوون زوو قەرزەکە بدەنەوە. پێنجەم، ئەگەر گوناحتان کرد، زوو تۆبە بکەن. لە پاشان

فەرمووی: داواتان لێدە کەم، بە بەرگ و لیباسی جوان و بە ملک و ماڵ و باغ و باغات، لە خۆتان بایی مەبن و خۆتان لێ نەگۆڕێ.

فەرمووی: وەک بیستوتانە هیچ جێگایەک و هیچ باغ و باغاتێک لە بەهەشت و باغاتی بەهەشت خۆشتر و چاکتر نیە، کەچی پیاوێکی گەورەی وەک حەزرەتی ئادەم، لە سەر بێ ئەمری یەک، لە بەهەشت و باغ و باغاتی بەهەشت دەرکرا.

دووبارە فەرمووی: بە تاعەت و عیبادەتیش مەغرور مەبن، نەتان بیستووە کە شەیتان بەو هەموو تاعەت و عیبادەتەوە، بە هۆی مەغرورییەوە لە قاپی ڕەحمەتی خوا دەرکرا و تۆقی لەعنەتی لە گەردن کرا. فەرمووی: بە زوهد و تەقواش لە خۆتان بایی مەبن، لە زەمانی حەزرەتی یووشەعی کوڕی نوون پێغەمبەر دا، هێندێک دەڵێن، کە زەمانی حەزرەتی مووسادا، عابیدێکی وەک بەلعەمی باعوورا لە خۆی بایی بوو، خۆی لێ گۆڕا، خوا غەزەبی لێ گرت. کۆمەڵێک لە عولەمای تەفسیر دەڵێن لەو دوو ئایەتەی سورەی ئەعراف دا، کە خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَاتْلُ عَلَيْهِم نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الغَاوِينَ، وَ لَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَ لٰكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ﴾

ئەی پێغەمبەر، تۆ بە سەرهاتی ئەو کەسەیان بۆ بگێڕەوە، کە ئیمە ئیمان و زانیاریمان دابوویە، کە چی لە خۆی بایی بوو، وە دوای قسەی شەیتان کەوت و گومڕا بوو، خۆ ئەگەر ئارەزومان بکردایە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام وەدووی هەوای نەفس کەوت، وەک سەگ زمانی دەرکێشا، چەغەی بکەیت و چەغەی نەکەی، هەر وەک یەک کە. ئەوە ئیشارەیە بۆ ئەو عابیدە. فەرمووی: بە هۆی شێخ و موشایخ و زانانیشەوە لە خۆتان بایی مەبن، خۆ هیچ شێخێک لە پێغەمبەر گەورەتر نیە؟ بۆ سوعلەبە خزمی نزیکی نەبوو! کاتێ لە دین لای‌دا، خزمایەتی و نزیکی پێغەمبەر فریای نەکەوت، دەبێ خۆتان باش بن، ئنجا پیاو چاک خۆشیان

دەوێن. «شێخ حاتەمی ئەسەم» لە ساڵی دووسەت و سیی و حەوتی کۆچیدا، لە وڵاتی بەڵخ و بوخارا وەفاتی فەرمووە: ئەوە بو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشتی «شێخ حاتەمی ئەسەم». ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ.

خوایە لەسەر چاکە تۆفیقمان بدەی. خوایە لە خۆمان و مردووی کەس و کارمان خۆش بی. خوایە، لە هەموو دەرد و بەڵایەک، بمان پارێزی. ئامین.

وَالسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (١٣)
# مەعروفی کەرخی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ اَلْعٰالَمِينْ، وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ أَفْضَلِ الأَنْبِيٰاءِ وَ سَيِّدِ المُرْسَلِينَ، قٰائِدِنٰا وَ شٰافِعِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ اِلىٰ يَوْمِ الدِّينْ]

موسوڵمانینە: گوڵی مەجلیسی ئێستامان و سەرحەڵقەی مەوعیزەکەمان، یەکێکی‌ترە لە خواناسان، کە لە کاتی خۆیدا هەمدەمی نەسیمی ویسال بوو، حەریمی حەرەمی ذوالجلال بوو، پیری مەیخانەی خواناسان بوو، بادەنۆشی مەجلیسی خاسان بوو، کاتێ بێ خەبەر لە ڕاستی بوو، دەورانێک مامۆستای ڕاستی بوو، گاهێ دێوانەی دەشتی عیرفان بوو، سەردەمێک شەیدای زاتی یەزدان بوو، زەمانێک شێخێکی مەلەوان بوو، بەینێک مەلایێکی زۆر زان بوو، گاهێ موقتەدای تەریقەت بوو، گاهێ ڕهنمای حەقیقەت بوو، ئەو زاتە بەرزو پیرۆزە، «حەزرەتی شێخ مەعروفی کەرخی‌یە». جا تکایە، گوێی دڵتان بکەنەوە، بۆ بیستنی باسی ژیان و ئامۆژگاریە بە نرخەکانی ئەو زاتە موبارەکەو پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

عەزەمەت و گەورەیی بۆ خواوەندێ کە ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَ يُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ لە مردوو، زیندوو دروست دەکا و لە زیندو مردوو. لە باوک و دایکێکی مەسیحی «شێخ مەعروفی کەرخی» پێ دەگەیێنێ، «شێخ مەعروفی کەرخی» لە شاری بەغدا، لە دایک بووە، هەر بە منداڵی ئاساری گەورەیی، لە

ناچاواندا، دیار بووە، باوک و دایکی زۆریان خۆش ویستووە، کە تەمەنی دەگاتە شەش حەوت ساڵ، دەی‌نێرنە قوتابخانە، ماوەیەک دەرس دەخوێنێ، ڕۆژێک لە دەرسەکەیدا، مامۆستا مەسیحیەکەی پێی دەڵێ: [قُلْ ثَالِثَ ثَلاثَةٌ] تۆ بڵێ: حەزرەتی عیسا سێیەم خوایە، ئەویش دەڵێ: ﴿قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ﴾ ئەی مامۆستا، تۆ بڵێ: خوا هەر یەکە، هەرچەند مامۆستاکەی گوتی: ئەو نەی بیست، ئاخری مامۆستاکەی زۆری لێ دەداو دەری دەکا، ئەویش لە ترسی دایک و باوکی نەیوێرا بچێتەوەماڵەوە، چوو بۆ مزگەوتی موسوڵمانان و لەوێ مایەوە، باوک و دایکی زۆری بۆ بە پەرۆش بوون، نەیان دەزانی کوڕەکەیان چی بە سەر هاتووە؟ چوونە لای مامۆستاکەی، کارەساتی بۆ گێڕانەوە، ئەوەندەی تر دڵیان نارەحەت بوو، نەیان دەزانی چی بکەن و چۆنی وە دۆزن، ئێوارەیەک باوک و دایکی، وەک هەموو باوک و دایکێک کە جگەرگۆشەیان لێ دوور کەوێتەوە، بۆی دەگریان و زۆریان پەرۆش بوو، دەیان گوت: خۆزگە جارێکی‌تر چاومان پێ دەکەوتەوە، هەر دینێکی بپەرستایە، دەچوینە سەر دینی ئەو. ئەو ڕۆژە «شێخ مەعروف» لەو لاوە چوو بۆ خزمەت ئیمام عەلی ڕەزای کوڕی ئیمام مووسای کازم و موسوڵمان ببوو، بە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕابووەوە، ئیمام عەلی فەرمووبوی: بچۆ بۆ لای دایک و باوکت با زۆر نارەحەت نەبن، خوا گەورەیە.

باوک و دایکی لەو گفتووگۆیە دا بوون، «شێخ مەعروف» لە دەرگای‌دا و وەژوور کەوت، باوەشیان بە یەکتر داکرد و پێک شاد بوونەوە (یا خوا هەموو دایک و باوک و کەس و کارێک ئاوا پێک شاد وەبن) ئنجا گوتیان: باشە ئەو چەند ڕۆژە لە کوێ بویی؟ ئەویش بە تەواوی بە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕانەوە. گوتیان: جا کە وایە ئێمەش موسوڵمان دەبین هەستان چوونە خزمەت ئیمام عەلی ڕەزای کوڕی ئیمام مووسای کازم و موسوڵمان بوون.

ئنجا خوێندنی تەواو کرد و لە ئاخریدا، بوو بەو «شێخ مەعروفی کەرخی»یە،

کە ئێستا بوتە چرای ئامۆژگاریەکەمان و یەکێک بوو لە ئەولیا بەرزەکان و پیاوە ناودارەکانی ئیسلام.

«شێخ مەعروفی» کەرخی، لە سەر مەزهەبی ئیمامی حەنەفی بووە، زوهد و تاعەت و کەشف و کەراماتی زۆر بووە، عالم و زانایێکی زۆر بەرز بووە، بە تایبەتی، لە کاتی خۆیدا، لە فتوادا، موعجیزەی نواندووە، خاوەنی تەسنیفاتی زۆر بووە، دۆعای زوو گیرا بووە، ئێستاش بە ئەغلەبی ئەو کەسانەی دەچنە بارەگایەکەی، دۆعا دەکەن، خواوەندی گەورە، لە بەر خۆشەویستی ئەو، دڵیان ناشکێنێ و دۆعایان قبوڵ دەکا.

نموونەیەک لە گیرابوونی دۆعای «شێخ مەعروفی کەرخی»، ئەوەیە، شێخ فەریدەدینی خاوەنی کتێبی [تَـذْكِـرَةُ الأَوْلِـيا] دەفەرمووێ: جارێک «شێخ مەعروفی کەرخی»، چەند مورید و مەنسووبی، لە خزمەتدا دەبن و بە قەراغ دجلەدا ئەڕۆن، موریدەکان تەماشا دەکەن، ئەوا کۆمەڵێک کوڕی گەنجی زۆر قۆز لە سەر چیمەنی کەناری دجلە. سفرەیان ڕازاندوتەوە و خەریکی کەیف و ڕابواردن و ئارەق خواردنەوەن. موریدەکان عەرزی شێخ دەکەن: قوربان، دۆعا بکە بەڵکو خواوەندی گەورە ئەو کۆمەڵە بەد ئەخلاقە لە بەین بەرێ، مەبادا بە هۆی شوومی خراپی ئەوانەوە، خوا غەزەب لە ئێمەش بگرێ، شێخ ڕووی کردە موریدەکانی و فەرمووی: ئەوەی دەس نوێژی نیە دەس نوێژ تازە بکاتەوە، موریدەکان دەس نوێژیان گرت، شێخ فەرمووی: دەست بەرز کەنەوە بۆ ئاسمان، دەستیان بەرز کردەوە، فەرمووێ: من دۆعا دەکەم ئێوەش بڵێن ئامین، گوتیان بڵێ، شێخ فەرمووی: ئەی خوای گەورە داوات لێ دەکەین: کە هەر وەک لە دونیادا، ژیان و عەیشی ئەو کۆمەڵە کوڕە گەنجەت خۆش کردووە، لە قیامەتیشدا ئاوا شاد و کەیف خۆشیان بکەی. موریدەکان هەر چەند دۆعاکەی شێخیان زۆر بەلاوە سەیر بوو، بەڵام هەر گوتیان:ئامین. لە پاشان عەرزی شێخیان کرد و گوتیان: ئەرێ

قوربان، ئەوە چ دوعایەک بوو کردت؟ ئێمە، لە سەری ئەو دوعایە تێ ناگەین، فەرموی: تۆزێک سەبرتان بێ تێی دەگەن. کاتێک شێخ لە کوڕە گەنجەکان نزیک بووە و چاویان بە شێخ کەوت، بە ئەمری خوا حاڵیان گۆڕا، تا رو، ڕوبابیان شکاندو، ئارەق و شەرابیان ڕشت و بە گریانەوە هاتن بۆ خزمەت «شێخ مەعروف» و تۆبەیان کرد.

شێخ ڕووی کردە، موریدەکان و فەرمووی: چاوتان پێ کەوت چۆن نیازی هەموو لایەکمان هاتە دی، بێ ئەوەی زەرەر بە کەسێ بگا.

با، بۆ خۆ بەزل نەگرتن و لە خۆبایی نەبوون، چاو لە «شێخ مەعروفی کەرخی» بکەین، با وەک ئەو، بەزەییمان بە فەقیر و هەژار و هەتیودا بێتەوە، شێخ سەری سەقەتی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: جەژنی قوربان بوو، تەماشام کرد، «شێخ مەعروفی کەرخی»، لە بن چەند دار خورما، خورما کۆ دەکاتەوە، چوومە خزمەتی و عەرزم کرد قوربان ئەوە خەریکی چی؟

فەرمووی: ئەو منداڵە هەتیوەم دی، دەگریا، گوتم: ڕۆڵە ئەوە بۆ دەگری؟ گریا و گوتی: ئەو منداڵانە، هەموو کراسی تازەیان، لە بەر کردووە و گوێزیان پێن هەڵماتێن دەکەن، من هیچم نیە. فەرمووی: منیش پارەم نیە تا بۆی بکرم. هێندێک خورما، کۆ دەکەمەوە تا پێیان ژیرەوە بێ، شێخ سەری سەقەتی فەرمووی: عەرزم کرد قوربان جەنابت لێی گەڕێ، من دەچم کراسیشی بۆ دەکرم و گوێزیشی بۆ دێنم. «شێخ مەعروف» زۆری پێ خۆش بوو، فەرمووی: زۆر باشە. دەفەرمووێ: کراسم بۆ کری و گۆیزم بۆ پەیدا کرد، منداڵەکە دەستی کرد بە یاری کردن، دەفەرمووێ: قەسەم بە خوا، لە ئەسەری بەرەکەتی «شێخ مەعروفە»وە نوورو کەیف و خۆشی یەک، بە سەرم دا باری، کە تا ئێستاش بەرەکەتی هەر ماوە.

«شێخ مەعروفی کەرخی» هەمیشە، خەڵکی هەڵناوە بۆ کارو کاسبی و کردەوەی چاکە، لە ئامۆژگاریەکدا، فەرموویەتی:

[إذا أَرادَ اللهُ بِعَبْدٍ خَيْراً فَتَحَ عَلَيْهِ بابَ الْعَمَلِ وَ أَغْلَقَ عَلَيْهِ بابَ الجَدَلِ، وَ إذا أَرادَ بِعَبْدٍ شَرّاً أَغْلَقَ عَلَيْهِ بابَ العَمَلِ وَ فَتَحَ بابَ الجَدَلِ]

هەر کاتێک خواوەندی گەورە، ویستی خێر بە عەبدی خۆی بگەیێنێ، ئەوە دەرگای کار و کاسبی بۆ دەکاتەوە و دەرگای بێ کاری و قسە کردنی پڕو پووچوو کێشە و هەرای، لە سەر دادەخا. بەڵام بە پێچەوانە، خوای گەورە کە ویستی یەکێک تووشی شەڕ بکا، ئەوە دەرگای کار و کاسبی لە سەر دادەخا و دەرگای قسە کردنی بێ مەعنای بۆ دەکاتەوە، هەمیشە هەر خەریکی غەیبەت و درۆو شتی بێ سوود دەبێ و کارێک بۆ خۆی ناکا.

فەرمووی: [وَاعْلَمْ أَنَّ الشِّفاءَ مِنْ کُلِّ داءٍ وَ کُلِّ بَلاءٍ نَزَلَ بِکَ کِتْمانُهُ، فَإنَّ النّاسَ لا يَنْفَعُونَکَ وَ لا يَضُرُّونَکَ وَ لا يَمْنَعُونَکَ وَ لا يُعْطُونَکَ]

ئەی برای موسوڵمان، بزانە کە شیفای ئەو دەرد و بەڵایانەی کە بە سەرت دێن، ئەوەیە، کە لە لای خەڵک باسیان نەکەی، واتە ئەگەر خوانەخواستە، تووشی تەنگ و چەڵەمەیێک و بەڵا و موسیبەتێک بوی، ئەوە لای خەڵک شکایەت لە خۆت مەکە و باسی مەکە، چونکە، لە ڕاستیدا، ئەوەی خوا بە سەرت بێنێ، بە خەڵک لاناچێ و ئەوەی خواش لە سەرت نەنووسێ، ئەوان ناتوانن بە سەرت بێنن، ئەوەی بتداتێ ناتوانن مەنعی بکەن و ئەوەی ئەو نەتداتێ ناتوانن بتدەنێ.

فەرمووی: بەڵام ئەوە مەعنای وانیە کار و کاسبی نەکەن، خوا هەر بۆتان دەنێرێ، بەڵکو دەبێ، بە ئومێدی خوا خەریکی کاسبی بی. [إشْتَرْ وَبِعْ وَلَوْ بِرأسِ المالِ، فَإنَّهُ يَنَمُو کَما يَنَمُو الزَّرْعُ] فەرمووی: بکڕە و بفرۆشە با هەر مایەکاریش بێ، چونکە کڕین و فرۆشتن وەک زەڕاعەت وایە، تۆ، توو بچێنی ئاخری هەر زیاد دەدروویتەوە.

فەرمووی: [أَللّٰهُمَّ اجْعَلْنا مِمَّنْ يُؤْمِنُ بِلِقائِکَ وَ يَرْضىٰ بِقَضائِکَ وَ يَقْنَعُ بِعَطائِکَ وَ يَخْشاکَ حَقَّ خَشْيَتِکَ] ئەی خوای گەورە، بمان گێڕە بە یەکێک لەو عەبدانەت، کە

ئیمانیان بە خزمەت گەیشتنی تۆ هەیە لە ڕۆژی قیامەتا و بە قەزاو قـەدەری تـۆ ڕازین و قەناعەت دەکەن، بەوەی بۆت دیاری کردون و بە ڕاستی لە تۆ دەترسن.

جا بە ڕاستی «شێخ مەعروفی کەرخی» زۆر لە خوا ترس بووە.

ڕۆژێک بە ڕۆژ و بوو، ڕۆژووی سوننەتی دەگرت، نیوەڕۆ بە بازاردا ڕۆیشت، کابرایەک ئاوی دەگێڕا، هاواری دەکرد و دەی گوت: [رَحِـمَ اللهُ مَـنْ شَرِبَ] ـ ڕەحمەتی خوا، لەو کەسەی ئاو دەخواتەوە، «شێخ مەعروف» چوو، لە ئاوەکەی خواردەوە و ڕۆژوەکەی شکاند گوتیان: قوربان خۆ جەنابت بە ڕۆژوو بوو، چۆن بوو ڕۆژوەکەت شکاند؟ فەرمووی: بـەڵێ بـە ڕۆژ بـووم، بـەڵام گـوتم: بـەڵکو خواوەندی گەورە، دۆعای ئاو فرۆشەکە قبوڵ بکا و ڕەحم پێ بکا.

لە ئاخری عومریدا ڕۆژێک دەچێتە خزمەت ئیمام عەلی ڕەزا و لە گەڕانەوەدا دەکەوێ و شانی دەشکێ، لە نەخۆش‌یەکەیدا، ڕوو دەکاتە، شێخ سەری سەقەتی و دەفەرمووێ: وەسیەت بێ، ئەگەر مردم، ئەو کراسەم زوو، لە بەر داکەنەو بیدە بە فەقیرێک، با هەر وەک چۆن بە ڕووتی هـاتمە سـەر دنـیا، ئـاواش بـە ڕووتـی بڕۆمەوە.

«شێخ مەعروف»، لە ڕۆژی دووی موحەڕەمی ساڵی دووسـەتی کـۆچیدا، لە شـاری بـەغدا وەفـات دەکـا و ئـێستا مـەرقەدی مـوبارەکـی لە شـاری بـەغدا، زیارەتگای موسوڵمانانە. یەکێک لە پیاو چاکان دەفەرمووێ: لە پـاش وەفـاتی شەوێک لە خەومدا بە خزمەتی گەیشتم، پیاسەی دەکرد، عـەرزم کـرد قـوربان خواوەندی گەورە چی لە گەڵ کردی؟ لە وەڵامدا فەرمووی:

مَـوْتُ التَّـقِیِّ حَـیَاةٌ لا نَـفَادَ لَهـا     قَدْ ماتَ قَوْمٌ وَ هُمْ فِي النّاسِ أَحْـیاءٌ

ئەوەی پرهێزگار بێ و بمرێ، ئەوە ژیانی ئەبەدی دەست دەکەوێ و قەت نامرێ، بەڵام زۆر کەس ئێستا، لە ناو خەڵکدا دەژین و بە مردوو حیسابن.

«شێخ مەعروفی کەرخی»، بەزەیی بە هەموو گیان لەبەرێکدا، دەهاتەوە «شێخ مەعروفی کەرخی». «خاڵێکی» بوو لە شاری بەغدادا، زۆر خاوەن دەسەڵات بوو،

ڕوتبەو مەرتبەی دنیای زۆر بەرز بوو، ڕۆژێک بە کۆلانێکی کەرخەدا دەڕۆیشت، تەماشای کرد، ئەوا «شێخ مەعروف» لە ناو کۆلانەکەدا، دانیشتووەو، سەگێکی پیری لاکەوتووە. «شێخ مەعروف»، ئاگای لە «خالی» نیە، نانی لە بەر دەمە، هەر پارویێک بۆ خۆی دەخوا و پارویێک دەخاتە دەمی سەگەکەوە، خالی دەچێ بەلای‌داو دەلێ: ئەوە شەرم ناکەی لە گەل سەگ نان دەخویێ؟ ئەویش زۆر بە هێواشی و بێ ئەوەی تووڕە بێ، دەفەرمووێ: ئەی «خالە»: ئەوە نیشانەی شەرم لە خوایە، کە من لە گەل ئەو سەگە نان دەخۆم، خالی زۆر خەجالەت دەبێ و دەڕوا.

وەرع و تەقوا دیانەتی «شێخ مەعروفی کەرخی» زۆر عەجایب بووە، کەس وەک ئەو خۆی بۆ مردن ئامادە نەکردووە.

ڕۆژێک ئافرەتێک دەچێ زیارەتی دەکا، دەست نوێژی دەشکێنی، «شێخ مەعروف» فەوری هەلدەستێ تەیەمووم دەکا. عەرز دەکەن: قوربان خۆ ئاو نزیکە، ئەوە بۆ تەیەمومت کرد؟ لە وەلامدا فەرمووی، ئاخر گوتم: لە وانەیە، تا دەگەمە سەر دجلە مەرگ ببێ بە میوان و فریای دەس نوێژ نەکەوم.

موسولمانینە ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و هێندێک فەرمایشتی «شێخ مەعروفی کەرخی» ئۆمێد دەکەم لەزەتان لێ وەرگرتبێ. جا، با لە کۆتاییدا ئەو دۆعایە بکەین کە «شێخ مەعروف» لە چەند زانای نەقل کردووە دەفەرمووێ:

[اَللّٰهُمَّ آمَنّا بِکَ وَ لاٰ تَنْسَنا ذِکْرَکَ، اَللّٰهُمَّ لاٰ تَکْشِفْ عَنّا سَتْرَکَ وَ لاٰ تَجْعَلْنا مِنَ الغافِلِین، آمِینْ]

وَالسَّلامُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةِ اللهِ وَ بَرَکاٰتَهُ

# (١٤)
# سەری سەقەتی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ الحٰاكِمِ الهٰادِي، وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ، وَ أَتْبٰاعِهِ خُصُوصاً عَلىٰ أَستٰاذِنا الشَّيْخِ السَّرىَ السَّقَطى]

گوێ گری خۆشەویست، با لە دانیشتنی ئێستاشماندا، بچینە کۆڕو مەجلیسی یەکێ‌تر لەو زاتە بەرزانە، کە لە زەمانی خۆیدا، شاسواری مەیدانی تەریقەت بووی مەلەوانی بەحری شەریعەت بوو، خاڵی شێخ جونەیدی بەغدادی بوو، شابازی خۆش پەروازی مەعانی بوو، دڵی سەر چاوەی حیلم و کەرەم بوو، بە وێنەی دەریای غەم و ماتەم بوو، دڵی لە خواپەرستیدا فانی بوو، ئەو زاتە بەرزو پیرۆزە، «شێخ سەری سەقەتی»یە جا، با بە ئەدەب دانیشن و گوێ بگرین، بۆ باسی ژیان و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

«شێخ سەری سەقەتی»، دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کرد، دووکانی دانا و دەستی کرد بە کەسابەت، بەڵام دووکان دانانی ئەم لە گەڵ هی خەڵکی‌تر زۆر جیاوازی هەبوو. دوکانی بۆ دەس بڕینی خەڵک دانەنابوو، هەر ئەو ڕۆژەی دوکانی دانا، لە بەینی خۆی و خوادا بڕیاری دا، کە هەر لە دە دینار، نیو دینار قازانج وەرگرێ، دەگێڕنەوە، کە جارێک بادامێکی زۆری کڕی‌بوو، زۆر بە هەرزانی، زۆری نەخایاند بادام تەرەقی‌یەکی زۆری کرد، دەلاڵ باشی بەغدا، خەبەری زانی کە «شێخ سەری»، بادامێکی زۆری هەیە و بە هەرزانی کڕیوە، چوو

بۆ خزمەتی و گوتی: یا شێخ، بادام پارەی باش دەکا، بە هەرزانی لە دەستت دەر نەهێنن، خۆم بە پارەییکی باش بۆت دەفرۆشم، «شێخ سەری» فەرمووی: ئەی دەلاڵ باشی، من لە بەینی خۆم و خوادا بڕیارم داوە، کە هەر لە دە دینار دەس مایە، نیو دینار قازانج وەرگرم، دەلاڵ باشی تورە بوو، گوتی: یا شێخ من قەت مالی جەنابت بە ناقیسی نافرۆشم، ئەویش فەرمووی، ئاخر منیش قەت لە بڕیاری خۆم پەشیمان نابمەوە.

لە بارەی ناوی «شێخ سەری سەقەتیە»وە یەک دوو قسەیان کردووە. هێندێک دەڵێن: «شێخ سەری» کوڕی موفلیسی سەقەتی یە، بەعزێکی تر گوتویانە: «شێخ سەری»، لە ئەووەڵ جاردا، کە دووکانی دانا وردەفرۆش بوو، جا «سەقەت» بە مەعنا وردەیە، بۆیە بە «شێخ سەری»یان گوتووە: «سەری سەقەتی»، واتە «شێخ سەری»، وردە فرۆش و ئەو ناوەی بە سەردا براوە.

«شێخ سەری سەقەتی»، ئاخری دەستی لە دووکانداریش هەڵگرت و بە یەکجاری دەستی کرد بە خواپەرستی. جارێک یەکێک لە موریدەکانی عەرزی دەکا: ئەرێ قوربان بێ ئەدەبی نەبێ، هۆی تەرکی دنیات بە یەکجاری چی بوو؟

فەرمووی: ڕۆژێک، شێخ حەبیبی ڕاعی هاتە دووکانەکەم، منیش شتێکم دایە، بیدا بە دەروێشان، کەشتەکەم دایێ دۆعای بۆ کردم و فەرمووی: یا خوا، خوا خێرت بە نەسیب بکا. فەرمووی، کە شێخ حەبیبی ڕاعی دۆعاکەی بۆ کردم، بە ئەمری خوا دنیام لە پێش چاوان ڕەش بوو، دڵم سارد بووە.

فەرمووی: ڕۆژێکی تر شێخ مەعروفی کەرخی تەشریفی هات هەتیوێکی هێنا، فەرمووی: کراسێکی بۆ بکە، گوتم: بە چاوان. شێخ مەعروف فەرمووی یا ڕەببی خوا ئاسودەت بکا. دەفەرمووێ: لە پاش دۆعاکەی شێخ مەعروفی کەرخی، بە تەواوی دنیام لە پێش چاوان ڕەش بوو.

بۆ نوێژی بەیانی چوومە مزگەوت گوتیان: ئەی «سەری سەقەتی» ئەو

بازارەی، دووکانەکەی تۆی لێ بوو، ئیمشەو سووتاوە، کە چوینە بازار بە ئەمری خوا دوکانەکەی من نەبێ، هەموو بازارە کـە سـووتابوو. دەفـەرمووێ: کـە ئـەو حاڵەتەم چاو پێ کەوت، هەر چی لە دووکانەکـەمدا بـوو، بـەخشیمەوە دام بـە دەروێشان و ڕووم کردە خواپەرستی.

کوڕینە: ئاخری ئەو دوکاندارە، بوو بە پیاوێکی وا، کـە زاتـێکی وەک شـێخ جونەیدی بەغدادی دەربارەی زوهد و تاعەت و عیبادەت و خواپەرستی ئەودا بفەرمووێ: تا ئێستا کەسم نەدیوە وەک «شـێخ سـەری سـەقەتی» لە تـاعەت و عیبادەتدا، کامیل و تەواو بێ. فەرمووی: لە ماوەی نەوەت ساڵ عومردا، لە سەر کەلەکەی ڕانەکشا، لە نەخۆشی‌یەکـەیدا نـەبێ، چـل سـاڵ نـەفسی ئـارەزووی هەنگوینی کرد نەیدایێ، فەرمووی: ڕۆژێک، لە «شێخ سەری سەقەتی»م بیست، فەرمووی: ڕۆژێ چەند جار، لە ئاوێنە دەڕوانم، لە ترسی ئەوەی مەبادا بە هۆی ژەنگی گوناحەوە ڕووم ڕەش بوبێ‌و خەجاڵەت ببم. هەروەها لە مەدحی «شێخ سەری سەقەتی»دا، شێخ بیشری حافی فەرموویەتی: شتم لە کەس داوا نەکردووە لە «شێخ سەری سەقەتی» نەبێ، چونکە دەم زانی، ئەو کاتە لە هەموو کاتێ کەیف خۆشترە، کە یەکێک داوای شتێکی لێ بکا و شتێک بدا بە یەکێک. هەروەها دەڵێن «شێخ سەری سەقەتی» دۆعای زۆر، زووگیرا بووە. یەکێ لە پیاو چاکان دەڵێ: لە شامەوە چووم بۆ بەغدا، بۆ خزمەت «شێخ سەری سەقەتی»، چوومە مەنزڵەکەی و لە دەرگام دا، تەماشام کرد، خۆی هاتە دەرەوە بۆ دەرگا کردنەوە، بەڵام، کە دەهات گوێم لێ بوو دۆعای دەکرد و دەی‌فەرموو: [اللّٰهُمَّ أشْغِلْ مَنْ شَغَلَنِي عَنْکَ بِکَ] ئەی خوای گەورە، داوا دەکەم، ئەوەی دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی من لە تۆ، لە خۆتی نزیک بکەرەوە. فەرمووی: دەرگای کردەوە چـوومە خـزمەتی، لە پـاش ماوەیەک، گەڕامەوە بۆ شام، دەفەرمووێ: خواوەندی گەورە، بە هۆی دۆعاکەی «شێخ سەری یە»وە، لە ماڵی خۆی نزیک کـردمەوە، لە شـاری حـەڵەبەوە چـل

کەرەت، بە پێیان چوومە حەج و زیارەتی پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێ).

هەروەها جارێکی‌تر، شێخ جونەیدی بەغدادی فەرمووی: [سَمِعْتُ السَّري، يَقُولُ: أَرْبَعُ خِصَالٍ تَرْفَعُ العَبْدَ: العِلْمُ وَالأَدَبُ وَالعِفَّةُ وَالأَمَانَةُ] لە «شێخ سەری سەقەتی»م بیست، دەی‌فەرموو: چوار خەسڵەت، ئینسان بەرز دەکەنەوە، یەکەم، عیلم و زانیاری. دووەم، ئەدەب و ئیحتیرام سێیەم، بێ زەری و داوێن پاکی. چوارەم، خەیانەت نەکردن لە ئەمانەتا. ئەوەی ئەو خەسڵەتانەی تێدا بن، لای خوا و خەڵک خۆشەویستە.

دووبارە، شێخ جونەیدی بەغدادی دەفەرمووێ: ڕۆژێک چوومە خزمەتی، تەماشام کرد ژوورەکەی خۆی گسک دەدا و لە بەر خۆیەوە دەگریا و دەی‌فەرموو:

[لاٰ فِي النَّهٰارِ وَ لاٰ فِي اللَّيْلِ لِي فَرَحٌ فَلاٰ أُبٰالِي أَطٰالَ اللَّيْلُ أَمْ قَصِرٌ]

نە لە ڕۆژداو نە لە شەودا، من دڵم خۆش نیە، جا، بە من چی شەو درێژ دەبن، یان کورت.

«شێخ سەری سەقەتی»، ڕۆژێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، فەرمووی: خەڵکینە، تکاتان لێ دەکەم، شەرم و حەیاتان بێ و شەرم لە خوا بکەن، فەرمووی: کەسێک شەرم و حەیای نەبوو، خوا ناناسێ. فەرمووی: با پێتان بڵێم: مەعریفەتی «الله»، وەک تەیرێک، لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە و دەفڕێ و دەگەڕێ، تا دڵێک دەبینێتەوە، کە پڕ بێ لە شەرم و حەیا، جا، هەر کاتێ دڵێکی وای چاو پێ کەوت، دەچێتە ناوی. لە گەڵ ئەو هەموو زوهد و خواپەرستی یەشدا زۆر ڕوو خۆش و قسە خۆش بووە، جارێک نەخۆش دەکەوێ، جەماعەتێک دەچنە عەیادەت و ئەحواڵ پرسی، بەڵام زۆر دادەنیشن، شێخ زۆر نارەحەت دەبێ و زۆری پێ ناخۆش دەبێ کە ئەوەندە دادەنیشن، کاتێک هەڵدەستن بۆ خواحافیزی دەڵێن: یا شێخ دۆعامان بۆ بکە. شێخ ڕوو دەکاتە ئاسمان و دەفەرمووی: ﴿أَللّٰهُمَّ عَلِّمْنٰا كَيْفَ نَعُودُ المَرْضىٰ﴾ ئەی خوای گەورە، فێرمان بکە، کە چۆن بچینە لای نەخۆشان،

خەڵکەکە، حاڵی بوون کە نابێ ئینسان، کە چوە لای نەخۆش، زۆر دانیشێ. دۆعاکەی شێخیان زۆر پێ خۆش بوو. جا فەرمایشتەکەی «شێخ سەری سەقەتی» موافیقی حەدیسی پێغەمبەرە، کە فەرموویەتی: سوونەتە بچنە لای نەخۆش، بەڵام نابێ زۆ دانیشن.

«شێخ سەری سەقەتی» هەمیشە سوود و قازانجی برای موسوڵمانی پێش سود و قازانجی خۆی خستووە. دەڵێن: عادەتی وابوو، کە یەکێک سەلامی لێ بکردایە بە ڕوو گرژی وەڵامی سەلامەکەی دەدایەوە. جارێک گوتیان: قوربان ئەوە بۆ، کە سەلامت لێ دەکەن، بە ڕوگرژی وەڵام ئەدەیتەوە؟

فەرمووی: ئاخر ئێوە نەتان بیستووە، کە پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی: لەو کاتەدا، کە یەکێک سەلام لە یەکێ تر دەکا، لە لایەن خواوەندی گەورەوە، سەت بەش بەرەکەت و ڕەحمەت دێتە خوارەوە، نەوەت بەشی، بۆ ئەو کەسەیانە، کە ڕوو خۆشە، جا، منیش ڕووی خۆم گرژ دەکەم، تا نەوەت بەشەکە، بۆ ئەو کەسە بێ، کە سەلامەکەی لێ کردووم.

جارێک خەڵکێکی زۆر لە پیرو گەنج لە خزمەتیدا دەبن، ڕو، دەکاتە گەنجەکان و دەفەرمووێ: کوڕینە، تکایە تا گەنجن و تواناتان هەیە، چاکە و پیاوەتی و عیبادەتی خوا بکەن، چونکە کە پیر بوون و وەکو ئێمەتان لێ هات، پەکتان دەکەوێ و هیچتان پێ ناکرێ، ئەو کاتە پەشیمان دەبنەوە، بەڵام پەشیمانیەکەش هیچ سوودی نیە.

فەرمووی: ئەوە سی ساڵە، لە بەرامبەر شوکرانەیەک دا، لە بەر خوا دەپاڕێمەوە. گوتیان: جا قوربان چۆن شوکرانە بە گوناح دادەنرێ؟ فەرمووی: ڕۆژێک ئاگر لەو بازارە بەر بوو، کە دووکانی منی لێ بوو. هاتن گوتیان: دووکانەکەی تۆ نەبێ، بازاڕەکە هەمووی سووتاوە، منیش ئەوکاتە، لە دڵی خۆمدا گوتم: حەمد و سەنا بۆ خوا، کە دووکانەکەی من نەسووتاوە، فەرمووی: جا، لە خەجاڵەتی ئەوەی کە،

قازانجی خۆم لە پێش قازانجی خەڵک خست و بۆ سەلامەتی ماڵی دنیا حەمد و سەنای خوام کرد، لەو کاتەوە داوای لێ بوردن لە خوا دەکەم.

فەرمووی: ماڵی دنیا، هەمووی لە زیادی‌یە، پێنج شتی نەبێ. یەکەم، پاروە نانێک برسی‌یەتی لابەرێ، دووەم، ئاوێک تینویەتی نەهێڵێ، سێیەم، لیباسێک سەتری عەورەتی پێ بکەیت. چوارەم، خانوێک تێیدا ساکن بی. پێنجەم، عیلم و زانیاری یەک عەمەلی پێ بکەی. فەرمووی: کوڕینە با ئەوەشتان پێ بڵێم: هەر گوناحێک بە هۆی شەهوەت و ئارەزوی نەفسەوە کرابێ، ئومێدی عەفووی لێ دەکرێ. بەڵام گوناحێک بە هۆی خۆ بە زل زانین و فەخر بە سەر خەڵکداو تەکەبورەوە بکرێ، ڕەحمەتە خوای گەورە لەو گوناحە خۆش ببێ. فەرمووی: بۆ وێنەو میسال، گوناحی حەزرەتی ئادەم، بە هۆی ئارەزوی نەفس و شەهوەتەوە بوو، خوای گەورە عەفووی کردوو لێیی خۆش بوو، بەڵام گوناحی شەیتان بە هۆی خۆ بە زل گرتن و تەکەبورەوە بوو، لە قاپی ڕەحمەت دەرکرا و تۆقی لەعنەتی لە گەردن کرا.

فەرمووی: وەسیەت و ئامۆژگاری بێ: قەت خۆتان بە زل مەگرن و هەمیشە لە خوا بترسن، تەنانەت ئەگەر هات و یەکێک بە زاهیری، ئەوەندە پیاوی باش بوو، لە بەر گەورەیی و باشیانی بچێتە ناو باغ و باغاتێک، دار و درەختی زۆر چڕوپڕ بێ، هەر لەقە دارێ تەیر و باڵندەیەکی بە سەرەوە بێ، هەر تەیرێ بە زمانی خۆی بڵێ: بەو پیاوە [السَّلامُ عَلَیْکَ یا وَلِیَ الله] فەرمووی: ئەگەر ئەو پیاوە نەترسێ لەوە، کە ئەوە مەکری شەیتان و ئیستیدراجە، ئێوە لەو پیاوە بترسن، چونکە دەر دەکەوێ کە خوێ بە زل دەزانێ. کەرەتێک عەرزیان کرد، گوتیان: قوربان، عارف بە خوا، بە کێ دەڵێن و چۆنە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: عارف بە خوا، بەو کەسە دەڵێن، کە خواردنی وەک خواردنی نەخۆش کەم بێ و نوستنی وەک نوستنی ماران گاز وابێ و عەیش و ژیانی وەک ئینسانی غەرق بوو وابێ. فەرمووی: پیاوی

چاک و عارف بە خوا، دەبێ خوو ڕەوشت و سیفەتی ڕۆژی هەبێ، لە سەر هەموو شتێک هەڵێ، شکڵی وەک ئەرزو زەوی وابێ، باری هەموو کەس و هەموو بونەوەرێک هەڵگرێ، نیهاد و دەرونی وەک ئاو وابێ، دڵان زیندو بکاتەوە، ڕەنگی وەک ڕەنگی ئاگر وابێ، عالەم ڕووناک بکاتەوە. ئەگەر ئەو خەسڵەتانەی تێدا نەبوو، ئەوە عارف بە خوا نیە.

بۆ سەبر و خۆ ڕاگرتن دەبێ، چاو لە «شێخ سەری سەقەتی» بکەین. دەڵێن جارێک لە مەجلیسێکدا، باسی سەبر و خۆ ڕاگرتنی دەکرد، لەو کاتەدا، دوپشکێک کە شەو چوو بوو ناو جلەکانی یەوە، چەند جار بە ڕانیەوەدا وەسەرخۆی نەهێنا، کاتێ لە ئامۆژگاریەکەی بووە، دوپشکەکەی هێنایە دەرو کوشتی. دانیشتووانی مەجلیسەکە گوتیان: ئەی قوربان ئەوە بۆ زوو نەت فەرموو: تا ئەوەندەت نارەحەت نەکا، بی‌کوژین، فەرمووی: ئاخر زۆرم لا شەرم بوو، باسی خۆ ڕاگرتن و سەبر بۆ ئێوە بکەم و خۆم سەبر نەگرم.

«شێخ جونەیدی بەغدادی» دەفەرمووێ: «شێخ سەری سەقەتی» ئەوەندە بە ئەدەب و لە خوا ترس و خزمەت گوزرا بوو، بۆ خەڵک، جارێک فەرمووی: زۆرم پێ ناخۆشە لە شاری بەغدا بمرم، بەڵام بە دەست خۆم نیە. فەرمووی: ئەی جونەید، ئاخر ئەو خەڵکە لایان وایە، من پیاوی چاکم، منیش لەوە دەترسم، کە لێرە بمرم و لەبەر خراپی، ئەرزەوە خۆم نەگرێ و ڕیسوا و خەجاڵەتی ئەو خەڵکە ببم و ئەوانیش بە هۆی خراپی منەوە، بیر و باوەڕیان دەر حەق بە پیاو چاکان بگۆڕێ. فەرمووی: لە نەخۆشی وەفاتیدا چوومە خزمەتی، باوەشێنێکی لابوو، هەڵم گرت و دەستم کرد بە باوەشێنی، چاوی هەڵبڕی و فەرمووی: باوەشێنم مەکە، چونکە تۆ نازانی ئاگر بە «با» هەر خۆش دەبێ. دەفەرمووی: لە بەرە بەیانی، ڕۆژی سێشەنبەی سی مانگی ڕەمەزانیساڵی دووسەت و پەنجای کۆچیدا، لە شاری بەغدا وەفاتی فەرموو: ئێستا گۆڕی موبارەک و بارەگای لە شاری بەغدایە و

زیارەتگای موسوڵمانانە. موسوڵمانینە ئەو پیاوە گەورانە، ئەو زانا و ئەولیایانە، بەو هەموو عیلم و زانیاری و زوهد و تاعەت و خوا پەرستی‌یەیانەوە، خۆیان بە پیاوی باش لە قەڵم نەداوە، خۆیان لە کەس بە گەورەتر نەزانیوە، هەمیشە خەریکی خواپەرستی و ئامۆژگاری خەڵک بوون، سایە و بەرەکەتیان زۆر بووە، جا، با ئێمەش پەیڕەوەی لەوان بکەین و لە بەر خوا، وە پاڕێین، کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەر و پیاوچاکان عەفوومان کا. خوایە شیفای نەخۆشانمان بدەی. خوایە لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بمان پارێزی. خوایە تۆفیقمان بدەی، لە سەر چاکە، ئامین «یٰا رَبَّ العٰالَمینَ»

وَالسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (١٥)
# جونەیدی بەغدادی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ الْعَلِيِّ الْهٰادِي، وَالصَّلاٰةُ وَالسَّلاٰمُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا وَ شٰافِعِنٰا مُحَمَّدٍ الَّذِي إِلىٰ الْحَقِ نٰادِي، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ خُصُوصاً عَلىٰ حَضْرَةِ الشَّيْخْ جُنَيْدِ الْبَغْدٰادِيِّ]

برای گوێ گر، من و تۆ تا ئێستا، زۆرمان عومری خۆمان بە فیڕۆ داو لە دەستمان چوو، وەرە با، لە چەند دەقیقەی داهاتووی عومرماندا، بچینە مەجلیس و بارەگای ئەو ئەولیا و زاتە گەورەیە، کە مەشهوورە بە سەیدی تاییفەتەین و سوڵتانی تەریقەت و ئیرشاد، شێخی «عَلىٰ الأطلاق» بوو، قوتبی بە ئیستیحقاق بوو، مەتلەعی ئەنوار بوو، مەنبەعی ئەسرار بوو، لە ئوسول و فروعدا مفتی بوو، لە شەرع و موعامەلاتدا قازی بوو، پێشەوای ئەهلی حەقیقەت و ئەوتاد بوو، مەرکەزی دایرەی ئیرشاد بوو، گاهێ غەوواسی دورڕی مەعانی بوو، سەردەمێک، مەلەوانی دەریای عیرفانی بوو، پێشەنگی دڵ ڕووناکی کاروانی شادی، «حەزرەتی شێخ جونەیدی بەغدادی»، جا، با زۆر بە ئەدەب دانیشین و بە دڵ گوێ بگرین، بۆ باسی ژیان و بەسەر هات و فەرمایشتی، ئەو زاتە بەرزەو پەند و دەرس و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«شێخ جونەیدی بەغدادی» خوشکەزای شێخ سەری سەقەتی بووە، لە شاری بەغدا، لە دایک بووە، هەر بە منداڵی ئاساری گەورەیی و زەکاوەت و زیرەکی لە

ناوچاواندا، درەوشاوەتەوە، هێشتا بە تەواوی مووی لێ نەهات بوو، کە خوێندنی تەواو کردووە.

ڕۆژێک لە گەڵ منداڵانی گەڕەک یاری دەکرد، شێخ سەری سەقەتی خاڵی، بە لایدا تێ دەپەڕێ، سەیر دەکا، «جونەید»ی خوشکەزای، یاری دەکا، بانگی دەکا، دێتە خزمەتی و دەفەرمووێ: [مٰا تَقُولُ فِي الشُّكْرِ يٰا غُـلاٰمُ؟ قٰـالَ: الشُّكْـرُ أَنْ لاٰ تَستَعِينَ بِنِعمَهِ عَلىٰ مَعٰاصِيِه]

ئەی کوڕم، تۆ مەعنای شوکر چۆن لێ ئەدەیەوە و شوکر چی‌یە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان، شوکر ئەوەیە، کە ئەوەی خوا داویەتی بە تۆ، لە گوناح و بێ ئەمری خوادا بە کاری نەهێنی، شێخ سەری ناوچاوانی ماچ کرد و فەرمووی: ئەی «جونەید»، زۆر دەترسم هونەر و بەهرەی تۆ هەر بە هۆی زمانتەوە بێ! واتە هەر عالمی زاهیری بی! ئەوەی فەرموو: ڕۆیشت. «شێخ جونەید» دەیفـەرموو: لەو قسەی خاڵم زۆر ترسام، تا ڕۆژێک دەمزانی خاڵم پێویستی بە چی هەیە، بۆم کڕی و چوومە خزمەتی، فەرمووی: مژدە بێ ئەی «جونەید»، خوای گەورە دەتکا بە پیاوی چاک، فەرمووی: چونکە لەو کاتەدا، لە بەر خوا پاڕامەوە و داوام کرد کە ئەوەی پێویستیم پێ‌یە، بۆم بە پیاوێکی چاک دا بنێرێ، کە چی بە تۆیدا نارد.

ئنجا لە خزمەت خاڵیدا، دەستی کردووە بە سلوک و ئیجازەی تـەریقەت و خەرقەی ئیرشادی لە خاڵی وەرگرتووە. شێخی جامی (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە کتێبی «نَفَحٰاتُ الأُنْس»دا دەفەرمووێ: «شێخ جونەیدی بەغدادی» فەرموویەتی: ڕۆژێک خاڵم کە ئوستادم بوو، بانگی کردم فەرمووی: «جونەید»، ئەوا ئیزنم دای، بچۆ مەجلیس گەرم بکەو دەست بکە بە ئیرشاد و ئامۆژگاری خەڵک، فەرمووی: منیش خۆم بەو پیاوە نەدەزانی توانای ئیرشادم هەبێ و ئامۆژگاری خەڵک بکەم، لەم لاشەوە نەشم دەتوانی لە قسەی ئوستادم دەرچم، ئەو شەوە، شەوی جومعە بوو، لە خەومدا بە خزمەت حەزرەتی فەخری عالەم(ﷺ) گەیشتم، فەرمووی: لە

قسەی خاڵت دەرمەچۆ، بە قسەی بکەو ئیرشادی موسوڵمانان بکە، دەفەرمووێ: بۆ بەیانی زوو، چوومە خزمەت خاڵم، هەرکە چاوی پێ کەوتم فەرمووی: تا پێیان نەگوتی: منت بە ڕاست گۆ نەدەزانی؟ دەفەرمووێ: دەستم ماچ کرد و هەر ئەو ڕۆژە چووم دەستم کرد بە ئیرشادی خەڵک و مەجلیسم گەرم کرد. دەفەرمووێ: خەبەر بە شاری بەغدادا بلاو بوەوە، کە «جونەید» بووە بە مورشید و ئیرشادی خەڵک دەکا. ڕۆژێک مەوعیزەم بۆ خەڵک دەکرد، کوڕێکی گەنجی مەسیحی لە لیباسی موسوڵماناندا، هات لە گۆشەیەکی مەجلیسەکە ڕاوەستا و ڕووی کردە من و گوتی: [أَيُّهَا الشَّيْخُ مَا مَعْنىٰ قَوْلُ رَسُولِ اللهِ(ﷺ) اِتَّقُوا فَرَاسَةَ المُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللهِ؟] یا شێخ، مەعنای ئەو حەدیسەی پێغەمبەر چییە، کە فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە زەکاوەتی ئینسانی موسوڵمان، چونکە بە نووری خوا شت دەبینێ و بە نووری خوا تەماشای شت دەکا، فەرمووی: منیش بەینێک بێ دەنگ بووم و لە پاشان ڕووم کردە کوڕەکە گوتم: کوڕم وەرە بە قسەم بکە، وەختی هاتووە کە ئیمان بێنی و موسوڵمان بی، دەفەرمووێ: کە وامگوت: فەوری کوڕەکە خۆی هاویشتە سەر کۆشم و ئیمانی هێنا، جا ئیمامی یافیعی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: «شێخ جونەیدی بەغدادی»، لە وەڵامی پرسیاری ئەو کوڕەدا، دوو جار کەشف و کەرامەتی نواندووە. یەکەم، ئەوەیە کە فەرمووی، زانیویەتی موسوڵمان نیە و گاورە. و دووەم، ئەوە بوو کە زانی ئیمان دێنێ، جا ئەوەیە مەعنای حەدیسەکەی پێغەمبەر، (دروودی خوای لە سەر بێ) کە فەرمووی، موسوڵمان بە نووری خوا دەبینێ، «شێخ جونەیدی بەغدادی»، هەر لە زەمانی ئوستادەکەی خوێندا، بە پلەو پایە گەیشت. خاوەنی کتێبی «سَفِينَةُ الأَوْلِيَا»، دەفەرمووێ: ڕۆژێک عەرزی شێخ سەری سەقەتی دەکەن، دەڵێن: ئەرێ قوربان، واهەیە خەلیفە و مورید بگاتە پلە و پایەی مورشید و ئوستادی خۆی؟ ئەویش لە وەڵامدا، دەفەرمووێ: بەڵێ: تەنانەت جاری واش دەبێ پلە و پایەی لە ئوستادەکەی

خۆشی بەرزتر دەبێ، فەرمووی: دەلیل و بەڵگەشم لە سەر ئەو قسەم، «جونەیدی بەغدادیە»، کە ئێستا، دەرجەو پایەی ئەو، لە پلەو پایەی من بەرزترە.

شێخ ئەبو جەعفەری حەداد دەفەرموویّ: ئەگەر بێتوو عەقڵی هەموو کەس بکریّ بە ڕەسم و سورەت و وێنە دەبێ لە سەر شکڵ و سورەتی «شێخ جونەیدی بەغدادی» بێ، چونکە، تا ئێستا کەسم لەو عاقڵتر نەدیوە.

«شێخ جونەیدی بەغدادی» (ڕەزای خوای لێ بێ) قەدر و حورمەتی زانایانی ئایینی زۆر لابوو، خۆی بە یەکێک لە زانایان دەزانی و هەمیشە ئامۆژگاری سۆفیەکانی دەکرد، کە لە ڕێبازی شەرع لانەدەن و قەدری عولەمای دینیان زۆر لابێ، تەنانەت خۆیشی، هەر لە لیباسی مەلایاندا بوو، ڕۆژێک کۆمەڵێک لە موریدەکانی عەرزی دەکەن، دەڵێن: قوربان، زۆرمان پێ خۆشە خەرقەی شێخانە لە بەرکەی. لە وەڵامدا دەفەرموویّ: ئەگەر بمزانیایە خەرقە لە بەرگ و لیباسی زانایان باشترە، خەرقەیێکم لە ئاگر و ئاسن دروست دەکرد و لە بەرم دەکرد. فەرمووی: بەڵام زۆر جار لە غیبەوە گوێم لە دەنگێکە دەفەرموویّ: [يَا جُنَيْدُ لَيْسَ الاِعْتِبَارُ بِالْخِرْقَةِ وَ إِنَّمَا الاِعْتِبَارُ بِالْحِرْفَةِ] ئەی جونەید، بزانە ئیعتبار بە خەرقە نیە بەڵکو بە کردەوەیە.

«شێخ جونەیدی بەغدادی» لە ناو ئەولیادا، بە گەورە و سەییدی تاییفەتەین ناو براوە. ڕاوی دەڵێ: یەکێ لە پیاو چاکان لە خەویدا، تەماشای کرد مەجلیسێکی زۆر گەورە بەستراوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) لە سەرووی مەجلیسەکە تەشریفی دانیشتووەو «شێخ جونەیدی بەغدادی» لە تەنیشتی‌یەوە بە چۆک داهاتووە، لەو کاتەدا، پیاوێک هات، پرسیارێکی شەرعی نووسی بوو بردی‌یە خزمەت پێغەمبەر، پێغەمبەر فەرمووی: بیدە بە «جونەید» با وەڵامت بداتەوە. کابرا گوتی: ئەی خۆشەویستی خوا، جا چۆن تا جەنابت حازر بێ، یەکێ‌تر وەڵام بداتەوە؟ حەزرەت فەرمووی: ئاخر تۆ نازانی و «جونەید» ناناسی. پێغەمبەرەکان

لە ڕۆژی قیامەتدا، چەند شانازی بە ئۆممەتەکانیانەوە دەکەن، من بە تەنیا ئەوەندە شانازی بە «جونەید»ەوە دەکەم.

دەڵێن: جارێک چاوی دێشا، چوون دوکتۆرێکی گاوری باشیان هێنا، تەماشای چاوی کرد و دەرمانی کرد و گوتی: یاشێخ نابێ تەڕی کەی، شێخ فەرمووی: ئەی دەست نوێژ نەگرم؟ دکتۆرەکە ووتی: ئەگەر چاوەکەت دەوێ نەخێر، نابێ تەڕی کەی و دەس نوێژ بگری، کە دوکتۆر ڕویشت، شێخ هەستا دەس نوێژێکی زۆر تەواوی هەڵگرت و دوو ڕکات نوێژی کرد و بە سوجدە دا کەوت و خەوی لێ کەوت، لە خەوەکەیدا، لە غیبەوە پێیان ووت: ئەی «جونەید»، تۆ لە بەر خاتری ڕەزای ئێمە، چاوی خۆت نەویست، ئەگەر بەو عەزم و نیازەوە، داوای لێ خۆش بوونی زۆربەی گوناح کاری ئۆممەتی پێغەمبەرت بکردایە، لێیان خۆش دەبووم. لە خەوەکەی ڕاپەڕی، بە ئەمری خوا چاوی چاک ببوەوە، ڕۆژی دووایی دوکتۆر بۆ تەداوی چاوی هاتەوە، تەماشای کرد چاوی شێخ چاک بوەتەوە زۆری لا سەیر بوو، گوتی: یا شێخ بۆ خاتری خوا پێم بڵێ، ئەوە چیت کردووە چاوت وا چاک بوەتەوە؟ «شێخ جونەید»، دەس نوێژ گرتنەکەی و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، دوکتۆر زۆر ئاقڵ بوو گوتی: یا شێخ ئاشکرا بوو کە من نەخۆش بووم و جەنابت دوکتۆری شادە و ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو.

ڕۆژێک ڕوو دەکاتە موریدەکانی و دەفەرمووێ: مورید دەبێ، دڵی وەک دڵی حەزرەتی ئیبراهیم بێ، وەک حەزرەتی ئیسماعیل تەسلیمی قەزاوو قەدەر بێ، وەک حەزرەتی داوود غەمبار بێ، وەک حەزرەتی عیسا بە فەقیری ڕازی بێ، وەک حەزرەتی ئەییوب سابیر بێ، شەوقی وەک شەوقی، حەزرەتی مووسا بێ، لە ئیخلاسی‌شدا، تابیعی حەزرەتی «محمد المصطفی» بێ، لە پاشان دۆعای کرد و فەرمووی: یارەببی خوایە، لە ڕۆژی قیامەتدا، کوێر بم تا ئەوانە نەبینم کە ڕزقی تۆیان خواردووەو بێ ئەمری تۆیان کردووە.

برای گوێ گر، پیاوی دانا و زانا و خۆ بە کەم گرووو بێ تەکەببور، وەک «شێخ جونەیدی بەغدادی» دەبێ، شێخی سەعدی، (ڕەزایی خوای لێ بێ)، لە بۆستاندا، بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: جارێک «شێخ جونەیدی بەغدادی» تووشی سەگێکی زۆر پیر دەبێ، تەماشای دەکا، کەڵپەکانی کەوتوون، جاران کە دەی‌توانی لە دەشتی عەرەبستاندا، ئاسک و کارمامز بگرێ، ئێستا لە بەر پیریان، وەک ڕێوی پیری لێ هاتووە و تەنانەت بزن و مەڕیش، حۆچی لێ دەگرن و تێی هەڵدەدەن، لە بەر پیریان و لە برسان ناتوانێ لە جێگای خۆی هەستێ، «شێخ جونەید» ئەو نانەی کە پێی بوو، کردی بە دوو بەش و نیوەی بۆ سەگەکە هاویشت و دەستی کرد بە گریان و لە بەر خۆیەوە و دەی‌فەرموو: کێ دەزانێ لە من و لەو سەگە، کێمان چاکترە؟ ڕاستە بە ڕواڵەت من باشترم، بەڵام، خوا دەزانێ قەزاو قەدەر چم بە سەر دێنێ، ڕاستە ئەگەر بە ئیمانەوە بمرم، ئەوا تاجی عەفوو لە سەر سەر دادەنێم و لەو سەگە باشتر دەبم، بەڵام، خوانەخواستە ئەگەر لیباسی تەقوا و عیبادەتم لە بەر دارنن، ئەوە من لەو سەگە کەمترم و ئەو هەزار قات لە من باشترە. فەرمووی: خۆ ئەو سەگە کە مرد، نایبەنە جەهەننەم، بەڵام ئینسان کە خراپ بوو، بە مردن نەجاتی نابێ و ئەهلی جەهەننەمە.

«شێخ جونەید» ئاوا موتەوازیع بووە، بۆیە بەو ڕوتبە و مەقامە گەیشتووە. بۆ بێ تەماعی، «شێخ جونەیدی بەغدادی»، لە ناو ئەولیادا، یەکەم بووە. ڕۆژێک، کابرایەک دەچێتە خزمەتی و هەزار دیناری لە پێش دادەنێ، «شێخ جونەید» دەفەرمووێ: بێ ئەو هەزار دینارە، پارەت لە ماڵەوە ماوە؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ: قوربان زۆرم هەیە. شێخ دەفەرمووێ: بۆ پارەی تر هەوڵ دەدەی و هیترت دەوێ؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ قوربان پیاو تا ماوە، بۆ ماڵی دنیا هەوڵدەدا. «شێخ جونەید» دەفەرمووێ: هەزار دینارەکەت هەڵگرەوە، بۆ تۆ باشترە، من هیچم نیە و هیچیشم ناوێ، هەر چەند کابرا هاوار دەکا، فائیدەی نابێ و «شێخ جونەید» هەر بە

سەریدا دەداتەوە.

دەڵێن: جارێک لە شاری بەغداد، دزێکیان هەڵاواسـی بـوو، لە داریـان دەدا، «شێخ جونەید» بەوێدا ڕۆیشت، کە چاوی پێ کەوت چوو، بەری پێی دزەکەی ماچ کرد، سۆفی و موریدان عەرزیان کرد، قوربان ئەوە چ حاڵەتێک بوو، بە سەرتا هات؟ فەرمووی: هەزار ڕەحمەت لەو دزە، کە لە کاری خۆیدا ئەوەندە بەر دەوام بووە، سەری خۆی لە سەر داناوە، حەیفە هەرچی دەی‌کەی ئاوا سەری لە سەر دانەنێیی. ئەگەر لە باسی گەورەیی «شێخ جونەیدی بەغدادی»دا، چەند لاپەڕەی تر بنوسین، هێشتا هەر تەواو نابێ. جا، با لێرەدا بزانین کە لە دیاری کـردنی ڕۆژی وەفاتیدا. چەند قەولێک هەیە، یەکێ لەو قەولانە دەڵێ: لە ڕۆژی شەممەی بیست و حەوتی مانگی ڕەجەبی ساڵی دووسەت و نەوەت و هەشتی کۆچی، لە شاری بەغدا وەفاتی فەرمووە و مـەرقەدی مـوبارەک و ئـارامگـایەکـەی زیـارەتگای موسوڵمانانە. با کۆتایی ئامۆژگاری یەکەمان، بۆ بەرەکەت، بەو چەند دۆعایە بێنین کە «شێخ جونەیدی بەغدادی»، لە کاتی خۆیدا، پێیان لە بەر خوا پـاڕاوەتـەوە، بەڵکو خوای گەورە لێمان قبوڵ بکا.

[أَللّٰهُمَّ إِنّٰا نَسْأَلُکَ أَنْ تذعُزَّنٰا وَ لاٰ تُذِلَّنٰا، وَ تَرْفَعَنٰا وَ لاٰ تَضْعَفْنٰا.؟ أَللّٰهُمَّ ٱجْعَلْ يَوْمَ مَوْتِنٰا يَوْمَ حَيٰاءٍ وَكَرٰامَةٍ وَ سُرُورٍ، وَ لاٰ تَجْعَلْهُ يَوْمَ نَدْمٍ وَ أَسىٰ وَ غُرُورٍ. أَللّٰهُمَّ ٱجْعَلْ قُبُورَنٰا رِيٰاضاً مِن رِيٰاضِ جَنَّتِکَ وَ أَمْناً فِيهٰا مِنَ ٱلرَّوْعٰاتِ يٰا جٰامِعَ ٱلنّٰاسِ لِيَوْمٍ لاٰ رَيْبَ فِيهِ. أَللّٰهُمَّ خَلِّصْنٰا مِنَ ٱلشَّدٰايِدِ وَ حٰاسِبْنٰا حِسَاباً يُسْراً وَٱحْشُرنٰا فِي زُمْرَةِ مُحَمَّدٍ صَلىٰ ٱللّٰهُ عَلَيْهِ وَ سَلَّم].

وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (١٦)
# مەنسوری حەللاج

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾
[اَلْحَمْدُ للهِ حَمْداً يُوٰافِي نِعَمَهُ وَ يُكٰافِيءُ مَزِيدَ فَضْلِهِ وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰاءِ أُمَّتِهِ وَاَلتّٰابِعِينَ اِلىٰ يَوْمِ قِيٰامِ عَدْلِهِ]

ئەی ئەو کەسانەی کە ئامۆژگاری و خوێندنەوەی باسی پیاو چاکانتان پێ خۆشە، وەرن با مۆمی عومرمان، لەم چەند دەقیقەی داهاتوودا، هەڵکەین و شریتی بیرمان، بخەینە سەر تەسجیلی دڵمان و بچینە مەجلیسی شێری بێشەڵانی تەحقیق، سەرداری شەهیدانی تەریق، لە سەحرای خواپەرستیدا، شارەزاو لە بەحری مەعریفەتدا، غەریق، قارەمانی مەیدانی حەق ناسی، پاسەوانی خەرمانی دوڕ ناسی. شۆڕە سواری ڕێگای ویلایەت، مەلەوانی دەریای دیرایەت، لە فەساحەت و بەلاغەتدا، سەحبانی وائیل شاگردی، نە زاناکان پەیان بە عیلمی ئەو دەبرد، نە ئەولیا دەیان شکاند گەردی، پەتی سێدارەی نایە سەر، وەک تاج، سەرداری سەر دار، «حوسەین مەنسوری حەللاج». جا، با بە ئەدەب دانیشین و بە دڵ گوێ بگرین بۆ هێندێک باسی ژیان و بە سەرهاتی ئەو عاشقی بازاری [أَنَا اَلْحَقّ]ە و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

کاری ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە زۆر عەجایب و سەر سام ئاوەر بووە. ژیان و بە سەرهاتی، بوەتە مەیدانی تاقی کردنەوەی بیر و هۆشی تەواوی زاناو ئەولیا، پیاوێکی تا بڵێیی عالی هیمەت و قسەزان و بلیمەت بووە، کە کەوتوەتە بازاڕی

بۆیژی دانیشتوانی دەوروبەری، واقیان وڕماوە و زاناکان لە بەرامبەریدا، زمانیان لاڵ بووە، زانا و دانا و شێخ و مەشایخ دەربارەی «مەنسوری حەللاجە»وە، بوونە چەند دەستە، دەستەیەکیان وەکو شێخ عومەری کوڕی عووسمانی مەکی و شێخ ئەبوو یەعقووبی زەجوری و شێخ عەلی ئیسفەهانی و کۆمەڵێکی تریش ئینکاری «مەنسوری حەللاج»یان کردووەو تەنانەت هێندێکیان بە ساحیریان ناو بردووە. جەماعەتێکی تر وەک شێخ ئەبوو بەکری شبلی و شێخ ئیبنوو عەتار و شێخ عبدالله خەفیف و شێخ ئەبول قاسمی نەسرئابادی و شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر و «شێخ الإسلام خواجە عبداللهی» ئەنساری و شێخ ئەبول قاسمی گورگانی و شێخ پیر عەلی و شێخ ئەبوو عەلی فارمەدی و شێخ یووسفی هەمەدانی، بە ڕاستیان زانیوە و لایان خواناسێکی زۆر گەورە بووە. بەڵام ئوستاد ئەبولقاسمی قوشەیری، فەرموویەتی: من دەربارەی «مەنسوری حەللاج» دوو دڵم، نازانم پلە و پایەی چۆن بووە.

«مەنسوری حەللاج»، لە ئەسڵدا، خەڵکی گەڕەکێک لە شاری شیراز بووە، بە ناوی «بەیضاء»، کە شێخ عبداللهی خاوەنی تەفسیری بەیزاویش، هەر خەڵکی ئەو گەڕەکە بووە، بۆیە دەڵێن، قازی بەیزاوی.

«مەنسوری حەللاج»، لە عومری هەژدەساڵیدا، چوەتە «تستر» و دوو ساڵ، لە خزمەت شێخ عبداللهی تەستەری ماوەتەوە، لە پاشان هاتوەتە شاری بەسرە، لە وێوە هاتوەتە شاری بەغدا، کە مەرکەزی ئەولیا بووە، ئنجا چوەتە خزمەت شێخ عەمری کوڕی عووسمانی مەکی و هەژدە مانگ لە خزمەتیدا، ماوەتەوە و شێخ ئەبوو یەعقووب، کچی خۆیی داوەتێ، لەو ماوەیەدا، بە دزی شێخ عومەری ئوستادی نامیلکەیەک لە عیلمی تەسەووفدا دەنووسێ و نیشانی موریدەکانی شێخیان دەدا، شێخ کە خەبەر دەزانێ، زۆری پێ ناخۆش دەبێ، دۆعای لێ دەکا و دەفەرمووێ: یاڕەببی «مەنسور» خوای گەورە، زاڵمێکت بۆ بنێرێ، چاوت

دەریێنێی و لە سێ دارەت بدا. جا دەڵێن: ئاخری کە حاڵی گۆڕا و لە دار درا، هەر لە ئەسەری دۆعای مامۆستایەکەیەوە بوو.

«مەنسوری حەللاج» دنیای ئەو سەردەمەی زۆر پشکنیوە، چوەتە خۆراسان، ماوەیەک لە ماوەرائونەهر بووە، لە پاشان چوەتە خوزستان، بەینێک چوەتە کرمان و سیستان، دوبارە چوەتەوە فارس، واتە شیراز و دەور و بەری، چەند کتێبێکی لەوێ داناوە، لە پاشان هاتوەتە ئەهواز، چوەتە هێندوستان و چوەتە چین و ماچین، لە وێوە گەڕاوەتەوە بۆ مەککە و دوو ساڵ لەوێ ماوەتەوە، ئنجا هاتوەتەوە بۆ بەغدا، بەڵام کە گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا، بە تەواوی حاڵی گۆڕاوە، شتی وای کردووە. زۆر لە زانایان دەیانگوت: فاسقەو و لە شەرع لای داوە «مەنسوری حەللاج» کەشف و کەرامات و خەواریقی وای دەنواند، زۆربەی شێخ و مەشایخ تێیدا، سەرسام دەبوون و سەریان سڕ دەما

ڕاوی دەڵێ: خۆ وەنەبێ «مەنسوری حەللاج» هەللاجی کردبێ و ناویان نابێ (مەنسوری حەللاج)، بەڵکو ڕۆژێک دەچێتە سەر دووکانی کابرایەکی هەللاج و کابرا بۆ ئیشێک دەنێرێ. تا کابرا دەگەڕێتەوە هەر بە قامک ئیشارە دەکا، بە ئەمری خوا تەواوی لۆکەکە بە ئیشارەی قامکی دەکرێتەوە، جا لەوەوە ناویان نا «مەنسوری حەللاج».

دەڵێن: هەموو شەوو، ڕۆژێک چوار سەت ڕکاتی نوێژ دەکرد. جارێک عەرزی دەکەن، قوربان جا تۆ کە گەیشتوویە ئەو پلەو مەقامە، بۆ خۆت ئەوەندە نارەحەت دەکەی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: کەسێک بە ڕاستی خوا پەرست و پیاوی خوا بێ، فەرقی ڕەنج و ڕاحەت زۆر ناکا، چونکە پیاوی خوا فانی سیفەتە خۆشی و ناخۆشی تەئسیری تێ ناکا.

جارێک لە گەڵ چەند مورید، بە چۆڵ و بیابانێکدا دەڕۆن. موریدەکانی عەرزی دەکەن، دەڵێن: یا شێخ زۆرمان حەز لە هەڵوایە. ئەویش دەفەرمووێ:

سەبرتان بێ، بۆتان پەیدا دەکەم. شێخ تۆزێک خۆی دوور خستەوە و زۆری نەخایاند، هاتەوە سینێکی پڕ لە هەڵوای گەرم لە پێش دانان و فەرمووی: فەرموون، ئەوە هەڵوا. موریدەکان زۆریان لا عەجایب بوو، عەرزیان کرد قوربان ئەو جۆرە هەڵوایە لە «باب الطاقه»ی بەغدا نەبێ دەس ناکەوێ، ئەوە لە کوێت پەیدا کرد؟ لە وەڵامیاندا گوتی: لای من «باب الطاقه»ی بەغدا و سەحرا و بیابان هەر یەکە، ئێوەش هەر خواردنتان لە سەرە، دەنگ مەکەن و بخۆن. ڕاوی دەڵێ: لەو کاتەدا کە ئەوان لەو سەحرایە تارەزوی هەڵوا دەکەن لە «باب الطاقه»ی بەغدا، هەڵوا فرۆشێک چەند سینی هەڵوا بۆ فرۆشتن دادەنێ، کاتێ دەڕوانێ سینێکی هەڵوا نەماوە، زۆری لا سەیر دەبێ، بەڵام لای کەس دەنک ناکا، چونکە تا ئەو کاتە کەس نایەتە لای تا شکی دزی لێ بکا، بەڵام لەوە سەیرتر ئەوە دەبێ لە پاش بەینێک کاتێ ئاوڕ دەداتەوە سینیەکەی بە بەتاڵی لەوێ دانراوەتەوە، ئەوەندەی تریش سەری سڕ دەمێنێ.

کاتێک «مەنسوری حەللاج» و موریدەکانی لە سەفەرەکەیان دەگەڕێنەوە و موریدەکان باسی هەڵواکە بۆ خەڵک دەگێڕنەوە، کابرای هەڵوا فرۆش هەواڵ دەزانێ و دەچێ لە گەڵ موریدەکان، ڕۆژەکان لێک دەدەنەوە، دەر دەکەوێ کە هەڵوا وون بونی ئەم، لە گەڵ ڕۆژی هەڵواکەی ئەوان، هەر یەک ڕۆژ بووە. کابرای هەڵوا فرۆش دەچێتە خزمەت «مەنسوری حەللاج» و دەبێتە یەکێک لە مووریدەکانی.

ڕۆژێک قسەی بۆ موریدەکانی دەکرد، گوتی: جارێک حەزرەتی مووسا (عَلىٰ نَبِيِّنا وَ عَلَيْهِ السَّلامُ) تووشی شەیتان دەبێ و دەفەرمووێ: ئەی دەرکراو لە قاپی ڕەحمەتی خوا، ئەوە بۆ سوجدەت بۆ ئادەم نەبرد تا تۆقی لەعنەتت لە گەردن نەکرایە. گوتی: شەیتان وەڵامی حەزرەتی مووسای دایەوە و گوتی: یا مووسا من وەکو تۆ، ڕووم لە خوا وەرنەگێڕا، تا تەماشای غەیری خوا بکەم. گوتی: تۆ کە

داوای دیداری خوات کرد، لە وەڵامدا گوتیان: تەماشای ئەو کێوە بکە، تۆ ڕووت لە خوا وەرگێڕا تەماشای کێوەکەت کرد، بەڵام کاتێ بە منیان ووت: سوجدە بـۆ ئادەم بەرە، من لە وەڵامدا گوتم: ئەی خوای گەورە بۆ تۆ نەبێ، من سوجدە بـۆ کەسی‌تر نابەم. نەمزانی کە شەرت، بێ ئەمری نەکردنە.

جارێک زانایەک دەڵێ: ئەی شێخ حوسەینی مەشهور بە «مەنسوری حەللاج» لە بارەی حەزرەتی مووساوە ڕەئیت چۆنە؟ دەڵێ: حەزرەتی مووسا لە سەر حەق بوو. ئنجا دەڵێ: ئەی فیرعەون، دەڵێ: ئەویش هەر لە سەر حـەق بـوو. زانـاکـە وەڵامەکەی زۆر لا سەیر دەبێ، دەڵێ: جا چۆن هەر دووکیان هەر لە سەر حەق بوون؟ «مەنسور حەللاج» دەڵێ: ئاخر تۆ نازانی کە حەزرەتی مووسا و فیرعەون، دوو سینفی لێک جیاواز بوون، لە ڕۆژی ئـەزەلدا، ئـەمیان وا دروست کـراوە و ئەویشیان وا، دەبێ هەر کەس بۆچی دروست کرابێ و چی بۆ دانرابێ هەر ئەوە بکا. چونکە شتی وای دەگوت و شتی وای نیشان دەدا، زۆر لە زانایان لایان وابوو «مەنسوری حەللاج» لە شەریعەتی ئیسلام بە تەواوی لای داوە.

ڕۆژێک جەزبەی گرتبوو، لە بازاڕێکی تردا بوو، مەستی بادەی ئەلەستی بوو، سووتاوی عەشقی مەعنەوی بوو، تێکەڵ بە نووری ئیلاهی بوو، شای بە سەپانی خۆی نەدەزانی، هاواری دەکرد و دەی‌گوت [أَنَا الحَقّ] واتە من حەقم. هێندێک لە زانـایانی ئـەو سـەردەمە، مـەعنای ئـەو دوو کـەلیمەیان والێکـدایـەوە گـوتیان: «مەنسوری حەللاج» گوتوویەتی: من خوام وخۆی کافر کردووە. چوون لە لای خەلیفەی بەغدا کە لەو کاتەدا [اَلْمُقْتَدِرِبِالله] بـوو، شکـایەتیان لێ کـرد. خـەلیفە ئەمری کرد بە وەزیر، کە ناوی عەلی کوڕی عیسا بوو گرتیان و خستیانە زیندانەوە، ساڵێک لەوێدا مایەوە، زۆر لە مووریدەکانی هات و چۆیان هەر دەکرد، ئاخری مەنعی مولاقات و هات و چۆشیان کرد.

دەڵێن: بەندیخانە کە سێ سەت زیـندانـی تـێدا بـوو، شـەوێک ڕوو دەکـاتە

بەندی‌یەکان و دەڵێ: دەڵێن چی ڕزگارتان بکەم؟ ئەوانیش گاڵتەی پێ دەکەن و دەڵێن: ئەگەر ئەوەندە ئازای، بۆ خۆت ڕزگار ناکەی! لە وەڵامدا گوتی: ئاخر من خواگیرم و لە بەندیخانەی خوادام و ئاگاداری شەریعەت دەکەم، گرتنی من چەند ئەسراری تێدایە، وەک هی ئێوە نیە، گوتیان دەباشە فەرمووو ڕزگارمان بکە. ئەڵێن بە دوو قامک ئیشارەی کرد، بە ئەمری خوا، تەواوی پێوەند و کەلەپچە کانی دەست و قاچیان لێک ترازان و کرانەوە، هەستانە سەر پێ و گوتیان، جا باشە بە کوێدا بڕوێن، خۆ هەموو دەرگاکان داخراون؟ «مەنسوری حەللاج» لە بەر خۆیەوە شتێکی خوێند و ئیشارەیێکی تری کرد، دەرگا کەوتنە سەر پشت، عەرزیان کرد قوربان دەفەرموو تۆش وەرە لە گەڵمان. فەرمووی: ئاخر خوای گەورە عیتابم لێ دەگرێ، ناتوانم بێ ئەمری بکەم. بەندییەکان ڕزگاریان بوو، ئەو هەواڵەیان دا بە خەلیفە، خەلیفە زۆر توورە بوو، گوتی: هەر ئێستا دەبێ دارکاری بکەن. چوون سێ سەت داریان لێدا. ئەو کابرایە کە «مەنسوری حەللاجی» دارکاری کردووە، گێڕاویەتەوە و سوێندی خواردو و گوتویەتی: لە گەڵ هەر دارێک کە لێمان ئەدا، گوێم لێ بوو دەنگێک لە غەیبەوە دەهات و دەی‌گوت: [يَا حُسَينُ بن مَنْصُورٍ لاَ تَخَفْ] ئەی حوسێنی کوڕی مەنسور مەترسە.

ئنجا ئەوەندەیان لای خەلیفە باسی «مەنسوری حەللاج» بە خراپە کرد و زانایان ڕەخنەیان لێ گرت، تا ڕۆژێک خەلیفەی بەغداد تەواوی دانا و زانا و ژن و پیاوو پیر و گەنجی شاری بەغدای کۆ کردەوەو چەند عالمی زاهیری، فتوای کوشتنی «مەنسوری حەللاجیان» داوو خەلیفە ئەمری کرد بێنن لە داری بدەن و چاوی دەربێنن و سەری ببڕن بۆ پەند و عیبرەت. کاتێ چوون هێنایان بۆ سەربڕین و لەدار دان، زۆر بە لەنجە و لار دەڕۆیشت و پێدەکەنی و ئەو شیعرانەی دەخوێندوەو و دەی گوت:

نَدِيمِی غَيْرُ مَنسوبٍ إلیٰ شَیءٍ مِنَ الحَيفِ      سَقَانِي مِثْلَ مَا يَشرِبُ كَفِعْلِ الضَّيْفِ بِالضَّيْفِ

فَـلَمّا دارَتِ آلكَأْسُ داعاً بـالقَطعِ وَآلسَّـيفِ    كَذا مَنْ يَـشْرِبُ آلرّاحَ مَـعَ آلتِّـنِينِ بِـالصَّيْفِ

واتە ئەی خەڵکینە، ئاگادار بن و بزانن کە حەریفی مـن رژد و بـەخیل نـیە. شەرابێکی دامێ وەک ئەو شەراب و شەراب دانەی کە میوان دەیدا بە میوان و دەربەست نیە، کاتێ چەند دەوری شەراب گێڕا، زنـجیر و شـیری داوا کـرد تـا دووبارە بە جۆرێکی‌تر سزام بداتەوە. ئاوایە پاداشتی کەسێک لە هاویندا، لە گەڵ مار شەراب بخواتەوە، یا مەعنای ئاوایە، پاداشتی کەسێک لە مـانگی تـەموزدا شەرابی کۆن بخواتەوە.

ئەو ڕۆژە وەک ڕۆژی قیامەت بوو، دەت گوت: جەنگی مەغلووبەیە، دەنگی شین و گریانی خەڵک سەحرای عەرەبستانی پڕ کردبوو. کاتێ بردیانە بـن سـێ دارە، سێ دارەکەی ماچ کرد، خەڵک ئەوەندەی تریش هاواریان بەرز بووە، لەو کاتەدا گوتیان: حاڵت چۆنە؟ بە زەردە خەندەوە وەڵامیدایەوە گوتی: مـیعراجـی مەردان سەر دارە. یەکێ لە موریدەکانی بە گـریانەوە ووتـی: قـوربان مـورید و مونکیری تۆ پاداشتی قیامەتیان چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەی منی بەردباران کردوەو من لە سێ‌دارە دەدا دوو ئەجر و پاداشتی هەیە، بەڵام ئێوە هەر ئەجرێکتان دەست دەکەوێ. موریدەکە زۆری لا عەجایب بوو گوتی: قوربان جـا چـۆن وادەبـێ؟ فەرمووی: ئاخر ئەوەی موریدی من بووە، هەر حوسنی زەننی بە من بووەو لای وا بووە من پیاوێکی باشم، بۆیە دوام کەوتووە، بەڵام ئەوەی من بەرد باران دەکا و دەمکوژێ ئەوە ئیمانی بە قووەتەو دەڵێ: شـەرع فتوای کـوشتنی داوە، کـە واتـە ئەوان ئەسڵی تەوحید بە کاردێنن و ئێوە حوسنی زەن، دیارە تـەوحید ئـەسڵە، پاداشتی زۆرترە، بەڵام حوسنی زەن فەرعە، پاداشتی کەمترە.

لەو کاتەدا قازی فـتوای دا، گـوتی چـونکە «حـوسین مـەنسوری حـەللاج» [أَنَاآلحَقّ]ی گوتووە، خۆی کافر کردووەو کوشتنی دروستە. خەلیفە ئەمری کرد سەنگبارانی بکەن و لە داری بدەن، لەو کاتەدا کە پیاوەکانی خەلیفە و خەڵک بەرد

بارانیان دەکرد، شێخ ئەبوویەکری شبلی چوو گوڵێکی پێدا. (مەنسوری حەللاج) هەناسەیێکی هەڵکێشا و زۆری پێ ناخۆش بوو. عەرزیان کرد ئەوە بۆ خەڵک بەرد بارانت دەکا، دەنگ ناکەی، بەڵام بۆ گوڵ باران کردنی شێخ ئەبوویەکری شبلی هەناسەت هەڵکێشا و نارەحەت بووی؟ فەرمووی: ئاخر ئەو خەڵکە مەعزوورە، چونکە نازانن من چیم. بەڵام شێخ ئەبوویەکری شبلی دەزانێ کە کوشتنی من دروست نیە، بۆیە گوڵەکەی ئەوم لە بەردی خەڵک پێ ناخۆشترە.

ئەی لەو بێ ڕەحمی‌یە! هاتن دەستی ڕاستیان بڕی. بە دەستەکەی تری خوێنەکەی لە دەم و چاوی خۆی هەڵسوو. گوتیان: ئەوە بۆ دەم و چاوت خوێناوی دەکەی؟ لە وەڵامدا ووتی: دەزانم خوێنم زۆر لە بەر ڕۆیشتووەو ڕەنگم زەرد بووە، دەم و چاوم سوور دەکەم تا خەڵک وانەزانێ دەترسم و حوکمی شەرعم پێ ناخۆشە، با دەم و چاوم هەر سوور و گەش بن، شین و گریانێک بوو مەگەر خوا بزانێ، کەس ئاگای لە کەس نەمابوو.

ڕاوی دەڵێ: هەر دڵۆپە خوێنێک کە دەتکایە سەر ئەرز، بە عالەمی ئاشکرا زۆر کەس گوێیان لێ بوو دڵۆپە خوێنەکەی دەی گوت: [أَنَا ٱلحَقُّ].

کە دەکەوتە سەرزەویش وەکوو بە قەڵەم بینووسی دەنووسرا [أَنَا ٱلحَقُّ].

ئنجا لەو حاڵەتەدا، کە زۆربەی خەڵک خۆیان بۆ ڕانەدەگیرا، تەواوی بەدەنی «مەنسوری حەللاج» لە خوێندا شەڵاڵ بوو بوو، ڕووی کردە ئاسمان فەرمووی: ئەی خوای گەورە، ئەو خەڵکە بۆ ڕەزای تۆ، بە ئەمری شەرعی تۆ، من بەردباران دەکەن و دەمکوژن، خوایە داوا دەکەم، کە بێ ئەجر و پاداشتیان نەکەی.

دەڵێن: هێشتا سەریان نەبڕی بوو، بانگی پیاوێکی خەلیفەی کرد، فەرمووی: کە سەرتان بڕیم زوو ئەو جبەی منە بەرە پێش ئاوی دجلە، با نەیێتە جۆش و غەزەب نەگرێ و بەغدا، لە بەین نەچێ! ئاخری سەریان بڕی و شەهیدیان کرد و سووتاندیان و خەریک بوون خۆڵەکەی بکەنە ناو ئاوی دجلە، کاتێ بە خۆیان

زانی، دجلە توغیانی کرد و شالاوی هێنا، ئەگەر جبەکەیان بەرەو پیری نەبردایە، بەغدای لە بەین دەبرد، بەڵام کاتێ بردیانە پێش ئاوەکە، بە ئەمری خوا ساکین بوو ڕاوەستا. ئەو کارەساتە دڵ تەزێنە لە ڕۆژی سێشەممەی بیست و پێنجی قوربانی ساڵی سێ سەد و نۆی کۆچی، لە شاری بەغدا دا ڕوی داوە.

گوێ گرینە بە ڕاستی بە سەرهات و کارەساتی «حوسێن مەنسوری حەللاج» ئەوەندە سەر سام ئاوەرو دڵ تەزێنە، ئێنسان تا بیری لێ بکاتەوە، زیاتر تێیدا سەر گەردان و سەراسیمە دەبێ، بەڵام بە ڕاستی دەبێ ئێمە پەند و عیبرەت و ئامۆژگاری زۆری لێ وەرگرین و لە بەرامبەر حەق و حوکمی شەرعدا، سەری تەعزیم دانەوێنین. جا، با لە بەر خواوەندی گەورە وەپاڕێین کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی عەفوومان کا. لە ڕێگای شەرع لامان نەدا. لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکا. لە بەڵاو موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین [يَا رَبَّ الْعَالَمِينْ]

وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (١٧)
# حەبیبی عەجەمی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلىٰ دِينِ الْإِسْلاٰمِ، وَ صَلىٰ اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ خَيْرِ الأَنٰامِ، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ أُمَّتِهِ الكِرٰام، وَ عَلىٰ أَتْبٰاعِهِ مِنَ الْيَوْمِ إِلىٰ يَوْمِ الْقِيٰامِ]

موسوڵمانینە، خواوەندی گەورە، لە سورەی حوجوراتـی قـورئانی پـیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقٰاكُمْ﴾ بە ڕاستی خۆشەویسترینی عەبد و بەندەگان، لە ئێوە لای خوا، ئەو کەسەیە تەقوا و عیبادەت و پەرهێزگاری زۆرتر بێ، جا، با لە هەر نەتەوەیەک بێ، بە هەر زمانێک بدوێ و لە سەر هەر شکڵ و سورەتێک بێ.

*حسن ز بصره و بلال از حبش و سهیل از روم وین بوالعجب، ز خاک مکه، بولهب زاید*

خۆ پیاوی چاک مەعنای ئەوە نیە، هەر خزمی پێغەمبەر بێ، حافیزی شیرازی دەڵێ: تۆ تەماشای کاری خوا بکە، شێخ حەسەنی بـەسری لە بـەسرە و بـیلالی حەبەشی لە حەبەشەو سوهەیبی ڕۆمی لە ڕۆم دەبێ! بەڵام لە شاری مەککە و لەماڵی خوا و لە خزمی پێغەمبەر ئەبولەهەب دەبێ!

جا، با بۆ وێنە، لە چەند دەقیقەی داهاتوودا بچینە مەجلیسی یەکێ لە ئەولیای خوا، کە لە کاتی خوێیدا وەلی گومبەزی غیرەت بوو، سەر دەفتەری مـەجلیسی وەحدەت بوو، خاوەنی ڕاستی و هیمەت بوو، چرای تـاریکی خـەڵوەت بـوو، هێندی جار زۆر دوور لە ویجدان بوو، سەردەمێک دەوڵەمەندێکی ناودار بوو،

زەمانێک باوکی دەیان فەقیر و هەژار بوو، ئەو زاتە گەورە و وەلی‌یە جەنابی «شێخ حەبیبی عەجەمی‌یە».

جا تکایە بە گوێی دڵ گوێ بگرن و بزانن کاری خواوەندی گەورە چۆنە! ئەگەر ویستی بەندەیەک پێ بگەیێنی چۆنی هیدایەت دەدا.

«شێخ حەبیبی عەجەمی» لە ئەووەڵی ژیانیدا، یەکێک بوو لە بازرگانە سوود خۆرەکان، بە سوود نەبایە، شتی نەدەفرۆشت، زۆر دەوڵەمەند و ماڵ دار بوو، بەڵام زۆر ڕژد و بەخیل و بێ خزمەت بوو، نانێکی بە خۆڕایی نەدەدا بە بابیشی، تەنانەت ماڵ و منداڵی خۆشی قەت تێر نەدەکرد. عادەتی وابوو، قەرزی لە سەر هەر کەسێک بوایە، کە لە کاتی خۆیدا بۆی نەهێنابایەوە، خۆی دەچوو بۆ ماڵی قەرز دارەکەو سەرە ڕای قەرزەکەشی، کرێی ڕێگاشی لێ دەستاند، جارێک بۆ قەرز وەرگرتنەوە دەچێ بۆ ماڵێک خاوەن ماڵ، لە ماڵ نابێ، ژنەکەی دەڵێ، مێردەکەم لە ماڵ نیە و هیچیشمان نیە بتدەمێ، ئەویش دەڵێ، تا شتێکم نەدەیتێ نارۆم، ژنە دەڵێ: لەم ڕۆژانەدا مەڕێکمان کوشتوە،تەوە ملەکەی ماوە، ئەگەر ئەتەوێ بیبە، دەڵێ، لە دەستی خاڵی هەر باشترە، بی‌هێنە، ژنەکە بۆی دینێ و دەی باتەوە بە ژنەکەی دەڵێ، ئەوە لە باتی کرێی ڕێگا وەرم گرتووە، مەنجەڵ بێنە وە سەری نێ. ژنەکەی تووڕە دەبێ و دەڵێ، جا خۆ دارمان نیە ئاگری پێ بکەمەوە و نانیشمان نیە تێی گوشین، ئەویش دەڵێ: ئافرەت تووڕە مەبە، سوود و سەلەم خۆش بێ، هەر ئێستا بۆت پەیدا دەکەم، دەڕوا دەچێتە سەر قەرزدارێک، پارەکەی نابێ بیداتەوە، لە باتی کرێی ڕێگا، نان و داری لێ دەستێنێ و دێتەوە دەڵێ، دەتا زووە سەری نێ، ژنە ئاگری کردەوە مەنجەڵی سەرنا، ڕاوی دەڵێ: چێشت کوڵی و مەنجەڵیان داگرت چێشت تێکەن، لەو کاتەدا، سواڵ کەرێک لە دەرگای‌دا، گوتی، خێرتان دەگا، چۆڕێکم چێشت بۆ تێکەن، «حەبیب» زۆر بە ناشیرینی ووتی: بڕۆ چێشتی چی، کابرای فەقیر بە نائومێدی گەڕایەوە، کاتێ ژن کەوچکی خستە ناو

مەنجەڵەوە چێشت تێکا، دوو دەماری مل و خوێناو نەبێ، مەنجەڵ هیچی تری تێدانیە، بانگی «حەبیب» دەکا و دەڵێ، وەرە ماڵ نەوێران بزانە بە هۆی شوومی و خراپی خۆمانەوە چی ڕووی داوە؟ کە ئەو حاڵەتەی دی، بە ئەمری خوا ئاگرێکی لە دڵ بەر بوو، قەرار و ئارامی نەما، وەک ماسی سەر ووشکی لێ هات، لە دڵی خوێیدا بڕیاری داکە جارێکی تر سوود و سەلەم نەکا و هەر پارەیێکی لای خەڵکە وەری گریتەوە! ڕۆژی دوایی ڕۆژی جومعە بوو، لە ماڵ هاتە دەرەوە لە ڕێگادا تووشی کۆمەڵێک منداڵ بوو، یاریان دەکرد، گوێی لێ بوو خۆ بە خۆ لە بەرخۆیانەوە بە یەکتریان دەگوت: منداڵینە «حەبیبی» سوود خۆر هات. دوور کەونەوە، با تۆزی پێی ئەوتان وێ نەکەوێ و وەک ئەو بەدبەخت بن. کە ئەوەی لە منداڵەکان بیست زۆر ناڕەحەت بوو، زۆری بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە، هەر لەوێ بە یەکجاری بڕیاری دا کە جارێکی تر نەچێ بە لای قەرزدارەکانیدا ڕۆیی بۆ مەجلیسی شێخ حەسەنی بەسری. لەو کاتەدا شێخ حەسەنی بەسری خەڵکێکی زۆری لە خزمەت بوو، ئامۆژگاری دەکردن، مەوعیزە و ئامۆژگارییەکەی شێخ حەسەن لە دڵی «حەبیبی عەجەمی»دا زۆر کاریگەر بوو، تا شێخ حەسەن لە مەوعیزەکەی بووەوە، ئەو هەر گریا، لە پاشان هەستا چوو دەستی شێخ حەسەنی بەسری ماچ کرد و لە سەر دەستی شێخ حەسەن تۆبەی کرد و بەرەو ماڵ گەڕایەوە. لە ڕێگادا یەکێ لە قەرزدارەکانی چاوی پێ کەوت، خەریک بوو لە ترسانا ڕاکا، «حەبیبی عەجەمی» بانگی کرد و گوتی: وەرە، ڕامەکە، گەردنت ئازاد بێ و گەردنم ئازاد بکە، لە ئیمڕۆ بەدواوە، دەبێ من لە بەر تۆ ڕاکەم، کابرا زۆری پێ خۆش بوو.

وەختێ بە لای منداڵەکاندا هاتەوە، گوێی لێ بوو بە یەکتریان دەگوت، بەولاوە بڕۆن، تۆبەی کردووە، با تۆزی ئێمەی لێ نەنیشێ و بێ ئەدەب نەبین، کە ئەوەی بیست گریا و ڕووی کردە ئاسمان و گوتی، ئەی خوای گەورە بە ڕۆژێک، ئاشتی ئاوات خۆشەویستی من خستە دڵی خەڵکەوە، گوتی: یا ڕەببی قەت لە شوکرانەی

تۆ دەرناچم. ئنجا چووەوە ماڵەوەو بۆ بەیانی جاڕیدا، کە هەرکەسێک حەقێکی بە سەرمەوەیە، با بێ حەقی خۆی وەرگرێتەوە، هەر سوود و سەلەمێک کرد بووی، دایەوە بە خەڵک و حەقی کەسی نەهێشتەوە.

خاوەنی کتێبی «حِلْيَةُ الأَوْلِيا» دەفەرمووێ: ڕۆژێک دە هەزار دیرهەمی کردە خێر، ڕۆژی دوایی دەهەزاری تری لە شوکرانەی ئەوەی کە خوای گەورە ڕۆژی پێشوو هیدایەتی دا خێر بکا، کردی بە خەیر، ڕۆژی سێیەم گوتی ئەی خوای گەورە، ئەگەر خێرەکەی دوێنێت لێ قبووڵ کردووم، با ئەو دەهەزارە، لە شوکرانەی ئەو دابێ. دەفەرمووێ: بەو پارە و خێرە نەفسی خۆی کڕیەوە، ئنجا هات لە قەراغ ناوی فورات، عیبادەتگایێکی بچووکی دروست کرد و دەستی کرد بە خوا پەرستی و بە تایبەتی بە ڕۆژ، بە زۆری دەچوە خزمەت شێخ حەسەنی بەسری دەرسی دەخوێند و گوێی لە فەرمایشتەکانی دەگرت و ڕۆژ، لە دوای ڕۆژ دڵی ڕووناکتر دەبوو.

تا دوێنێ بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، ئیمرۆ دەوڵەمەندی سەر بەر ماڵە، سەروەت و سامانی دنیای نەما، بوو بە سەرمایەداری قیامەتی.

لە ئاخیردا، ڕۆژی تا ئێوارە دەچوە عیبادەتگایەکەی و شەو دەهاتەوە بۆ لای خێزانەکەی، ڕۆژێک ژنەکەی بە تورەییەوە دەڵێ: هیچمان نیە، هەوڵێ بدە با نەمرین لە برسان. ئەڵێ: باشە، دەڕوا بۆ مزگەوتەکەی دەست دەکا بە نوێژ، ئێوارە دێتەوە، ژنەکەی دەڵێ: کوا چیت پەیداکردووە؟ ئەویش دەڵێ: ئافرەت ئیمرۆ کارم بۆ زاتێکی زۆر گەورەو خاوەن دەسەڵات کرد، بە ڕاستی حەیام کرد کە داوایی کرێکەی لێ بکەم. بۆ بەیانیش چووەوە مزگەوتەکە و دەستی کردەوە بە نوێژ، ئێوارە کە چووەوە دووبارە ژنەکەی گوتی: ئیمرو چیت پەیداکردووە؟ گوتی: ئافرەت هەر بۆ زاتەکەی دوێنێم کار کردووە، ئەو پێویستی بە پێ گوتن نیە، بە بێ پرس دەی نێرێ.

خوولاسە تا چەند ڕۆژ ئاوا ڕایان بوارد، ئێوارەیەک کە چوەوە ماڵەوە، لە دوورەوە بۆنی چێشتی کرد، گوتی: یا خوا خێر بێ، ژنەکەی لە دوورەوە بەرەو پیری هات و گوتی: ئەوە تۆ ئەو چەند ڕۆژە ئیشت بۆ کێ کردووە؟ بە ڕاستی دیارە زۆر خاوەن کەرەمە، دوانیوەڕۆ ئارد و گۆشت و ڕۆنی بە پیاوەکەی خۆیدا بۆ نارد بووین، گوتبوشی بە «حەبیبی عەجەمی» بڵێن: ئەوە کرێی ئەو چەند ڕۆژەیە، تا ئەو کارەکەی زیاد بکا، ئێمەش کرێکەی زیاد دەکەین. «حەبیبی عەجەمی» کە ئەوەی چاو پێ کەوت، بە تەواوی ڕووی کردە خوا پەرستی و سوجدەی شوکری بردو ئاخری بوو بە یەکێ لە ئەولیای خواو بوو بە یەکێ لە پیاوە بەرزەکانی ئیسلام.

ڕاوی دەڵێ، ماڵی «حەبیبی عەجەمی»، لە شاری بەسرە لە سەر چوار ڕیانێک بوو، «شێخ حەبیبی عەجەمی» عەبایەکی پێستی هەبوو، ڕۆژێک خەریکی دەس نوێژ دەبێ، عەباکەی لە سەر ڕێگا یەکیان دادەنێ، لەو کاتەدا، شێخ حەسەنی بەسری بەوێیدا دێ، تەماشا دەکا عەباکەی «حەبیبی عەجەمی» لە سەر ڕێگا دانراوە، دەفەرمووێ: ئەوە عەباکەی «حەبیبی عەجەمی»یە لێرە کەوتووە، با بۆی ئاگاداری بکەم تا دێتەوە. کاتێ دێتەوە، تەماشا دەکا شێخ حەسەنی بەسری لای عەباکەی وەستاوە، زۆری لا سەیر دەبێ، دوای دەست ماچ کردن و سەلام شێخ حەسەن دەفەرمووێ: تۆ نازانی ئێرە سەرە ڕێگایەو چوار ڕیانە! عەباکەت بە هیوای کێ لێرە داناوە! فەوری وەڵام ئەداتەوە و دەڵێ: بە هیوای ئەو کەسەی کە زاتێکی وەک تۆی ناردووە ئاگاداری عەباکەم بۆ بکا، شێخ حەسەن ئافەرینی دەکا و ناوچاوانی ماچ دەکا و دەفەرمووێ: خوزگە چەندی وەک تۆمان بوونایە.

جا بە ڕاستی خوای گەورە، «حەبیبی عەجەمی» زۆر خۆش ویستووە، دەڵێن ساڵێک کابرایێکی خۆراسانی بە خۆی و ژنەکەیەوە دێتە بەسرە و دەی هەوێ خانوویێک بکڕێ و لەوێ وەمێنێ، بەڵام، کاتێ وەختی ئەوە هات، خەڵک خۆی

ئامادە بکا بۆ حەج، ئەویش خەیالّی حەجی کەوتە سەر، دە هەزار دەرهەمی پێ بوو، ڕۆژێک بردی بۆ لای «حەبیبی عەجەمی»و گوتی: یا شێخ هەر چەند بە کاری جەنابیشت ناشێ، بەلاّم لە جەنابت ئەمین تر دەست ناکەوێ، خەیالّی حەجم هەیە با، تا لە حەج دەگەڕێمەوە، ئەو دەهەزار درهەمەت لابێ، ئەگەر بۆت کرا و زەحمەت نەبوو، بۆم بدە بە خانوویێک، شێخ فەرمووی: زۆر باشە.

کابرا ڕۆیشت بۆ حەج، سالەکەی زۆر سالێک گرانی و قاتی بوو، خەلک زۆر لە ناڕەحەتی‌دا بوون، شێخ هەستا بایی دەهەزار درهەمەکەی ئارد کڕی و بە سەر خەلکدا بێ پارە دا بەشی کرد، فەرمووی: ئەگەر کابرا هاتەوە دەلێم بۆم داوی بە قەسرێک لە قەسرەکانی بەهەشت، ئەگەر ڕازیش نەبوو پارەکەی بۆ پەیدا دەکەمەوە. کابرا چوو حەجی کرد و هاتەوە، ڕۆژێک چوە خزمەت شێخ و عەرزی کرد، قوربان، خانوەکەت بۆ کڕیوم؟ شێخ فەرمووی: بەلێ: خانوێکم بۆ کڕیوی، حەوشە کەی پڕە لە باغ و باغات و ئاوی خۆش و ساف و ڕەوانی تێدایە، کابرا زۆر دلخۆش بوو، گوتی: قوربان لە کوێیە؟ فەرمووی: کاکە، خانوەکەت لە بەهەشتەو بۆم لە خوا کڕیوی، کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە و گوتی: جا ئەگەر پێی ڕازی، ئەوە باشە، دەنا پارەکەت بۆ پەیدا دەکەمەوە، خانوێک بکرە.

کابرا چوو قسەکەی «شێخ حەبیبی» بۆ ژنەکەی گیڕایەوە، ژنەکەی زۆر ئاقل بوو، گوتی: زۆر باشە، بەلاّم بچۆ عەرزی شێخ بکە، با دوو کەلیمەت بۆ بنوسێ، پیاوەکە هات عەرزی «شێخ حەبیبی» کرد، شێخ میرزایەکی بانگ کرد فەرمووی: ئەی میرزا بنووسە [بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ هٰذٰا مٰا إِشْتَرىٰ حَبِيبٌ مِنْ رَبِّهِ عَزَّ وَ جَلَّ لِفُلاٰنِ الخُرٰاسٰانِي إِشْتَرىٰ لَهُ مِنْهُ مَنْزِلاً فِي الجَنَّةِ بِقُصُورِهِ وَ أَنْهٰارِهِ وَ أَشْجٰارِهِ وَ صَفٰائِهِ وَ صِفٰاتِهِ بِعَشَرَةِ آلاٰفِ دِرْهَمٍ فَعَلىٰ رَبِّهِ تَعٰالىٰ أَنْ يُدْفَعَ هٰذٰا المَنْزِلَ إِلىٰ فُلاٰنِ الخُرٰاسٰانِيِّ وَ يُبْرِىءُ حَبِيباً مِنْ عُهْدَتِهِ﴾ بە ناوی خوای گەورە، ئەوە قەبالەی ئەو خانووەیە کە «حەبیبی عەجەمی» لە خواوەندی گەورەی کڕیوە، لە بەهەشتدا بە تەواوی باغ و

باغات و جۆگە ئاوو غولام و کەنیزەکەوە بۆ فلان کەسی خوراسانی بە دەهەزار درهەم، بە ئۆمیدی ئەوەی خوای گەورە، لە ڕۆژی خۆیدا بیداتێ و «حەبیبی عەجەمی» لە عوهدەی دەرچێ. ئەوەی نووسی «شێخ حەبیب» ئیمزای کرد و کابرا وەری گرت و چووەوە بۆ ماڵەوە. ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، لە پاش چەند ڕۆژ کابرا نەخۆش کەوت، لە نەخۆشی‌یەکەیدا، وەسیەتی کرد کە مرد، قەباڵەکەی بخەنە ناو کفنەکەیەوە، زۆری نەخایاند وەفاتی کرد، قەباڵەکەیان خستە کفنەکەیەوە و بە جێ‌یان هێشت. کاتێ بۆ سێ ڕۆژانەی چوونە سەر قەبران تەماشایان کرد، نامەیەک لە سەر گۆڕەکەی دانراوە، کە بردیانەوە و خوێندیانەوە نووسرابوو، ئەو نامەیە، بەڕائەتە لە لایەن خواوە بۆ «حەبیبی عەجەمی»، چونکە ئەو خانووەی کە بۆ فلان کەسی خوراسانی کڕی بوو، تەسلیمی کرا.

«شێخ حەبیب» لە خۆشیان دەستی کرد بە گریان و تا وەفاتی فەرموو: هەر دەگریا و دەی‌خوێندەوە و دەی‌فەرموو: ئەو نامەیە ڕزگار بوونی منی تێدا، نووسراوە لە لایەن خوای گەورەوە.

دەڵێن: ڕۆژێک لە گەرمای نیوەڕۆدا شێخ حەسەنی بەسری تەشریفی چوو بۆ لای «حەبیبی عەجەمی»، ئەویش دووای دەست ماچ کردن و بە خێر هاتن، هەستا یەک دوو کولێرەی جۆی هێنا، لە پێش شێخ حەسەنی دانا و گوتی: فەرموو قوربان، لەو کاتەدا، فەقیرێک لە دەرگایدا و داوای نانی کرد، هەستا بە بێ پرسی شێخ حەسەن نانەکەی هەڵگرت و بردی بۆ فەقیرەکە، شێخ حەسەن فەرمووی: ئەگەر بە تەواوی شەرعت بزانیایە، بێ پرسی من نانەکەت نەئەدا بەو فەقیرە، چونکە بێ پرسی میوان، نابێ هەموو نانەکەی لە پێش هەڵگری. «شێخ حەبیب» دەنگی نەکرد، زۆری نەخایاند پیاوێک هات سفرەیێکی لە سەر سەربوو، هێنای لە پێش شێخ حەسەنی بەسری دانا و ڕۆیشت. کاتێ تەماشایان کرد، خواردنی زۆر باشی لە سەربوو، دەستیان کرد بە خواردن، شێخ «حەبیبی عەجەمی» ڕووی

کردە شێخ حەسەن و فەرمووی: ئەی ئوستاد، بە ڕاستی جەنابت زۆر عالم و دانا و زانا و شەرع زانی، بەڵام خۆزگە بە تەواوی یەقین و تەوەکولیشت بوایە، چونکە عیلم و زانیاری بە یەقینەوە جوانە، شێخ حەسەن دووبارە ناوچاوانی «شێخ حەبیبی» ماچ کرد و ئافەرینی کرد.

«شێخ حەبیبی عەجەمی» هەر چەند شتی وای نەخوێندبوو، بەڵام خواوەندی گەورە ئەگەر ویستی یەکێک پێ بگەیێنێ بێ، مامۆستا، زانا و دانای دەکا، دەڵێن: کەرەتێک ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد، (ڕەزای خوایان لێ بێ)، لە جێگایەک دا دەنیشن، لەو کاتەدا شێخ «حەبیبی عەجەمی» بەوێدا دێ و سەلام دەکا. دوای بە خێر هاتنی، ئیمامی ئەحمەد دەفەرمووێ، با پرسیارێک لەو شێخە بکەین و بزانین هیچ دەزانێ، واخویی کردووە بە شێخ، ئیمامی شافیعی (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرمووێ: ئەی ئیمامی ئەحمەد کارت بە سەرەوە نەبێ، چونکە عالەمی مەشیخەت عالەمێکی زۆر سەیرە! ئیمامی ئەحمەد خۆی بۆ ڕاناگیرێ و ڕوو دەکاتە «شێخ حەبیبی عەجەمی» و دەفەرمووێ: یا شێخ، تۆ دەربارەی کەسێک کە یەکێک لە پێنج فەرزەکانی فەوتاو نەی دەزانی کامەیە، دەفەرمووی: چی؟

«شێخ حەبیب» فەوری فەرمووی: کەسێک نوێژی فەوتاو نەیزانی کامەیە، مەعنای وایە دڵی لە خوا بێ خەبەر و غافڵە، دەبێ ئەو کەسە تەنبێ بکرێ و حوکمی لێ بکەن هەر پێنج نوێژەکان وەگێڕێ، ئیمامی ئەحمەد زۆری لا سەیر بوو کە موافیقی شەرع وەڵامی دایەوە، ئیمامی شافیعی فەرمووی: ئاخر پێم نەگوتی: ئەوانە عالەمێکی سەیرن، بۆ تاقی کردنەوە نابن. جا گوێ گری موسوڵمان هەر کەسێک لە هەر نەتەوەیەک بێ و بەهەر زمانێک بدوێ و لە سەر هەر شکڵ و سورەتیک بێ و هەر بەرگ و لیباسێکی لە بەردا بێ، کە خوای گەورە هیدایەتی داو ڕووی کردە چاکە، ئەوە پیاوی خوایە و خۆشتان بوێ و چاو لە

کردەوەی چاکی بکەن و پەند و عیبرەت و دەرسی لێ وەرگرن.

ئەوە بوو بە کورتی باسی هێندیک لە ژیان و بەسەرهاتی «حەبیبی عەجەمی».
ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ، لە بەر خوای گەورە دەپارێینەوە، هیدایەتمان بدا بۆ کردەوەی چاک. خوایە عەفوومان کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکەی. خوایە شیفای نەخۆشمان بدەی. خوایە لە شەڕی شەیتان و بەلای زاڵمان بمان پارێزی. ئامین.

وَالسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (١٨)
# ئەبولحەسەنی خەرقانی

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ الَّذِي فَتَحَ بَصٰائِرَ أَوْلِيٰائِهِ. وَ صَلىٰ اَللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ حَبِيبِ اللهِ وَ رَسُولِ اللهِ، وَ سَيِّدِ أَنْبِيٰائِهِ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ اِلىٰ يَوْمِ الْقِيٰامَةِ]

وەرن با بە دڵێکی دوور لە فکر و خەیاڵەوە، لەم چەند دەقیقەی داهـاتوودا، بچینەوە بارەگا و مەجلیسی یەکێکی تر لەو زاتانە، کە لە کاتیٚ خۆیدا پـێشەوای ئەهلی تەریقەت بوو، پاسەوانی دەرگـای حـەقیقەت بـوو، شـەیدای بـارەگـای ڕەببانی، مەرکەزی دائیرەی عیرفانی، گەوهەر ناسی دەریای مەعانی، بادە نۆشی یەزدانی، دێوانەی سەرمەستی بیابانی، ڕەئیسی دەروێشانی جانی، خەرقە پۆشی مەجلیسی ڕوحانی، «شێخ ئەبولحەسەنی خەڕقانی». جا، با گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهات و تاعەت و عیبادەت و فەرمایشتەکانی و پەند و ئاموژگاریان لیٚ وەرگرین. «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» ناوی عەلی یەو کوڕی جەعفەرە و خەڵکی خەڕقانە لە نزیک قەزوێن. ڕاوی دەڵـێ: چـەند جـار شـێخ بـایەزیدی بوستامی، کە ڕێگای دەکەوتە خەرقان، ماوەیەک دەمایەوە، ڕۆژێک عەرزیان کرد، ئەرێ قوربان، ئەوە بۆ تا دەگەیە خەرقان، ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە؟ خۆ تا ئێستا ئەو دێیە پیاو چاکی لیٚ هەڵنەکەوتووە، شێخ بایەزیدی بـوستامی لە وەڵامـیاندا فەرمووی: کورینە بە ڕاستی من لەم دێیە، بۆنی پەیدا بوونی یەکێک لە ئەولیای خواوەندی گەورە دەکەم، کە لێرە بە دواوە، لەم دێیە لە دایک دەبیٚ و ناز نـاوی

«ئەبولحەسەن» دەبێ و ناوی عەلی ئەبێ. کار و کاسبی دەکا و نەمام دەنێژێ و زەراعەت دەکا و نانی ڕەنجی شانی خۆی دەخوا، بەڵام بەرەکەتی دنیا پڕ دەکا.

لە پاش وەفاتی شێخ بایەزیدی بوستامی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» لە دایک دەبێ، کاتێ گەورە دەبێ، ڕوو دەکاتە کارو کاسبی و تاعەت و عیبادەت و خواپەرستی.

ئاخری وای لێ دێ، زۆر شەوان دەچێتە سەر مەرقەدی بایەزیدی بوستامی لە بوستام و بۆ بەیانی دەگەڕێتەوە خەرقان، ماوەی دوازدە ساڵ هات و چۆی سەر گۆڕی بایەزیدی بوستامی دەکا. ڕاوی دەڵێ: لە پاش دوازدە ساڵ هات و چۆ، ڕۆژێک گوێی لە دەنگێک بوو گوتی: ئەی «ئەبولحەسەن» هات و چۆ بەسە، بڕۆ دانیشە، دەڵێ: منیش دەستم کرد بە گریان و لەبەر خۆمەوە گوتم: ئەی خاک بە سەرم، جا من چۆن ئیرشاد بکەم! خۆ هیچم نەخوێندوە شەرع نازانم و ئاگام لە قورئان نیە. دەفەرمووێ: دووبارە گوتیان: ئەی «ئەبولحەسەن»، مەترسە ئەوەی خوای گەورە ڕووی ڕەحمەتی تێ بکا، زاناشی دەکا. دەفەرمووێ: هاتمەوە خەرقانو بە بیست و چوار ڕۆژ هەموو قورئان فێر بووم.

جارێک «شێخ ئەبولحەسەن» لای مەلایەک دەڵێ: من پیاوێکی نەخوێندەوارم، خواوەندی گەورە زۆر شتی داوە بە من، بەڵام هەموو شتێکی بێ منەت دامێ، عیلم نەبێ، بۆ عیلم منەتی بەسەر دا کردم. مەلاکە دەڵێ: بۆ شێخ جەنابت شت دەزانی؟ دەڵێ: بەڵێ، لە خزمەت پێغەمبەر فێر دەبم. مەلاکە دەڵێ: ئەو قسە ڕاست نیەو باوەڕ بە «شێخ ئەبولحەسەن» ناکا. شەوێ لە خەویدا، بە خزمەت فەخری عالەم دەگاو دەفەرمووێ: ئەی مامۆستا، پیاوی خوا قسەی درۆ ناکەن، هەر ڕاست دەڵێن. بۆ بەیانی مامۆستا کاتی مەوعیزەو ئامۆژگاری دێ، دەست دەکا بە حەدیس خوێندنەوە، لە پاش چەند حەدیس، حەدیسێک دەخوێنێتەوە «شێخ ئەبولحەسەن» دەفەرمووێ: مامۆستا ئەوەیان حەدیسی پێغەمبەر نیە، بە دەم

پێغەمبەریانەوە هەڵبەستووە. مەلا دەڵێ: یا شێخ بە چیدا دەزانی کە ئەوە حەدیس نیە؟ دەڵێ: هەر کاتێ جەنابت دەست دەکەی بە حەدیس خوێندنەوە، من تەماشای ناو چاوانی پێغەمبەر دەکەم. کە تۆ ئەو حەدیسەت خوێندەوە، ناو چاوانی مووبارەکی گرژ کرد، زانیم کە پێی ناخۆشەو ئەوە فەرمایشتی ئەو نیە.

شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر، لە تەعریفی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی»دا، دەفەرمووێ: من کە چوومە خزمەت «شێخ ئەبوولحەسەنی خەرقانی» وەک خشتی کاڵ وابووم، بەڵام لە گەڕانەوەدا بوومە گەوهەر.

شێخ ئەبوولقاسمی قوشەیری دەفەرمووێ: بە گەورەیی خوا، کاتێ چوومە خەرقان، لە بەر حیشمەت و گەورەیی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» فەساحەت و بەلاغەتم نەماوە وەک کەڕو لاڵم لێ هات و وام زانی کە هەر ڕوتبەو مەقامێکی هەمە، لێیان ساندمەوە.

ئێمە دەبێ بۆ سەبرو تەحەممولو حەوسەڵە، چاو لە «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» بکەین.

دەڵێن: شێخ ئەبوو عەلی سینا، کە زاناو فەیلەسووف و دوکتۆرێکی زۆر بە ناوبانگە، خەبەری پیاوچاکی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» زانی، هەستا لە شاری هەمەدانەوە ڕۆیشت بۆ لای «شێخ ئەبوولحەسەن»، کاتێ گەیشتە خەرقان و چوو لە دەرگای مالی شێخ حەسەنیدا، ژنەکەی هاتە دەرەوە، شێخ ئەبوو عەلی سینا گوتی: ئەوە «شێخ حەسەن» لە کوێیە؟ ژنەکە زۆر بە تووڕەییەوە گوتی: چووزانم ئەو ساحیر و بێ دینە لە کوێیە؟ شێخ ئەبوو عەلی سینا بە سپاوی گەڕایەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی: جا شێخیک، ژنەکەی خۆی وای پێ بڵێ، دەبێ چ پیاوێک بێ. لە ڕێگەدا، تووشی «شێخ ئەبولحەسەن» دەبێ، تەماشا دەکا، شێرێکی بار کردووە، زۆری لا عەجایب دەبێ، لە پاش بەخێر هاتن و چاک و چۆنی، شێخ ئەبوو عەلی سینا باسی خێزانەکەی بۆ گێڕایەوە و گوتی: یا شێخ جا ئەوە چ

حاڵەتێکە؟ «شێخ ئەبولحەسەن» بە پێکەنینەوە فەرمووی: ئەبوو عەلی، ئاخر تا ئێمە باری ئەو گورکە هەڵنەگرین، شێریش باری ئێمە هەڵناگرێ. شێخ ئەبوو عەلی سینا ماوەیەک لە خزمەتیدا مایەوەو گەڕایەوە بۆ هەمەدان و ئێستاش بارەگای گۆڕی مووبارەکی لە شاری هەمەدانە،

ڕۆژێک کابرایەکێ دێتە خزمەت «شێخ ئەبولحەسەن»، دەڵێ: قوربان هاتووم خەرقەی خۆتم لە بەر کەی، با ببمە پیاوی چاک. شێخ فەرمووی: کاکە ئەگەر پیاوێک چارشێوی ژنێک بە سەر خۆی دادا دەبێتە ژن؟ گوتی: نەخەیر، فەرمووی: ئەی ئەگەر ئافرەتیک بەرگ و لیباسی پیاوێک لە بەرکا دەبێتە پیاو؟ گوتی: نەخەیر. فەرمووی: دەتۆش کە پیاو نەبی بە خەرقەکەی من نابیە پیاو.

ڕۆژێک یەکێک لە وانەی کە بە ناو شێخن، عەرزی کرد قوربان ئیجازەم بدەبە با ئیرشادی خەڵک بکەم بۆ لای خوا. «شێخ ئەبولحەسەن» فەرمووی: وریا بە خەڵک بۆ لای خۆت بانک نەکەی! کابرا گوتی: جا قوربان چۆن خەڵک بۆ لای خۆمان بانگ دەکەین. شێخ فەرمووی، ئەگەر یەکێکی‌تر ئیرشادی خەڵکی کردو تۆ پێت ناخۆش بوو، ئەوە مەعنای وایە، تۆ ئیرشادی خەڵک بۆ لای خوا ناکەی، بۆ لای خۆتی دەکەی.

تەماشای پیاو چاکی و عەزەمەت و گەورەیی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» بکەن، دەڵێن: جارێک سوڵتان مەحمودی غەزنەوی، دێ بۆ خزمەت «شێخ ئەبولحەسەن»، بۆ ئەوەی «شێخ ئەبولحەسەن» تاقی بکاتەوە، لە ڕێگادا لیباسەکانی خۆی لە بەر هەیاس دەکاو لیباسی هەیاس لە بەر دەکاو شیرێک بە دەستەوە دەگرێ و لە پشت سەر هەیاس دەڕوا. کاتێ لە خانەقای «شێخ ئەبولحەسەن» نزیک دەبنەوە پیاوێک دەنێرێ بۆلای شێخ و دەڵێ: بە شێخ بڵێ، سوڵتان مەحموود لە غەزنەینەوە بۆ خزمەت جەنابت هاتووە، تۆش لە خانەقا وەرە دەرەوە بە خێر هاتنی بکە، ئەگەر نەش‌هات، ئەو ئایەتەی سوورەی نیسای بۆ

وەخوێنە کە خواوەندی گەورە دەفەرمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللهَ و أَطِيعُوا الرَّسُولَ وَ أُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ﴾.

ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، ئیتاعەی خواو ئیتاعەی پێغەمبەر و ئیتاعەی ئامیری وەختتان بکەن. کابرا چوو عەرزی کردو شێخ فەرمووی: بۆم ناکرێ بچم بۆ لای. کابرا ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە، شێخ فەرمووی: بە سوڵتان مەحموود بڵێ، «ئەبولحەسەن» دەڵێ: وەها لە ﴿أَطِيعُوا اللهَ﴾ دا غەرق بووم، ئاگام لە ﴿أَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ یش نەماوە، چ جایێکی ﴿أُوْلِي الأَمْرِ﴾، کابرا چوو بۆ سوڵتان مەحموودی گێڕایەوە، سوڵتان مەحموود گوتی: با ئێمە بچین بۆ خزمەتی، هەر وەک عەرزم کردن، لیباسی هەیاسی لەبەردا بوو، دەکچیشی هێنا، لیباسی کوڕانی لە بەر کردن و هەیاسی پێش خۆ،داو ڕۆیشتن بۆ خانەقا، کاتێ چوونە ژووری خانەقاو سەلامیان کرد، شێخ بەخێر هاتنی کردن، بەڵام لە بەریان هەڵنەستا، «شێخ» ڕووی لە هەیاس وەرگێڕاو ڕووی کردە سوڵتان مەحموود کە بە زاهیری خۆی کردبوو بە هەیاس. گوتی: یا شێخ ئەوە بۆ لە بەر سوڵتان مەحمود هەڵنەستای؟ فەرمووی: چوونکە فێڵتان کرد. ئنجا دەستی سوڵتان مەحموودی گرت و گوتی وەرە پێشەوە، سوڵتان مەحموود چوە خزمەتی و گوتی: فەرمو، شێخ فەرمووی: ئەو ئافرەتە نامەحرەمانە بکە دەرەوە، سوڵتان مەحموود زۆری لا عەجایب بوو، ئیشارەی بۆ کردن، چوونە دەرەوە. سوڵتان مەحموود گوتی: یا شێخ، فەرمایشتێکی شێخ بایەزیدم بۆ وە گێڕە. «شێخ ئەبولحەسەن» فەرمووی: شێخ بایەزید فەرموویەتی: هەرکەسێک چاوی بە من کەوتبێ، لە لیستەی پیاو خراپاندا نەماوە. سوڵتان مەحموود گوتی: یا شێخ جا خۆ بایەزید لە پێغەمبەر گەورەتر نەبووە! چەندین کەسی وەک ئەبووجەهل و ئەبوو لەهەب چاویشیان بە پێغەمبەر کەوتووەو هەر خراپتریش بوون. «شێخ ئەبوولحەسەن» فەرمووی: ئەدەبت بێ‌و قسە لە خۆت زیاتر مەکە، غەیری ئەسحاب کەس پێغەمبەری نەدیوە. فەرمووی:

ئەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، تۆ دەڵێی قەت ئەو ئایەتەی سوورەی ئەعرافت نەخوێندوەتەوە کە دەفەرمووی: ﴿وَ تَرَاهُمْ يَنْظُرُونَ اِلَيْكَ وَ هُمْ لاٰ يُبْصِرُونَ﴾ تۆ دەبینی ئەو کافرانە تەماشای تۆ دەکەن، بەڵام ئەوان وەکوو پێغەمبەرێک تۆ نابینن، سوڵتان مەحموود زۆری پێ خۆش بوو. گوتی: یا شێخ ئامۆژگاری‌یەکم بکە. شێخ فەرمووی: ئەی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، ئامۆژگاری من بۆ تۆ ئەوەیە، تا ماوی ئەو چوار شتە مەفەوتێنە. یەکەم، خۆت لە بێ شەرعی بپارێزە. دووەم، نوێژ بە جەماعەت بکە. سێیەم، تا دەتوانی سەخاوەت بنوێنە. چوارەم، دەر حەق بە خەڵک، بە ڕەحم بە.

کاتێ سوڵتان مەحموود هەستا خواحافیزی کرد، «شێخ ئەبولحەسەن» بەدرەقەی کرد. سوڵتان مەحموود گوتی: یا شێخ، ئەوە بۆ کاتێ هاتم لە بەرم هەڵنەستای، بەڵام ئێستا کە دەڕۆم، بەدرەقەم دەکەی؟ شێخ فەرمووی: ئاخر کاتێ هاتی، غروری پاشایەتیت لە سەردا بوو، بۆ تاقی کردنەوە هاتبووی، بەڵام ئێستا ڕۆژی دەروێشی‌یەتیت لە سەر هەڵاتووەو وەکوو دەروێشێک تەماشات دەکەم، دووبارە سوڵتان مەحموود دەستی شێخی ماچ کردەوەو خواحافیزیان کردو ڕۆیشتن.

«شێخ ئەبولحەسەنی خەڕقانی» کاتێ جەزبەی دەگرت، ئاگای لە خۆی نەدەما، ڕۆژێک حاڵی لێ هاتبوو، هاوارو بانگی دەکردو دەی فەرموو: ئەی خوای گەورە، قەت ئیزرائیل مەنێرە بۆ لای من، چونکە من گیانی خۆمی تەسلیم ناکەم، ئەو گیانی نەداوە بە من تا بیدەمەوە، تۆ گیانت داوە بە من و تەسلیم بە تۆی دەکەمەوە، دەی گوت: خەڵکینە ئەگەر هەتا هەتایە، لە دنیادا، لە ژێر خاری موغەیلاندا بژیم، پێم خۆشترە لەوەی بچمە بەهەشت بە خزمەت خوا نەگەم.

دەی فەرموو: گوێم لێ‌یە، خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: ئەی عەبدو بەندەی من، ئەگەر بە غەم و ئەندوهەوە، بێیەوە لای من شادت دەکەم، وە ئەگەر بە فەقیری

و هەژاری‌یەوە بگەڕێتەوە بۆ لای من، دەوڵەمەندت دەکەم، ئەگەر بە تەواویش ڕوو بکەیتە من، ئەوە هەموو شتێکت بۆ مووسەخەر دەکەم، ئەو ئایەتەی سوورەی «بروج»ی خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بە ڕاستی ئەوەی خوا گرتوویێ، بە زەحمەت نەجاتی دەبێ و گرتنی خوا زۆر بە شیددەتە، فەرمووی: گرتنی من لە گرتنی خوا بە شیددەت‌ترە، چونکە خوا خەڵک دەگرێ، بەڵام من داوێنی گەورەیی ئەو دەگرم، فەرموی لە سێ شوێندا مەلائیکە سام و هەیبەتیان لە ئەولیا زۆرترە. یەکەم، حەزرەتی ئیزرائیل لە کاتی گیان کێشاندا. پەنا بە خوا لەو کاتەدا. دووەم، [كِرَامُ الْكَاتِبِينْ] لە وەختی نووسینی نامەی ئەعمالدا. سێ‌یەم، نەکیر و مونکەر لە وەختی سوئالی قەبردا. فەرمووی لەو سێ جێگایەدا نەبێ، ئەولیا سام و هەیبەتیان لە مەلائیکە زۆرترە.

فەرمووی: ئەی خاک بە سەرمان، من کە تەماشای تاعەت و عیبادەتی حەفتا ساڵەی خۆم دەکەم، وەکو یەک ساعەت لە ژیانمدا، خەریکی عیبادەت بوویم، وام دێتە بەرچاو. بەڵام کاتێ تەماشای گوناح و بێ‌ئەمری حەفتا ساڵەم دەکەم، وەک لە ماوەی ژیان و عومری حەزرەتی نووحدا بێ ئەمریم کردبێ، ئاوا درێژم دێتە بەرچاو.

جا بە ڕاستی ئەگەر هەر کام لە ئێمە تاعەت و خواپەرستی خۆمان لە گەڵ گوناح و بێ ئەمریەکانمان قیاس بکەین، لەوە خراپتر دەر دەچێ و کردەوەی بێ شەرعی و خراپەمان زۆر زۆرترە. پەنا بە خوا.

زانایەک گوتی: یا شێخ غیرەت و ئیمان و مەعریفەت لە چ جێگەیەکی ئینسانی دان؟ فەرمووی: تۆ پێم بڵێ: ڕەنگیان چۆنە، تا منیش پێت بڵێم جێگایان کوێیە؟ جارێک فەرمووی: مەردی و پیاوەتی وەک دەریایەک وایە، سێ سەرچاوەی لێ هەڵدەگیرێ، سەرچاوەیەکیان سەخاوەتە، یەکێ تریان ڕەحم و بەزەیی و شەفەقەتە، سێ‌یەمیان بێ ئیحتیاجی بە خەڵک و پەنا بردن بە خوایە.

فەرمووی: خەڵکینە لە کار و کاسبی و عەمەل مەترسن، کارکردن تا دەستت بۆ نەبردووە، لە پێش چاوەت وەک شێر وایە، بەڵام کە دەستت دایە، دەبێتە ڕێوی.

هەروەها فەرموویەتی: لەو نیعمەتانەی کە خواوەندی گەورە، داونی بە ئینسان، لە دوای ئیمان، هیچیان لە دڵی بێ غەلل و غەش و پاک و زمانی ڕاست گۆ باشتر نین. شەرت و وەفای «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی» نیسبەت بە شێخ بایەزیدی بوستامی ئوستادی ئاوا بوو، لە نەخۆشی وەفاتیدا وەسیەتی کرد فەرمووی: ئەگەر مردم، گۆڕە کەم سێ میتر قووڵ هەڵکەنن، چونکە خاکی خەرقان لە خاکی بەستام بەرزترە، ئەدەب نیە تەرمەکەی من لە هی ئوستادەکەم بەرزتر بێ. لە ئامۆژگاری‌یەکدا فەرمووی: موسوڵمانینە، تا دەتوانن خزمەتی غەریبەو میوان بکەن وە ئەگەر لە ڕۆژ هەڵاتەوە بڕۆن بۆ ڕۆژ ئاوا، بۆ زیارەتی زانایێک و پیاو چاکێک، لە بەر ڕەزای خوا هێشتا هەر کەمە.

فەرمووی: زۆر کەس کە دۆعا دەکەن و لە بەر خوا دەپاڕێنەوە دەڵێن: لە کاتی گیان کێشان و لە سوئالی قەبرو لە ڕۆژی قیامەتا فریامان بکەوە، بەڵام من دەڵێم: ئەی خوای گەورە، لە هەموو کات و سەعاتێکدا فەریامان بکەوە.

فەرمووی: خەڵکینە ئامۆژگاریتان دەکەم، یارمەتی فەقیر و دەست کورت و هەژاران بدەن، فەرمووی: من ئەگەر بمرم و پێنسەت دینار قەرزداری خەڵک بم و لە ڕۆژی قیامەتا داوای قەرزەکەم لێ بکەنەوە، هێشتا لەوەم پێ خۆشترە، یەکێک بە نائومێدی بەڕێ بکەم. «شێخ ئەبولحەسەن خەرقانی» لە شەوی سێ‌شەممەی دەی مانگی موحەڕەمی ساڵی چوار سەت و بیست و پێنجی کوچیدا، وەفاتی فەرمووە. گوێ گری خۆشەویست، ئەوە بوو بە کوردی و بە کورتی باسی ژیان و خوو ڕەوشت و فەرمایشتە بە نرخەکانی «شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی»، ئومێد دەکەم فەرمایشتەکانی بکەنە سەرمەشقی ژیانتان و سوودیان لێ وەرگرن.

لە بەر خواوەندی گەورە دەپاڕێینەوە کە بە گەورەیی خۆی هیدایەتمان بدا.

خوایە عەفوومان کەی. خوایە لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بە دورمان کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکانی ئوممەتی پێغەمبەر حەشرمان بکەی. ئامین. [یٰا رَبَّ اَلعٰالمِینْ.]

وَالسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (١٩)
# ئەبووبەکری شیبلی

﴿بِسْمِ اللهِ اَلرَّحْمٰنِ اَلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلعَلِيمِ اَلعَلِيِّ. وَاَلصَّلوٰةُ وَاَلسَّلاٰمُ عَلىٰ فَخْرِ اَلْأَنْبِياءِ وَ سَيِّدِ اَلْمُرْسَلِينَ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ اَلعَرَبِيِّ اَلهٰاشِمِيِّ اَلمَكِّي. وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ اَلجَلِيِّ. وَ عَلىٰ بَقِيَّةِ أَتْبٰاعِهِ. خُصُوصاً عَلىٰ الشَّيْخِ أَبُوبَكْرِ اَلشِّبْلِيِّ.]

حەمدو سەنا بۆ خوای گەورە کە ئێمەی لێرە کۆ کردوەتەوە، بە دڵێکی پڕ لە ئیمان و باوەڕەوە، لە چەند دەقیقەی داهاتوودا، دەچینە مەجلیسی یەکێک لە ئەولیای خواو گوێ دەگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتە بە نرخەکانی و پەند ئامۆژگاریان لێ وەر دەگرین.

ڕەئیسی مەجلیسی ئیمڕۆمان لە زەمانی خۆیدا، غەرقی دەریای دەوڵەتی ئەبەدی بوو، برووسکەو بەرقی هەوری عیززەتی سەرمەدی بوو، دێوانەی دەشتی تەریقەت بوو، مەجزوبی سەحرای حەقیقەت بوو، پیری مەیخانەی پەرهێزگاران بوو، سەردەستەی کۆڕی شەو بێداران بوو، ئەستێرەی گەشی ئاسمانی دین بوو، دورناسی بەحری [عِلْمُ اَلیَقِين] بوو، سەرخۆشی بادەی شەرع و ئایین بوو، سووتاوی تاوی هاوینی ژین بوو، بۆ باغچەی حەدیس، شۆڕاو پەرژین بوو، سەرچاوەی کانی عیلم و زانین بوو، ئەو پێشەوای عالەمی حیسسی و عەقڵی یە، جەنابی «شێخ ئەبووبەکری شیبلی»یە.

جا، با بە دڵ گوێ بۆ بگرین و پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرین. «شێخ

ئەبووبەکری شیبلی» ناوی جەعفەرەو کوڕی یونسە و لە شاری بەغدا، لە دایک بووە. هەر لە منداڵییەوە، ئاساری زەکاوەتی لە ناو چاواندا دیار بوو، وەکوو هەموو زاناکانی ئەو سەردەمە، لە حوجرە دەستی کردووە بە خوێندن، وەکوو بۆ خۆی لە فەرمایشتێکدا دەفەرمووێ: ماوەی سی ساڵ خەریکی شەرع و حەدیس بووم تا ڕۆژی ڕووناکی شەریعەت سینگمی ڕووناک کردەوە ڕاوی دەڵێ: تا بیر لە کاری خوا بکەیتەوە تێ فکری سەرت سڕ دەمێنێ و دەبێ سەری تەعزیمی بۆ دانەوێنی. کاری خواوەندی گەورە زۆر سەیرە! ئەگەر ویستی یەکێک زەلیل بکا تووشی داوی دنیاپەرستی و شەهوەت پەرستی و مەقام پەرستی دەکا، بەڵام ئەگەر ویستی یەکێک لە خۆی نزیک بکاتەوە ڕوتبەو مەقامو دنیاو مافیهای، لە پێش چاوان ڕەش دەکا.

دەڵێن: دوای ئەوەی «شێخ شیبلی» خوێندنی تەواو کردووە، کراوە بە ئەمیرو سەرداری نەهاوند، جارێک لە گەڵ چەند پیاو ماقووڵدا، بانگ دەکرێتەوە بۆ بەغدا، بۆلای خەلیفەی ئەو سەردەمە کە [اَلْمُقْتَدِر بِاللهِ] دەبێ، زۆری ڕێزو حورمەت لێ دەگرێ و خەڵاتی دەکاو لە پاش چەند ڕۆژ مانەوە لە بەغدا دەگەڕێتەوە بۆ نەهاوند، لە ڕێگەدا دەپشمێ و بەو عەبایەی کە خەلیفە خەڵاتی کردبوو، تفو چڵمی پشمینەکە دەسترێ، یەکێک لە بەدگۆو جاسووسان، زۆر بە ناشیرینی ئەو هەواڵە بۆ خەلیفە دەگێڕێتەوە، خەلیفە زۆر تووڕە دەبێو ئەمر دەکا، نامەی عەزل کردنی لە ئەمیری ناوچەی نەهاوند دەنووسن، وەختێک ئەمری عەزل کردنەکەی پێ دەگا، بیر دەکاتەوەو لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئەی دڵی غافڵ! بۆ وشیار نابیەوە، کەسێک خەڵاتی مەخلووقێک، بکاتە دەسرەوەو بێ موبالاتی پێ بکا، شایانی عەزل کردن و بە چاوی سووک تەماشا کردن بێ، ئەی ئەو کەسەی کە بێ حورمەتی و بێ موبالاتی بە ئەمر و فەرمان و خەڵاتی پاشای هەشتا هەزار عالەم بکا، دەبێ چی لێ بکەن و شایانی چی بێ؟ فەوری هەستا، سواری

وەڵاغەکەی بوو بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ، کاتێ گەیشتە بەغداو چوە خزمەت خەلیفە، دڵ نەوازی دایەوە، [خەلیفە] ویستی لە سەر کارو وەزیفەیێکی تر داینێ، لە وەڵامدا گوتی: ئەی خەلیفە، جەنابت کە عەبدو بەندەو مەخلوقێکی، زۆرت پێ گران بوو کە بێ ئەدەبی بە خەڵاتی تۆ بکرێ، بەڵام بزانە کە خەڵاتی تۆ لە بەرامبەر خەڵاتی خواوەندی گەورەدا، شایانی موقایەسە نیە، ئێستاش حەمدو سەنا بۆ خوا، کە گەورە ڕووی دۆستی و نووری مەعریفەتی خەڵات کردووم، قەت ئیجازەم نادا، تازە ڕوو لە خەڵاتی ئەو وەرگێڕم و خزمەتی جەنابت بکەم، ئەوەی گوت و خواحافیزی لە خەلیفە کردو هاتە دەرەوە، چوو بۆ مەجلیسی شێخ ئەبوولحسێنی «خیر النساج» و کارەساتی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەویش لە بەر ئەوەی «شێخ ئەبووبەکر» خزمی شێخ جونەیدی بەغدادی بوو هەواڵەی لای شێخ جونەیدی کرد، «شێخ ئەبووبەکری شیبلی» چوە خزمەت شێخ جونەید و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، شێخ جونەید فەرمووی: زۆر باشە، بەڵام دەبێ تا یەک ساڵ، لە شاری بەغدادا، شەمچەفروشی بکەی، گوتی: بەڵێ، هەستا ساڵێک شەمچەفرۆشی کرد و لە پاشان چوەوە خزمەت شێخ جونەید، شێخ جونەیدی بەغدادی فەرمووی: ئەی «ئەبووبەکری شیبلی» تۆ لە کاتی خۆیدا، حاکم و ئەمیری نەهاوند بووی، بڕۆ گەردنی خۆتیان پێ ئازاد بکەو وەروە. «شێخ ئەبووبەکری شیبلی» هەستا، ڕۆیشت بۆ نەهاوند و ماڵ بە ماڵ گەڕا، گەردنی خۆی بە تەواوی خەڵکی نەهاوند ئازاد کردو هاتەوە، ئنجا شێخ جونەید فەرمووی: دەبێ ساڵێکی تەواویش خزمەتی خانەقاو دەروێشان بکەی، یەک ساڵیش خزمەتی خانەقاو موریدو و مەنسووبی شێخ جونەیدی کرد، ئنجا شێخ جونەید ئیجازەی تەریقەت و خەرقەی ئیرشادی دایەوە، دەستی کرد بە سلووک و عیبادەت، ئاخری ئەو «شێخی شیبلی»یە کەوتە حاڵەتی جەزبەو عەشقێکەوەو، وا لە گەڵ نووری ڕەببانی تێکەڵ ببوو، بە زۆری ئاگای لە خۆی نەدەما، زۆر جاری وابوو لە

كووچەو و بازاری شاری بەغدادا، جەزبەی دەگرت و هەڵدەپەڕی، خەڵک بە زۆری وایان دەزانی شێت بووە.

ڕۆژی وابوو دەچوو قەندو شەكری دەدا بە منداڵان، بۆ ئەوەی بڵێن. «أللە» و ناوی خوا بەرن، جاری واش بوو پارەی دەدانێ.

ڕۆژێک لە گەرمەی جەزبەدا، دەستە چیلەیێکی ئاگری بە دەستەوە گرتبوو، دەیگوت لێم گەڕێن، دەچم ماڵی بەیت دەسووتێنم تا خەڵک وەک من ڕوو بكەنە خاوەنی كەعبە و ڕوو لە كەعبە وەرگێڕن.

ڕۆژێ‌تر دارێکی بەدەستەوە بوو، هەر دوو سەری داگیرساند بوو، جەزبەی گرتبوو سۆزی دەكردو دەی فەرموو: دەچم بەهەشت و جەهەننەم ئاگر ئەدەم، دەیان سووتێنم تا خەڵک خواپەرستی لە بەر خاتری بەهەشت و لە ترسی جەهەننەم نەكەن، هەر لە بەر خوا، خوا بپەرستن.

دەڵێن: شەوێک تا مەلا بانگ دان، چوە سەر دارێک و گوتی: [هوو، هوو] عەرزیان كرد، قوربان ئیمشەو چ حاڵەتێک بوو؟ فەرمووی: ئاخر ئەو كۆترە باریكە لە سەر ئەو دارە، هەر دەیگوت كوو، كوو، منیش چووم پێم ووت: [هوو، هوو]. «شێخ ئەبوو بەكری شیبلی» گەیشتبوە مەقام و مەرتەبەیێكی وا، شێخ جونەیدی بەغدادی كە بە سەییدی تائفەتەین مەشهورە و دەربارەی «شێخی شیبلی»یەوە فەرموویەتی: هەموو دەستەو تاقم و كۆمەڵێک، تاج و گەورەیێكیان هەیە، تاجی ئێمەیش كۆمەڵی ئەولیا سۆفی و دەروێش «ئەبووبەكری شیبلی»یە.
دەڵێن: ڕۆژی جەژن، «شێخ ئەبوو بەكری شیبلی» لیباسێكی ڕەشی پۆشی بوو، هاتبوو، لە ناوە ڕاستی بازاری بەغدادا، جەزبەی گرتبوو، دەگریاو هەڵدەپەڕی.

عەرزیان كرد قوربان، ئیمرۆ ڕۆژی جەژنی موسوڵمانانە، خەڵک لیباسی جوان و تازەی پۆشی وە شادو كەیف خۆشن، كە چی بە پێچەوانە، جەنابت لیباسی ڕەشی پۆشی‌وەو دەگری، فەرمووی: ئاخر من بۆ ئەو خەڵكە دەگریم و لە بەر

خاتری ئەوان لیباسی ڕەشم پۆشیوە، ئەوان بە خۆیان نازانن کە لەم ڕۆژە جەژنە موبارەکەدا، تووشی چەند گوناح و بێشەرعی دەبن! نازانن چەند لە خوا غافڵن.

جا موسوڵمانینە، بە ڕاستی ئەگەر ئێمە بیر لەو فەرمایشتە بە نرخەی «شێخ ئەبوو بەکری شیبلی» بکەینەوە، زۆر گرنگ و بەنرخە، تۆ بزانە خەڵکی، هێشتا بە زۆری‌و بە تایبەتی لە ڕۆژانی موبارەکی، وەک ڕۆژی جەژن و ڕۆژەکانی جومعەدا، دەست دەکەن بە ڕابواردن و ئارەق خواردنەوەو کەیف و ئاهەنگ‌و سەرخۆشی، کە موسوڵمان دەبێ لەو ڕۆژانەدا زیاتر لە خوا نزیک وەبێ و زیاتر خێرو ئیحسان و چاکەو پیاوەتی بکا، بە ڕاستی ئەگەر پیاو چاکێکی وەک «شێخی شیبلی» ببوایە، دەبوو شەوو ڕۆژ بۆ ئێمە بگری، چونکە، کەم ماڵە موسوڵمان هەیە، بە تایبەتی لە ڕۆژانی جەژن و جومعەکاندا بێ شەرعی نەکەن، هیچ نەبێ زۆربەی ئافرەتانیان لە ڕۆژی جەژن و ڕۆژانی جومعەدا، دەچنە سەر قەبران و ئەوەی شەرع نەهی لێ کردووە ئەی‌کەن.

«شێخ ئەبووبەکری شیبلی» وای لێ هاتبوو، بە شەو خوێ دەکردە چاوانی، تا خەوی نەیەو بە خەبەر بێ و لە یادی خوا غافڵ نەبێ.

زۆر جار خوێیی دەکردە چاوو بەشەو جەزبەی دەگرت و ئەو دوو شیعرەی دەخوێندەوە.

وَالْهَجْرُ لَوْ سَكَنَ الْجِنَانَ تَحَوَّلَتْ نِعَمُ الْجِنَانِ عَلَى الْعَبِيدِ جَحِيماً
وَالْوَصْلُ لَوْ سَكَنَ الْجَحِيمَ تَحَوَّلَتْ حَرُّ السَّعِيرِ عَلَى الْعِبَادِ نَعِيماً

دەی فەرموو: ئەگەر هیجرەت و کۆچ و دووری لە دۆست بچێتە بەهەشتەوە، تەواوی نازو نێعمەتی بەهەشت، دەبێتە کیم و زووخاوی دۆزەخ، بەڵام ئەگەر گەیشتن بە یاروو دۆست و مەحبوبە بچێتە جەهەننەم، بڵێسەی ئاگری جەهەننەم دەکا بە ناز و نیعمەت.

ڕۆژێک خەڵکێکی زۆری لە دەور کۆ ببونەوە، قسەی بۆ دەکردن، لەو کاتەدا،

تــەماشای کــرد دارێکــی تــەڕیان بــە ئــاگــرەوە نــابوو، ســەرێکی دەســووتاوو سەرەکەی‌تری ئاوی لێ دەتکا، داری تەڕ وایە سەرێکی داگیرسێنە، ئەوی‌تری ئاوی لێ دێ، شــێخ کــە ئــەوەی دی، نــەعرەتەیێکی لێ داو جــەزبەی گــرت و فەرمووی: ئەی دەروێش و موریدینە، ئەگەر ڕاست دەکــەن و دەڵـێن: ئــاگــری شەوقمان لە دەروون دایە، بۆ فرمێسکتان لە چاوان نایەتە دەرەوەو وەک ئەو دارە ناگرین و تەڕ نابن؟

شێخ جونەیدی بەغدادی شەوێک وای زانی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) هات‌و ناوچاوانی «شێخ شیبلی» ماچ کرد، شێخ جونەید بەیانی «شێخی شیبلی» بانگ کرد و فەرمووی: ئیمشەو چ کارێکی خـێرت کـردووە؟ «شـێخی شیبلی» فەرمووی: لە پاش سونەتی نوێژی عیشا دوو ڕکـاتم نـوێژ کـردو ئـەو ئایەتەی ئاخری سوورەتی تۆبەم خوێند، کە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿لَـقَدْ جٰاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيهِ مٰا عَنِتُّمْ حَـرِيصٌ عَـلَيْكُمْ بِـالْمُؤْمِنِينَ رَؤُفٌ رَحِيمٌ﴾.

قەسەم بە خوا، خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردون کە لە خۆتانەو زۆری پێ ناخۆشە تووشی زەرەرو زیان و بەڵاو موسیبەت ببن‌و زۆری پێ خۆشە کە باش بن و لە گەڵ موسوڵمانان زۆر بە ڕەحم و میهربانە. شێخ جونەید فەرمووی: ئەو هاتنی پێغەمبەرو ناوچاوان ماچ کردنی «شـێخی شـیبلی»یـە بـە هـۆی خـوێندنی ئـەو ئایەتەوە بووە. مەعنای وایە کە خوێندنی ئەو ئایەتە زۆر پیرۆزە.

جارێکیان باسی ئینسانی عارف بە خوای دەکرد، فەرمووی: ئێوە لاتان وانەبێ کە هەرچی ئیدعای خواناسینی کرد ڕاست دەکا. عارف بە خوا دەبێ وەک ڕۆژی مانگی بەهار وابێ، وەک ڕەعد گرمەی بێ، وەک هەور پێ بکەنێ، وەک بـەرق بسووتێ، وەک «با» بەملاو ئەولادا بێ، وەک غونچە بپشکوێ، وەک تەیر و باڵندە بخوێنێ، واتە پیاوی خوا دەبێ بە چاو بگری، بە لێو پێکەنێ، بە دڵ بسـووتێ، بە سەر ببزوێ، هەمیشە ناوی خوا بەرێ و یادی بکاتەوە. فەرمووی: خۆ پیاو چاکی

هەر بە قسە نابێ، فەرمووی: شەریعەت ئەوەیە کە خوا بپەرستی و تەریقەت ئەوەیە تەڵەبی خوا بکەیت و حەقیقەتیش ئەوەیە خوا ببینی.

یەکێ لە پیاو چاکان دەفەرمووێ: لە نەخۆشی وەفاتیدا، لە کاتێکدا زمانی لاڵ ببوو، ناوچاوانی ئارەقی پێدا دەهاتە خوارێ، ئیشارەی کرد، دەس نوێژی پێ هەڵگرین، تەشتێکمان هێناو ئاومان هێنا دەس نوێژمان پێ هەڵگرت، بەڵام لە بیرمان چوو کە خەلەلەی ڕیشی بکەین، دەفەرمووێ: زۆرم لا سەیر بوو بە دەست ئیشارەی بۆ من کرد چوومە خزمەتی، دەستی گرتم و بەڕیشی خوێدا هێناو خەلەلەی پێ کرد، دەفەرمووێ: منیش ئاگام لە خۆم نەماو دەستم کرد بە گریان و گوتم:

[سُبْحَانَ اللهِ] دەبێ دەرەجەی پیاوێکی وا، کە لە عومری خوێدا سوننەتێکی پێغەمبەری تەرک نەکردبێ، بە تایبەتی لە کاتێکی وادا کە زمانی لاڵ بووەو ئارەق بە ناو چاوانیدا دێتە خوارێ، دەیەوێ ئەو سوننەتەی نەفەوتێ، چۆن بێ؟ دەفەرمووێ: لەو کاتەدا، یەکێک عەرزی کرد قوربان چۆنی؟ فەرمووی: بە خوای خۆم گەیشتم، ئەوەی گوت و وەفاتی فەرموو.

«شێخ ئەبووبەکری شیبلی» لە شەوی جومعەی بیست و حەوتی مانگی قوربانی ساڵی سێ سەت و سی و چواری کۆچیدا، لە شاری بەغدا وەفاتی فەرموو، لە عومری هەشتاو هەشت ساڵیدا. گۆڕی موبارەکی لە گۆڕستانی مەشهور بە گۆڕستانی خەیزەران نێژراوەو ئێستاش زیارەتگای موسوڵمانانە.

ئەوە بوو بە کوردی و کورتی باسی ژیان و بەسەر هات و ئامۆژگاری و فەرمایشتە جوانەکانی «شێخ ئەبووبەکری شیبلی»، ئومێد دەکەم دەرس و پەندو ئامۆژگاری و سوودتان لێ وەرگرتبێ. لە بەر خواوەندی گەورە دەپاڕێینەوە کە هیدایەتمان بدا. خوایە عەفوومان کەی. خوایە شیفای نەخۆشمان بدەی. خوایە لە خراپە بە دورمان کەی. خوایە لە بەڵاو موسیبەت بمان پارێزی ئامین.

وَٱلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهَ وَ بَرَكَاتُهُ

# (٢٠)
# ئیمامی حەنەفی

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ ٱلَّذى إعْتَرَفَ بِوَحْدٰانِيَّتِهِ كُلُ ٱلْمَوْجُودِ. وَ نَشْهَدُ أَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاَّ ٱللهُ ٱلْمَـلِكَ ٱلْمَعْبُودُ. وَ نَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدَنٰا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ اِلىٰ كُلِّ بِيَضٍ وَ سُودٍ. أَللَّهُمَّ صَلِّ وَ سَلِّمْ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ ٱلَّذى أَشْرَفَ بِهِ ٱلْوُجُودْ. وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ، خُصُوصاً مِنْهُمْ عَلىٰ ٱلقٰائِمِينَ بِنَشْرِ ٱلشَّرِيعَةِ اِلىٰ ٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودْ].

با هەر وەکوو ڕۆژانی پێشوو، لە چەند دەقیقەی داهاتووی عومرماندا، بچینە کۆڕو مەجلیسی یەکێ لی تابیعینی ئۆممەتی پێغەمبەر کە لە ئاسمانی دیندا، مانگی شەوی چواردە بوو، لە زانینی شەریعەت و ئاییندا «ئیمامی ئەعزەم بوو». دورناسی دەریای مەعانی، پیری، بیر تیژی زانا بە ئەلفازی قورئانی، فیکری بەرزی ئەلەتریکی دۆزینەوەو شت زانی، لە لایەک ئوستادی ئوستادان، لە لایێکیتر سەرقافڵەی بازرگانی، لە ئاسمانی عیراقدا ئەستێرەیێکی پرشنگ دار، لە گەوهەری نووکتە زانیدا، پێشەوایێکی وشیار، جا ئەو زاتە بەرزو پیرۆزە، «ئیمامی حەنەفی»یە. جا، با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بەسەر هات و هێندێک لە فەرمایشتە بە نرخەکانی و پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرین و بیان کەین سەرمەشقی ژیانمان.

«ئیمامی حەنەفی» کە مەشهورە بە «ئیمامی ئەعزەم» ناوی نووعمانی کوڕی سابیتە و لە ئەسڵدا، خەڵکی شاری کوفەیەوە دەڵێن: لە شاری ئەنبار لە دایک بووە،

لە ساڵی هەشتای کۆچیدا، چاوی بە زۆر لە ئەسحابی پێغمبەر و زاناو موشایخ کەوتووە، وەک ئەنەسی کوڕی مالیک، جابیری کوڕی عبداللە، عبداللەی کوڕی ئەبی ئەوفا، و عبداللەی زەعبەری، و مەعقەلی کوڕی بەسیار و زۆری تریش. هەروەها زۆر بە خزمەت ئیمام جەعفەری سادق گەیشتووەو ئوستادی دەرسی فوزەیلی کوڕی عیاز و ئیبراهیمی ئەدهەم و بیشری حافی و داوودی تائی و ئەبوو یوسف و ئیمام محمد بووە.

خاوەنی کتێبی «کشفُ المَحْجُوبْ»، لە تەعریفی «ئیمامی حەنەفی»دا نووسیویەتی، دەڵێ: «ئیمامی حەنەفی» ئیمامی ئیمامان و موقتەدای «سوننیان» و شەرەفی فوقەهاو عیززی عولەما بووە.

«ئیمامی حەنەفی» دەفەرمووێ: دوای ئەوەی ماوەیەک خوێندم، لام وابوو هەموو شتێک دەزانم، تا سەفەرێک چوومە بەسرە، زۆر پرسیاریان لێ کردم، نەمزانی وەڵامیان بدەمەوە. فەرمووی: بیست و پێنج ساڵیتر لە خزمەت حومادی کوڕی زەیددا، مامەوە.

کاتێ بە تەواوی خوێندنی تەواو کرد، هاتوەتە بەغداو دەستی کردووە بە کارو کاسبی، تا شەوێک لە خەویدا دەچێ قەبری پێغەمبەر هەڵدەداتەوە و جەنازەی موبارەکی دێنێتە دەرەو، لە ترسان لە خەوەکەی ڕادەپەڕێ و خەوی لێ ناکەوێتەوە، بەیانی دەڕواو دەچێ، ئیبنوو سیرین دەدۆزێتەوە، خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێ بچۆ تەدریس بکە، خەوەکەت مەعنای وایە شەرع و حەدیسی پێغەمبەر زیندو دەکەیتەوە. ئنجا دەستی کرد بە تەدریس و ئاخری بوو بە یەکێک لە سەر مەزهەب و موجتەهیدە گەورەکان و تەرەقی بە دینی ئیسلامدا.

دەگێڕنەوە دەڵێن: ساڵێک دەچێتە مەدینەو دەچێ بۆ مەرقەدی فەخری عالەم و سەلام دەکاو دەڵێ: [اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يا سَيِّدَ الْمُرْسَلِين] بە عالەمی ئاشکرا، گوێی لێ دەبێ، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) وەڵامی ئەداتەوەو دەفەرمووێ:

[وَ عَلَيْكَ اَلسَّلَامُ يَا إِمَامَ ٱلْمُسْلِمِينْ] زیرەکی و زانایی بە دەرەجەیێکی وابووە.

جارێک ئافرەتێک لە مزگەوت دەچێ بۆ پرسیارێکی شەرعی، لەو کاتەدا «ئیمامی حەنەفی» چەند کەسێکی لە خزمەتدا دەبن، ئافرەتەکە، سێوێک دەدا بە «ئیمامی حەنەفی»، لایێکی سوور دەبێ و لایێکی زەرد، «ئیمامی حەنەفی»، بێ دەنگ سێوەکە لە ناوە ڕاستا، لەت دەکاو دەی داتەوە بە ئافرەتەکە، ئافرەتەکەش بێ دەنگ خواحافیزی دەکاو دەڕوا. خەڵکەکە زۆریان لا سەیر دەبێ، عەرزی دەکەن قوربان ئەوە چی بوو؟ دەفەرمووێ: ئەو ئافرەتەکەوتوەتە حەیزەوە، جاری وایە خوێنەکەی سوورەو جاری واشە زەردە، هات پرسیاری کرد داخۆ کامەیان خوێنی حەیزە؟ منیش سێوەکەم بۆ لەت کرد و دامەوە، مەعنای وایە تا وەکوو ناوەڕاستی ئەو سێوە پاک و سپی نەبێتەوە هەر لە حەیز دایە، ئافرەتەکە حاڵی بوو ڕۆیشتەوە.

هەروەها ڕۆژێکی‌تر لە مزگەوت دەبێ، کۆمەڵێک لە وانەی پێیان دەگوتن خەواریج، دەست بە شمشێرەوە دەچنە سەری و دەڵێن: ئەی «ئەبوو حەنیفە»، دوو پرسیارت لێ دەکەین، ئەگەر زانیتن، ئەوە ڕزگارت دەبێ، دەنا دەت کوژین. فەرمووی: بڵێن، بزانم دەڵێن، چێ؟ گوتیان دوو جەنازەیان هێنا بۆ هەیوانی مزگەوت، یەکێکیان پیاوەو لە کاتی مەستی‌دا مردووە، ئەوی تریشیان ئافرەتێکە زینای کردووەو حامیلەیە، ئەو ژن و پیاوە بە کافری مردون یان بە موسوڵمانی، (ئەو کۆمەڵەش لایان وابوو، ئینسان بە گوناحێک کافر دەبێ. جا بزانە «ئیمامی حەنەفی» چۆنی خۆ ڕزگار کرد)، فەرمووی: ئەو ژن و پیاوە جوولە کە بوون؟ گوتیان: نەخێر. فەرمووی: گاور بوون؟ گوتیان: نەخەێر. فەرمووی: ئاگرپەرست بوون؟ گوتیان: نەخەێر. فەرمووی: ئەی بت پەرست بوون؟ گوتیان: نەخەێر. فەرمووی: ئەی باشە لە چ تاقمێک بوون؟ گوتیان موسوڵمان بوون. فەرمووی: جا، ئەوا خۆتان وەڵامی خۆتان دایەوە. گوتیان: چۆن؟ فەرمووی، ئێوە نالێن

موسوڵمان بوون؟ گوتیان: باشە، بەهەشتین یان جەهەندەمین؟ فەرمووی: حەزرەتی ئیبراهیم دەرحەق بە خراپتر لەوانە چی فەرمووە، منیش وا ئەڵێم، گوتیان: چی فەرمووە؟ گوتی: ئەوە نیە خوای گەورە لە سوورەی ئیبراهیمدا دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ تَبِعَنِیْ فَإِنَّهُ مِنِّیْ وَ مَنْ عَصَانِی فَإِنَّکَ غَفُورٌ رَّحِیمٌ﴾ ئەوەی وەدوای من کەوت، ئەوە وەک من وایە لە منە، بەڵام ئەوەی بێ ئەمری منی کرد، ئەوە کەیفی خۆتە، خۆت غەفوورو و ڕەحیمی. دەفەرمووێ: ئەوانەی چوو بوون، تاقی بکەنەوە و بی‌کوژن، کە زانیان ئاوا ئاقڵ و زاناو زیرەکە، دەستیان ماچ کردو تۆبەیان لە سەر دەستی کرد.

«ئیمامی حەنەفی» زۆر حەقگۆ بووە، شەرمی لە کەس نەکردووە، دەڵێن خەلیفەی بەغدا، ئەبوجەعفەری مەنسوور بڕیار دەدا، کە هەر زانایەی پارچە ئەرزێکی لەسەر تاپۆ بکەن، تا بیکا بە خانوو. فتوا نامەیەک دەنووسێ و دەی‌نێرێ بۆلای زانا بەرزەکان ئیمزای بکەن و فتوای لە سەر بدەن، لە پێشدا بردیان بۆلای قازی بەغدا، کە تەماشای کرد ئیمزای خەلیفەی پێوە بوو، ئیمزای کرد. ئنجا بردیان بۆلای «ئیمامی حەنەفی»، فەرمووی: تا خەلیفە نەبینم، من ئیمزای ناکەم، پیاوی خەلیفە تووڕە بوو، گوتی: قازی بەغدا ئیمزای دەکا، تۆ ئیمزای ناکەی! چووە خەبەری دا بە خەلیفە، خەلیفە تورە بوو گوتی: بچن قازیم بۆ بانک بکەن، قازیان هێنا بۆ لای خەلیفە، خەلیفە ووتی: جەنابی قازی، لە شاهیدیدا، چاوپێ کەوتن شەرتە؟ ووتی: بەڵێ: خەلیفە لە قازی تووڕە بوو گوتی: ئەی باشە ئەگەر چاوپێکەوتن شەرتە، بۆچی لە پێش ئەوەیدا چاوت بە من بکەوێ ئیمزات کرد؟ قازی گوتی: ئاخر زانیم کە بە ئەمری تۆیە، بەڵام نەمتوانی داوای جەنابت بکەم. خەلیفە گوتی: کە واتە، «ئەبوو حەنیفە» ڕاست دەکا و بەڵام، قازی لە بەر ئەوەی شەرمی حزووری کردووە، ئەوا لە قازیەتیم خست.

خەلیفە گوتی: «ئیمامی حەنەفی»و سەفیانی سەوریو شوریح و موسعەری

کوڕی حەرامم، بۆ بانگ بکەن. چوون کۆیان کردنەوەو هێنایانن بۆلای خەلیفە. لە ڕێگەدا، «ئەبوو حەنیفە» فەرمووی: کوڕینە، من دەزانم بۆچیان بانگ کردووین و دەزانم چی و چیمان بە سەر دێ؟ گوتیان: چۆن؟ فەرمووی: خەلیفە داوامان لێ دەکا ببین بە قازی، من بە فێڵێک خۆم ڕزگار دەکەم، سەفیانی سەوری، ڕادەکاو خۆی دەشارێتەوە، مەسعەر لە ترسان خۆی شێت دەکا، بەڵام، شورەیح دەبێتە قازی. قسەکەی «ئەبوو حەنیفە» یان، زۆر لا سەیر بوو. زۆر نەڕۆیشتن سەفیانی سەوری ڕای کردو خۆی شاردەوە، ئەوانی‌تر چوونە لای خەلیفە، خەلیفە ڕووی کردە «ئیمامی حەنەفی» و گوتی: دەبێ ببیە قازی، لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی جەنابی خەلیفە، خۆت دەزانی من لە ئەسڵدا، عەرەب نیم و گەورە پیاوانی عەرەب بە فتواو حوکمی من ڕازی نابن. خەلیفە گوتی: قەزاوەت پیاوی زانای دەوێ، عەرەب بێ، یان عەرەب نەبێ، فەرقی نیە. «ئیمامی حەنەفی» فەرمووی: قوربان ئاخر من لایقی قەزاوەت نیم، جا ئەگەر لەوەدا ڕاست دەکەم ئەوە دیارە بۆ قازی نابم، ئەگەر درۆش بکەم، جەنابت نابێ ڕازی بێ، درۆزنێک ببێتە قازی. «ئەبوو حەنیفە» ڕزگاری بوو. لەو کاتەدا، مەسعەر هەستا، چوە بەردەمی خەلیفە و دەستی گرت و ڕای وەشاند گوتی: ئەرێ خەلیفە، چۆنی چاکی منداڵەکانت چۆنن؟ خەلیفە بە سەرسامیەوە تەماشای مەسعەری کرد و وای زانی شێتە گوتی: وەرن ئەو شێتەم لە کۆڵ بکەنەوە، ئەویش ڕزگاری بوو. لە پاشان شورەیحیان کردە قازی و قازی شورەیحی مەشهور، ئەو قازی‌یەیە.

✓ با بۆ ئەدەب و ئیحتیرام و لە خواترسی، چاو لە «ئیمامی حەنەفی» بکەین. شێخ داوودی تائی دەفەرمووێ: بیست ساڵ لە خزمەت «ئیمامی حەنەفی»دا بووم، قەت نەمدی، جارێک سەر ڕووت کاو قەت نەمدی جارێک پێ ڕاکێشی، دەفەرمووێ: ڕۆژێک عەرزم کرد قوربان چی دەبێ ئەگەر بۆ حەسانەوە تۆزێک پێ ڕاکێشی؟ فەرمووی: ئەی داوودی تائی ئینسان دەبێ لە خەڵوەتیشدا، شەرم لە

خوا بکاو بە ئەدەب بێ.

رۆژێک چەند کەسێکی لە خزمەتدا دەبن، بە ڕێگایەکدا دەڕوا، تەماشا دەکا، منداڵێک لە قوڕ چەقیوەوە قوڕای بووە، دەفەرمووێ: ڕۆڵە ئاگات لە خۆت بێ نەکەوی، منداڵەکە سەر بەرز دەکاتەوە دەزانێ کە ئەوە «ئیمامی حەنەفی»یە، دەڵێ: ئەی ئیمامی موسوڵمانان، کەوتنی من شتێکی ئاسانە، ئەگەر بشکەوم گورجێک ڕاست دەبمەوە، بەڵام تۆ وشیار بە نەکەوی و لە حەق لانەدەی، چونکە ئەگەر تۆ لابدەیت و هەڵ خلیسکێت، تەواوی ئەو موسوڵمانانەی وەدوای تۆ کەوتوون، دەکەون و ڕاست کردنەوەیان زەحمەتە. «ئیمامی حەنەفی» قسەی منداڵەکەی زۆر لا بەنرخ بوو دەستی کرد بە گریان و ڕووی کردە خەڵکەکەو ووتی: دەخیلە ئەگەر بەڵگەو دەلیلێکتان دەست کەوت، دەلالەتی دەکرد لە سەر بەتاڵی فتوای من، بە قسەی من مەکەن.

«ئیمامی حەنەفی» عەقڵ و فەراسەت و زەکاوەتێکی زۆر غەریبی بووە. زۆربەی خەڵکی بە عەقڵ و قیاس بێ دەنگ کردووەو وەڵامی داوەنەتەوە.

دەڵێن: کابرایێکی دەوڵەمەند، زۆری حەزرەتی عووسمان ناخۆش ویستووەو جنێوی پێداوەو بە جوولەکەی ناو بردووە، «ئیمامی حەنەفی» خەبەر دەزانێ و دەنێرێ بە دوای‌دا، کابرا دێتە خزمەتی و دوای بە خێر هاتنی، دەفەرمووێ: دەزانی بۆ چیم بە دوادا ناردی؟ کابرا دەڵێ: قوربان نازانم. ئەویش دەفەرمووێ: خەبەرم زانیوە کچێکی باشت هەیە، داوات لێ دەکەم بیدەی بە فلان جوولەکە، کابرا زۆری لا سەیر دەبێ دەڵێ: جا قوربان جەنابت ئیستا، ئیمامی موسوڵمانانی، فتوا دەدەی، کە کچی موسوڵمانێک، بدرێ بە پیاوێکی جوولەکە! گوتی: قوربان، ئەگەر جەنابیشت فتوا بدەی، من هەر نایدەمێ. «ئیمامی حەنەفی» فەرمووی: ئەی باشە، تۆ کە بە ناو یەکێکی لە ئۆممەتی پێغەمبەر، ڕازی نابی کچی خۆت بدەی بە جوولەکەیەک، کە واتە چۆن بە ڕەوای دەزانی کە پێغەمبەر، دوو کچی خۆی بدا، بە

یەک جوولەکە، کابرا کە ئەوەی لە «ئیمامی حەنەفی» بیست، زانی کە مەبەستی چی‌یە، هەستا دەستی ماچ کرد و لە غەڵەتی خۆی پەشیمان بووەو تۆبەی کردو بڕیاری دا جارێکی‌تر باسی حەزرەتی عووسمان بە خراپە نەکا..

- لە قسەو فتوادا، زۆر ورد بین بووە، ڕۆژێک بە ڕێگایەکدا دەڕوا، چەند دڵۆپە قوڕاوێکی لەکەواکەی هەڵدەپرژێ، فەوری دەچێ دەی‌شواتەوە، عەرزی دەکەن: دەڵێن: قوربان جەنابت فتوات داوە کە هێندێک پیسی کەم، لە بەرگ و لیباس بکەوێ، عەفووی لێ‌یە، کە چی بۆ خۆت، ئەو نەختە قوڕەت شتەوە، ئەوە مەعنای چی‌یە؟ فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن کە فتواو تەقوا لێک جیایە، ئەوەی ئێوە دەڵێن: ئەوە فتوا بووە، بەڵام ئەم شتنەوەی من تەقوایە. فەرمووی: نابینن کە پێغەمبەر ڕێگای بیلالی حەبەشی نەدا، کە زەخیرەی زستان داکا، بەڵام بۆ حەرەمەکانی خۆی قووتی ماوەییکی دانا.

- سەخاوەت و کەرامەت و پیاوەتی «ئیمامی حەنەفی» لە حیساب نایێ. لە گەڵ ئەو هەموو تەدریس و فتوایەشدا، بازرگانی دەکردو قازانجەکەی دەبەخشی یەوە، بە تایبەتی، عەباو کەواو سەڵتەی، زۆربەی مەلاو فەقێیان لە سەر ئەو بوو. دەشی فەرموو: ماڵی خوایە هیچ منەتی تێدا نیە.

- هەروەها دەڵێن: عادەتی وابوو، هەر کەسێک لای دانیشتبایە، پرسیاری لێ دەکرد داخۆ ژیانی چۆنە؟ ئەگەر دەست کورت بووایە، دەستی دەگرتەوە. ڕۆژێک پیاوێکی لیباس چڵکن دەچێتە خزمەتی، بەینێک دادەنیشێ و لە پاشان کە خەڵک هەڵدەستێ، ئەویش خەریک دەبێ بڕوا. «ئیمامی حەنەفی» دەفەرمووێ: جارێ دانیشە، کابرا دادەنیشی تا چۆڵ دەبێ، لە پاشان ئیمام دەفەرمووێ: ئەو لێوە بەڕە هەڵدەرەوە هەزار درهەمی تێدایە، بۆ خۆت خەرجی کە، کابرا دەڵێ: قوربان فەقیر نیم. ئەویش دەفەرمووێ: دەی باشە تۆ ئەو حەدیسەی پێغەمبەرت نەبیستووە کە فەرموویەتی: خواوەندی گەورە زۆری پێ خۆشە، ئەسەری ناز و نیعمەتی خۆی

بە عەبدانەوە ببینێ؟ کە چویتەوە خۆت بگۆڕەو لیباسێکی تازە لە بەر بکە.

مەناقیب و فەزائیل و زوهد و تاعەت و ئینساف و گەورەیی «ئیمامی حەنەفی»، ئەوەندە زۆرن، بە ڕاستی بە تەواوی، لە ئامۆژگاری یەکدا جێیان نابێتەوە، لە خوا نەبێ لە کەس نەترساوە، چەند جار لە لایەن خەلیفەکانی بەغداوە گیراوە، تا جاری ئاخری کە ئەبوو جەعفەری مەنسوور، دووبارە ناردی بە دوای‌دا کە ببێ بە قازی، فەرمووی: بە خەلیفە بڵێن: قەزاوەت ناکەم، چوون بە خەلیفەیان گوت: شتێکی وا دەڵێ: خەلیفە تووڕە بوو، سوێندی خوارد گوتی: دەبێ هەر بیکا، چوون گوتیان خەلیفە سوێندی خواردووە کە دەبێ قەزاوەت بکەی، ئەویش سوێندی خوارد گوتی: نایکەم. گوتیان: ئاخر خەلیفە سوێندی خواردووە، فەرمووی: ئەو کەفارەتی سوێندی باشتر پێ دەدرێ، جا لەوەدا، خەلیفە ئەمری کرد گرتیان و حەپسیان کرد و لە بەندیخانەدا وەفاتی فەرموو، لە ساڵی سەت و پەنجای کۆچیداو ئێستا مەرقەدی موبارەکی لە بارەگای مزگەوتی «ئیمامی ئەعزەم»دا زیارەتگای موسوڵمانانە. ئەوە بوو بە کورتی و بە کوردی باسی هێندێک لە ژیانو بەسەرهات و فەرمایشتەکانی، ئومێد دەکەم، بیان کەنە، سەرمەشق و سوودیان لێ وەرگرن.

لە بەر خوا دەپاڕێینەوە کە عەفوومان بکا. خوایە هدایەتمان بدەی. خوایە لە ئاگری غەزەبت بە doورمان کەی. خوایە تاعەت و عیبادەتمان قبوڵ کەی. خوایە لە گەڵ پیاو چاکان لە خزمەت پێغەمبەردا حەشرمان بکەی. خوایە لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان و زوڵمی زاڵمان بمان پارێزی. ئامین.

وَٱلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكاٰتُهُ.

# (٢١)
# ئیمامی مالیک

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلْعُلَمَاءَ فِي ٱلدُّنيا هُدَاةً لِلأَنَامِ. وَ صَلىٰ ٱللهُ عَلىٰ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ خَيْرِ ٱلأَنَامِ. وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحَابِهِ ٱلْبَرَرَةِ ٱلكِرَامِ. وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُ بِأَحْسَانٍ إِلىٰ يَوْمِ ٱلقِيَامِ.]

برای گوێ گرێ موسوڵمان، وەرە، با لە چەند دەقیقەی داهاتووی عومرماندا، بە دڵێکی پڕ لە باوەڕەوە، بچینە مەجلیسی یەکێ‌تر لەو ئەستێرە گەشانەی لە ئاسمانی دیندا هەڵاتوون و هەتا هەتایە ڕووناکییان ئاوا نابێ، بچینە خزمەت ئەو کەسەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێ) دەربارەی ئەو فەرموویەتی: زانایەک لە مەدینە پەیدا دەبێ، عالەمی ئیسلامی موحتاجی عیلمی ئەو دەبن. با بچینە مەجلیسی ئەو زاتە بەرزە، کە مامۆستای ئیمامی شافیعی بووە. بچینە مەجلیسی ئەو زانایە، کە تابیعی تابعین بووە. جەنابی «ئیمامی مالیک».

«ئیمامی مالیک» بە قەوڵێک دەڵێن: لە ساڵی نەوەت و سێ‌ی کۆچیدا، لە شاری مەدینە لە دایک بووەو لە ساڵی سەت و نەوەت و نۆدا وەفاتی فەرمووە: بەڵام هێندێکی‌تر بۆ زانینی ڕۆژی لە دایک بوون و ماوەی ژیانی لە دنیاداو ساڵی وەفاتی بە حیساب ئەبجەد ئەو نیوە شیعرەیان بۆ داناوەو دەڵێن:

﴿وَ مَالِكٌ فِي قَطْعِ جَوْفٍ ضَبَطاً﴾. واتە: «ئیمامی مالیک» لە «فِی» دا لە دایک بووە، کە بە حیسابی ئەبجەد «ف» «هەشتا»و «ی» «دە»یەو دەکاتە ساڵی نەوەتی

کۆچی. لە «قَطْع» یشدا وەفاتی فەرمووە، کە «ق» سەدەو «ط» «نۆ»یەو «ع» «حەفتا»یە. دەکاتە سەت و حەفتاوو نۆ. عومریشی «جاف»ە کە «ج» «سێ»یەو «و» «شەش»و «ف» «هەشتا»یە. واتە هەشتاوو نۆ ساڵ ژیاوە.

«ئیمامی مالیک»، سەرچاوەی عیلم و ئەدەب و خوو ڕەوشتی بەرز بووە. گەوهەرێکی بێ وێنە بووە، ئەدەبێکی زۆری لە پێغەمبەر کردووەو هەر کاتێ ویستبێتی حەدیسی پێغەمبەر وەخوێنێ، لە پێشدا غوسڵی کردووەو خۆی بۆن خۆش کردەووەو نەی هێشتووە کەس قسە بکا، ئنجا دەستی کردووە بە حەدیس خوێندنەوە.

یەکێ لە پیاو چاکان دەڵێ: تازە «ئیمامی مالیک» خوێندنی تەواو کردبوو، شەوێک لە خەومدا پێغەمبەر لە مزگەوتی مەدینەدا دانیشتبوو، خەڵکێکی زۆری لە خزمەتدا بوو، «ئیمامی مالیکیش» لە بەردەمی پێغەمبەر ڕاوەستا بوو، زەرفێکیش لە پێش پێغەمبەر دانرا بوو، پێغەمبەر خێرا خێرا دەستی موبارەکی دەخستە ناو زەرفەکەو چنگێکی پڕی دێنایە دەرو دەیدا بە «ئیمامی مالیک»، ئەویش بە سەر خەڵکدا بەشی دەکرد. دەفەرمووێ: لە پاش بەینێک، ئاوازی زانیاری «ئیمامی مالیک»، بە عالەمی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە، ئەو کاتە زانیم کە مەعنای خەوەکەم چیە.

«ئیمامی مالیک» دەیان فەرمایشتی وای فەرمووە کە دەبوو بە ئاوی زێڕ بنووسرێتەوە. یەکێ لە فەرمایشتەکانی ئەوەیە کە دەفەرمووێ: ﴿إِذَا لَمْ يَكُنْ لِلْإِنْسَانِ فِي نَفْسِهِ خَيْرٌ، لَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ فِيهِ خَيْرٌ﴾. هەر کەسێک خێری بۆ نەفسی خۆی نەبوو، (زەرەری بە دنیاو قیامەتی خۆی وەگەیاند)، ئەوە، ئەو کەسە، قەت خێری بۆ خەڵک نابێ.

بە تایبەتی لە فەرمایشتێکدا زۆر ئامۆژگاری زانایانی ئایینی دەکا و دەفەرمووێ: ﴿ذَلٌّ وَ إِهَانَةٌ لِلْعِلْمِ أَنْ يَتَكَلَّمَ الرَّجلُ بِالْعِلْمِ عِنْدَ مَن لاَ يُطِيعُهُ﴾. ئەی زانایانی ئایینی، تکاتان لێ دەکەم، عیلم سووک مەکەن و خۆتان و ئایەتی قورئان

و حەدیسی پێغەمبەر بێ حورمەت مەکەن، ئایەت و حەدیس بۆ یەکێک مەخوێننەوە کە ئیمانی نەبێ و ئیتاعەی خواو و پێغەمبەر نەکا. فەرمووی: ﴿اِنَّکَ قَدْ اِسْتَدْبَرَتَ اَلدُّنْیا مُنْذُ کُنْتَ، وَ اِسْتَقْبَلَتَ الآخِرَةَ، وَ اَنَّ داراً تَسِیرُ اِلَیْها أَقْرَبُ اِلَیْکَ مِنْ دارٍ تَخْرُجُ مِنْها﴾ ئەی برای زانای ئایینی، بزانە کە تۆش و هەموو ئەو کەسانەی کە لە دایک بوون، لە کاتی لە دایک بوون دا، پشت دەکەنە دنیا و ڕوو دەکەنە قیامەت، چونکە تا لە سکی دایکت دای، بەرەو دنیا دێی، بەلاّم کە لە دایک بووی، لە بەر ئەوەی ماوەی مانەوەت لە دنیادا دیاری کراوە، ناتوانی چەند سانیەیەک زیاتر لە دنیادا وەمێنی، بەرەو قیامەت دەڕۆی، وە بزانە کە ئەو ماڵەی، بەرەو پیریەوە دەچی، لە تۆ نزیکترە و نزیکتر دەبێتەوە لەوەی بەجێی دێڵی، جا کە وایە ئاگات لە خۆت بێ نەفس و شەیتان و هەواو هەوەس و ئینسانی نامەرد بە سەهوت نەبەن و لە ڕێگا لات نەدەن.

٧ «ئیمامی مالیک» لە گەڵ ئەو هەموو عیلم و زانیاریە و لە گەڵ ئەوەشدا، کە نووسین و کتێبەکەی بە ناوی «المُوَطَّأ»ی «ئیمامی مالیک» لە پاش قورئان، یەکەم نووسراوە و کتێبەکە دانراوە و زۆر بە نرخە، زۆر خۆی بە کەم گرتووە و زۆر ئەمین بووە.

٨ هەر کاتێ فتوایێکی ئەدا، لە دوای نووسینی فتواکەی ئەو ئایەتەی سوورەی جاسیەی دەخوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿اِنْ نَظُنُّ اِلاَّ ظَنّاً وَ ما نَحْنُ بِمُسْتَیْقِنِینَ﴾ ئێمە هەر بە بیر و ڕاو و زەینی خۆمان، ئەو فتوایانە لە ئایەت و حەدیس وەردەگرین و بە تەواوی لێمان یەقین نیە، ئەگەر کەسێک هات و مەعنایێکی جوانتری لە ئایەت و حەدیس دایەوە زۆرمان پێ خۆشە.

٩ «ئیمامی مالیک» زۆر لە خوا ترس بووە، با بۆ لە خوا ترسان، چاو لە «ئیمامی مالیک» بکەین. دەڵێن: لە مەزهەبی «ئیمامی مالیک»دا دروست نیە لە پاش نوێژی عەسر، نوێژی سوننەت بکرێ، کە چی جارێک دوای نوێژی عەسر تەشریفی لە

مزگەوت دەبێ، کوڕێکی گەنج دێ، دەڵێ: ئەی «ئیمامی مالیک» هەستە دوو ڕکات نوێژ بکە، ئەویش بێ دەنگ هەڵدەستێ دوو ڕکات نوێژ دەکا، عەرزی دەکەن دەڵێن: قوربان، جەنابت لات وایە کە دووای نوێژی عەسر نوێژی سوننەت دروست نیە؟ ئەی بۆ موخالەفەی مەذهەبەکەی خۆت کردو نوێژت کرد؟

لە وەڵامدا فەرمووی: [خَشِيتُ أَنْ أكُونَ مِنَ الَّـذِينَ إذٰا قِـيلَ لَهُـمْ ارْكَـعُوا لاٰ يَرْكَعُونْ] ئاخر لەوە ترسام کە هەڵنەستم، خوای گەورە، لەو کەسانم حیساب بکا کە پێیان بڵێن: هەستن دوو ڕکات نوێژ بکەن و ڕکوع بۆ خوا بەرن، نەیکەن و بیان باتە جەهەننەم.

وەکو عەرزم کردن، «المُوَطّأ»ی «ئیمامی مالیک»، یەکەم نووسراوەیە لە دووای «قورئان»، حەدیسی وای تێدا ڕیوایەت کراوە، کە قیمەتی تەواو نابێ، جا لە بەر گرنگی ئەو حەدیسانە، لێرەدا چەند حەدیسێکتان بۆ شی دەکەمەوە، کە وەکو تەڵای دەستە و شار بۆ وەی دەبن دەما و دەم و دەستا و دەستیان بگێڕێ و سوودیان لێ وەرگرن.

بۆ نموونە دەفەرمووێ: [مَرَّ عَلیٰ النَّبِي﴿ﷺ﴾ بِجَنٰازَةٍ، فَقٰالَ مُسْتَرِيحٌ اَو مُسْتَرٰاحٌ مِنْهُ. فَقٰالُوا: يٰا رَسُولَ الله مٰا المستريحُ و مٰا اَلْمُسْتَرٰاحُ مِنْهُ؟ قٰالَ اَلْعَبْدَ اَلْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبَ اَلدُّنْيٰا وَ أَذٰاهٰا اِلیٰ رَحْمَةِ اللهِ، وَاَلْعَبْدُ اَلفٰاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ اَلعِبٰادُ وَاَلبِلاٰدُ وَالشَّجَرُ وَاَلدَّوٰابُّ﴾

ڕۆژێک جەنازەیێکیان هێنا، پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرمووی: ئینسان کە مرد، یان خۆی ئاسوودە دەبێ، یان بە نەمانی ئاسوودە دەبن، بە عیبارەتێکی تر فەرمووی: ئەش حەسێتەوە و لە بەریشی دەحەسێنەوە، عەرزیان کرد قوربان چۆن؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە دەمرێ، ئەگەر موسوڵمان بێ، لە نارەحەتی دنیا ڕزگاری دەبێ و دەچێتە قاپی بارەگای ڕەحمەتی خوا، وە ئەگەر کافریش بێ، ئەوە خەڵک و وڵات و حەیوانات و دارو بەرد، لە بەری

دەحەسێنەوە. گوێ گری خۆشەویست چەند خۆشە و چەند ڕوو سووری‌یە بۆ خۆت و کەس و کارت کە تا ماوی وا بژی شاعیر ئەڵێ:

«وا بـژی لە دنیا ئـەگـەر بـمری      هەرچی ناوت بزانێ بۆت بگری»

لە جێگایەکی‌تردا دەفەرمووێ: ﴿نَظَرَ النَّبِيُّ(ﷺ) اِلىٰ اِبْنِهِ اِبْرَاهِيمَ وَ هُوَ فِي حُجْرَةٍ يَمُوتُ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ فَقَالَ لَهُ عَبْدُالرَّحْمٰنِ: أَتَبْكي يَا رَسُولَ اللهِ؟ وَ قَدْ نَهَيْتَنَا مِنَ الْبُكَاءِ؟ فَقَالَ: اِنِي لَمْ أَنْهَكُمْ عَنْ هَذَا، اِنَّ هَذَا رَحْمَةٌ، مَنْ لاٰ يَرْحَمُ لاٰ يُرْحَمُ]

ئەو ڕۆژەی حەزرەتی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر وەفـاتی کـرد، پـێغەمبەر لە کاتی گیان دانیدا، لە سەر باوەشی خۆی داینا بوو، تەماشای دەکرد و وەک دانە مرواری، فرمێسک بە سەر ڕوومەتی موبارەکیدا دەهاتنە خوارەوە، لە بەر خۆیەوە دەگریا، عبدالرحمن‌ی کوڕی عەوف، عەرزی کرد، ئەی ڕەسـولی خـوا، تـۆش دەگری! خۆ تا ئێستا جـەنابت بـە ئـێمەت دەفـەرموو، نـابێ بگـرین. پـێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرمووی: ئەی عبدالرحمن من، مەنعی گریانی وام لێ نەکردوون، چونکە ئەو نەوعە گریانە، بێ هاوار و لە خۆدان، ئەوە ڕەحمەتە و ڕەحمێکە، کە دەبێ هەموو موسوڵمانێک ببێ. فەرمووی: هەر کەسێک ڕەحمی نەبێ ڕەحمی پێ ناکرێ.

دووبارە دەفەرمووێ: ﴿قَالَ رَسُولُ اللهِ(ﷺ) اِنَّ اللهَ تَعَالىٰ يَقُولُ: لِأَهْلِ اَلْجَنَّةِ يَا أَهْلَ اَلْجَنَةِ فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ وَ سَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: وَ مَـا لَـنَا لاٰ نَرْضىٰ وَ قَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكمْ أَفْـضَلَ مِـنْ ذٰلِكَ، أَحَلَّ عَلَيْكُمْ رِضْوانِي فَلاٰ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ﴾

پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) لە حەدیسێکدا فەرمووی: خواوەندی گەورە، لە بەهەشتا، بە ئەهلی بەهەشت دەفەرمووێ: ئەی ئەهلی بـەهەشت، لە وەڵامدا دەڵێن: ئەی خوای گەورە، لە خزمەتتدا ڕاوەستاوین، ئەمرت بـە چـیە؟ دەفەرمووێ: لێم ڕازی بوون؟ دەڵێن: ئەی خوای گەورە جا چۆن ڕازی نابین بەو

جێگاو مەقامەی، کە تا ئێستا نەت داوە بە هیچ گیان لە بەر و مەخلوقێک، ئـنجا خـواوەنـدی گـەورە دەفـەرمووێ: لەوەش بـاشترتان ئـەدەمێ، مـژدە بـێ تـازە جارێکی تر غەزەبتان لێ ناگرم و هەتا هەتایە، لێتان ڕازی دەبم.

پێغەمبەر، لە فەرمایشتێکی تردا فەرموویەتی: [سَاعَتَانِ تُفْتَحُ فِيهِمَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ فَلَمْ تَرُدَّ فِيهِمَا دَعْوَةٌ، عِنْدَ حُضُورِ الصَّلاٰةِ وَ عِنْدَ الزَّحْفِ لِلْقِتٰالِ]

ئەی ئوممەتی پێغەمبەر، وشیار بن، بە تـایبەتی دوو کـات هـەن، لە مـاوەی ژیانتاندا، لەو دوو کاتەدا، فرسەت لە دەست مـەن، دۆعـایان تـێدا گـیرا دەبـێ. یەکەمیان، وەختی چوونە سەر بەر ماڵە بۆ نوێژ، و ئەوی‌تریشیان وەختی غـەزا کردنە. لەو دوو کاتەدا، دۆعای ئینسانی نوێژکەر و غازی شەڕی کافران گیرا دەبێ.

لە جێگایەکی‌تردا دەفەرمووێ: پێغەمبەر فەرموویەتی: [مَنْ قَضىٰ لِأَخيهِ حَاجَةً كُنْتُ وَاقِفاً عِنْدَ مِيزَانِهِ، فَإِنْ رَجَّحَ وَ إِلاَّ شَفَّعْتُ لَـهُ] هـەر کـەسێک لە دنـیادا، لە ئۆممەتی من کاری برایێکی دینیی ڕاپەڕێنێ و بۆی جێ بە جێ بکا و دڵخۆشی بکا، ئەوە لە کاتی وەزن کردنی خێر و شەڕی ئەو کەسە لە مەیدانی مـەحشەردا حازر ئەبم، ئەگەر خێری زۆرتر بوو ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر گوناحی زۆرتر بوو، ئەوە لە پاداشتی ئەو چاکەی کە لە دنیادا لە گەڵ داماوێکی ئوممەتی منی کردووە، شەفاعەتی بۆ ئەکەم و ڕزگاری ئەکەم. گوێ گـرینە، بـە ڕاسـتی ئـەو حـەدیسە مژدەیێکی زۆر خۆشە.

پێغەمبەر فەرمووی: ﴿أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلىٰ أَشْرَفِ أُمَّتِي؟ قٰالُوا: بَلىٰ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ مَنْ طَالَ عُمْرُهُ وَ حَسُنَ عَمَلُهُ وَ رَجِىٰ خَيْرُهُ وَ أَمِنَ شَرُّهُ، أَلا أَدُلُّكُمْ عَلىٰ شِرَارِ أُمَّتِي؟ قَالُوا: نَعَمْ قَالَ مَنْ طَالَ عُمْرُهُ وَ سَاءَ عَمَلُهُ وَ أَيِسَ مِنْ خَيْرِهِ، وَ لَمْ يُؤْمَنْ شَرُّهُ﴾

ئەی موسوڵمانینە، پێتان خۆشە، پێیتان بڵێم، کـە ئـەشرەف و شـەریف‌ترینی ئۆممەتی من کێیە؟ ئەسحاب فەرموویان: زۆرمان پێ خۆشە پێمان بـفەرمووێ، فەرمووی: شـەریف‌ترینی ئۆممەتی مـن، ئـەو کـەسانەن عـومریان درێـژ بـێ و

کردەوەیان چاک بێ و چاوەڕوانی خێری لێ بکرێ و لە شەڕوو خراپەی ئەمین بن. دووبارە فەرمووی: ئەی ئەسحاب و ئوممەتم، پێتان بڵێم خراپترینی ئوممەتی من کی‌یە، گوتیان بەڵێ، فەرمووی: خراپترینی ئۆممەتی من، ئەو کەسەیە عومری درێژ بێ، بەڵام کردەوەی خراپ بێ و چاوەڕوانی خێری لێ نەکرێ و لە شەڕی ئەمین نەبن.

ئیمامی شەعرانی لە کتێبی «الطَّبَقَاتُ آلكبْرىٰ» دا، لە باسی ئەدەب و شەرم و حەیای «ئیمامی مالیک»دا، دەفەرمووێ: «ئیمامی مالیک» لە مەدینەی موونەوەرە قەت سوواری وەڵاغ نەدەبوو، هەمیشەش هەر بە پێ خاوسی دەڕۆیشت، دەی‌فەرموو: من حەیا دەکەم لە خوا، کە بە سواری یان بە پێڵاوەوە بە سەر خاکێکدا بڕۆم، کە لاشەو جەنازەی موبارەکی خۆشەویستی خوای، لە باوەش گرتبێ. لە گەڵ ئەوەشدا «ئیمامی مالیک» سام و هەیبەتێکی زۆری هەبوو، تەنانەت پاشا و مەلیک و ئەمیرانیش شەرمیان لێ دەکرد.

با ئەو حیکایەتەتان بۆ بگێڕمەوە و بزانن کە «ئیمامی مالیک» چۆنی ئیحتیرامی عیلم و زانیاری گرتووە!

دەڵێن: خەلیفەی بەغدا، هارونە ڕەشید، دەچێتە مەدینەی موونەووەرە و خەبەر دەزانێ کە «ئیمامی مالیک»، کتێبێکی داناوە بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوە. بە جەعفەری بەرمەکی دەڵێ: بچۆ بۆ لای «ئیمامی مالیک»و سەلامی پێ بگەیەنە و بڵێ، هارون دەڵێ، کتێبەکەی بێنێ، هێندێکم بۆ وەخوێنێ. جەعفەری بەرمەکی دەچێ و عەرزی دەکا. «ئیمامی مالیک» دەفەرمووێ: بچۆوە سەلامی من بە خەلیفە بگەیێنە و بڵێ، «مالیک» دەیگوت: عیلم زیارەتی کەس ناکا، دەبێ زیارەتی بکرێ و بە پیری کەسەوە ناچێ، دەبێ بە پیریەوە بچن. جەعفەری بەرمەکی چوەوە عەرزی خەلیفەی کرد، لەو کاتەشدا، ئیمام ئەبوو یوسف، کە شاگردی ئیمامی حەنەفی بوو، زانایێکی عیراقی زۆر بەرز بوو، (ئەوە تا ئێستا مەرقەدی موبارەکی لە

مزگەوتی ئیمام مووسای کازم دایە و بارەگای جیایە)، لای هارونە ڕەشید دانیشتبوو، فەرمووی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان، بە دوایدا بنێرەوە بابێ، ئەگینا خەبەر دەچێتەوە بۆ عیراق، دەڵێن: «ئیمامی مالیک» بە قسەی خەلیفەی نەکردووە، لەو کاتەدا «ئیمامی مالیک» وەژوور دەکەوێ و سەلام دەکا و دادەنیشێ، هارونە ڕەشید دەڵێ: ئەی «ئیمامی مالیک»، من دەنێرم بە دوات دا و جوابم نادەیەوە! «ئیمامی مالیک»، زۆر بەبێ ترس دەڵێ: زەیدی کوڕی سابیت دەفەرمووێ: کاتبی وەحی بووم، قورئانم دەنووسی‌یەوە، نووسیم «لاَ يَسْتَوِى ٱلْقَاعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمجَاهِدُونَ» لەو کاتەشدا عبداللەی کوڕی [أمُ مَكْتُومْ] لەوێ بوو، گوتی: ئەی ڕەسولی خوا، دەی باشە خواوەندی گەورە دەفەرمووێ: دەرەجەی ئەوانەی ناچنە غەزا و لەماڵەوە دادەنیشن، وەک ئەوا نە نیە کە دەچن بۆ غەزا، من کە کوێرم و غەزام بۆ ناکرێ چ گوناحێکم هەیە؟ پێغەمبەر داما و فەرمووی: نازانم، دەفەرمووێ: منیش قەڵەمەکەم ڕاگرت و ڕاوەستام، پێغەمبەر بێ هۆش بوو، لە پاشان هەستا، دانیشت فەرمووی: ئەی زەید بنوسە ﴿غَيْرَ أُولِى ٱلضَّرَرِ﴾ ئیللا ئەوانە نەبێ کە مەعزورن، شەلن کوێرن هەر عوزرێکیان بێ، ئەوانە مەعفوون.

«ئیمامی مالیک» فەرمووی: ئەی هارونە ڕەشید، بۆ ئەو دوو کەلیمە، حەزرەتی جوبرەئیل و پێغەمبەر ئەوەندە نارەحەت بوون، تا خوا فەرموونی. جا توو خوا حەقم نیە، من ڕێزی عیلم بگرم! جەنابیشت خوای گەورە بەرزی کردویەوە تۆ مەبە بە یەکەم کەس، عیلم سووک بکەی، با خوا سووکت نەکا. هارونە ڕەشید زۆری پێ خۆش بوو، هەستا لە گەڵ «ئیمامی مالیک» چوو بۆ ماڵی «ئیمامی مالیک»، هارونە ڕەشید گوتی: لە کتێبەکەت، نەختێکم بۆ وەخوێنە، فەرمووی: زۆر دەمێکە بۆ کەسم نەخوێندوتەوە، هارونە ڕەشید گوتی: با خەڵکەکە بڕۆنە دەرەوە، تا خۆم وەی خوێنم، «ئیمامی مالیک» فەرمووی: هەر عیلمێک بۆ یەکێک لە خەڵک مەنع بکرێ، ئەو یەکە، قەت سوودی لێ ناکا، ئنجا مەعنی کوڕی عیسای

قەزازیان هێنا و «المُوَطأ»ی «ئیمامی مالیکی» دەخوێندەوە و «ئیمامی مالیک» مەعنای لێ دەدایەوە و هارونە ڕەشید گوێی گرتبوو، لە پاشان هارونە ڕەشید زۆر بە ئەدەبەوە دەستی «ئیمامی مالیکی» ماچ کرد و گەڕایەوە.

لە پاش ماوەیەک، «ئیمامی مالیک»، لە ڕۆژی دەی مانگی ڕەبیعی ئەوەل ساڵی سەت و حەفتاوو نۆی کۆچیدا، لە مەدینەی موونەووەرە وەفاتی فەرموو، ئێستا مەرقەدی مووبارەکی لە قەبرستانی بەقیعە. ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و هێندێک لە بە سەرهات و فەرمایشتی «ئیمامی مالیک». ئۆمید دەکەم خواوەندی گەورە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەر و دیانەتی «ئیمامی مالیک» لێمان خۆش بێ، شیفای نەخۆشمان بدا، وە بەر شیفاعەتی پێغەمبەرمان بخا، لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بمان پارێزی. ئامین.

وَٱلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (٢٢)
# ئیمامی شافێعی

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ ٱلَّذِی رَفَعَ ٱلعُلَمٰاءَ اِلىٰ أَشْرَفِ ٱلمنٰاصِبِ وَ أَسْمىٰ، وَ ٱلصَّلاٰةُ وَالسَّلاٰمُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ ٱلَّذِی أَذْهَبَ ٱللهُ بِشَرِيْعَتِهِ عَنِ ٱلقُلُوبِ هَمـاً، وَ صَـلىٰ ٱللهُ عَـلىٰ آلِـهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ، خُصوصَاً عَلىٰ ٱلَّذِينَ أَطْلَعَ ٱللهُ فِي سَمٰاءِ ٱلشَّرَفِ لَهُمْ نَجْمٰا]

گوێ گری خۆشەویست، چرای مەجلیسی ئیمرۆمان و شەمعی بەزمی دانیشتنەکەمان، یەکەم دوڕ ناسی دەریای مەعانی، زانا بە مەعنا و لەفزی قورئانی، زانیاری دەریا، ئەو مەلەوانی، فەرموودەکانی لەعلی یەمانی، هاتە شاری شەرع، بوو بە سوڵتانی، ڕابەروو واریسی دینی پێغەمبەری، ڕووناک کەرەوەی ڕێگای دین و دنیای بەشەری، بە روو پشت ئەتڵەس، حەزرەتی «ئیمامی شافیعی»یە، جا، با زۆر بە ئەدەب دانیشین و بە دڵ گوێ بگرین، بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و هێندێک لە فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین، کورپینە، شتێکی زۆر خۆشە پیاو بزانێ، سەر مەذهەبەکەی کێیە و چۆن ژیاوە و ناوی چی بووە و چی بە سەرهاتووە و چی فەرمووە.

«ئیمامی شافیعی» ناوی محمدە و کوڕی ئیدریسە و لە «عبدالمناف»ی با پیری پێغەمبەر دا، لە گەڵ پێغەمبەر دەبنەوە یەک پشت.

دایکیشی بە چوار پشت، دەچێتەوە سەر حەزرەتی ئیمامی عەلی، هێندێک لە مێژوو نووسان گوتویانە: لە مەککە، لە دایک بووە، بەعزێکی‌تر ووتویانە و لە

یەمەن و لە دایک بووە، کۆمەڵێک دەڵێن: لە عەسەقەلان لە دایک بووە، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: لە شاری غەززەی فەلەستین، لە دایک بووە.

تەمەنی دوو ساڵانە دەبێ، باوکی وەفات دەکا و دایکی دەی با بۆ مەککە، هێندێک دەڵێن: چوار ساڵ لە سکی دایکیدا ماوەتەوە، ئنجا لە شەوی وەفاتی ئیمامی حەنەفیدا، لە دایک بوو، کاتێ دایکی دەی با بۆ مەککە و گەورە دەبێ، لە پێش، دەست کردنی بە خوێندن، لە حەرەمی ماڵی بەیتدا دەچوو گوێی لە مەلا و فەقێکان دەگرت و چی گوێ لێ بوایە لە بەری دەکرد، ئنجا دەستی کرد بە خوێندن لە خزمەت موسلیمی کوڕی خالیدی زەنگی، کە مفتی شاری مەککە بوو، لە عومری پازدە ساڵیدا، مفتی مامۆستای ئیجازەی فتوای دایە. «الْمَوطأ»ی ئیمامی مالیک بە تەواوی لە بەر دەکا و دەچێ بۆ مەدینە، بۆ خزمەت ئیمامی مالیک، دوای دەست ماچ کردنی و بە خێر هاتنی، عەرزی ئیمامی مالیک دەکا و دەڵێ: قوربان هاتوومە خزمەتت، گوێم لێ بگری، کتێبەکەت دەخوێنمەوە، بزانە دەیزانم؟ ئیمامی مالیک چوونکە تەماشای کرد بە تەمەن منداڵ بوو، فەرمووی: بچۆ لای حەبیبی کاتیب، با گوێت لێ بگرێ، «ئیمامی شافیعی» گوتی: قوربان دوو سێ لاپەڕەت بۆ دەخوێنمەوە، ئەگەر پێت باش نەبوو دەچم بۆ لای ئەو، فەرمووی: بڵێ: بزانم، «ئیمامی شافیعی» هێندێکی بۆ خوێندەوە و ڕاوەستا، ئیمامی مالیک فەرمووی: دەی وە خوێنە، هەموو کتێبەکەی بە ڕەوانی بۆ خوێندەوە، ئیمامی مالیک زۆری لا سەیر بوو ئەو کوڕە گەنجە لەو تەمەنە کەمەدا، ئاوا زیرەکە، فەرمووی: ئەی «محمد» ئاگات لە خۆت بێ، تۆ دەبیە زانایێکی زۆر گەورە، ماوەیەک لە خزمەت ئیمامی مالیک دەمێنێتەوە، لە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەککە،

زیرەکی و زەکاوەتی «ئیمامی شافیعی»، لە ئەندازە بەدەر بووە، ڕۆژێک لە خزمەت ئیمامی مالێک دەبێ، پیاویک دێتە خزمەت ئیمامی مالک و عەرزی دەکا دەڵێ: قوربان من بولبول فرۆشم، دوێنێ بولبولێکم بە پیاوێک فرۆشتوە، کەچی

ئیمرۆ بە سەریدا، دامەوە دەڵێ: ناخۆینێ، منیش تەڵاقم خوارد گوتم: تەڵاقم کەوێ بێ دەنگ نابێ، هەر دەخوێنێ، کابرا گوتی: ئایا تەڵاقم دەکەوێ؟ ئیمامی مالیک فەرمووی: بەڵێ: تەڵاقت کەوتووە، «ئیمامی شافیعی» گوێی لە وەڵامەکەی مالیک بوو، چوە سەر ڕێگای کابراو گوتی: ئەرێ کاکە، بولبولەکەت بە زۆری دەخۆینێ، لە کاتی خۆیدا یانێ بێ دەنگ دەبێ؟ کابرا گوتی: بە زۆری دەخوێنێ، فەرمووی: دە بچۆ بە ئیمامی مالیک بڵێ: قوربان کوڕێکی گەنج لە دەرەوەیە، عەرزت دەکا، تەڵاقەکە نەکەوتووە، کابرا گەڕایەوە عەرزی ئیمامی مالیکی کرد، ئیمامی مالیک فەرمووی: بچۆ ئەو کوڕەم بۆ بانگ بکە، کابرا چوو «ئیمامی شافیعی» بانگ کرد، ئیمام مالیک فەرمووی: کوڕم، بەڵگەت چیە لە سەر نەکەوتنی ئەو تەڵاقە؟ گوتی: قوربان، جەنابت ئەو ڕۆژە نەت فەرموو: دەڵێن: ڕۆژێک فاتمەی کچی قەیس دەچێتە خزمەت پێغەمبەر و عەرزی دەکا دەڵێ: قوربان بێ ئەدەبی نەبێ، پرسێکت پێ دەکەم، دەفەرمووێ: بڵێ: بزانم، ئەڵێ: مووعاوییە و ئەبوو جوهەم هەر دووکیان داوام دەکەن، شوو بە کامیان بکەم؟ حەزرەت فەرمووی: موعاویە فەقیرە ئەبوجوهەمیش قەد عەساکەی لە سەر شانی دانانێ ـ واتە هەر دەخوا و دەخەوێ. گوتی: قوربان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر خۆ مەعنای وانیە کە قەت هیچی پێ ناکرێ؟ بەڵکو مەعنای وایە زۆربەی کات ئاوایە.

ئەو پیاوەش کە تەڵاقی خواردووە و گوتویەتی: بێ دەنگ نابێ و دەخۆینێ، نیەتی پێ ئەوە بووە کە بە زۆری دەخۆینێ، کە واتە تەڵاقەکەی ناکەوێ. ئیمامی مالیک قسەکەی وەرگرت و زۆر ئافەرینی کرد و فەرمووی: لەم ڕۆ بە دوواوە تۆ حەقی ئەوەت هەیە فتوا بدەی، ئنجا تەشریفی دێ بۆ بەغدا و ماوەی دوو ساڵ لە بەغدا دەمێنێتەوە، زۆربەی عالم و زاناکانی عیراق، دووای دەکەون و پەیڕەوی لە بیر و باوەڕی دەکەن، لە پاش دوو ساڵ تەشریف دەباتەوە بۆ مەککە و چەند مانگێک لەوێ دەمێنێتەوە، ئنجا بۆ جاری دووەم دێتەوە بۆ بەغدا.

لەو کاتەدا، ئیمامی ئەحمەد، لە بەغدادا، مەزهەبێکی سەر بە خۆی دانابوو، زۆر زانا و دانا بوو، زۆری خەڵک دوای کەوتبوو.

کە «ئیمامی شافیعی» گەڕابەوە بەغدا، ئیمامی ئەحمەد کە دەیانگوت سێ سەت هەزار حەدیسی لە بەرە، بە زۆری دەچوە مەجلیسی «ئیمامی شافیعی» و گوێی لە فەرمایشتەکانی دەگرت.

ڕۆژێک پەیڕەوەکانی لۆمەیان کرد و عەرزیان کرد، قوربان، زۆرمان لا سەیرە کە جەنابت بەو عیلم و زانیاری‌یەوە، دەچی گوێ لە گەنجێکی بیست و پێنج ساڵی ڕادەگریێ؟ بۆ ئەو کوڕە گەنجە، ڕەفاقەتی ئەو هەموو زانا ئوستادانەت تەرک کردووە! ئیمامی ئەحمەد لە وەڵامیاندا دەی فەرمو: ئێوە نازانن و نای ناسن، دەرگای شاری شەریعەت، دووکان و بازاری پێوە درابوو، داخرا بوون، خوای گەورە بە هۆی ئەو کوڕە گەنجەوە کردنیەوە. فەرمووی: ئەوەی ئێمە لەفزەکەمان لە بەر کردووە، ئەو مەعناکەی دەزانێ،

فەرمووی: نەک هەر من، بەڵکو هەموو موسوڵمانێک قەرزداری «ئیمامی شافعین»، دەبێ دۆعای خێری بۆ بکەن.

شێخ عبداللهی ئەنساریش، لە مەدحی «ئیمامی شافیعی»دا دەفەرمووێ: هەر چەند من لە سەر مەزهەبی «ئیمامی شافیعی» نیم، بەڵام زۆرم خۆش دەوێ، چونکە لە هەر مەقامێک تەماشا دەکەم، «ئیمامی شافیعی» لە پێشەوەیە.

دەڵێن: ڕۆژێک، هاروونە ڕەشید، خەلیفەی بەغدا، لە گەڵ سیتە زوبەیدەی خێزانی لە سەر شتێک دەکەونە کێشە، سیتە زوبەیدە توورە دەبێ و بە هاڕوونە ڕەشید دەڵێ: تو جەهەننەمی. هاڕوونە ڕەشید زۆری پێ ناخۆش دەبێ، ئەویش توورە دەبێ، دەڵێ: ئەگەر من جەهەننەمی بم، تەڵاقت بکەوێ، بە توورەییەوە، لێک جیا دەبنەوە، هاروونەڕەشید سیتە زوبەیدەی زۆر خۆش ویستووە، زۆری بۆ پەرۆش دەبێ، دەنێرێ بە دووای تەواوی عولەمای بەغدادا، داوای فتوایان لێ

دەکا، کەس ناتوانێ پێی بڵێ، تەڵاقەکەت کەوتووە یان نەکەوتووە، چونکە دەڵێن: خوا دەزانێ، داخۆ هارووونە ڕەشید بەهەشتی‌یە یان دۆزەخی‌یە؟ «ئیمامی شافیعیش» لەوێ دەبێ بەڵام لە چاوزاناکان، زۆر گەنج دەبێ، کە دەزانێ کەس لە خۆی ڕانابینێ وەڵامی بداتەوە، لە جێگای خۆی هەڵدەستێ و دەڵێ: ئەگەر ڕێگام بدەن، من وەڵامی ئەدەمەوە، زۆربەی ئەوانەی نای ناسن، دەڵێن: سەیری ئەو فەقێ‌یە، چۆنی خۆ شێت کردووە! لە جێگایەک، تەواوی زانای بەغدا نەتوانن وەڵامی بدەنەوە، ئەو دەتوانێ؟ بەڵام هارووونە ڕەشید بانگی کردە لای خۆی و گوتی: فەرموو: فتواکەت بڵێ: بزانین دەڵێی چی؟ «ئیمامی شافیعی» فەرمووی: ئەی خەلیفە، ئێستا تۆ کارت بە ئێمەیە، یان ئێمە کارمان بە تۆیە؟ گوتی: من کارم بە ئێوەیە، ئنجا «ئیمامی شافیعی» فەرمووی: کە واتە زەحمەت نەبێ، جارێ لە سەر کورسی‌یەکەت وەرە خوارەوە، چونکە مەرتەبە و پلە و پایەی زانا، لە هی جەنابت بەرزترە، هارووونە ڕەشید هاتە خوارەوە، ئەوا هەموو زانا و عالم دانیشتوانی مەجلیسەکە واقیان وڕماوەو گوێیان گرتووەو تەماشا دەکەن، «ئیمامی شافیعی» ڕووی کردە هارووونە ڕەشید و گوتی: پرسیارێکت لێ دەکەم وەڵامم بدەوە، ووتی: فەرموو، فەرمووی: ئەی خەلیفەی ئیسلام، ئەوەتی تۆ بوویە خەلیفە، قەت وارێکەوتووە دەسەڵاتت بە سەر تاوان بارێکدا بووبێ و عەفوت کردبێ و لەبەر خۆفی خوا، مووخالەفەی ئارەزووی نەفست کردبێ؟ گوتی: بەڵێ، بە خوا چەند جاری وابووە، لە بەر ڕەزای خوا خەڵکم بەخشیوە. «ئیمامی شافیعی» فەرمووی: ئەوا حوکمم کرد، کە تۆ بەهەشتی و تەڵاقت نەکەوتووە، زاناکان هەر یەکە لایەکەوە دەنگی بەرز کردەوە، بە تووڕەییەوە ووتیان تۆ بە چ دەلیلێک ئەو فتوایە ئەدەی؟ «ئیمامی شافیعی» زۆر بە هێواشی و لە سەر خۆییەوە فەرمووی: بەڵگە و دەلیلم ئەو ئایەتەی سوورەی «نازعات»ە کە دەفەرمووێ:

﴿وَ أَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَ نَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ﴾

هەر کەسێک لە بەر ترسی خوا موخالەفەی ئارەزووی نەفس بکا ئەوە جێگای بەهەشتە.

زۆربەی مەلاکان، زۆریان ئافەرین کرد و دۆعای بە خێریان بۆ کرد و هارروونە ڕەشید و سیتە زوبەیدەشی پێک شاد کردنەوە و خەلاتیکی زۆر باشیان دایە، بەلام وەری نەگرت.

سەفەرێک دەکا بۆ یەمەن، لەو کاتەدا کە مامێکی دەبێتە قازی یەمەن، چەند مانگێک لە یەمەن دەمینێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ [عیراق] و قەولی قەدیمی لە عالەمی ئیسلامیدا بلاو دەکاتەوە، ئنجا دەچێ بۆ میسر و لەوێش قەولی جەدیدی بلاو دەبێتەوە. «ئیمامی شافیعی» وەک کانێکی ئالتوون، تا ڕۆژی حەشر سوودی بۆ بەری ئادەمیزاد هەیە و ئیستیفادەی لێ دەکرێ.

بێجگە لەو هەموو فتوا و شەریعەت و مەذهەبەی، کە ملیونها کەس پەیڕەوی لێ دەکا، دەیان قسەی بە نرخی ئامۆژگاری فەرمووە:

بۆ وێنە دەفەرمووێ: لە هەموو کەس زاڵمتر، ئەو کەسەیە کە تەوازوع لە بەر کەسێک بکا کە ئیحتیرامی نەگرێ و کەسێکی خۆش بوێ کە هیچ کەڵکیکی نەبێ. دەیفەرموو: بۆ زانایی ئایینی هیچ شتێک لە قەناعەت و ڕازی بوون بە دەست کورتی جوانتر نیە. دەی فەرموو: هەوڵ بدەن لە پێش ئەوەدا ببنە کار بە دەست، شەرع فێر بن. دەیفەرموو: جوانی بۆ زانایان ئەوەیە، نەفسیان دەنی نەبێ و زینەتی علیم وەرع و حیلمە.

دەی فەرموو: عیلم ئەوە نیە لە بەری کەیت و بیزانی، عیلم ئەوەیە سوودی هەبێ و عەمەلی پێ بکەی.

دەیفەرمو: کەسێک بە هۆی تەقوا و تاعەت و چاکە و پیاوەتیەوە، گەورە نەبێ، قەت گەورە نابێ، دەڵێن: «ئیمامی شافیعی» وا پیر نەبووبو پێویستی بە گۆچان و عەسا بێ، بەلام بە زۆری عەسای بە دەستەوە دەگرت، ڕۆژێک عەرزی دەکەن، دەڵێن قوربان، خۆ لە سایەی خواوە جەنابت پیرو بێ تاقەت نی، ئەی

بۆچی بە زۆری عەسا بە دەستەوە دەگری؟ دەفەرمووێ: بۆ ئەوەی هەمیشە وا بزانم، کە لە دنیا دا سەفەریم.

دەی فەرموو: کارێک مەکەن سووکتان بکا، دەی فەرموو: ئەگەر ئاوی سارد زەرەری بۆ پیاوەتی ببوایە، قەتم نەدەخواردەوە.

دەی فەرموو: نیشانەی ڕەفیق و هاوڕێی ڕاست ئەوەیە، عوزرت لێ قبوڵ کا و ئیشێکت بوو، بە دڵ بۆت جێ بە جێ بکا و غەڵەتێکت کرد، عەفووت بکا، دەی فەرموو: هیچ خۆشی‌یەک، وەک خۆشی بە یەک گەیشتنی دوو دۆست و هاوڕێی نیە و هیچ غەمێکیش وەک غەمی لێک جیا بوونەوە نیە.

دەی فەرموو: ئەوەی چاکەت لە گەڵ دەکا، دەت بەستێتەوە و ئەوەی خراپەت لە گەڵ دەکا، ئەو بەرەڵات دەکا.

دەی فەرموو: بەرزترین کەس، ئەو کەسەیە، کە خۆی بە بەرز نەزانی.

دەی فەرموو: تا ئێستا حورمەتی هەر کەسێکم، زیاد لە ئەندازە گرتبێ، حورمەتی خۆم ئەوەندە کەم بوەتەوە.. «ئیمامی شافیعی» سام و هەیبەتی زۆر بووە، دەڵێن: هیچ شاگردێکی نەی توانیوە «ئیمامی شافیعی» تەماشای بکاو ئاوی بۆ وەخورێ.

دەی فەرموو: کەڕامەت و سەخاوەت، عەیبی دنیا و قیامەتی ئینسان دادە پۆشن.

دەی فەرموو: لای خەڵک باسی عومر و تەمەنی خۆتان مەکەن، چونکە ئەگەر تەمەنت کەم بێ، بە بچووکت تەماشا دەکەن و ئەگەر زۆریش بێ بە پیرت دادەنێن.

دەی فەرموو: خۆتان بە پاک و خاوێنی ڕاگرن، تا غەمتان کەم بێ و خۆتان بۆن خۆش کەن، تا عەقڵتان زیاد بێ.

بۆ زانینی ساڵی لە دایک بوون و ماوەی تەمەنی و ساڵی وەفاتی، بە حیسابی ئەبجەد ئەو نیوە شیعرەیان داناوە، دەڵێن: [وَٱلشَّافِعِي صِينٌ بِبَرْنْدٍ] ـ واتە ئیمامی شافیعی لە «صین» دا، لە دایک بووە، کە بە حیسابی ئەبجەد «ص» «نەوەد»ەو «ی»

«ده»یەو «ن» «پەنجا»یە، واتە لە سالی سەدو پنجا، لە دایک بووە وە لە «ببر» دا، وەفاتی کردووە، کە دوو جار «ب» دەگاتە «چوار» و «ر» «دوو سەد» واتە، لە سالی دووسەت و چواری کۆچیدا، وەفاتی فەرموە، تەمەنیشی «ند» یە، کە «ن» «پەنجا»یە و «د» «چوارە»، واتە، پەنجا و چوار سالّ ژیاوە. موسولّمانینە، ئەوە بوو بە کوردی و کورتی باسی دلّۆپێک لە دەریای زانیاری «ئیمامی شافیعی»، (خوای لێ رازی بێ)، لە ئاخریدا، کۆتای بەو دوو سێ شیعرەی دێنین، کە خۆی لە پاڕانەوەیەکدا فەرموونێ: بەلّکو خواوەندی گەورە لێمان وەرگرێ و لێمان خۆش بێ. دەفەرمووێ:

[بِمَوْقِف ذلی دُونَ عِـزَّتِکَ الْـعُظْمیٰ    بِمَــخْفی سِر لاٰ أحِــیط بِـــهِ عِـلْماٰ]

ئەی خوای گەورە، سوێند بە زەلیلی خۆمان و گەورەیی خۆت و بۆ خاتری بچووکی ئێمە و گەورەیی خۆت، لێمان خۆش بە.

[بأطـرٰاق رَأسی بأغْـتِراقی بَـذلَتی    بمد یدی أستمطر الجُـوَد وَالرَّحَـا]

ئەی خوای گەورە، بۆ خاتری سوجدە و سەر بەردانەوەی ئێمە و دان نان بە تاوانباری و زەلیلی خۆمانداو بۆ خاتری دەست بەرز کردنەوەو پاڕانەوەمان، بارانی ڕەحمەتمان، لە هەوری سەخاوەتت، بە سەرماندا بڕژێنە.

[بِعَهْدِ قَـدِیم مِـنْ أَلَسْتُ بِـرَبِّکُمْ    بِمَنْ کٰانَ مَجْـهُولاً فَـعَلَّمْتَهُ الأَسْماٰ]

ئەی خوای گەورە، بۆ خاتری پەیمانی، ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّکُم﴾، بۆ خاتری ئەو کەسەی، فێری هەموو ناوێکت کرد.

أَذِقْنٰا شَرٰابَ الأُنْسِ یٰا مَنْ إِذٰا سَقیٰ    مُحِبّاً شَرٰاباً لاٰ یُـضٰامُ وَ لاٰ یَـظْمَأ﴾

بمان دەیە، قومێک شەرابی ئولفەت و مووحیبەت، ئەی ئەو کەسەی، کە تۆ شەرابی خۆشەویستی بدەی بە هەر کەسێک، تازە جارێکی تر، ئەو کەسە، نە موحتاج دەبێ و نەتینووی دەبێتەوە، ئامین [یٰا رَبُّ الْعٰالمین]

وَٱلسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ.

# (٢٣)
# ئیمامی ئەحمەد

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ الْواحِدِ الأَحَدِ الْفَرَدِ الصَمَدِ، وَ صَلىَ اللهُ عَلىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحابِهِ وَ أَتْباعِهِ إلىٰ يَوْمِ الدِّين]

با، لە چەند دەقیقەی داهاتووی عومرماندا، بچینە مەجلیسی ئەستێرەیێکی گەشی تری ئاسمانی ئایینی بەرزی ئیسلام، کە لە زەمانی خۆیدا، ئیمامی دین و سوننەت بوو، پێشەوای مەزهەب و میللەت بوو، لە خواپەرستیدا، دڵی وەک ئاوێنە بوو، لە وەرع و تەقوا و خۆ پاراستن لە دنیا پەرەستیدا بێ وێنە بوو، عالمێکی ڕەببانی بوو، شەهیدی قورئانی بوو، ئەو بوو مەزهەبی حەنبەلی دانا، سەریشی لە ڕێگای قورئان دانا، ئەو زاتە بەرز و بێ بەدەلە، جەنابی «ئیمام ئەحمەدی حەنبەل»ە، جا با زۆر لە خزمەتیدا، بە ئەدەب دانیشین و گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و شەهید کردنی و هێندێک لە بە سەر هات و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

«ئیمامی ئەحمەد» کوڕی محمدی کوڕی حەنبەل، لە شاری بەغدا، لە دایک بووە، چوارەم پێشەواو سەر مەزهەب و ئیمامە، لەو چوار ئیمام و موجتەهیدانەی، کۆمەڵی موسوڵمانانی سوننی مەزهەب، پەیڕەوی لە ڕێگا و فتوا و مەزهەبیان دەکەن.

«ئیمامی ئەحمەد»، تا کۆمەڵی مووعتەزیلە، لە شاری بەغدا سەریان هەڵدا،

لای هەموو دانا و زانا و تەواوی موسوڵمانان زۆر خۆشەویست بوو.

وەرع و تەقوا و عیبادەتی، «ئیمامی ئەحمەد»، وەک موعجیزە وا بوو، خاوەن زەکاوەت و فەڕاسەتێکی زۆر بێ وێنە بوو.

«ئیمامی ئەحمەد» زۆر دەچوە مەجلیسی ئیمامی شافیعی، هەر چەند لە تەمەندا، ئەو لە ئیمامی شافیعی گەورەتر نەبوو، بە خزمەت زۆر لە پیاوە گەورەکانی ئایینی گەیشتبوو، وەکو «زوننونی»ی میسری بیشری حافی و سەری سەقەتی و شێخ مەعروفی کەرخی.

ئەو زاتە بەرز و پیرۆزانە، زۆریان خۆش ویستووە. بیشری حافی ڕەزای خوای لێ بێ، کە باسی «ئیمامی ئەحمەد»یان لا دەکرد، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، ئێوە نازانن، «ئیمامی ئەحمەد» سێ سیفەت و خەسڵەتی تێدایە، کە یەکێک لەو سێ خەسڵەتە لە مندا نین.

فەرمووی: یەکەم، خەسڵەتیان ئەوەیە، «ئیمامی ئەحمەد» دەیەوێ، بۆ خۆی و ماڵ و منداڵی شتی حەڵاڵ پەیدا بکا، بەڵام من هەر هەوڵی حەڵاڵ بۆ خۆم نەدەم، فەرمووی: «دووەم» خەسڵەتیان ئەوەیە، ئەو هەرچی بیدەنێ، وەری ناگرێ، بەڵام من زۆر شتم وەرگرتووە. فەرمووی: خەسڵەتی سێیەم، ئەو تا ئێستا نەچووە بۆ لای زۆر کەس، بەڵام من خۆم ڕانەگرتووەو چووم.

هەروەها ئیمامی شافیعی، کە تەشریفی لە بەغدا، چوەتە میسر، پرسیاریان لێ کردووە کە زانا و زاهیدی بەغدا کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا، ئەو جوملەی فەرمووە:

**خَرَجْتُ مِنْ بَغْدادَ وَ ما خَلَفْتُ فِيْها أَفْقَهَ وَ لاٰ أَوْرَعَ وَ لاٰ أَزْهَدَ وَ لاٰ أَعْلَمَ مِنْ ٱلْإِمٰامِ أَحْمَدَ**

کاتێ من بەغدام بە جێ هێشت، لە «ئیمامی ئەحمەد»م، شەرع زانتر و واریع تر و زاهیدتر و زاناتر، تێدا بە جێ نەهێشتووە.

دەڵێن: «ئیمامی ئەحمەد» دۆعای زۆر زوو، گیرا بووە، دەڵێن: کوڕێکی گەنج،

دایکێکی زۆر پیر و نەخۆشی دەبێ، ڕۆژێک بە کوڕەکەی دەڵێ: ڕۆڵە دەڵێن: «ئیمامی ئەحمەد» دۆعای زۆر زوو گیرا دەبێ، هەستە بچۆ لای، با دۆعایێکم بۆ بکا، کوڕە دێت و عەرزی ئیمام دەکا. ئەویش دەفەرمووێ: جا من چیم، تا خوا دۆعام گیرا بکا، دەفەرمووێ: بەڵام لە بەر خاتری ئێوە، لە بەر خوا دەپاڕێمەوە، هەڵدەستێ دەس نوێژ تازە دەکاتەوە و دوو ڕکات نوێژ دەکا و دۆعا بۆ ئافرەتەکە دەکا، کاتێ کوڕە دەچێتەوە ماڵەوە تەماشا دەکا، دایکی لە بەرەکاتی دۆعای «ئیمامی ئەحمەد»ەوە خوای گەورە شیفای بۆ ناردووە و چاک بوەتەوە.

وەرع و دیانەتی «ئیمامی ئەحمەد» بە ئەندازەیەک بوو، نانی گەنمی بەغدای نەدەخوارد، دەیفەرموو: لە بەر ئەوەی حەزرەتی عومەر، کردویەتی بە وەقف و داگیر کراوە، حەرامە، دەی نارد لە مووسڵ ئاردیان بۆ دێنا و دەیان کرد بە نان.

دەڵێن: ساڵحی کوڕی، دەبێتە قازی شاری ئیسفەهان و زۆر زانا و بە دین دەبێ و پیاوێکی زۆر سەخی و نان بدە دەبێ، دوای ئەوەی ماڵی دێتەوە بەغدا، ڕۆژێک ماڵی «ئیمامی ئەحمەد» هەویر ترشیان نامێنێ، دەچنە ماڵی ساڵحی کوڕی هەویر ترش دێنن و نان دەکەن، نیوەڕۆ نان بۆ «ئیمامی ئەحمەد» دادەنێن، یەکەم پارووی دەیخوا، فەرقی پێ دەکا و دەفەرمووێ: نانی ئەم جارەمان تامی نانی ڕۆژانی نیە، دەبێ پێم بڵێن، بۆ وایە؟ دەڵێن: قوربان، هەویر ترشەکەمان لە ماڵی ساڵحی کوڕت هێناوە. فەرمووی: ئاردی ئەوان بۆ گەرووی ئێمە نابێ، چونکە ئەو ماوەیێ قازی ئیسفەهان بووە، نانەکەی نەخوارد.

«ئیمامی ئەحمەد»، لە گەڵ ئەوەشدا کە یەکێک بوو، لەو چوار سەر مەزهەبانەی، گەشەیان بە شەریعەتی ئیسلامدا و زۆر ڕێگای باشیان بۆ خەڵک، لە دیندا دۆزیەوە، فەرمایشت و ئامۆژگاری، زۆر بە کەڵکیشی فەرموون، بۆ نموونە عەرزیان کرد، قوربان، ئیخلاس چیە؟ فەرمووی: ئیخلاسی ڕاستەقینە ئەوەیە، لە ترسی بەڵا و ئافەتی کردەوەی خۆت ڕزگارت بێ، واتە کردەوەکانت لەو

کردەوانە بن، پەشیمانیان بە دواوە نەبێ. گوتیان: ئەی قوربان تەوەکوول چـیە؟ .فەرمووی تەوەکوول ئەوەیە، سیقەت بە خوا بێ و دوو دڵ نەبی. گوتیان: ئەی ڕەزا چیە؟ فەرمووی: ڕەزا بە قەزاش ئەوەیە، هەموو کارێک حەواڵە بە خوا بکەیت و بە هیوای خوا ڕوو بکەیتە چاکە. عـەرزیان کـرد، قـوربان، ئـەی زوهـد چـیە؟ فەرمووی: زوهد واتە، خۆ پاراستن لە حەرامە، سێ جۆرە، یـەکـەمیان ئـەوەیە، تەرکی حەرام بکەی، کە ئەوەیان زوهدی عەوامونناس و زۆربەی موسوڵمانانە. دووەمیان ئەوەیە، لە هێندێک حەلاڵیش خـۆت بپارێزی، فـەرمووی: ئـەوەیان زوهدی کـۆمەڵێکی تـایبەتی لە مـوسوڵمانانە. سـێیەمیان ئـەوەیە تـەرکی ئـەو شتانەش بکەی، کە لە خوات دوور دەخەنەوە، کە ئەوەیان زوهدی عارفانە.

عەرزیان کرد، قوربان، کۆمەڵیک لە خـەڵک، وەک هـێندێک مـەلاو فـەقێ و سۆفی و دەروێش، بە زۆری لە مزگەوت دادەنیشن و عیلمیان بەوە نیە کە ئینسان دەبێ هەوڵ بدا، فەرمووی: ئەوەی دەڵێ، ئەوانەبێ عیلمن، غەڵەت دەکـا، ئـەوە عیلم لە مزگەوتی داناون، گوتیان: قوربان، جا چۆن دەبێ هیممەتی ئـەو جـۆرە کەسانە، دەبێ هەر پاروە نانێک بێ، فەرمووی: جا توو خوا هیممەت لە هیممەتی ئەو کەسە بەرزتر هەیە، کە لە دنیادا، بە پاروە نـانێک قـەناعەت بکـا؟ «ئـیمامی ئەحمەد» زۆر زانا و دانا بوو، کاتێ کۆمەڵی مووعتەزیلە پەیدا بوون، دەستییان کرد بە دوژمنایەتی «ئیمامی ئەحمەد» و لای خەلیفەی بەغدا شکایەتیان لێ کرد، گوتیان: «ئیمامی ئەحمەد»، لای وایە خوا قسە دەکا و دەڵێ: قورئان مەخلووق نیە، خەلیفەش تووڕە بوو، گوتی: چۆن شتی وا دەبێ! خوا چۆن قسە دەکا! بچن بۆم بانک بکەن. چوون «ئیمامی ئەحمەدیان» گرت و بردیان بۆ بارەگای خەلیفە، لە دەرگای بارەگا، یەکێ لە پیاوە گەورەکانی خەلیفە تووشی بوو، گوتی: ئەی «ئیمامی ئەحمەد»، من وەختی خۆی لە سەر دزی هەزار داریان لێ دام، ڕاستیم نەگوت: تۆش ئاگات لە خۆت بێ، بە هۆی لێدان و ئەزیەت دانەوە لە حەق لا نەدەی؟

کاتێ بردیان بۆ لای خەلیفە، خەلیفە بە تووڕەییەوە گوتی: تۆ بە چ دەلیلێک دەڵێی قورئان غەیرە مەخلووقە؟ فەرمووی: بەو حەدیسە کە پێغەمبەر، (درووودی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی: خوای گەورە قسەی لە گەڵ حەزرەتی مووسادا کردووە، خەلیفە گوتی: تۆ درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە دەکەی، پێغەمبەر قەت وای نەفەرمووە. «ئیمامی ئەحمەد» فەرمووی: ئەگەر ئەو حەدیسە درۆ بێ، خۆ ئەو ئایەتە درۆ نیە کە خوای گەورە، لە سوورەی سوجدە دا دەفەرمووێ: ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾

فەرمووی: ئەگەر ئەوە قسەی خوا نەبێ، مەعنای وایە مەخلووقە و یەکێک وتویەتی: ئەگەر یەکێکیش وتبێتی بە ڕاستی قسەیەکی زۆر لە خۆی زیاد گوتووە، چونکە خوا نەبێ، کێ دەتوانێ ئەجینە و ئینسان بەرێ بۆ جەهەننەم و جەهەننەم پڕ بکا. دەڵێ: دوو نەفەر لە زانا مووعتەزیلیەکان، لای خەلیفە بوون، گوتیان قوربان بیکوژە، هۆ باڵی بە ئەستۆی ئێمە. خەلیفە گوتی: بەرن دارکاری بکەن و بیبەنە حەپس خانە، زۆریان لێ داو گرتیان، تا خەلیفە «ٱلْمُعْتَصَم بِـالله» مرد، لە پاش ئەو، هارونی واسق بوو بە خەلیفە، لە زەمانی خەلافەتی هارون دا، زۆریان ناڕەحەت دەکرد و زۆریان لێ دەدا، ڕۆژێک سیجنەوانە کە دەچێ بۆلای و دەڵێ: ئەی «ئیمامی ئەحمەد» ئەوە حەدیسە ڕیوایەتیان کردووە دەڵێن: پێغەمبەر فەرموویەتی: زاڵم و ئەوانەی یارمەتی زاڵم ئەدەن، دەچنە جەهەننەم. فەرمووی بەڵێ کابرا گوتی، جا خۆ من یارمەتی زاڵمان ئەدەم، کە واتە منیش دەچمە جەهەننم. فەرمووی: وانیە، ئەو کەسە یارمەتی زاڵم ئەدا، کە چێشت بۆ تۆ لێ دەنێ و نانت بۆ دەکا و جلت بۆ دەشوا، تۆ بۆ خۆت زاڵمی.

✓ «ئیمامی ئەحمەد» لە بەندیخانەدا مایەوە، تا «الواسق» مردو، بوو بە دەوری جەعفەری «المتوکل بالله»، ماوەیەک دەڵێن: لە بەندیخانەی هێنا دەرێ و زۆری دڵ نەوای کرد، بەڵام ئەوەندەیان ئەزیەت دابوو، هەموو گیانی برین بوو، هەر بەو

برین و نەخۆشی‌یەوە وەفاتی فەرموو، خەڵکی شاری بەغدا، بە ژن و پیاوو گەورە و بچووکەوە، حازری جەنازەکەی بوون و نوێژیان لە سەر کردوو تەسلیم بە خاکیان کرد، «ئیمامی ئەحمەد» زاتێکی زۆر گەورە بوو، زۆر حەق گۆ بوو، زۆر بە دین بوو، زۆر لە خواترس بوو، ڕەواجی بە حەدیسی پێغەمبەر دابوو، بە تەواوی سوونەتەکانی پێغەمبەری زیندوو کردبوونەوە.

✓ یەکێک لە پیاو چاکان دەفەرمووێ: من ماڵم لە شاری قەزوێن بوو، جیران و دراوسێ یەکمان کوژرا، ئەو شەوەی «ئیمامی ئەحمەد»ی تێدا، شەهید کرا بوو بەیانی برای ئەو جیرانەمان هات بۆ لام گوتی: ئیمشەو خوا بە خێری بگێڕێ، خەونێکی زۆر عەجایبم دی! لە خەومدا، براکەم سواری ئەسپێک ببوو، زۆر کەیف خۆش بوو، گوتم: ئەرێ تۆ شەهید نەکرای؟ ووتی: بەڵێ، شەهید کرام، بەڵام ئیمشەو، «ئیمامی ئەحمەد»، لە بەغدا وەفاتی فەرمووە، خواوەندی گەورە، ئەمری فەرموو کە تەواوی شوهەدا و دانیشتووەکانی ئاسمانەکان، حازری جەنازەی «ئیمامی ئەحمەد» بن، ئەوە دەچم بۆ بەغدا، دەڵێ: کە حیسابمان کرد ئەو شەوە «ئیمامی ئەحمەد» وەفاتی فەرموو بوو.

✓ جا بۆ زانینی ساڵی لە دایک بوون و ماوەی تەمەنی و ساڵی وەفاتی، بە حیسابی ئەبجەد ئەو نیوە شیعرەشیان بۆ ئەو داناوە: و [أَحْمَدُ بِسَبْقٍ أَمْرَ جَعْدٍ] ، واتە ئیمامی ئەحمەد لە «بسَبْقْ» یندا، لە دایک بووە، کە دەکاتە ساڵی سەت و شەست و چواری کۆچی، چونکە دوو «ب» دەکاتە «چوار» و «س» «شەست»ە و «ق» «سەد»ە. وە لە «أمر» دا وەفاتی کردووە، کە دەکاتە دوو سەت و چل و یەک، چونکە «أ» «یەک»ە و «م» «چل»ەو «ر» «دوو سەت»ە و تەمەنیشی «جعد»ە، کە دەکاتە حەفتاوو حەوت ساڵ، چونکە «ج» «سێ»یە و «ع» «حەفتا»یە و «د» «چوار»ە.

ـ موسوڵمانینە زاتێکی وەک «ئیمامی ئەحمەد»، بیست و چوار مانگ لە بەندیخانەدا مایەوە، ئەو هەموو لێدان و ئەزیەتەی لە سەر ئەوە قبوڵ کرد و شەهید

کرا، کە نەی گوت: قورئان مەخلووقە، با ئێمەش بۆ خوا پەرستی و ڕاست گۆیی و چاکە، چاو لەو پیاوە گەورانە بکەین، با بزانین کە دنیا وەفایی بۆ ئەو زاتانە نەبووە، بۆ ئێمەشی نابێ، با تا ماوین ئاگامان لە خۆمان بێ، شەیتان و ئادەمیزادی شەیتان سیفەت، لە ڕێگای ڕاست و حەق لامان نەدەن، با چاومان لە برای موسوڵمان و هاو وولاتیمان بێ و دڵی ڕاگرین تا خوا ئاگای لێ بین.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و سەرهات و چەند فەرمایشتی بە نرخی «ئیمامی ئەحمەد»، ئومێد دەکەم سوودی لێ وەرگرن و لە بەر خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و پێغەمبەری خۆشەویست و «ئیمامی ئەحمەد» لێمان خۆش بێ. عەفوومان بکا. شیفای نەخۆشمان بدا. لە شەڕی شەیتان و بەلای ناگەهان بمان پارێزێ. [ئامین یا رَبُّ ٱلعالَمِین]

وَٱلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكاتُهُ

# (٢٤)
# حەزرەتی غەوس

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ للهِ اَلَّذِی فَتَحَ أَبْوابَ حَضْرَتِهِ لِأَوْلِيائِهِ، وَ صَلىَ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا وَ سَنَدِنٰا وَ شٰافِعِنٰا مُحَمَّدٍ سَيِّدِ أَنْبِيائِهِ، وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ اِلىٰ يَوْمِ لِقٰائِهِ]

برای گوێ گر و کاکی خوێندەوار، تا ئێرە باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتی چەند ئەولیای گەورەت، بۆ خوێندرایەوە، یا خوێندتەوە، ئومێدە سوودت لێ وەرگرتبن، جا بزانە، کە ئەم مەجلیسەی، لێرە بە دوواوە تێیدا دادەنیشی، ئاخر مەجلیس و دانیشتنی گوێ گرتن لەم کتێبەیە[١]، بەلاّم بزانە:

﴿خِتٰامُهُ مِسْکٌ وَ فِي ذٰلِکَ فَلْيَتَنٰافَسِ ٱلْمُتَنٰافِسُونَ﴾

مەجلیسی ئاخری وەک پڕ بێ لە میسک و عەتر و گولاّو، دەیان فرسەنک بۆنی خۆشی باسی خاوەنی گەورەی، ئەو کۆڕوو مەجلیسەمان بە ولاّتاندا دەڕواو تا ئێستا ڕۆیشتووە، جا لە بەر ئەوەی دەبێ، ئەوانەی خاوەن عەقڵی تەواو ئیمان و باوەڕن، زۆر بە دڵ هەوڵ بدەن و بچن لە پێشەوەی مەجلیسی ئیمڕۆمان، دانیشن و بە دڵ گوێ بگرن، بۆ باسی ژیان و بە سەر هات و فەرمایشتی گوڵی مەجلیسەکەمان و پەند ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

گوڵی مەجلیسی ئێستامان، ڕۆژی هەلاّتووی ئاسمانی ویلایەت بوو،

---

١ - *یانی ئاخر مەجلیسی بەرگی یەکەمە*

ئەستێرەیەکی گەشی حەقیقەت بوو، سوڵتانی ئەولیا بوو، ئیمامی ئەسفیا بوو، ڕوکنی شەریعەت بوو، ئوستادی تەریقەت بوو، گەوهەرێکی شەوچرا، لە خانەدانی نوبووەتدا، زانایێکی بێ وێنە، لە بنەماڵەی سیادەتدا، شەیدای بارەگای یەزدانی، دوڕ ناسی دەریای مەعانی، پیری مەیخانەی مەی فرۆشانی مەعریفەت، سەر حەڵقەی دەستەی دەروێشانی حەقیقەت، پێی، لە سەرشانی ئەولیا بوو، باوکی دەروێش و بێ نەوا بوو، شابازی خۆش پەروازی یەزدانی، «حەزرەتی شێخ عەبدوالقادری گەیلانی» (قَدَّسَ اللهُ أَسْرارَهُ)

جا، با زۆر بە ئەدەب دانیشین و بە چاو بڕوانین و بە دڵ گوێ بگرین و بزانین لە دەریای خواناسیدا چ مەلەوانێک بووە؟ لە علوومی ئیسلامیدا چ ئوستادێک بووە؟ «حەزرەتی غەوس» بە دە دوازدە پشت، لە باوکیڕا دەچێتەوە سەر حەزرەتی عەلی و باوکی ناوی مووسا بووە و دایکی فاتمەی کچی شێخ ئەبوو عبداللەی «سومیعەیی» بووە و پیاوێکی زۆر گەورە و بە دین بووە. «شێخ عبدالقادری گەیلانی» لە ئەووەڵ شەوی مانگی ڕەمەزانی ساڵی چوار سەت و حەفتای کۆچیدا، لە دایک بووە، دایکی ئافرەتێکی زۆر بە دین و موسوڵمان و خانەدان بووە، لە تەمەنی شەست ساڵیدا، حەزرەتی «غەوسی» بووە

دایکی گێڕاویەتەوە و فەرموویەتی: هەر بە منداڵی عەلامەت و نیشانەی گەورەیی، لە ناو چاوانی «عبدالقادر» دا دیار بوو، دەفەرمووی: لە ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا، تا ئێوارە شیری نەدەخوارد و مەمکی نەدەگرت.

جارێک هەور بوو، خەڵک نەیان زانی داخۆ ئەو ڕۆژ ڕەمەزانە یان نا؟ هاتن لە منیان پرسی و گوتم: «عبدالقادر» ئیمڕۆ مەمکم ناگرێ، مەعنای وایە ڕەمەزانە. لە ئاخریدا، دیاری دا، کە ئەو ڕۆژە ڕەمەزان بووە و خەڵک، ڕۆژوەکەیان گرتەوە.

لە بابەت شوێنی، لە دایک بوونی «شێخ عبدالقادر»ی گەیلانیەوە، چەند قەولێک هەیە، بەڵام خاوەنی «مُعْجَمُ ٱلْبُلْدانْ» دەڵێ: قسەی ڕاست ئەوەیە، کە لە ئاوایی بشتیز، لە دەورو بەری گیلان، لە دایک بووە، کە تەمەنی شەریفی گەیوەتە

حەوت ساڵ، دەستی کردووە بە قورئان خوێندن و قورئانی بە تەجویدەوە لە بەر کردووە.

ئنجا، لە مەدرەسەی شێخ ئەبوولوەفا و شێخ ئەبولخەتاب و شێخ ئەبولحوسین و شێخ ئەبوو سەعددا، عیلمەکانی تەواو کردووەن. عیلمی حەدیسی لای ئەبوو غالبی کوڕی حەسەنی باقلانی کوردی و چەند زانای‌تر خوێندووە. عیلمی ئەدەب و ئادابی لە خزمەت عەلی کوڕی زەکەریای تەوریزی و شێخ حمادی کوڕی موسلیم خوێندووە.

بە تایبەتی عیلمی تەریقەتی، لە شێخ حەماد وەرگرتووە و خەرقەی شەریفیشی، لە دەستی قازی ئەبوو سەعیدی مەخزومی وەرگرتووە.

تەشریفی لە خزمەت شێخ ئەبوو سەعید مامۆستای بە ناوبانگ و شێخی شێخان، لە بەغدا زۆر مایەوە، ئاخری ناو بانگێکی وای پەیدا کرد، لە هەموو عالەمی ئیسلامی‌دا، دەهاتنە خزمەتی و زۆر پرسیاری شەرعی، کە بۆ زاناکانی بەغدا حەل نەدەبوو، ئەو زۆر بە ئاسانی حەلی دەکرد.

ئاخر ئوستاد و شێخەکەی شێخ حەماد، لە مەدرەسەکەی خۆی، لە جێگای خۆی دای نا و فەرمووی: «عبدالقادر» ئەو جێگایە شایانی شانی تۆیە، ئەوا دام بە تۆ، ئیرشاد و تەدریسی تێدا بکە.

«حەزرەتی غەوس» دەستی کرد بە دەرس ووتنەوەو ئیرشاد، زانایانی بەغدا زۆریان پێ ناخۆش بوو، چونکە دەیان زانی تازە بازاریان وەک جاران نامێنێ و فەقێکان بە زۆری ڕوو دەکەنە بارەگای «حەزرەتی غەوس»، سەت نەفەریان کۆ بوونەوە و هەر یەکەی چەند پرسیاری ڕەقی عیلمی و شەرعی ئامادە کرد و هاتن لە «حەزرەتی غەوس»یان وە پرسن و تاقی بکەنەوە. «حەزرەتی غەوس» زۆری بە خێر هاتن کردن و حورمەتی لێ گرتن، کاتێ بە تەواوی دانیشتن و سەر و قاوەیان خواردەوە، «حەزرەتی غەوس» سەری بەردایەوەو کەوتە موراقەبەو،

ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، باقەیەک نوور لە سینگی «حەزرەتی غەوس» هـاتە دەرێ و ڕووناکی دای لە دڵی ئەو سەت عالمە و هیچیان لە بیر نەما، زۆریان لا سەیر بوو، کەوتنە حاڵەتی جەزبەوە و هەڵدەپەڕین و هاواریان دەکرد و لیباسیان لە بەر خۆیاندا دەدڕی و مەندیلیان، لە سەر، سەر فڕێدا. ئنجا «حەزرەتی غەوس» چوە سەر کورسی وەعزوو ئیرشاد، دانیشت و تەماشایێکی کردن هاتنەوە سـەر خۆیان، ڕووی کردە زاناکان و وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە، ئەو سـەت عـالم و زانایە بوون بە موریدی «حەزرەتی غەوس».

جارێک کابرایەک سێ بە سێ تەڵاق دەخوا و دەڵێ: هەرسێک تەڵاقم کەوێ، دەبێ عیبادەتێک بکەم، لەم سەعاتەدا، کەس لە دنیادا نـەی کـا، هـیچ زانـایەک، نەیزانی وەڵامی پرسیاری ئـەو تـەڵاقە بـداتـەوە. چـوونە خـزمەت «حـەزرەتی غەوس» و پرسیارەکەیان عەرز کرد، فەوری فەرمووی: با بڕوا بۆ ماڵی بەیت و لە کاتێکدا، بە تەنیا تەوافی بەیت بکا، تەڵاقەکەی ناکەوێ، زاناکانی بەغدا فتواکەیان زۆر پێ جوان بوو.

«حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی» عالمی زاهیری و باتینی بوو، دەیان زانا لە کۆڕی ئامۆژگاریدا، مل کەچ سەریان بەر دەدایەوە و دادەنیشتن و گـوێیان لە مەوعیزە جوانەکانی دەگرت، بـە دەیـان قـوتابی، لە عـالەمی ئـیسلامی دەهـاتە حـەلقەی دەرسـیەوەو دەرسـیان لا دەخـوێندە، بـێجگە لەوەی کـە هـەزاران موسوڵمان، لە هەموو لایەکەوە دەهاتنە حەلقەی زکـریەوەو تـۆبەیان دەکـردوو دەبوونە دەروێشی.

ڕۆژێک خەلیفەیێکی خۆشەویستی عەرزی دەکا و دەڵێ: ڕۆحم بە فیدات بێ، بۆچی تۆ ناوت «عبدالقادر»ە و پێت دەڵێن: «موحیەددین»؟

فەرمووی: ڕۆژێکی جورمعە، لە بەغدا دەرکەوت بووم، لە گەڕانەوەدا تووشی نەخۆشێکی زۆر زەعیف بووم، ڕەنگی گۆڕا بوو، کە چاوی بە من کەوت گوتی:

﴿اَلسَّلامُ عَلَیْکَ یا عَبْدَالْقادِر﴾ فەرمووی: منیش وەڵامم دایەوە گوتی: وەرە پێشەوە، چوومە بەردەمی، ووتی: هەڵم هەستێنە، چوومە بن باڵی و ڕاستم کردەوە، تەماشام کرد نەخۆشی‌یەکەی نەما و ڕەنگی ڕوون بوەوە، فەرمووی: پرسیارم لێ کرد تۆ کێی؟ ووتی: بۆ نام ناسی؟ ووتم نا، ووتی: ئەی «عبدالقادر»، من دینی باپیری تۆم، وەک چاوت پێ کەوتم ئاوا نەخۆش و زەعیف بووم، بەڵام خوای گەورە بە هۆی تۆوە زیندووی کردومەتەوە، دەفەرمووێ: هاتمە وە بۆ مزگەوت دوو ڕکات نوێژم کرد و ویستم بێمە دەرێ، کابرایەک هات، پێڵاوەکەی بۆ دانام و لە خۆڕا ووتی: «یا شێخ موحیەددین» فەرمووی: کە هاتمە دەرەوە هەر کەس چاوی پێ دەکەوتم، پەلاماری دەدامێ و دەیگوت «یا شێخ موحیەددین» فەرمووی: ئەوەیە هۆی ئەو ناوەم.

کەشف و کەراماتی «حەزرەتی غەوس» لە ئەندازە بە دەر بووە.

دەڵێن: ڕۆژێک خەلیفەی بەغدا، دەچێتە خزمەتی و دەکیسەی پارە بۆ دادەنێ، شێخ دەفەرمووێ: لە سایەی خواوە پێویستم بە پارە نیە، هەڵیان گرەوە، خەلیفە زۆر کێشە دەکا دەڵێ: قوربان دەبێ لێم وەرگری. «حەزرەتی غەوس» ئاخری توورە دەبێ و کیسەیەک بە دەستی ڕاست و کیسەیەک بە دەستی چەپەوە دەگرێ و بە توندی لێکیان ڕادەکێشێ خوێنیان لێ دەر دەپەڕێ، تورە دەبێ و دەفەرمووێ: ئەی ئەبوو موزەفەر، شەرم لە خوا ناکەی خوێنی خەڵک دەمژی و کۆی دەکەیەوە و دێنی لە پێش منی دا دەنێی و ڕادەوەستی! خەلیفە بێ هۆش دەبێ و لە پاش ماوەیەک، بە هۆش دێتەوە و دەستی شێخ ماچ دەکا و بە خەجاڵەتیەوە دەڕوا.

«حەزرەتی غەوس» قەت نەچوەتە بارەگای خەلیفەی بەغدا و کاتێ خەلیفەش دەهات بۆ خزمەتی، قەت لە بەری هەڵنەستاوە، دەڵێن هیچ کەسێک بە قەد «حەزرەتی غەوس» ڕوو خۆش و خۆش خولق و میهرەبان نەبووە، هەر کەسێک بچووبایە خزمەتی، کە دەهاتەوە، وای دەزانی کە «حەزرەتی غەوس» کەسی لەو

خۆشتر ناوێ.

«حەزرەتی غەوس» قەت کەسی مەحروم نەکردووە، داوای هەرچیان لێ کردبێ، بێ بەشی نەکردوون، دۆعای واگیرا بووە، هەر نەخۆشێک بە دوکتۆرو دەرمان چاری نەکرایە، ئەگەر دەردی ئەجەل نەبوایە، بە دۆعای ئەو شیفای بۆ دەهات و چاک دەبووەوە.

«حەزرەتی غەوس» خیلافی شەرعی نەکردووە، هەر خەلیفە و دەروێشێک بە پێچەوانەی شەرع و ئایینی ئیسلام، کارێکی بکردایە، فەوری لە حەلقەی زکری دەر دەکرد و تا تۆبەی نەکردایە، قبولی نەدەکردەوە.

«حەزرەتی غەوس» خاوەن مەجلیسی وەعز و حەلقەی دەرس و کۆڕی زکر بوو، چەند کتێبی وەک «غونیە» و «الفتح الربانی» داناوە، دیوانێکی شیعری زۆر نایابی بە فارسی هەیە.

«حەزرەتی غەوس»دە کوڕی بووە، یەکەمیان شێخ «عبدالوهاب» بووە، شێخ عبدالوهاب زاتێکی زۆر گەورە بووە، زۆر دانا و زانا و عالم بە عیلمی زاهیری و باتینی بووە، لە پاش وەفاتی باوکی لە جێگای باوکی دانیشتووە وەعز و ئیرشادی کردووە، لە شەوی بیست و پێنجی مانگی شەووالی ساڵی شەش سەد و سێ کۆچی‌دا، وەفاتی فەرمووە: گۆڕی موبارەکی لە بەغدایە. کوڕی دووەمی، شێخ عیسایە، زۆر زانا و عالم بووە، کتێبی «جواهر الأسرار»ی داناوە، «حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی» باوکی، کتێبی «فتوح الغیب»ی بۆ ئەو داناوە، لە ساڵی پێنج سەت و حەفتا و سێ کۆچیدا، لە میسر، وەفاتی فەرمووە، کوڕی سێیەمی شێخ «عبدالعزیز»ە، ئەویش لە خزمەت باوکی خوێندنی زاهیری و باتینی تەواو کردبوو، زۆر فازیل بوو، تەشریفی لە سنجار وەفاتی فەرمووە. کوڕی چوارەمی، شێخ «عبدالرزاق»، زۆر عالم و زانا بووە، بووەتە مفتی بەغدا و لە بەغدا وەفاتی کردووە. کوڕی پێنجەمی، شێخ ئیبراهیمە زۆر زانا و زاتێکی زۆر گەورە بوو،

ئیرشادی کردووە و خەڵکی زۆر پێ گەیاندوەو، لە ساڵی شەش سەت و بیست و سێ کۆچیدا، لە بەغدا وەفاتی کردووە و لە بارەگای باوکیدا نێژراوە.

کوڕی شەشەمی، شێخ «محمد»ە، عالمی زاهیری و باتینی بووە لە ساڵی شەش سەتی کۆچیدا، وەفاتی کردووە. کوڕی حەوتەمی، شێخ «عبدالله»یە، زۆر دانـا و زانا بووە، زۆر حەدیس زان و شەرع زان بووە، لە ساڵی پێنج سەت و هـەشتا و حەوتی کۆچیدا، هەر لە بەغدا وەفاتی کردووە. کوڕی هەشتەمی، شێخ یەحیایە، لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواو کردووە زۆر زانا بووە، لە شەوی بەراتی ساڵی شەش سەتی کۆچیدا، لە بەغدا وەفاتی فەرمووە. کوڕی نۆیەمی، شێخ مووسایە، ئەویش خوێندنی لە خزمەت باوکیدا تەواو کردووە، زۆر عالم و زانـا بـووە، لە دیمشق دانیشتووە، لە ساڵی شەش سەت و هەژدەی کۆچیدا، وەفاتی کردووە. لام وایە کوڕی دەیەمی، ناوی سالح بووە. بەڵام هیچم نەدی تا لە سەری بنووسم.

✓ «شێخ عبدالقادری گەیلانی»(قدس سره) زۆر زاتێکی کەم وێنە بووە. خوو ڕەوشتی بەرزی، شێوەی خوو ڕەوشتی با پیرە گەورەی، سەرداری عالەم بووە.

شێخی سەعدی (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە بابی دووەمـی کـتێبی گـولستاندا، دەفەرمووێ: «شێخ عبدالقادری گەیلانی»یان دی، لە ماڵی کەعبە، نارچاوانی لە سەر عەساکەی دانابوو، دەی فەرموو: ئەی خوای گەورە بمبەخشە، ئەگەر تاوان باریشم لە ڕۆژی قیامەتدا، بە کوێری حەشرم بکە، تـا لە ڕووی پـیاو چـاکـاندا شەرمەسار نەبم، لە گەڵ ئەوەشدا کە زۆری ئومێد بە ڕەحـمەتی خـوا بـووە، لە دیوانە فارسی یەکەیدا دەفەرمووێ: خواوەندی گەورە فەرموویەتی:

***بندەای گر بنگ خوردی ور شـراب        توبه کن آمورزمت بی پـیچ و تـاب***

ئەی عبدو و بەندەی من، ڕەحم و کەرەم و بەخشینی من ئەوەندە زۆرە، ئەگەر بەنگ بکێشی و نارەق و شەراب وەخۆی و تۆبە بکەی، بێ پێچو و پـەنا دەت بەخشم، دەفەرمووێ: خوای گەورە دەفەرمووێ:

*گر خطا کردی بگـوئید کـردەام تا کنم جمله خطا را من صواب*

ئەگەر خەتاو و بێ ئەمریەکتان کرد، تۆبە بکەن و بڵێن: غەڵەتمان کرد، تا هەموو گوناح و خەتاکانتان بۆ بکەم بە خێر و سەواب

دەفەرمووێ: خوا دەفەرمووێ:

*کی حساب آن گدا کردست شاه که خورد در مطبخ شه نان و آب*

کەی پاشا حیساب لە گەڵ ئەو گەدایە دا، دەکاکە لە ئاشپەزخانەی پاشادا، نان و ئاو دەخوا؟ دەفەرمووێ: خوای گەورە دەفەرمووی:

*بـــندهٔ مـــائی و انـــدر شـــرع مـــا بنده هرچی کرد بر خواجه ست خواب*

تۆ عەبد و بەندەی ئێمەی و لە شەرعی ئێمەشدا، عەبد و بەندە هەرچی بیکا گەورەکەی، خەو لە خۆی تێک نادا. دەفەرمووێ: خوای گەورە دەفەرمووێ:

*خصم دامن گـیر را راضـی کـنم روز حشر از تو دهم بر او ثواب*

ئەو دوژمن و تۆڵە ئەستێنانەی داوێنی تۆ دەگرن، لە ڕۆژی حەشردا، ڕازیان دەکەم و لە باتی تۆ، پاداشتی باشیان دەدەمەوە.

بە ڕاستی مەعنای ئەو چەند شیعرە، بە زمان و قەڵەمی زاتێکی وەک «حەزرەتی غەوس»، مژدەیێکی زۆر خۆشە بـۆ هـەموو مـوسوڵمانێک، کـە تـۆبە بکـا و لە کردەوەی خراپ پەشیمان وەبێ.

«حەزرەتی غەوس» فەرموویەتی: هەر کەسێک پەنا بۆ من و بارەگای من بێنی، بە ئومێدی خوا نائومێد نابێ، جا هەر ئەوەیە دەبینین، تا ئێستاش ڕۆژی هەزاران داما وو لێ قەوما و هاواری ئەکەنێ و پەنای بۆ دەبەن، بە هاواریان دەگاتێ.

دەڵێن: جارێک «حەزرەتی غەوس»، دەرسی بە فەقێکانی دەفەرموو، مورید و مەنسووبێکی زۆری لە خزمەتدا بوو، لەو کاتەدا، مـارێکی زۆر گـەورە لە سـەر دیواری مەدرەسە کەکەوتە خوارەوە و چوە سەر جبەی موبارەکی پاپۆکەی کرد و

سەری بەرز کردەوە بۆ بن گوێی «حەزرەتی غەوث»، زمانی دەرهێنا، خەڵک زۆر ترسان، بەڵام «حەزرەتی غەوس» دەرسەکەی نەبڕیو و ڕووی وەرنەگێڕاو وەسەر خۆی نەهێنا و تێک نەچوو، ئنجا مارەکە، هاتە بەردەمی هوشەیێکی لێ هات و «حەزرەتی غەوس» تەماشای کرد و شتێکی پێ گوتوو مارەکە ڕۆیشت، لە پاشان عەرزیان کرد قوربان ئەوە چی بوو؟ فەرمووی: ئەو مارە هات منی تاقی کردەوە، کاتێ ڕۆیشت گوتی: تا ئێستا زۆرم لە ئەولیای بەغدا تاقی کردوەتەوە؟ منیش وەتم: تۆ گیاندارێکی بێ دەسەڵاتی، قەزاو قەدەر هەڵت دەسووڕێنێ، خواحافیزی کرد و ڕۆیشت،

✓ ئنجا گوێ گری خۆشەویست، کەشف و کەڕامات و گەورەیی «شێخ عبدالقادری گەیلانی»، لە کەس شاراوە نیەو هەموو کەس لە قەدەر خۆی، شتێکی بۆ ڕوون بوەتەوە، ئێستاش لە سایەی هیممەت و بەرەکەتی ئەو گەورەیی ئەولیایەوە ،دەیان تەکیە دروست کراون و زکر و یادی خوایان تێدا دەکرێتەوە، هەزاران مورید و مەنسووب و دەروێش و دێوانە زکر و یادی خوایان تێدا دەکەنەوە، بە ڕاستی «حەزرەتی غەوس»، تا ئێستاش نەمردووە و نامرێ، «حەزرەتی غەوس» ڕەحمەتێک بوو لە ڕەحمەتەکانی خواوەندی گەورە و خوای گەورەش خۆی لە سوورەی فاتیر دا فەرموویەتی: ﴿مَا يَفْتَحِ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا﴾ هەر ڕەحمەتێک، خوا بیدا بە خەڵک، قەت کۆتایی نایە و بە کەس مەنع ناکرێ.

بە ئومێدی خوا، تا ڕۆژی قیامەت هیممەت و بەرەکەتی «حەزرەتی غەوس» لە هەموو جێیەکدا و لە هەموو کات و ساعەتێکدا، فریای هەموو موسوڵمانێک دەکەوێ و خواوەندی گەورە بە گەورەیی خۆی و بۆ خاتری «حەزرەتی غەوس»، نائومێدمان ناکا. بە ڕاستی سام و هەیبەت و خۆشەویستی «حەزرەتی غەوس» ئەوەندە زۆرە، ئێستاش کە پیاو دەچێتە بارەگاکەی، شەرم دەکاو، وا دەزانێ

تەشریفی لە حاڵی حەیات دایە و پیاو ڕووی نایێ، زۆر بچێتە نزیک مەرقەدی موبارەکی ﴿قَدَّسَ اللهُ أسْرَارَهُ﴾ «حەزرەتی غەوس» لە دوای نوێژی عیشای شەوی شەممەی نۆی مانگی ڕەبیع الأولی ساڵی پێنج سەت و شەست و یەکی (٥٦١) کۆچیدا، لە تەمەنی نەوەدو یەک ساڵی‌دا، وەفاتی فەرموو، بارەگای موبارەکی لە «باب الشیخ»ە، تا ڕۆژی قیامەت جێگای ڕاز و نیازی موسوڵمانانە و وەک خۆی لە حاڵی حەیاتدا فەرموویەتی، هەر کەسێک بە دڵێکی پاک ڕوو بکاتە ئاستانەی، خوا دڵی ناشکێنێ

ئەگەر دەیان کتێبی ئامۆژگاری لە سەر باسی کەشف و کەرامات و گەورەیی «حەزرەتی غەوس» بنووسین، هێشتا هەر تەواو نابێ، با لێرەدا خواحافیزی لە «حەزرەتی غەوس» و «مەجلیسی ئەولیا» بکەین و لە بەر خواوەندی گەورە وەپاڕێین، کە بارانی ڕەحمەتی بڕژێنێ بە سەر گیانی پاکی پێغەمبەری نازدار و ئال و ئەسحاب و ئەولیای دینداو، لە گەڵ کۆمەڵی ئەولیا و زاناو پیاو چاکاندا، لە ژێر ئالآی پێغەمبەر دا حەشرمان بکا. لە گوناحمان خۆش بێ و عەفوومان بکا. لە شەڕی شەیتان و بەلآی ناگەهان بە دورمان بکا. یاڕەبی خوایا ئێمە و خزم و کەس و کارمان و برای دەینیمان لە دەرد و بەلآ بە دور کەی. ئامین «یَا رَبَّ ٱلعَالَمِین»

وَٱلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

حەمد و سەنا بۆ ئەو خوایەی، کە یارمەتی دام، بۆ دانان و نووسینەوەی ئەم «مەجلیسی ئەولیایانە». لە ڕۆژی سێ‌شەممەی ڕێکەوتی دەی ڕەجەبی «١٤٠٤»ی کۆچی، بەرامبەر بە دەی نیسانی «١٩٨٤»ی زایینی، لە حوجرەی مزگەوتی حاجی حەمە ساڵەحی بۆسکانی، لە شاری سولەیمانی، لە نووسینەوەیان بوومەوە.

«محمدی شڵماشی»

# مه جليسى ئه‌وليا

به رگى دووه‌م

دانراوى:

مامۆستا مه‌لا محمدى شه‌لماشى

١٤١٢ كوچى ١٩٩١ زايينى

# پێشەکی
# باســی ئەولیـا

﴿بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ ٱلَّذِى نَوَّرَ قُلُوبَ أَوْلِيٰائِهِ بِلَطٰائِفِ أَنْوٰارِهِ، وَ جَعَلَ فِي نُـفُوسِ أَحِـبّٰائِهِ كُنُوزَ أَسْرٰارِهِ، وَ الصَّلٰوةُ وَ السَّلاٰمُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَوْلِيٰائِهِ وَ الصّٰالِحِينَ، وَ عَلىٰ مَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسٰانٍ مِنْ بَدْءِ ٱلْإِسْلاٰمِ إِلىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ]

حەمد و سەنا و شوکر و سوپاس، بۆ خوداوەندێ کە بە کـەرەم و گـەورەیی خۆی، لە مستێک خاک، باوکی بەرەی ئادەمیزادی دروست کردوە، کە حەزرەتی ئادەم بوو، وە بە مەعنا و مەفهوومی ئایەتی ﴿وَ نَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي﴾ ڕۆح و گیانی کردە بەر قاڵب و بەدەنی و ناوی نا ئینسان، جا لەبەر ئەوەی کە کەلیمەی ئینسان، ئونس و ئولفەت و هاوڕێیی دەگەیەنێ، خوای گەورە، دایکە حەووای بۆ خەلق کرد، تا بە خۆشی ژیان بەرنەسەر، و کورەی زەوی ئاوەدان وەکەن و ببنە خەلیفەی خوا، بۆ ئاوەدان کردنەوەی بە تاعەت و عیبادەت، تا هەر وەک چۆن مەلائیکە لە ئاسمانەکاندا، خوا پەرەستی دەکەن، ئەوانیش لە سەر کورەی زەوی خوا پەرستی بکەن.

[سُبْحٰانَ ٱللهِ] لە عەزەمەت و گەورەیی ئەو خوایە، کە هەر لە ئـەسڵێک ئـەو هەموو فەرعە و لە باوک و دایکێک ئەو هەموو هۆز و تایفە و نەتەوەی درروست کردووە، کە هەر یەکە بە ڕەنگێک و هەر یەکە بە زمانێک و هـەر کـەسە خـوو ڕەوشتێکی تایبەتی داوەتێ، لە ئادەمەوە تا خـاتەم، سـەدان پـێغەمبەری ڕەوانـە

کردوە، بۆ ئامۆژگاری و ئیرشادیان بۆ ڕێگای ڕاست، بە تایبەتی خواوەندی گەورە، قورئانی بە خەڵات بۆ «محمدالمصطفی» نارد، کە سەبارەت بە گەورەیی ئەو قورئانە، خوای گەورە هەر لە قورئاندا، لە ئایەتی پەنجاو نۆی سووڕەی ئەنعامدا دەفەرموێ: ﴿وَ لاٰ رَطْبٍ وَ لاٰ يٰابِسٍ إِلاّٰ فِي كِتٰابٍ مُبِينٍ﴾ واتە هیچ تەڕ و وشکێک نیە، کە لە قورئاندا، لە عیلمی خوادا و لە «لَوْحُ الْمَحْفُوظ»دا نەنووسرابێ و دیاری نەکرابێ، ئینجا خوای گەورە لە دوای قورئان، فەرمایشت و حەدیسی پێغەمبەری، کردووە بە ڕێگا نیشان دەری موسوڵمانان. بەڵام لە دوای ئایەت و حەدیس، هیچ قسەیەک بە ئەندازەی قسە و فەرمایشت و باسی ئەولیا و پیاو چاکان سوود و فایدەی نیە بۆ دین و دونیای ئینسانی خاوەن ئیمان و موسوڵمان. فەرمایشتی ئەو پیاوە گەورانە، بەر و سەمەری چەندین ساڵ زانیاری و تاعەت و عیبادەت و خوا پەرەستی و چلە و ڕیازەت و زەحمەتیان بووە.

پیاو چاک و ئەولیا، شەمسی ئاسمانی دین و ئەستێرەی فەلەکی یەقینن، عولەمای ئیسلام فەرموویانە نەک هەر ئەولیا بەڵکوو کەرامەتی ئەولیاش حەقە.

خاوەنی کتێبی «جَمْعُ اَلجَوٰامِعْ» و خاوەنی «عەقیدەی ئیسلامی» بە ئاشکرا، باسی کەرامەتی ئەولیایانی کردوە لە کتێبی «فەتاوای حەدیسیە»دا پرسیار لە شێخی «اِبْنُ حَجَر» کراوە، سەبارەت بە کەرامەتی ئەولیا، لە وەڵامدا فەرموویەتی: عولەمای شەرع و عولەمای حەدیس زۆربەیان لە سەر ئەوەن، کە کەرامەتی ئەولیا حەقە و ئەوەی نەزان و بێ ئاگا نەبێ، ئینکاری ناکا، دەفەرموێ: «زۆر لە زاناکان فەرموویانە: ئەوەی بە موعجیزە بۆ پێغەمبەرەکان کراوە، بە کەرامەت، بۆ وەلی دەکرێ و کراویشە.

موسوڵمانینە! مەڵێن: خۆ ئێمە ئەو پیاو چاک و ئەولیایەمان نەدیون و لە پاش مردن چ سوودێکیان بۆ ئێمە هەیە؟ وانیە، چونکە خۆ ئێمە نە بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتوون و نە ئەسحابی پێغەمبەرمان دیوە و نە چاومان بە تابعینی کەوتووە، نە

بە خزمەت سەرمەزهەبەکان گەیشتوین. کە چی دواشیان کەوتوین و سوودمان لە قسەو فەرمایشتەکانیان وەرگرتووە.

شێخی «اِبْنُ حَجَر» لە شێخی «یَافِعی»یەوە ڕیوایەت دەکا، کە فەرموویەتی: کەرامەتی ئەولیا لە موعجیزەی پێغەمبەرانە، چونکە دبێتە بەڵگە و شاهید لە سەر پیاو چاکی ئۆممەتی ئەو پێغەمبەرە.

جا لە بەر ئەوەیە کە خوێندنەوە و باسی پیاو چاک و ئەولیا، لە چەند لاوە سوود و فایدەی هەیە، لە دوای ئایەت و فەرمایشتی پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ)، قسە و باسی ئەوان لە هەموو قسە و باسێک گرنگترە، لە بەر چەند هۆیەک:

**یەکەم:** باسی پیاو چاک و ئەولیا خۆشەویستی دین دەخاتە دڵی ئینسان و خۆشەویستی دنیا، لە دڵی پیاودا، کەم دەکاتەوە و ئینسان خۆی بۆ تەماع و ماڵی دنیا تووشی تەنگ و چەڵەمە ناکا و چاو لە ژیانی ئەو پیاوە گەورانە دەکا و قەناعەت دەکاتە دەستمایەی ژیانی. **دووەم:** گوێ گرتن لە باسی پیاوچاکان، بە زۆری ڕۆژی قیامەت بیری ئینسان دەخاتەوە و پیاو خۆی لە خراپە دوور دەخاتەوە. **سێیەم** چوونە کۆڕ و مەجلیسی باسی پیاو چاکان دەبێتە هۆی ڕووکردنە خوا و زیاتر تاعەت و عیبادەت کردن و گەڕانەوە بۆ لای دین. **چوارەم:** خۆشەویستی پیاو چاکان و گوێگرتن، بۆ باسی ژیان و بەسەرەهاتیان، دەبێتە هۆی زەخیرە و توێشوی ڕۆژی قیامەت، بۆ ئینسان بە ئۆمێدی خوا. جا کە واتە، دەبێ چی لە دانیشتن و گوێ گرتن لە باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتی پیاو چاک و ئەولیا خۆشتر بێ.

خواجە «مُعِینَ اَلدِّینِ چەشتی» ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرموویەتی: ڕەفاقەتی چاکان لە هەموو چاکەیەک چاکترە و ڕەفاقەتی خراپان لە هەموو خراپەیەک خراپترە. چونکە شابازی ئەولیا و ئوستادی ئەسفیا و مەحبووبی ڕەببانی، حەزرەتی شێخ عبدالقادری گەیلانی «قَدَّسَ اللّٰهُ اَسْرَارَهُ» فەرموویەتی:

ئەولیا پاشای دنیا و قیامەتن و لە دوارۆژدا بە کەڵکی ئەو کەسە دێن کە دوایان دەکەوێ.

موسوڵمانینە! خۆ ئێمە، بە ناشوکری نەبێ، دەیان فەرسەخ لە خوو ڕەوشتی پیاو چاک و ئەولیاوە دوور کەوتووینەتەوە، با هیچ نەبێ مونکیریان نەبین، با پیاو چاک و ئەولیامان خۆش بوێن، یەکێ لە ئەولیا کە سوڵتانی دنیا و دین بوو، سیمۆرغی قافی یەقین بوو؛ گەنجینەی عالەمی گۆشەگیر، پادشای ئیقلیمی ئەعزەم، حەزرەتی ئیبراهیمی ئەدهەم، جارێک قسەی بۆ خەلک دەکرد و ئامۆژگاری دەکردن؛ فەرمووی: شەوێک لە خەومدا، مەلائیکەیەک هات، تۆمارێکی بە دەستەوە بوو، شتی لە سەر دەنووسی، پرسیارم کرد و عەرزم کرد: ئەوە چی دەنووسی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ناوی پیاو چاکان و دۆستانی خوا تۆمار دەکەم، عەرزم کرد ئەرێ ناوی منیشت تۆمار کردووە و نووسیوتە؟ لە وەڵامدا گوتی: نە. دەفەرموێ: لەو کاتەدا، بە دەمم دا هات و گوتم، بەڵێ، ڕاستە کە من ئەولیا نیم، بەڵام ئەولیا و پیاو چاک و دۆستی خوام زۆر خۆش دەوێن. دەفەرموێ: ئێمە لەو گفتوگۆیەدا بووین، لە ناکاودا، مەلائیکەیەک لە لای خواوە نازڵ بوو فەرمووی: ئەی مەلائیکە! بە ئەمری خواوەندی گەورە، ئەو تۆمارە هەڵدەرەوە و ناوی ئیبراهیمی ئەدهەم، لە پێشەوەی هەمووانداا بنووسە، چونکە دۆستی دۆستانی خوایە.

جا لە بەر ئەوەیە، کە گوتراوە [مَنْ تَشَبَّه بِقَومٍ فَهُوَ مِنْهُم] هەر کەسێک کە تێکەڵاوی قەومێک بێ، وەکوو ئەوان بچێ و خوو ڕەوشتی ئەوان بگرێ، ئەوە لەوانە و وەکوو ئەوان حیسابی بۆ دەکرێ.

هەروەک دەڵێن: پێغەمبەریش (دروودی خوای لە سەر بێ)، لە حەدیسێکدا فەرموویەتی: [اَلْمَرْءُ مَعَ مَنْ اَحَبَّهُ] واتە پیاو حەشری لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکرێ، کە خۆشی دەوێ: جا چی لەوە گەورەتر و خۆشترە، کە ئێمە حەشرمان لە گەڵ پیاو

چاکاندا بکرێ.

سەبارەت بەو کەسانەی کە گوێ لە ئایەت و حەدیس و فەرمایشتی زانا و پیاو چاک و ئەولیا ڕادەگرن، خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، لە ئایەتی هەژدەی سوورەی زومەڕدا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَـٰئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَٰهُمُ ٱللَّهُ وَ أُولَٰئِكَ هُمْ أُولُوا الأَلْبَابِ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر، تۆ موژدە بدە بەو کەسانەی کە گوێ بۆ قسەی باش دەگرن و دوای قسەی چاک دەکەون. ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا هیدایەتی داون و ئەو جۆرە کەسانە خاوەن عەقڵن.

خواوەندی گەورە لە ئایەتی شێست و دووی سورەی یونس‌دا دەفەرموێ: ﴿اَلآ اِنَّ أَوْلِيَاءَ ٱللَّهِ لاٰ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَ لاٰ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئاگادار بن خەڵکینە! کە بەڕاستی ئەولیا و پیاوی خوا لە هیچ شتێ ناترسن و بۆ هیچ شتێ غەم ناخۆن. چونکە خۆیان و کار و فەرمانیان تەسلیم بە خوا کردووە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا، لە عەزاب و غەزەبی خوا باکیان نیە. لە ئایەتی دوای ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ ئەولیای خوا ئەو کەسانەن کە بە ڕاستی ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەر هێناوە و خاوەن تەقوا و پەرهێزکارن. ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرىٰ فِي ٱلْحَيَاةِ ٱلدُّنْيَا وَ فِي الآخِرَةِ﴾ لە دنیا و قیامەت موژدەیان پێ دراوە لە لایەن خواوە، کە ئێوە ئازار نادرێن و بە سەر بەرزی ڕا دەبوێرن لە بەهەشتا.

ئای سەت خۆزگە بە دەرەجە و مەرتەبەی، ئەو کەسانەی کە خواوەندی گەورە، موژدەیان پێ بدا، بە سەربەرزی دنیا و قیامەت و لە ئاخری ئایەتەکەدا بفەرموێ: ﴿لاٰ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە قسە و فەرمایشت و کەلیماتی خوا ناگۆڕێ و ئەوەی قەراری داو وەعدەی پێدا، هەر ئەوەیە. جا بە ڕاستی سەروەت و قازانجی زۆر گەورە ئەوەیە.

بۆیە شاشوجاعی کرمانی (ڕەزای خوای لە سەر بێ)، لە فەرمایشتێکدا، فەرموویەتی: لە دوای فەرز و واجبات، گەورەترین تاعەت و عیبادەت، ئەوەیە

پیاو چاک و ئەولیای خوات خۆش بوێت. چونکە خۆشەویستی ئەولیا، بەڵگە و دەلیله لە سەر ئەوە، کە تۆ خوا و پێغەمبەرت خۆش دەوێ، چونکە ئەوە شتێکی ئاشکرایە، کەسێک ئاغایەکی خۆش نەوێ، قەد نۆکەرە گوێ لە مستەکەی ئـەو ئاغایەشی خۆش ناوێ و ئەویشی خۆش بـوێ، پـیاوەکـانیشی خـۆش دەوێ، هەروەها شێخ ئەبوو تورابی نەخشی (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ هەر دڵێک خوا لە ڕێگای ڕاست لای بدا و ڕێگای لێ بگۆڕێ، ئەوە بوغزی ئەولیای دەخاتە ناوەوە و پیاو چاکی ناخۆش دەوێ و ئینکاری کەرامەت و پـیاو چـاک دەکات.

دووبارە شێخی «اِبْنْ حَجَر»، لە فەتاوادا، دەفەرموێ: ئەوەی خاوەنی عەقڵ و دین بێ، خۆی ناخاتە گێژاوی ئینکاری ئەولیا، چونکە بە ڕاستی ئـینسانی تـێدا دەخنکێ و سەمی قاتیله، هەروەکو «اِبْنْ سەقای» تێدا خنکا و بە کافری مرد.

دەفەرموێ یەکێک لە زانایان، کە ناوی «عبدالله»یە و بە ئەبوو عەسرون بە ناو بانگە، دەڵێ: لە شاری بەغدادا، پیاوێک هەبوو پێیان دەگوت غەوث، جـارجـار دەهات، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد و جـاری واشـبوو ون دەبـوو، خـەڵک زۆر عەقیدەی پێ بوو. دەڵێ: من و ابن سقا و عبدالقادری گەیلانی فەقێ بووین، لە مەدرەسەی نیظامیە ئەمان خوێند، ڕۆژێک سێ بە سێ چووین بۆ خـزمەتی، لە ڕێگادا ابن سەقا گوتی، خەڵک دەڵێ ئەو پیاوە وەلیە، وانیە، [منیش گوتم] بزانین، ئێستا دەچین پرسیارێکی لێ دەکەم، بزانم چۆنم وەڵام دەداتـەوە! عـبدالقـادری گەیلانیش گوتی؛ [مَعَاذالله]، کە من تـاقی بکـەمەوە، تـەنیا بـۆ چـاوپێکەوتن و بەرەکەت دەس کەوتن بە خزمەتی دەگەم.

دەفەرموێ کاتێ چووینە خزمەتی، بـە تـووڕەییەوە لە ابـن سـقای ڕوانـی و فەرمووی: تۆ پرسایرێکم لێ دەکەی، کە وەڵامەکەی نازانم! ئەوە پرسیارەکەتە و ئەوەش وەڵامەکەیەتی، فەرمووی: من ئاگری کوفر لە ناوچاوانتا دەبـینم بـڵێسە

دەدا.دەڵێ: ڕووشی کردە من و فەرمووی: عبدالله، تۆش وتت پرسیارێکێ لێ دەکەم، بزانم وەڵامەکەی چیە؟ ئەوە پرسیارەکەتەو وەڵامەکەشی ئەوەیە، چونکە بێ ئەدەب بووی لە گەڵ ئەولیا، تابناگوێیانت لە ماڵی دنیا و دنیا پەرستیدا غەرق دەبی. ئنجا ڕووی کردە عبدالقادری گەیلانی و فەرمووی: عبدالقادر، تۆ بە هۆی ئەدەبتەوە لە گەڵ ئەولیا، خوا و پێغەمبەرت لە خۆت ڕازی کرد. فەرمووی: وام دێتە بەر چاو، ڕۆژێک دەبێ، ئەوەندە تەرەققی دەکەی لە شاری بەغدا دەچیتە سەر کورسی و دەڵێی: پێی من لەسەر گەردەنی هەموو ئەولیایە، کە هەموو ئەولیا سەری تەعزیمت بۆ دادەنەوێنن. دەفەرمووێ: زۆری نەخایاند عبدالقادری گەیلانی بوو بەو پیاوە و ابن سقاش بوو بە عالمێکی زۆر گەورە و خلیفەی بەغدا، بۆ موزاکرە ناردی بۆ وڵاتی ڕۆم، وە هەموو قەشەومەلاکانی بۆڕدا و کچی پاشای ڕۆم ئاشقی بوو. باوکی گوتی ئەگەر بێیتە سەر دینی ئێمە لێت مارە دەکەم و «اِبْنُ سَقا» بوو بە مەسیحی و کچەکەیان دایە و نەگەڕایەوە بۆ بەغدا و لە ئاخیردا تووشی نەخۆشی گولی بوو و قورئانی لە بیر چووە و بە کافری مرد. دەڵێ: منیش چووم بۆ شام و سوڵتان صالح نورالدین، کردمی بە وەزیری ئەوقاف و زۆر دەوڵەمەند بووم و تەواوی فەرمایشتەکانی پیاو چاکەکەی بەغدا، هاتنە دیی و بە چاوی خۆم دیم. پەنا بە خوا لە ئینکاری کردنی ئەولیا!.

جا گوێ گرینە، لە بەر ئەم چەند هۆیانە و لە بەر ئەوەش کە تا ئێستا زۆر لە موسوڵمانان، داوایان لێ کردووم کە بەشی دووەمی، مەجلیسی ئەولیایان، بۆ بنووسم و مەجلیسی خۆیان لە چەند کاتێکدا، بە باسی ئەو زاتە بەرزانە وەڕازێنن، بێ دڵیم نەکردن و بە ئومێدی خوا، لە مەجلیسەکانی داهاتوودا، ئەگەر خوایار بوو، هەر ڕۆژە دەچینە خزمەت یەکێک لە ئەولیای خوا و مشت و ماڵی دڵ و مێشکمان بە فەرمایشتە جوانەکانیان و، بەسەرهاتیان دەکەینەوە و لە کۆتایی ئامۆژگاری ئەمڕۆ ماندا، بەو چەند شیعرانەی دیوانی حەقیقی، لە بەر خوای گەورە دەپاڕێنەوە

که تۆفیقمان بدا و له هەموو لایەکمان خۆش بێ.

خــوداوەنــدا بـه حـەققی بێ نـەزیریت
بــه حــەققی پــادشایی و بێ وەزیـریت
بــه زاتــی پــاکــی بێ وێنه و میسالت
بــه عـیلم و قـودرەت و جـاهو جـەلالت
به حەققی سورەیی [اَلْحَمدُ] و [إِخْلاٰص]
به سورەی [فاتحه] تـا سـورەیی [نـاس]
بــه حــامیمی لەقـەب ئـاها و یـاسین
که خەڵقی کوللی مەخلووقت له بەر وین
بــــه حـــەققی ســورەیی [إِنّــا فَــتَحنا]
بــه وانــەی تــۆ دەیــان زانــی ئـەمن نـا
بـه مـالی [کـعبه] و [بـیت المـقدس]
بـه ڕۆحـی ئـەنبیا و هـەرچـی تـیا هـەس
بــــه حـــەققی گــوڵبژێری ڕەهــبەرانت
«مــحەممەد» خـــاتەمی پــێغەمبەرانت
بـه حـەققی مـەهبەتی [رُوحُ الأَمِين] ت
بــــه حـــەققی [رَحْـمَةٌ لِـلْعٰالَمين] ت
بــه حــەققی چــوار یـاری یـار و یـاوەر
ئەبووبەکر و عومەر، عوسمان و حـەیدەر
بـه حــەققی ئـال و ئـەسحاب کـرامـی
خسووسەن «حـەمزەو» «عـەبباسی» مـامی
به دو غـونچەی گـوڵی ڕەوزەی جـینانت
نـــەوەی پــێغەمبەری ئـاخر زەمـانت

بــە ئـیمانی ئــەوانــەی خــاسی نــاسن
بــە چــاکــانێ بــە چـاکـی تـۆ دەنـاسن
بـــە ئـــومێدی دڵانـــی پــڕ لە ئـیمان
بــە شـــەرمی شـەرمە سارانـی پـەشیمان
بە وانەی دێنە دەربارتِ بـە ڕووی سـوور
بە وانـەی ڕادەوەسـتن مـل کـەچ و دوور
بــە وانــەی [قـائِمَ آلیَّـل]ن بـە بـێ خـەو
بــە وانـەی [صٰـائِمُ الدَّهْـر]ن هـەتا شـەو
بــە چــاوی پـڕ لە فـێرمێسکی سـەغیران
بە ڕووی زەرد و هەناسەی ساردی پـیران
بــە نــامۆیی ئـەسیر و خـۆف و تـرسی
بە کـەم ڕووی غـەریبی ڕووت و بـرسی
بـــە وانـــەی پـــیرە دڵـــیان و مـنالْن
بــە وانــەی زۆر مــناڵ و ئــەهلی حـاڵن
بــە وانـەی خـۆت دەیـانناسی و دەزانـی
لە گـــەڵیانا هـــەتا لوتـــفی نـــیهانی
پەڵەی هەوری کەرەم چـی لێ دەبێ کـەم
پەڵەی ڕەحمەت بـدا سـەرجـەم لە عـالەم
زەوی و زاری عــیبادەت ویشکــە دێــرە
پــەڵێکی هــەوری ڕەحــمەت بـۆ بنێرە
بـــە خـــوڕڕەم ڕێــژنەیێکی لێ بــبارێ
تـــەم و ژەنگـــی گــوناهی لێ بــتارێ

وَ صَلیٰ اَللهُ عَلیٰ سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ اِلیٰ یَومِ اَلدِّین. وَ آخِرُ دَعْوٰنا اَنِ اَلحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ اَلعٰالَمِینَ وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَکٰاتَهُ

# (۲۵)

## باسی ئیمام زین العابدین

﴿بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلَّذِی خَلَقَ الاِنْسانَ مِنْ طِینٍ. و الصَّلوةُ وَ اَلسَّلامُ عَلیٰ جَمیعِ الْأَنْبِیاءِ وَ الْمُرْسَلِینَ، خُصُوصاً عَلیٰ سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ الطَّیِّبِینَ اَلطّاهِرِینَ، وَ عَلیٰ أَصْحابِهِ وَ أَتْباعِهِ مِنْ أَوَّلِ اَلیَوْمِ اِلیٰ یَوْمِ اَلدِّینْ، سِیَّما عَلیٰ ثَمَرَةِ فُؤادِ اَلحُسَینِ نَجْلِ فاطِمَةِ اَلزَّهْراء، وَ عَلیَ اِبْنِ أَبِي طالِبِ اَلاِمامِ اَلمُلَقَّبِ «بِزَیْنِ اَلعابِدِین» رِضْوانُ اللهِ تَعالیٰ عَلَیْهِمْ اَجْمَعِینَ آمِینْ]

موسولمانینه، با لەم چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینە کۆڕ و مەجلیسی کەسێکی، کە لە ناو سەیادەتا، ڕۆژی ڕووناکی ئاسمانی ویلایەت و دین بوو، مانگی چواردەی شەوەزەنگی عیلم و زانیاری و یەقین بوو، ئەستێرەی بەرەبەیانی سوبحی سالحان و مامۆستای عولەما و سولەحا و ئەولیا و عارفین بوو، شابازی سەرشانی عابدین و زاهدین و سالکین بوو، میوەو بەر و سەمەری دڵی فاتمەی زەهرا و حەزرەتی عەلی بوو، جا ئەو زاتە خاوەن سیفاتە نوورینە، حەزرەتی «ئیمام عەلی کوڕی ئیمامی حوسەین «زین العابدین»»ە، با بۆ ماوەی چارکە سەعاتێک لە مەجلیسی باسی ئەو ئەولادی پێغەمبەرە، زۆر بە ئەدەب و ویقار دانیشین و بە گوێی دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و زوهد و تاعەت و وەرع و عیبادەت و عیلم و زانیاری و کەشف و کەرامەت و خوو و ڕەوشت و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری دین و دنیایان لێ وەرگرین،

ئیمام زین‌العابدین کوڕی حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلی یە، لە ڕۆژی پێنج شەممەی پێنجی مانگی شەعبانی ساڵی سی‌و هەشتی کۆچی و لە زەمانی حەیاتی با پیریدا (حەزرەتی عەلی)، «زین‌العابدین» لە شاری مەدینەی مونەووەرە لە دایک بوو.

«ئیمام زین العابدین»، ناوی ئەسڵی عەلی ئەسغەرە و لە قەبی «زین العابدین» بوو، ئیمامی مالیک (ڕەزای خوای لیّ بیّ)، فەرموویەتی: لە بەر ئەوەی زۆری عیبادەت دەکرد، ناو چاوانی نووری عیبادەتی پێوە دیار بوو، ناویان نا «زین‌العابدین»

«ئیمامی زین‌العابدین»، ئیمامی چوارەمی مەزهەبی شیعەی ئیمامی‌یەیە. عەللامەی ئیسلام، شێخی زومەخشەری، (ڕەحمەتی خوای لیّ بیّ)، لە کتێبی «ربیع الابرار»دا دەفەرمویّ: کاتی لە زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتابدا، (ڕەزای خوای لیّ بیّ) عیراق و بە تایبەتی شاری مەداین گیرا، سیّ کچی یەزدگردی کوڕی نەوشیرەوانی عادل و دادگەر، کە لەو سەردەمەوەدا پاشای ئێران بوو، ئەسیر کران و هێنایانن بۆ خزمەت حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لیّ بیّ)، ئەسحابەکان ویستیان ئەو سیّ کچەش وەکوو ئەسیرەکانی تر بخەنە مەزاتەوە و بیان فرۆشن، لەو کاتەدا حەزرەتی عەلی [كَرَّمَ اللهُ وَجْهَهُ] فەرمووی: نابیّ کچی پاشایان وەکوو کچی خەڵکی‌تر موعامەلەیان لەگەڵ بکریّ! خەلیفەی ئیسلام حەزرەتی عومەر ئەو قسەی زۆر پیّ خۆش بوو، فەرمووی: ئەی باشە یا عەلی چیان لیّ بکەین؟ حەزرەتی عەلی فەرمووی: بە لای منەوە وا باشە، بە پارەیەک بیان قەملێنین و ئەوەی پارەکەیدا بۆ ئەو بن. خەلیفەی ئیسلام حەزرەتی عومەر فەرمووی: زۆر باشە، قەملاندیانن و حەزرەتی عەلی گورج پارەی هەرسێکیانی دا و یەکێکیان کە ناوی شهربانوو یان غەزالە بوو، دای بە حەزرەتی حوسەینی کوڕی، یەکی تریان دا، بە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر و ئەویتریان دا بە محمدی کوڕی حەزرەتی ئەبووبەکر و فەرمووی: ئەو سیّ کچە پاشایە قابیلی ئەو

سی کوڕانەن.

بە ئەمری خواوەندی گەورە، ئەو سێ خوشکە، لەو سێ کوڕە خەلیفانە، هەریەکەی کوڕێکی بوو. شابانوو، لە حەزرەتی حوسەین، «ئیمام زین‌العابدین»ی بوو. ئەوی تریان، لە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر، سالمی بوو. ئەوی تریشیان، لە محمدی کوڕی حەزرەتی ئەبووبەکر قاسمی بوو، کە هەرسێکیان زۆردانا و زانا و عالم و بوونە گەورە پیاوی عالەمی ئیسلامی جا گوڵی بۆن خۆشی ئەم مەجلیسەمان، کە «ئیمام زین العابدین»ە، یەکێک لەو سێ گەورە پیاوانەیە.

«ئیمام زین‌العابدین»، لە خزمەت باوکی دا بوو، کە لە کەربەلا شەهید کرا، بەڵام ئەو لەو کاتەدا نەخۆش بوو، لە جێگادا کەوتبوو و شەهید نەکرا.

مەناقیب و خوو و ڕەوشت و کەشف و کەرامات و ئەخلاقی بەرز و جوانی «ئیمام زین العابدین»، ئەوەندە زۆرن، لە حیساب نایەن. زانای بە ناو بانگ شێخی زەهری دەڵێ: تا ئیستا هیچ قورەیشی یەکەم نەدیوە، بە قەد «زین العابدین» دانا و زانا و فازیل بێ. «اِبْنُ اَلمُسَیِّبْ» دەفەرمووێ: کەسم نەدیوە لە «ئیمام زین‌العابدین» پەرهێزکارتر بێ، کاتێ خەریکی دەسنوێژ گرتن دەبوو، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا و تێک دەچوو، ڕۆژێک عەرزیان کرد، قوربان، ئەوە بۆ لە کاتی دەس‌نوێژ گرتندا، ڕەنگت زەرد هەڵدەگەڕێ؟ لە وەڵام دا فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن کە ئەو دەسنوێژە، بۆ ڕاوەستان لە حزووری کێیە! دەسنوێژ بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ نوێژە کە موناجات و پاڕانەوەیە، لە خزمەت خوای گەورەدا، جا چۆن ڕەنگم زەرد نەبێ!؟

«زین‌العابدین» خوشوع و خوزووع، لە نوێژدا ئەوەندە زۆر بووە کە دەڵێن: جارێک لە نوێژدا بوو، ئاگر لە ماڵەکەیان بەربوو، بانگیان کرد قوربان، ئاگر لە ماڵەکەت بەربووە، نوێژەکەی نەبڕی و سەری لە سوجدە بەرز نەکردەوە، پاشان عەرزیان کرد؛ ئەوە بۆ نەت زانی کە ئاگر لە ماڵەکەت بەربووە، فەرمووی: بەڵێ زانیم، بەڵام لە ترسی ئاگری دۆزخ هۆشی ئەو ئاگرەم نەمابوو.

«زین‌العابدین» لە گەڵ خەڵکدا، ئەوەندە بە ڕەحم بوو، کە یەکێک بە خراپە باسی بکردایە دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە ئەگەر ئەو کابرایە ڕاست دەکا و ئەمن ئەوەندە خراپم عەفووم کە، ئەگەر درۆش دەکا، خوایە، لێی خۆش بی.

جارێک: ئامۆژگاری بۆ خەڵک دەکرد، لە فەرمایشتەکانیدا فەرمووی: بە ڕاستی مردن و نەمانی دۆست و برادەران، زۆر ئینسان مەحزوون دەکا و پیاو وەک غەریبانی لێ دێ، بەڵام دەبێ، ئینسان دڵی بەوە خۆش بێ کە ئەو خزم و دۆست و کەس و کارە، با گوناهباریش بووبن، ئەگەر تۆبەیان کردبێ، خوای گەورە [إنْ شاءَ الله] عەفووی کردوون. چونکە پێغەمبەر، (درووودی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی: خوای گەورە بەندەی گوناهکاری پەشیمانی خۆش دەوێ. خەڵکەکە بەو فەرمایشتە، زۆر کەیف خۆش بوون.

لە فەرمایشتەکانی تردا، فەرموویەتی: ئینسان لە کاتی تووڕە بوون و رق هەڵستاندا، لە هەموو وەختێک لە غەزەبی خوا نزیکترە، چونکە لەوانەیە بە هۆی ئەو تووڕە بوونەوە، تووشی گوناح و خەتایەکی گەورە ببێ و خوا غەزەبی لێ بگرێ.

جارێکی تر فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە تا دوێنێ نوتفەو مەنی بووە، چەند ڕۆژی‌تر دەمرێ و بۆگەن دەکا، خۆی بە زل دەگرێ و فەخر و تەکەببور بە سەرخەڵکەوە دەکا، شەرم ناکا!

هەروەها فەرمووی: ئەو کەسەشم زۆر لا عەجایبە، کە ئەو هەموو مەخلووقاتە دەبینێ، کە خوا دروستی کردووە و خوا ناناسێ. دووبارە فەرمووی: زۆرم لا عەجایبە کەسێک باوەڕی بە دوا ڕۆژ و زیندووبوونەوە نەبێ و بشزانێ کە خواوەندی گەورە، ئەو خەڵکەی لە ئەووەڵەوە لە نەبوو دروست کردووە.

هەروەها فەرموویەتی: دنیا [دارُالفانی]ە و قیامەت [دارُالبقا]یە کەچی زۆر کەس ئەوەش دەزانێ و هەوڵ بۆ [دارُالفنا] دەدا و [دارُالبقا] لە بیر خۆی دەباتەوە.

جارێکیان ئامۆژگاری ئیمام محمد باقری کوڕی دەکرد، فەرمووی: ئەی کوڕی

خۆشەویستم، تکات لێ دەکەم هاورێیی و ڕەفاقەتی چوار کەس مەکە. فەرمووی: یەکەم، قەت ڕەفاقەتی پیاوی فاسق مەکە، چونکە بە پاروە نانێک دەتفرۆشێ. دووەم، قەت ڕەفاقەتی ئینسانی بەخیل و ڕژد مەکە، چونکە لەو شتەش بێ بەشت دەکا، کە تۆ زۆری پێ موحتاج بی. فەرمووی: سێیەم، قەت ڕەفاقەتی پیاوی درۆزن مەکە، چونکە نزیکت لێ دوور دەخاتەوە و دوورت لێ نزیک دەکاتەوە و بە سەهوت دەبا. فەرمووی: چوارەم، ئەوەیە قەت ڕەفاقەتی ئەو کەسانە مەکە، کە قەت سیلەی ڕەحم بەجێ ناهێنن و قەتعی سیلەی ڕەحم دەکەن، چونکە ئەوجۆرە کەسانە بە سێ ئایەتی قورئان مەلعونن.

ڕۆژیکی‌تر ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: خەڵکینە، وریا بن و ئاگاتان لە خۆتان بێ، بە سەهو نەچن، سەبر و حەوسەڵە و حیلم لە دەس بدەن، لە سەر تاعەت و عیبادەت سابیر و خۆڕاگر بن و ئەگەر خوا نەکەردە، لە ڕووی نەزانینیشەوە گوناە و بێ ئەمرییەکتان کرد، زوو تۆبەی لێ بکەن، خواوەندی گەورە، عەفووتان دەکا و لێتان خۆش دەبێ. فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا، کاتێ بە فەرمانی خوای گەورە، هەموو خەڵک زیندوو کرایەوە و کۆ کرایەوە؛ مەلائیکەیەک بانگ دەکا و دەڵێ: کوان ئەوانەی کە لە دنیادا ئەهلی فەزڵ بوون؟ کۆمەڵێک ڕاست دەبنەوە و دەڵێن: ئەی مەلائیکە، ئێمە لە دنیادا، ئەهلی فەزڵ بووین، مەلائیکە دەڵێن باشە بڵێن، بزانین فەزڵی ئێوە چی بووە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە لە دنیادا ئەگەر یەکێک غەیبەتی بکردینایە، یان قسەیەکی خراپی دەرهەق بکردینایە، خۆمان ڕادەگرت و سەبرمان لەسەر دەگرت و زۆر جاریش هەر کابرامان عەفوو دەکرد، هەروەها لە سەر تاعەت و عیبادەت سەبرمان دەکرد و دووریمان لە گوناح و خراپە دەکرد و لە بەر ڕەزای خوا زیارەت و هات و چۆی پیاو چاکانمان دەکرد و بە قسە و فەرمایشتەکانی ئەوان، ڕەفتارمان دەکرد. مەلائیکە دەڵێن: کەواتە ئەو بانگ کردن و جاڕ دانە بۆ ئێوە بوو [أُدْخُلُوا ٱلْجَنَّةَ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَامِلِينَ] دەڵێن: دەفەرموون، بچنە بەهەشت، بەڕاستی ئەوەی لە دنیادا، عەمەل و

کردەوەی چاکی کرد بێ، پاداشی بەهەشتی بەرینە. «زین‌العابدین» فەرمووی: جارێک من و عەکرەمە و کوڕی مەهران و ئەبولعالیە، لە مزگەوتی تایف دا، لە خزمەت عبداللهی کوڕی حەزرەتی عەبباسی مامی پێغەمبەردا دانیشتبووین، کاتێ بانگ‌دەر بانگی دا، دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە گریا، بەر ماڵەکەی تەڕ کرد و دەماری ملی هەستان و چاوی سوور هەڵگەڕان. «ئەبوولعالیە عەرزی کرد: ئەرێ قوربان، ئەو گریانەت لە بەر چیە؟ خۆ ئێمە کە گوێ لە بانگ دەگرین، گریانمان نایە و تا ئێستا نەگریاوین، بەڵام تۆ ئەوەندە گریای، ئێمەشت بە گریان خست، لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن کە بانگ دەر گووتی: [اَللّٰهُ اَکْبَرْ. اَللّٰهُ اَکْبَرْ] ئەوە مەعنای وایە دەڵێ: ئەی خەڵکینە، دەست لە کار و کاسبی و کردەوەی دنیا هەڵگرن و وەرن بۆ باشترین عیبادەت و کردەوە، کە گوتی [اَشْهَدُ اَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاّٰ اللّٰه] ئەوە مەعنای وایە دەڵێ: ئەی موسوڵمانینە، ئەوا ئەمن، هەر گیان لەبەرێ، کە لە سەر زەوی‌یە، هەر مەلائیکەتێ لە سەر ئاسمانەکانە، کردم بە شاهید تا لە ڕۆژی قیامەتا شاهیدیم بۆ بدەن کە من لە فلاّن ڕۆژ و لە فلاّن کات و ساعەتدا، بانگم کردوون بۆ نوێژ و خواپەرستی. فەرمووی: کە دەڵێ [اَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَّسُوْلُ اللّٰه] مەعنای وایە دەڵێ: خەڵکینە، هەموو پێغەمبەرەکان و پێغەمبەری خۆشمان شاهیدیم بۆ ئەدەن، کە من ڕۆژی پێنج جار بانگی ئێوەم کردووە، تا بەڵگەتان نەمێنێ. فەرمووی کە دەڵێ: [حَیَّ عَلَی الصَّلاٰةِ، حَیَّ عَلَی الفَلاٰحْ] ئەوە مەعنای وایە کە دەڵێ: ئەی خەڵکینە. مەردی خوابن، ئەو دینە لە دەست مەدەن، ئاگاری بکەن و وەرن بەشە ڕەحمەتی خۆتان لە ماڵی خوا، بە هۆی کردنی نوێژ بە جەماعەت لە مزگەوت بەرنەوە، فەرمووی لە ئاخریش‌دا دەڵێ: [اَللّٰهُ اَکْبَرْ، اَللّٰهُ اَکْبَرْ] ئەوە مەعنای وایە دەڵێ: دەخیلە خەڵکینە، کە بانگ درا تازە کاسبی حەرامە، تا نوێژەکەتان نەکەن. فەرمووی کە دەڵێ [لاٰ اِلٰهَ اِلاّٰ اللّٰه] ئەوە مەعنای وایە دەڵێ: کوڕینە، ئەوە ئامانەتیەکی زۆر گەورەیە، لە سەرشانی ئێوە دانراوە، ئاگاتان لە خۆتان بێ. فەرمووی، جا هەر لە ئێوە دەپرسم: تۆ خوا کەسێک مەعنای بانگ ئاوا

بزانێ، حەقی گریانی نیە؟! ناچار گوتمان: بەڵێ قوربان، بەڕاستی هەم لە گریانەکەت و هەم لە مەعنای بانگەکە سوودی زۆرمان وەرگرت. خوا پاداشتت بداتەوە.

«ئیمام زین العابدین» (ڕەزای خوای لێ بێ)، وەها چووبوە ناو دڵی خەڵکەوە و ئەوەندە خۆشیان دەویست، کە خوا خوایان بوو، بە خزمەتی بگەن و زیارەتی بکەن. دەڵێن هیشامی کوڕی عبدالملکی کوڕی مەڕوان، هێشتا نەببوو بە خەلیفە، لە شامەوە چوو بۆ حەج و خەڵکێکی زۆری لە گەڵ بوو، لە کاتی تەوافی کەعبەدا، زۆری هەوڵ دا زیارەتی «حجرالاسود» بکا لە بەر زۆری حەجاج بۆ نەکرا، لە دوای تەواف کردن و سەفا و مەڕوە، هات لە دوا مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم، کورسییەکیان بۆ دانا و لە سەری دانیشت و لە مالّی کەعبەوە ڕاماو تەماشای خەڵکەکەی دەکرد. لە حاجییەکانی شام، کۆمەڵێکی زۆری لە دەورەوە بوون، لەو کاتەدا تەماشایان کرد، پیاوێکی بالاّ کورتی، ناوچاوان نوورانی، هات دەستی کرد بە تەواف، کە لە بەردی «حجرالاسود» نزیک بووە، خەڵکەکە، لە خۆڕا دڕیاندا و بە ئاسانی چوو زیارەتی «حجرالاسود»ی کرد، لە پاشان کە لە تەواف بووەوە، عالەمەکان دەستە دەستە چوون زیارەتیان کرد و دەستیان ماچ کرد، یەکێک لە شامیەکان گوتی: ئەرێ ئەوە کێیە کەوا خەڵک ڕێزی لێ دەگرن و زیارەتی دەکەن و دەستی ماچ دەکەن؟ هیشام بە تووڕەییەوە گوتی، من نای ناسم. ڕووی کردە فوڕەزدەقی شاعیر و گوتی: ئەی ئەبووفیراس ئەوە کێیە؟ فوڕەزدەق فەوری ئەو قەسیدەی دانا و گوتی:

هَذَا الَّذی تَعْرِفُ البَطْحاءُ وَ طْأَتَهُ ‌ ‌ ‌ ‌ وَ ٱلبَیْتُ یَعْرِفُهُ وَ ٱلحِـلُّ وَ الحَـرَمُ

واتە ئەوە ئەو کەسەیە، کە هەموو شیو و دۆڵێک جێی پێی موبارەکی وی دەناسێ و ماچی دەکا و هەروەها ماڵی بەیت و کەعبە و حەرەم و دەورووبەری دەیناسن.

هٰذا اِبنُ خَیرِ عِبادِ ٱللهِ کُلِّـهِم ‌ ‌ ‌ ‌ هٰذا اَلتَقِیُّ النَّقِیُّ الطّاهِرُ الْـعَلَمُ

گوتی: ئەوە کوڕی باشترین عەبدانی خوایە و ئەو تەقی و نەقی و پاک و بێ گەردە، وەکوو مانگ دەدرەوشێتەوە وەکوو ئاڵا دەشەکێتەوە و زۆر زانایە.

هٰذا اِبْنُ فاطِمَةَ اِنْ کُنتَ تَجْهَلُهُ بِجِدِّهِ اَلاَنْبِیاءُ اللهِ قَدْ خُتِمُوا

ئەوە کوڕی فاتیمەی زەهرایە، ئەگەر نای ناسی با پیریشی خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە.

اِذا رَاٰتْهُ قُرَیْشٌ قالَ قائِلُها اِلیٰ مَکارِمِ هَذا یَنْتَهی اَلْکَرَمُ

هەرکاتێ قورەیشیان، چاویان پێ بکەوێ دەڵێن؛ هەموو سەخاوەت و کەرەمێک، سەرچاوەکەی لە ئەمانەوەیە.

یَنْمی اِلی زَرْوَةِ العِزِّ الَّتِی قَصُرَتْ عَنْ نَیْلِها عَرَبُ اَلاِسلامِ وَ الْعَجَمُ

گوتی: ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە، ئەوەندە گەورە و عەزیز و خۆشەویستە، کە تا ئێستا عەرەبی موسوڵمان و عەجەمی موسوڵمان، لە هیچ خوو و ڕەوشتێکدا نەی گەیشتوونێ.

مٰا قالَ لاٰ قَطُّ اِلاّ فِی تَشَهُّدِهِ لَوْ لاٰ التَشهُّدُ کانَتْ لاٰوُهُ النَعَمُ

ئەوە ئەو کەسەیە، کە قەت نەیگوتووە لا، لە تەحیاتدا نەبێ، ئەگەر واجب نەبوایە بڵێ [لا إله إلاّ الله] ئەو لایەشی هەر بەڵێ و نَعَم دەبوو.

مِنْ مَعْشَرٍ حُبُّهِمْ دینٌ وَ بُغْضُهُمُ کُفْرٌ وَ قُرْبُهُمْ مَلْجاً وَ مُعتَصَمُ

گوتی: ئەوە لە عائیلەیەکە، کە خۆشەویستی ئەو عائیلە دینە و واجبە و بوغزاندنیان کوفرە و لێ نزیک بوونەوەیان پشت و پەنایە، بۆ دین و دنیا.

وَ لَیْسَ قَوْلُکَ هَذِهِ بِضائِرِهِ العربُ تَعْرِفُ مَنْ اَنْکَرْتَ وَ الْعَجَمُ

گوتی: ئەی هیشام، ئەوە کە تۆ دەڵێ نای ناسم، لە نرخ و گەورەی ئەو کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو ئەوەندە خۆشەویست و مەشهوورە، هەموو عەرەب و عەجەمێک دەیناسێ.

ئەمانە و چەند شێعرێکی تریشی لە مەدحی «ئیمام زین‌العابدین»دا گوتن و ئەوەندەی تریش هیشام تووڕە کرد، هیشام ئەمری کرد فورەزدەقیان گرت و

بردیان لە عسفان خستیانە بەندیخانەوە.

«ئیمام زین العابدین» کە ئەوەی زانی، دوازدە هەزار درهەمی بۆ نارد، بەڵام فورەزدەق، پارەکەی بۆ ناردەوە و گوتی: عەرزی بکەن، کە من هەر لە بەر ڕەزای خوا، لە سەری وە جواب هاتم. «ئیمام زین العابدین» دووبارە بۆی ناردەوە و فەرمووی: ئێمە ئەهلی بەیتی پێغەمبەر، کە شتێکمان بەخشی تازە وەری ناگرینەوە.

یەکێک لە کەراماتی «ئیمام زین العابدین» ئەوەبوو: عبدالملکی کوڕی مەڕوان، کە بوو بە خەلیفە، نامەیەکی بۆ حەجاجی کوڕی یوسف نارد، بۆی نووسی بوو، ئاگادار بە، خوێنی ئەولادی عبدالمطلب نەڕێژی، چونکە تا ئێستا هەر کەسێک لە تایفەی ئێمە، خوێنی یەکێکی لە وان ڕشتبێ، زوو لە بەین چووە، لە ئاخریدا نووسیبووی، بەڵام نابێ ئەو قسەیە، لە لای کەس بدرکێندرێ.

[سبحان الله]، هەر لەو کاتەدا، کە عبدالملک لە شامەوە، ئەو نامەیەی بۆ حەجاج نارد، «ئیمام زین العابدین» دەستی دایە قەڵەم ونووسی، لە پاش [بسم الله] و سەلات و سەلام، ئەی عبدالملک، تۆ ئیمڕۆ، کە ڕۆژی ئەوەندەی ئەوەندەیە، لە فلان کات و ساعەتدا، سەبارەت بە ئێمە، ئاوات بۆ حەجاج نووسیوە، خوای گەورە پاداشتت بداتەوە، نامەکەی مۆر کرد و ناردی بۆ شام. کاتێ عبدالملک نامەکەی خوێندەوە؛ زۆری لا عەجایب بوو، باری وشترێکی پارە و ئەشیا بۆ نارد و بە غوڵامەکەی گوت عەرزی «ئیمام زین‌العابدین» بکە، دوعای خێرمان بۆ بکا.

لە جێگایەکی تردا، زوبەیری کوڕی ئەسلەمی مەکی دەڵێ: جارێك لە خزمەت یەکێک لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر، جابیری کوڕی عبداللەدا بووین؛ «ئیمام زین‌العابدین» بە محمد باقری کوڕی گوت: هەستە بچۆ سەری مامت ماچ کە، محمد باقر چوو سەری جابیری ماچ کرد، جابیر چونکە کوێر بوو نەی ناسی، گوتی: ئەو منداڵە کێ بوو؟ «ئیمام زین العابدین» فەرمووی: قوربان ئەوە محمدی

کورِم بوو، جابیر زۆر کەیف خۆش بوو، توند محمد باقری لە باوەش گرت و فەرمووی: ئەی محمد، محمد کە ڕەسوولی خوا بوو، سەلامت لێ دەکا. خەڵکەکە لایان عەجایب بوو، گوتیان: قوربان، چۆن پێغەمبەر سەلامی لێ دەکا؟! فەرمووی: جارێک لە خزمەت پێغەمبەردا بووم، حەزرەتی حوسەینی لە باوەشدا بوو، یاری لە گەڵ دەکرد، ڕووی موبارکی کردە من و فەرمووی: ئەی جابیر، ئەم حوسەینە، کوڕێکی دەبێ، ناوی عەلی دەبێ، لە ڕۆژی قیامەتدا، مەلائیکەیەک بانگ دەکا و دەڵێ: سید العابدین بفەرموێ بچێ بۆ بەهەشت. دووبارە پێغەمبەر فەرمووی: ئەی جابیر! زین‌العابدینیش کوڕێکی دەبێ ناوی محمد دەبێ، فەرمووی ئەگەر مایت و تووشیان بووی، سەلامی منیان پێ ڕاگەیێنە! فەرمووی، بەڵام ئەی جابیر، لە دوای چاوپێکەوتنیان زۆر نامێنیتەوە، ڕاوی دەڵێ: [سُبحٰان الله] لە پاش چوار ڕۆژ، جابیر وەفاتی فەرموو. دەڵێن لە ئاخریدا وەلیدی کوڕی عبدالملکی کوڕی مەروان حەسادەتی بە «ئیمام زین العابدین» برد و ناردی ژەهریان دەرخوارد دا و بە ڕیوایەتێك دەڵێن: لە شەوی هەژدەی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی نەوەدو چواری کۆچی لە تەمەنی شەست و یەک ساڵیدا شەهید بوو، لە ڕۆژی وەفاتی‌دا شاری مەدینە، وەک ڕۆژی وەفاتی خولەفاکان بوو. لە گۆڕستانی بەقیع، لە خزمەت ئیمام حەسەنی مامی تەسلیم بە خاک‌کرا.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەر هات و فەرمایشتی «ئیمام زین العابدین»، ئومێد دەکەم سوودی لێ وەرگرن و لە بەر خواوەندی گەورە دەپاڕێنەوە، بۆ خاتری ئەولادی پێغەمبەر، لێمان خۆش بێ شیفای نەخۆشمان بدا. لە تەنگ و چەڵەمە لاماندا و بۆ ڕێگای ڕاست هیدایەتمان بکا. لە بەلاّ و موسیبەتی دونیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین.

[و صلّىٰ اللهُ على سيّدِنا مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْباعِهِ أَجْمَعِين آمين وَ السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ]

# (٢٦)

# باسی عومەری کوڕی عەبدل عەزیز

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِي أَسْماؤُهُ أُجِيبَ لِلدّاعِي بِها دُعاؤُهُ
ثُمَّ صَلاةٌ وَ سَلامٌ كَمُلا مِنْهُ عَلىٰ خَيْرِ نَبِيٍّ أُرْسِلا
وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ جُنْدِهِ وَ صالِحِي أُمَّتِهِ مِنْ بَعْدِهِ.[1]

موسوڵمانینە، با لە کۆڕ و مەجلیسی دانیشتنی ئێستاماندا، بچینە بارەگای یەکێک لە پیاو چاکانی ئوممەتی پێغەمبەر، کە لە زەمانی خۆیدا واحیدی ئوممەت، بوو. نەجیب زادەی عەشیرەت بوو، پاشای دنیا و قیامەت بوو، ئەمینداری ڕەعیەت بوو، خاوەن زوهد و تەوانا بوو، دنیای بە قیامەت فرۆشتبوو، تەرکی دنیای کردبوو، ئەو زاتە خۆشەویست و عەزیزە جەنابی «عومەری کوڕی عبدالعزیز»ە.

جا، با بۆ پەند و دەرس وەرگرتن، لەو پادشای دنیا و دینە، لەو ئەستێرە گەشەی ئاسمانی یەقینە، گوێ بگرین و بە ئەدەب دانیشین و بزانین کە ئەو زاتە بەرزە، چۆن ژیاوە و چ عەدالەتێکی نیشان داوە و چۆنی خەلافەت کردووە.

«عومەری کوڕی عبدالعزیز»ی کوڕی مەڕوان، لە ساڵی شەست و یەکی کۆچیدا، لە ئاوایی حەلوان، لە وڵاتی میسر، لە دایک بوو. دایکی کچی عاسمی کوڕی حەزرەتی عومەری خەلیفەی ئیسلام بوو.

---

١ - شێخ مارفی نۆدێی.

«عومەری کوڕی عبدالعزیز» ئەسحابە نەبوو، بەڵام بە خزمەت ئەسحابی پێغەمبەر گەیشتبوو و حەدیسی لە ئەنەسی کوڕی مالیک و سائیبی کوڕی یەزید و عبداللهی کوڕی جەعفەر و عامیری کوڕی سەعد و چەند ئەسحابەی تریش ڕیوایەت کردووە. زۆر زاهید و عابید و موسوڵمان و ڕاست گۆ و عادل بوو.

هەرچەند بە زاهیر پادشا و خەلیفەی وەخت بوو، بەڵام زۆر لە زانایان و ئەهلی باتین گوتوویانە: «عومەری کوڕی عبدالعزیز» یەکێک بووە لە ئەقتاب.

لە سەرەتای لاویدا، زۆر خۆشی ڕابواردووە و لیباسی زۆر فاخیری لە بەر کردووە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە سولێمانی کوڕی عبدالمەلیکی مامی وەفاتی کرد و تەسلیم بە خاکیان کرد، هەر لەو کاتەدا، ئەویان لە جێگای دانا و بەیعەتیان لە سەر دەستی کرد، بەڵام هەر لەو ڕۆژەوە، حاڵی گۆڕا و تا وەفاتی کرد، بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕڕەیەک لە ڕێگای شەریعەتی لا نەدا.

کاتێ گەورە بوو، باوکی ناردی بۆ مەدینە، لە خزمەت عبیداللهی کوڕی عبدالله دەستی کرد بە خوێندن، کاتێ باوکی وەفاتی کرد، عبدالملک هێنایەوە بۆ شاری دمشق و فاتمەی کچی خۆی لێ مارە کرد، کاتێ وەلیدی کوڕی عبدالملک بوو بە خەلیفە، «عومەری کوڕی عبدالعزیز»ی کرد بە ئەمیری مەدینە، لە ساڵی نەوەدو سێی کۆچیدا، هاتەوە بۆ شام.

ئەوەندە بە دین و تاعەت پاک و موتەوازیع بوو، ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرموێ: لە پاش پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ)، نوێژم لە پاش هیچ ئیمامێک نەکردووە، کە وەک عومەری کوڕی عبدالعزیز بشوبهێ بە پێغەمبەرەوە.

ئیمامی ئەحمەد (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: لە ناو تابیعیاندا، قەولی «عومەری کوڕی عبدالعزیز» نەبێ، قەولی کەس بە تەنیا بەڵگە و حوجەت نیە. ئیمامی شافیعی (ڕەزای خوای لێ بێ) لە مەدحی «عومەری کوڕی عبدالعزیز»دا فەرموویەتی: خولەفای ڕاشدین پێنج بوون، حەزرەتی ئەبووبەکر ، عومەر، عوسمان و عەلی و «عومەری کوڕی عبدالعزیز».

مالیکی کوڕی دینار، کە یەکێک بوو لە پیاوە بەرزەکانی ئیسلام، لە باسی زوهد و تەقوا و عیبادەتی «عومەری کوڕی عبدالعزیز»ەوە فەرموویەتی: خەڵک دەڵێ، مالیکی کوری دینار زاهیدە! زاهیدی ڕاستەقینە و خواناسی گەورە «عومەری کوڕی عبدالعزیز»ە. دەبێ هەموو موسوڵمانێک بۆ تەرکی دنیا و عەدالەت و دادپەروەری، بە تایبەتی پاشا و مەلیک و سوڵتان و وەزیر و ڕەئیس و کاربەدەستان، چاو لە «عومەری کوڕی عبدالعزیز» بکەن.

شێخی سەعدی (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە کتێبی بۆستاندا دەفەرموێ: یەکێ لە پیاوە گەورەکان، لە «عومەری کوڕی عبدالعزیز» دەگێڕێتەوە و دەڵێ: «عومەری کوڕی عبدالعزیز» ئەوەندە ئاگاداری دڵی خەڵکی دەکرد و بە تەنگیانەوە بوو، تا ئێستا بە هیچ حاکم و پاشایەکەوە نەبیندراوە، دەڵێ: ساڵێک باران نەباری و وشکە ساڵ بوو، خەڵک لە برسان ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕا و باریک بوون، کاتێ ئاوای چاو بە خەڵک کەوت گوتی: چۆن دەبێ خەڵک ئاوا نارەحەت بێ و منیش ئاسوودەبم! نەقیمێکی لە ئەنگوستیلەکەیدا بوو، هیچ گەوهەر فرۆشێک تا ئەو کاتە گەوهەری وای نە دیبوو، ئەوەندەشی نەبوو گەوهەرێکی وا بکڕێ، بەشەو وەکوو ڕۆژ دەدرەوشایەوە و دنیای ڕووناک دەکردەوە، دەفەرموێ: ئاخر کەسێک موسوڵمانی ڕاستەقینە بێ وەک «عومەری کوڕی عبدالعزیز»، چۆن چاوی لێ بێ، کە خەڵک ئاوی تاڵ و ژەهرەمار بخواتەوە! ئەو ئاوی شیرینی بۆ قوت دەچێ و بە قوڕگیاندا دەڕواتە خوارەوە! دەفەرموێ ئەمری کرد، ئەنگوستیلەکەیان فرۆشت و پارەکەی بە سەر غەریب و هەتیو و هەژاراندا، دابەش کرد. دەڵێن هێندێک لە خزم و وەزیرەکانی لۆمەیان دەکرد و گوتیان: بۆ چیت فرۆشت؟ تازە شتی وات وەدەست ناکەوێتەوە!

دەفەرموێ: لە کاتێکدا بارانی فرمێسک بە سەر ڕوومەتانیدا، وەکوو فرمێسکی شەمع و مۆم دەهاتە خوارەوە، دەیفەرموو: کوڕینە، زۆر ناشیرینە ئامیر و گەورەی وەخت، بەرگ و لیباسی جوان لە بەر بکا و خەڵکی وڵاتەکەش، زکی لە برسان

قۆڕەی بێ، دەی فەرموو: ئەی ئەو کەسانەی حەسوودی بە منەوە دەبەن و لۆمەم دەکەن، لە سەر فرۆشتنی ئەنگوستیلە، هیچ عەیبی تێیدا نیە کە من بێ ئەنگوستیلە بم، بەڵام نابێ خەڵک دڵی نارەحەت بێ، جا ئەوەیە کە شێخی سەعدی دەفەرموێ: خۆش بەخت ئەو ئامێر و گەورەیەیە، کە بۆ ژیان و ئاسایشی خەڵک هەوڵ بدا و دەربەست بە ژیانی خۆشی خۆی نەبێ.

جارێک لە دوان و خوتبەیەکدا فەرمووی: خەڵکینە، [إِنَّ ٱللهَ تَعَالیٰ لاٰ یُعَذِّبُ ٱلعامَّةَ بِعَمَلِ الخاصةِ؛ وَ لٰکِن إِذا أَظْهَرَتِ ٱلمَعَاصي فَلَمْ یُنکِروا فَقَدْ اِسْتَحقَ ٱلقَـوْمُ جَمیعاً العُقُوبَةَ] خواوەندی گەورە قەت بە هۆی خراپەی هێندێکیان هەموو کەس عەزاب نادا، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێک بە ئاشکرا گوناهیان کردن و ئەوانی‌تر مەنعیان نەکردن، ئەوە تەواوی دانیشتوانی ئەو شار و دێیە تووشی عەزاب و عوقوبەت دەبێ. وەکوو زۆربەی خەڵکی ئێستا کە بە هۆی خراپە کردنی هێندێکیانەوە، هەموومان تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی و دەرد و بەڵا بووین. پەنا بە خوا لە عەزابی دوا ڕۆژیش.

«عومەری کوڕی عبدالعزیز» ئەوەندە موتەوازیع و خۆ بەکەم گر بووە، دەڵێن: شەوێک میوانی هاتبوو، لە دوای نوێژی خەوتنان، خەریکی نووسین بوو، میوانەکەی دانیشتبوو، چراکەی هاتە کوژانەوە، میوانەکە گوتی: قوربان هەستم چراکە چاک کەم؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە پیاوەتی نیە کە ئیش بە میوان بکەین، کابرای میوان ووتی، قوربان ئەی پیاوەکەت هەستێنم، فەرمووی نا، تازە خەوی لێ کەوتووە، هەر خۆی هەستا و نەوتی هێنا و چراکەی پڕ کردەوە و دای گیرساندەوە. میوانەکە زۆری لا عەجایب بوو، کە خەلیفەی ئیسلام، ئاوا خۆ بەکەم گر و موتەوازیع بێ، گوتی: قوربان چۆن وا دەبێ؟! ئێمە دانیشین و خۆت هەستی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بۆ نابێ؟ کاتێ هەستام، هەر «عومەر» بووم و ئێستاش هەر «عومەرم»، هیچ بچووک نەبوومەوە.

فەرمووی: باشترین عەبد و بەندە، لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە خۆی بە

کەم بگرێ و موتەوازیع بێ. هەروەها دەڵێن لە عەدالەت و دادپەروەری‌دا بێ وێنە بووە. حەسەنی قەسساب دەڵێ: لە زەمانی خەلافەتی «عومەری کوڕی عبدالعزیز»دا، بەلای مێگەلێکدا ڕۆیشتم؛ تەماشام کرد گورگ و مەڕ پێکەوە دەلەوەڕان و دەڕۆیشتن، لە ئەووەڵەوە وامزانی کە گورگەکان سەگن بە شوانەکەم گوت: ئەم هەموو سەگەت بۆ چین؟! لە وەڵامدا گوتی خۆ ئەوە سەگ نین! ئەوانەی تۆ بە سەگیان دەزانی هەموو گورگن. دەڵێ: گوتم [سبحان الله] گورگ و مەڕ بە سەریەکەوەن و مەڕەکان زەرەریان پێ ناگا! شوانەکە گوتی: کوڕم، ئەگەر گەورەی وڵات باش و عادل و دادگەر بوو، نەک هەر مەڕ، کەس زەرەری پێ ناگا، چونکە ئامیر و گەورەی وڵات وەکوو سەر وایە و کە سەریش سەلامەت بوو، هەموو لاشە و بەدەن سەلامەت دەبێ.

✓ جارێک کابرایەک مردبوو، چوونە سەر قەبران و تەسلیم بە خاکیان کرد و گەڕانەوە. بەڵام «عومەری کوڕی عبدالعزیز» کە خەلیفەی وەخت بوو، مردووەکە خزمی بوو، لە سەر قەبران دواکەوت، خەڵکەکە زۆریان چاوەڕوان کرد، تا هاتەوە، عەرزیان کرد، قوربان ئەوە بۆ دوا کەوتی؟ فەرمووی: ئەی خەڵکینە، لە گەڕانەوەدا، قەبرێک بانگی کردم و گوتی: ئەوە بۆ پرسیار ناکەی، تا بزانی ئەو گۆڕستانە چی لە کەس و کاری تۆ کردووە، گوتم بڵێ بزانم، چیان لێ بەسەر هاتووە، لە وەڵامدا گوتی: کفنەکەیان ڕزیوە، بەدەنیان لێک بڵاو بوەوە، خوێنیان مژراوە، گۆشتیان خوراوە، دەستیان لە باسکانیان جیا بوتەوە، باسکیان لە قۆڵیان کراونەوە، قۆڵیان لە شانیان ترازاون، سمتیان لە ڕانانیان و ڕانیان لە ئەژنۆیانیان و ئەژنۆیان لە بەلەکیان و بەلەکیان لە قاچیان ترازاوە و لە پاشان دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: [ألا إنَّ الدُّنْيا بَقاؤُها قليلٌ، و عَزيزُها ذَليلٌ و غَنِيُّها فَقيرٌ و شَبابُها يهرَمُ و حَيُّها يَموتُ، فَلا يَغُرَّنَّكُمْ إقبالُها مَعَ مَعرِفَتِكم بِسُرْعَةِ إدبارِها وَ المَغْرُورُ مَنِ اغْتَرَّبها]

ئاگادار بن، کە بە ڕاستی دنیا بە قاو وەفای نیە و ئەوەی لە دنیادا عەزیز بێ،

زەلیلی دەکا و دەوڵەمەندان، فەقیر دەکا و گەنج و لاوان، پیر دەکا و زیندوان دەمرێنێ، فەرمووی: دەخیلتان بم، وریا بن دنیا کە ڕووی تێ کردن، مەغروورتان نەکا و بە سەهوتان نەبا، خۆتان دەزانن کە چەند زوو پشت دەکاتەوە ئینسان، ئەوەی بە دنیا و ماڵی دنیا، لە خۆی بایی بێ، ئەوە بێ عەقڵە. فەرمووی: [أينَ سُكانُها الّذينَ بَنَوْا مَدائِنَها وَ شَقَقوْا أنْهارَها و غَرَّسوْا أشْجارَها وَ أقامُوا فيها أيّاماً يَسيرَةً غَرَّتْهُمْ بِصِحَّتِهِمْ وَ غَروُّا بِنَشاطِهِمْ فَرَكِبُوا اَلْمَعاصِي]

لە کوێن، ئەو کەسانەی، ئەو شارانەیان بینا کردووە؟ کوا ئەوانەی جۆگە ئاوەکانیان لێ داوە؟، لە کوێن ئەوانەی ئەو هەموو باغ و باغاتانەیان ناژتووە؟ چەند ڕۆژێک لە سەر دنیامانەوە، کەچی بە هۆی ساغ و سەلامەتی و سیحەتی بە دەنیانەوە، لە خۆیان بایی بوون و دەستیان کرد بە بێ ئەمری خوا و پێغەمبەر، زۆری نەخایاند، ئەجەل بوو بە میوانیان، مردن. ئێستا ئێوە نازانن کە گۆڕ چی لە لاشەکەیان کردووە! کرم چۆن گۆشت و پێستی خواردوون!

ئەوان لە دنیادا، لە سەر دۆشەک و فەرش دەنووستن و خزمەتکاریان بوو، جیران و دراوسێ ڕێزی لێ دەگرتن، بەڵام ئێستا تەماشای جێگا و مەنزڵ و ماڵەکانیان بکەن، چەند لێک نزیکن، لە دەوڵەمەندەکانیان بپرسن، داخو هیچیان ماوە؟! یان بزانن هەژارەکانیان حاڵیان چۆنە لە گۆڕا؟! لە تۆڵەی گوناهدا چیان لێ بەسەر هاتووە.

[وَ سَلْهُمْ عنِ الألْسُنِ الّتِي كانُوا بِها يتكلّمُونَ وَ عَنِ الأَعْيُنِ الّتى كانَتْ إلىٰ اللذّاتِ بِهٰا يَنْظُرُونَ وَ سَلْهُمْ عَنِ الجُلُودِ الرَّقيقةِ وَ الوجُوهِ الْحسنةِ وَ الأجْسادِ اَلناعِمَةِ مٰا صَنَعَ بِها الدّيدانُ؟]

فەرمووی: دەی ئەی برای موسوڵمان، پرسیاریان لێ بکە و بزانە داخۆ ئەو زمانە نەرمەیان کە قسەیان پێ دەکرد، ئەو چاوەگەشانەیان کە دنیایان پێ دەبینی، ئەو پێستە تەنکەیان، ئەو دەم و چاوە جوانانەیان، ئەو جیسم و بەدەنە نەرمەیان، چی لێ بە سەر هاتووە؟ بزانن کرمی گۆڕ چی لێ کردوون و چیان بە سەر هاتووە!

هاوار بە ماڵم! ڕەنگیان گۆڕاوە، گۆشتیان خوراوە، دەم و چاویان ناشیرین بووە، پشتیان شکاوە، ئەندامەکانیان لێک ترازاون، خەدەم و حەشەمیان لە دەورە نەماوە، ماڵ و سەروەتیان لە لا نیە، خوا دەزانێ فەرشیان بۆ ڕانەخراوە، پاڵەپشتیان بۆ دانەناون، نەمامێکیان لە سەر گۆڕەکەیان نەچەقاندووە. [أَلَيْسُوا فِي مَنازِلِ الخَلواتِ وَ الفلواتِ؟ أَلَيْس اَللَّيلُ وَ النَّهارُ عَلَيهِمْ سَواءً؟] فەرمووی ئایا نابینن ئێستا ماڵ و مەنزڵیان لەو دەشت و سەحرایە و کەسیان لە لانیە! شەو و ڕۆژ بۆ ئەوان، وەک یەکە و هەموویان بە ئاشکرا، وەک یەک لە تاریکیدا نەخەوتوون؟ کەسیان هیچیان لە دەست دێ؟ لە کەس و کاریان دوور نەکەوتوونەوە؟ دەمیان پڕ لە کێم و زەخا و نیە؟ دەعبای ناو گۆڕ، هات و چۆیان بەسەردا ناکا؟ زۆریان ژنیان شوو ناکاتەوە؟ کوڕیان بە بێ خەم لە جادەکاندا پیاسە ناکا؟ و ئەوی بە خەیاڵدا دێتەوە، واریسەکانی ماڵ و سەروەت و میراتەکەیان بە ئارەزووی خۆیان دابەش ناکەن؟ باغ و باغاتەکەیان نا فرۆشن؟ جا فەرمووی: بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە حاڵی حەیاتی خۆیدا، تاعەت و عیبادەت و چاکە و پیاوەتی و خێر و خێرات و خزمەتی باوک و دایکی کردبێ و دڵی جیران و دراوسێی ڕاگرتبێ و خراپەی خەڵکی نەکردبێ، ئەوە قەبرەکەی بۆ دەبێتە باغ و باغات و ژیانێکی ڕۆحی خۆشی دەبێ. بەڵام ئەوەی لە ژیاندا، خوای نەپەرستبێ و ڕووی لە چاکە و پیاوەتی نەبووبێ، ئەوە پەنا بە خوا، دەبێ حاڵی لە گۆڕدا چۆن بێ؟! بە گریانەوە ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی:

[يَا سَاكِنَ القَبرِ غَداً، مَا الَّذي غَرَّكَ مِنَ الدُّنيا، هَلْ تَعْلَمُ أَنَّكَ تَبقَي اَوْ تَبقَي لَكَ؟] ئەی ئەو کەسەی، کە ئێستا لە لای من ڕاوەستاوی و ساغ و سەلامەتی، بەیانی ماڵ و مەنزڵت گۆڕ و قەبر دەبێ. بۆ بە دنیا مەغروور بووی؟ چی تۆی وا لە خۆ بایی کردووە؟ پێت وایە کە تۆ نامری و هەر دەمێنیەوە، یان دنیا بۆ تۆ هەروا خۆش دەبێ؟ نە، ڕۆژێک دێ و ئەو خانووەت نامێنێ، ئەوکانی و جۆگە ئاوەت نامێنێ، ئەو سەروەت و پارە و سەیارەت نامێنێ، ئەو بەر و سەمەرەی باغ و باغات

و زەویەت نامێنێ، ئەو بەرگ و لیباسی هاوین و زستانەت نامێنێ، ئەو بۆنە خۆشەت نامێنێ. فەرمووی:

[یا مُغْمِضَ الوٰالِدِ، وَ الأخِ وَ الوَلَدِ وَ غاسِلَهُ یا مُکْفِنَ المَیِّتِ وَ حامِلَه، یا مُخیله فِي القُبُورِ رٰاجِعاً عَنْه، هَیْهٰاتَ هَیْهٰاتَ!] ئەی ئەو کەسەی لە کاتی مردنی باوک و برا و کوڕدا، حازری و لە کاتی گیاندانیاندا، چاویان لە سەریەک دەنێی، وە ئەی ئەو کەسەی کفن و دفنی مردوو دەکەیت و هەڵی دەگری بۆ گۆڕستان، ئەی ئەوانەی دەیخەنە ناو گۆڕەوە، یان گڵی وەسەر دەدەن، ئاگاتان لە خۆتان بێ، نۆرەتان دێ، لە بیریان ناچنەوە. فەرمووی:

[ثُمَّ نٰادانِي التُّرابُ فَقالَ یا: عُمَرُ عَلَیْکَ بِأکْفانٍ لا تُبْلیٰ، قُلْتُ وَ مٰا أکفانٌ لاٰ تُبْلیٰ؟ قالَ اِتْقاءُ اللهِ وَ العَملُ الصّالِحْ] لە پاشان، گڵەکە بانگی کرد و گوتی: یا (عومەر)، کفنێک پەیدا بکە، کە لە گۆڕدا نەڕزێ، لە وەڵامدا گوتم: جا کوا کفنی وا کە لە گۆڕدا نەڕزێ، گوتی: ئەی (عومەر)، تەقوای خوا و کردەوەی چاک دەبنە هۆی ئەوە، کە خاوەنەکەیان، لە گۆڕدا، نە خۆیان، نە کفنەکەیان نەڕزێ،

﴿قٰالَ یٰا عُمَرْ إنَّمٰا أنْتُمْ فُرُوعُ أُصولٍ قَدْ مَضَتْ فَمٰا بَقاءُ فُروعٍ بَعدَ ذهٰابِ أصلِهِ﴾ گوتی ئەی (عومەر)، ئێوە فەرع و وەچەی باوک و باپیرانتانن و ئەوان ئەسڵ بوون و نەماون. کە ئەسڵ نەما، فەرعیش نامێنێ.

﴿فَمَنْ کٰانَ رَاغِباً فِي الجَنَّةِ وَ هٰارِباً مِنَ النّٰارِ قَبْلَ نَفادِ الأَجَل وَ اِنْقِضاءِ العَمَلِ الآنَ، فَالتَّوْبَةُ مَقْبُولَةٌ وَ الذَنُوبُ مَغْفُورةٌ﴾ فەرمووی: هەر کەسێک کە ئێستا، تا ئەجەل نەبووە بە میوانی و ئاخری هەموو کار و کردەوەیەک نە هاتووە، ئەگەر پێی خۆشە ڕوو بکاتە بەهەشت و لە دۆزەخ هەڵێ، با تۆبە بکا، خوای گەورە، تۆبە لە عەبدانی خۆی قبوڵ دەکا و لە گوناهیان خۆش دەبێ.

[أُوصِیکُمْ بِتَقویَ اللهِ وَ لُزُومِ طٰاعَتِهِ وَ التَّوبَةِ عَنِ المَعاصي، فَإِنَّ بِتَقویٰ اللهِ نَجا اَوْلَیاءُ اللهِ مِنْ سَخَطِهِ وَ بِهاَ تَحَقَّقَتْ لَهُمْ وَ لا یتُهُ وَ بِهٰا رٰافقوا أنبِیاءَ اللهِ وَ نَظَرُوا إلیٰ خٰالِقِهِمْ] فەرمووی وەسیەتتان لێ دەکەم، تەقوای خوا بکەن و دەست لە تاعەت و

عیبادەت هەڵ مەگرن و تۆبە لە گناهان بکەن، چونکە بە هۆی خوا پەرستی‌یەوە، ئەولیای خوا، لە غەزەبی خوا ڕزگاریان بووە، خوا کردوونی بە وەلی و بوونە هاوڕێی پێغەمبەران و بە چاوی دڵ تەماشای جەماڵی خوایان کردووە.

[وَ اعْلَمُوْا أَنَّ عَلَيْكُمْ مَلائكَةَ اَللهِ، حَفَظَةٌ عَلَيكُمْ، يَعلَمونَ ما تَفْعَلُونَ فَاسْتَحيوا مِنْهم وَ لا تُؤذُوهُمْ بِمَعاصي الله، وَ لا تَقولُوا إِنَّ عَدُوَّنا شرٌّ مِنّا وَ لَن يَنصُرُونا عَلَينا وَ اِنْ اَذْنَبْنا فكَمْ مِنْ قَومٍ سَلَطَ عَلَيْهِم بِأَشَرَّ مِنْهُمْ لِذُنُوبِهم]. فەرمووی: بزانن مەلائیکەی خوا، حەرەسن بە سەرتانەوە، هەرچی بیکەن دەی نووسن، شەرمیان لێ بکەن، بە هۆی گوناهەوە ناڕەحەتیان مەکەن، وریا بن بە سەهو نەچن، بڵێن: خۆ دوژمنەکەمان لە ئێمە خراپترە و نامان وێرێتێ با گوناهیش بکەن، چونکە تا ئێستا زۆر جاری وا بووە، خواوەندی گەورە، بە هۆی کەسێک کە لە زۆر کەس زاڵمتر و خراپتر بووە، زۆر گەل و نەتەوەی زاڵمی لە بەین بردووە.

[وَ لا تَأْمَنوا مَكرَالله في تَأخيرِ عُقوبَتِهِ لَكُمْ، فَإِنَّهُ إِنَّما يُعَجِّلُ بِالعُقُوبَةِ مَنْ يَخافُ الْفَوْتَ] فەرمووی: دەخیل تان بم، قەت لە غەزەبی خوا ئەمین مەبن، وا مەزانن کە گوناهێکتان کردوو عەزابی نەدان، تازە عەزابتان نادا، چونکە کەسێک لە تۆڵەی خراپەدا، پەلە دەکا، کە لەوە بترسێ، لە دەستی بچێ، خۆ خوای گەورە، هەمیشە خاوەن دەسەڵاتە و هەموو کاتێ دەتوانێ سزامان بدا.

[ثُمَّ قالَ إِنِّي لَأَقُولُ لَكُمْ هٰذِهِ المَقالَةَ وَ مَا أَعْلَمُ عِندَ أَحدٍ مِنْكُمْ مِنَ الذُّنُوبِ أَكثَرَ مِمَّا أَعْلَمُ عِندي وَاَسْتَغْفِرُ اَللهَ وَ أَتُوبُ إِلَيْهِ] لە پاشان بە گریانەوە فەرمووی: من ئەو ئامۆژگاریەم کردن، بەڵام دەزانم کە لە ناو ئێوەدا، کەستان بە ئەندازەی من گوناهبار نیە و لە گەڵ ئەوەشدا زۆر لە بەر خوا دەپاڕێمەوە و تۆبە دەکەم.

«عومەری کوڕی عبدالعزیز» لە تەمەنی سی و نۆ ساڵ و شەش مانگیدا، لە شاری دێرسمعان، لە ڕۆژی بیستی مانگی ڕەجەبی ساڵی سەدویەکی کۆچیدا، بە ئەوەکە، خزمەکانی ئەمەوی دەرمان خواردیان کردبوو، وەفاتی فەرموو. ماوەی خەلافەتی دوو ساڵ و سێ مانگ و هەشت ڕۆژ بوو. بە قەت ماوەی خەلافەتی

حەزرەتی ئەبوبەکر (خوا لێیان ڕازی بێ).

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەر هات و بە تایبەتی هێندێک لە ئامۆژگاریە بە نرخەکانی «عومەری کوڕی عبدالعزیز» ئومێد دەکەم، سودتان لێ وەرگتربێ. لە کۆتاییدا، لە بەر خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە عەفومان کا. ئیمانمان بە نسیب بکا. شیفای تەخۆشمان بدا. لە بەڵاو موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین. وَ صَلَّىٰ ٱللّٰهُ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَ آلِهُ وَ أَصْحابِهِ وَ أَتْباعِهِ إِلىٰ يَوْمِ الدِّين

وَ ٱلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَكاتُهُ

# (٢٧)

## باسی ئەبووسەعیدی ئەبولخەیر

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

[أَحمَدُ رَبِّي حَالَةَ ٱلضَّرّاءِ حَمْدي لَهُ في حالَةِ السَّرَّاءِ
لاحَمْدَ مَنْ يَعْبُدُ رَبَّهُ عَلىٰ حَرْفٍ فَإنْ وَ إنْ كَما قد أنْزِلاَ
ثُمَّ أُصَلِّي مَعْ سَلامٍ لا يَفِي بَحضرِهِ نِطاقُ نُطْقِ الأَحْرُفِ
عَلىٰ ٱلنَّبِيِّ أَحْمَدِ ٱلْمُخْتارِ وَ آلِه وَ صَحْبِهِ ٱلأَخْيارِ[1]]

شەو چەرەی مەجلیسی ئێستامان، باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشت و کەشف و کەراماتی یەکێک لە ئەستێرە ترووسکەدارەکانی ئاسمانی دینە، گڵۆپی ڕووناک کەرەوەی شەوی تاریکی ژینە، مەلەوانی بەحری عیبادەتە، سەوڵ لێدەری کەشتی شەریعەتە، سایقی پاپۆڕی دەریای تەریقەتە، جا ئەو زاتە پڕ بەرەکەت و خێرە، جەنابی «شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر»ە.

با زۆر بە ئەدەب و ویقار دانیشین و گوێ بگرین، بۆ باسی فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەربگرین.

«شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر» ناوی «فَضْلُ ٱللهِ»یە و لە ڕۆژی یەکشەممەی ئەووەڵی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی سێسەد و پەنجا و حەوتی کۆچیدا، لە شاری میهنە، لە خوراسان، لە دایک بووە. هەر بە منداڵی ئاساری گەورەیی لە ناوچاواندا دیار بوو. باوکی بۆ خوێندن بردیە لای شێخ ئەبوو

---

١ ـ لە کیفایەی بێتوشی وەرگیراوە.

محمدی غەننازی، کە یەکێک بوو لە قورئان زانەکانی خوراسان و پیاوێکی زۆر باوەرِع و تەقوا بوو، لە خزمەت ئەو زاتە بەرزەدا قورئانی خەتم کرد. «شێخ ئەبوو سەعید» دەیفەرموو: لەو کاتەدا کە قورئانم دەخوێند، باوکم لە گەڵ خۆی دەی بردم بۆ جومعە، رِۆژێک لە رِێگادا تووشی شێخ ئەبولقاسم بووین، کە یەکێک بوو لە بەناوبانگترینی عالم و زانای ئەو رِۆژگارە و گەورەترین مەشایخی ئەو زەمانە بوو، دەفەرمویٚ: باوکم دەستی ماچ کرد و کە چاوی بە من کەوت فەرمووی، ئەوە کورِی کێیە؟ باوکم عەرزی کرد، قوربان، ئەوە غولامی تۆ و کورِی منە.

دەفەرمویٚ: زیاتر تەشریفی هاتە پێشەوە و زۆری تەماشای من کرد و چاوی پرِ بوون لە ئاو، لە پاشان فەرمووی: ئەی ئەبولخەیر تا ئێستا دەمگوت، ئەگەر ئەو کۆمەڵە زانایە لە بەین بچن و بمرن، دنیا خاڵی دەبیٚ و ئەو مورید و دەروێشانە بیٚ سەرپەرشت دەمێننەوە، بەلام حەمد بۆ خوا، ئێستا کە ئەو کورِەی تۆم دی، دڵـم ئاسوودە بوو، غەمم نەما، چونکە لە ناوچاوانی ئەو کـورِەدا، ویـلایەت دەبینم. فەرمووی: ئەگەر لە جومعە بـوونەوە وەرن بـۆ لام، کـاتیٚ جـومعەمان کـرد، لە خزمەت باوکمدا، چووینە خزمەتی. شێخ رِووی کردە باوکم و فەرمووی: شانت رِاگرە با کورِەکەت، ئەو کولێرە، لە سەر ئەو تاقەداگریٚ! دەڵیٚ: چوومە سەر شانی باوکم و کولێرەکەم داگرت، کەچی هەر گەرم بوو، شێخ لێی وەرگرتم. چاوی پرِ بوون لە ئاو، کردی بە دوولەت، لە تێکی دا بە من، فەرمووی: بـیخۆ، خـواردم، لەتەکەی تری بـۆ خـۆی خـوارد، لە پـاشان رِووی کـردە بـاوکم و فـەرمووی: ماوەیەکی زۆرە ئەو کولێرەمان، لە سەر ئەو تاقە داناوە، چونکە وەعـدەیان پـیٚ دابووین، کە ئەگەر هەر کەسێک، ئەو کولێرەیەی هەڵگرت و لە دەسـتیدا گـەرم بووە، ئەوە ئەو کەسە، دنیا پرِ دەکاتەوە لە دینداری، فەرمووی: ئێستاش حەمد بۆ خوا، کە لە دەستی کورِەکەی تۆدا، گەرم بووەو ئەو موژدە و بەشارەتە بە نەسیب ئەو بوو. ئینجا رِووی کردە من و فەرمووی: [سُبْحٰانَکَ وَ بِحَمْدِکَ عَلیٰ حِلْمِکَ بَعْدَ عِلْمِکَ، سُبْحٰانَکَ وَ بِحَمْدِکَ عَلیٰ عَفْوِکَ بَعْدَ قُدْرَتِکَ]

«شێخ ئەبوو سەعید» دەیفەرموو، لە پاشان زۆر دەچوومە خزمەتی و زۆر شتی لێ فێر بووم. دەفەرموێ: ڕۆژێک فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم، ئەو حەدیسەی پێغەمبەرت لە بیر نەچێتەوە و لە یادی نەکەی، کە خواوەندی گەورە لە شەوی میعراجدا، فەرمووی:

[یا مُحَمَّدُ ما یَتَقَرَّبُ ٱلمَتَقَربُونَ إلیَّ بِمِثلِ أَداءِ ما اِفْتَرَضْتُ عَلَیْهِمْ وَ لاٰ یَزالُ ٱلعَبْدُ یَتَقَرَّبُ إلیَّ بِالنَّوَافِلِ حَتیَ أُحِبُّهُ، فَإذا اَحبَبْتُهُ کُنْتُ لَهُ سَمْعاً وَ بَصَراً وَ یَداً وَ مُوءَیداً فِي یَسمعُ وَ بِيَ یَبْصِرُ وَ بِي یَأْخُذُ] ئەی محمد، واجب و پێویستی سەرشانی خۆت، بە جێ گەیاندن، لە هەموو خێرێک خێرترە و بە هۆی سوننەتکردنی زۆرەوە و خۆی لە من نزیک دەخاتەوە، تا وا دەکا خۆشم بوێ، جا کە خۆشم ویست بە دەست و گوێ و چاو بێ ئەمری من ناکا و منیش ئاگاداری دەکەم.

«شێخ ئەبوو سەعید» کە عیلمی سەرف و نەحوی تەواو کرد، بۆ شەرع خوێندن چۆتە خزمەت زانای بە ناو بانگ ئیمام ئەبوو عبداللەی حوسەری، کە فەقێی مەزەنی و ئەویش شاگردی ئیمامی شافعی بوو، لە پاشان چۆتە خزمەت زانای ناودار شێخ ئەبووبەکری قفال و پێنج ساڵ لە گەڵ شێخ ناسر مەروزی و شێخ محمدی جووەبنی و شێخ بوو عەلی شەنجی، کە هەریەکەیان لە ئاخریدا، بوونە پێشەوای جیهانێک، خوێندوویەتی، ئینجا بۆ تەفسیر خوێندن، چۆتە شاری سەرەخەس و لە خزمەت ئەبوو عەلی تەفسیری خوێندووە، لە پاشان ئیجازەی نەشری عیلم و ڕوخسەتی ئیرشادی لە خزمەت شێخ عبدالرحمنی سوللەمی وەرگرتووە، کە ئەویش لە شێخ ئەبوولقاسمی نەسرابادی و ئەو لە شێخ جونەیدی بەغدادی و ئەو لە سەرِی سەقەتی و ئەو لە مەعرووفی کەرخی و ئەو لە ئیمام جەعفەری سادق و ئەو لە ئیمام محمد باقر و ئەو لە ئیمام زین العابدین و ئەو لە حەزرەتی حوسەین و ئەو لە ئیمامی عەلی و ئەو لە حەزرەتی «محمد المصطفی» وەرگرتووە.

«شێخ ئەبوو سەعید ئەبولخەیر» دەفەرموێ: یەکێک لە فەرق و جیاوازی لە

بەینی ئەنبیا و ئەولیادا، ئەوەیە کە ئەنبیا ئەمریان پێ کراوە، موعجیزە بنوێنن. بەڵام ئەولیا تابۆیان بکرێ، دەبێ کەتمی کەرامات بکەن.

فەرمووی: لەگەڵ ئەوەشدا، جارجار کەرامەت و خارقی عادات، لە سەر دەستی پیاو چاکان ڕوودەدا. بۆ نموونە، ئەمیر ئەبوو عەلی دەڵێ: لەو کاتەدا کە «شێخ ئەبوو سەعید» هات بۆ شاری تووس، من تازە پێ دەگەیشتم، لە خزمەت باوکمدا چوومە مەجلیسی شێخ، عالەمێکی زۆری لە دەوری کۆ ببووە، دەرگا و بان پڕ ببو لە خەڵک، جێگا نەمابوو، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، خەڵکەکە هەمووی دەگریا، لەو کاتەدا، منداڵێک لە سەر بانی لە دەستی دایکی پەڕی و کەوتە خوارەوە، فەوری شێخ فەرمووی: بیگرەوە دەڵێ: بە ئەمری خوا، دوو دەست لە غەیبەوە هاتن و کورەکەیان گرتەوە و لە سەر ئەرزیان دانا، خەڵکەکە ئەوەندەی تر دەستیان کرد بە گریان و تۆبە و گەڕانەوە وەلای خوا.

هەروەها ئیمامی حەرەمەین ئەبولمەعالی جووەینی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: کاتێ «شێخ ئەبوو سەعید» هاتە شاری نەیشابوور، باوکم زۆر مونکیری بوو و زۆری پێ ناخۆش بوو، کەس نەی دەوێرا بە ئاشکرا ناوی شێخی لە لا بەرێ، بەڵام زۆر سەیر بوو، ڕۆژێک لە پاش نوێژی بەیانی فەرمووی: هەستە خۆت بگۆڕە با بچین بۆ زیارەتی «شێخ ئەبوو سەعید»، فەرمووی لە خزمەت باوکمدا، هەستاین چووینە خانەقاکەی، کاتێ گەیشتینە بەر دەرگای خانەقا، «شێخ ئەبوو سەعید» بە دەنگی بەرزەوە فەرمووی: وەرە ژوورەوە، ئەی خەلیلی خوا، بۆ لای حەبیبی خوا. ئیمامی حەرەمەین دەفەرموێ: زۆرم لا عەجایب بوو، نەمزانی کە شێخ بۆ چی وای فەرموو؟! دەفەرموێ: کاتێ باوکم چوە ژوورەوە، شێخ بە تەنیا لە ژوورەوە بوو، شێخ بانگی دەروێشەکانی کرد و فەرمووی: وەرن باڵم بگرن، دوو کەس چوونە بن باڵی و هەڵیان ستاند و باوکمی دەباوەش گرت و دانیشتن، ماوەیەک پێکەوە قسەیان کرد، ئەوان لە گفتوگۆدا بوون، ئوستاد ئیمام ئەبولقاسمی قوشەیری وەژوور کەوت، ماوەیەک گفتوگۆیان کرد و ئوستاد

قوشەیری هەستا ڕۆیشت، باوکم لە دوواوە تەماشای دەکرد، شێخ، سەری بردە بن گوێی باوکم و شتێکی بە گوێدا چپاند، باوکم هەستا و ڕانی شێخی بە توندی ماچ کرد، دەڵێ: زۆرم لا سەیر بوو، لە پاشان خوا حافزیمان کرد و هاتینەوە. عەرزی باوکم کرد و گوتم: باوکە، ئیمڕۆ سێ حاڵەتی زۆر عەجایبم دی، یەکەمیان، ئەوە بوو، کە تۆ تا ئێستا مونکری شێخ بووی، کەچی ئەم بەیانیە فەرمووت، هەستە با بچین بۆ زیارەتی. دووەم، ئەوە بوو؛ کاتێ چووینە خزمەتی فەرمووی: وەرە ژوورەوە ئەی خەلیلی خوا، بۆ لای حەبیبی خوا. سێیەم، ئەوە بوو، کاتێ ئوستاد قوشەیری ڕۆیشت، تۆ لە دواوە تەماشات کرد و شێخ سەری هێنایە بن گوێت و تۆ هەستای ڕانی شێخت ماچ کرد. باوکم فەرمووی: با پێت بڵێم، هۆی ئەوانە چی بوو، دوێ شەو لە خەومدا، چوومە جێگایەکی زۆر خۆش. تەماشام کرد «شێخ ئەبوو سەعید» لەوێ کۆڕی ئامۆژگاری گەرم کردبوو، خەڵکێکی زۆری لە خزمەتدا بوو، لە بەر ئەوەی زۆرم ناخۆش دەویست، ڕوم لێ وەرگێڕا، لە غەیبەوە گوێم لە دەنگێک بوو بانکی کرد و گوتی: ڕوو لە کەسێک وەردەگێڕی، کە لە سەر کورەی زەوی، ئەمڕۆ وەکوو خۆشەویستی خوایە، فەرمووی کاتێ ئەو دەنگەم بیست، غیرەت گرتمی و گوتم: باشە ئەگەر ئەو وەک خۆشەویستی خوایە، دەبێ من وەک کێ بم؟ دەنگە کە گوتی: تۆ وەک خەلیلی خوای، فەرمووی: لە خەوەکە ڕاپەڕیم و بە قودرەتی خوا، ئەوەی ئینکاری بێ لە دڵمدا نەمابوو، جا بۆ بەیانی، کە چووینە خزمەتی، بە چاوی دادامەوە و ئەوەی بە خەون بیستبووم، ئەو بە ئاشکرا گوتی: وەرە ئەی خەلیلی خوا، بۆ لای حەبیبی خوا. فەرمووی: کە ئوستاد ئەبولقاسمی قوشەیریش ڕۆیشت، لە دواوە تەماشام کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: باشە دەرەجەی شێخ وەک دەرەجەی حەبیبی خوا بێ و ئی من وەک خەلیلی خوا بێ، دەبێ دەرەجەی ئوستاد ئەبولقاسمی قوشەیری چۆن بێ؟! ئەوە بوو: شێخ سەری هێنایە بن گوێم و گوتی: دەرەجەی کەلیم اللهی هەیە، جا لەبەر ئەوە بوو، منیش لە خۆشیان شێخم زیارەت کرد.

ئەبولمەعالی دەڵێ: عەرزی باوکم کرد، جا چۆن ئەوە باوەڕ کەم؟ باوکم فەرمووی: ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێ) لە حەدیسدا، نەیفەرمووە: [عُلَمٰاءُ أُمّتِی کَأَنْبِیاءِ بَنِي إسرائِیلَ] عولەمای ئوممەتی من، وەک پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل وان.

هەروەها دەڵێن، شێخ ئەبوو محمدی جووەینی وەکیلێکی گاوری بوو، زۆری لە گەڵ خەریک بوو، بۆی موسوڵمان نەدەبوو، ڕۆژێک پێی گوت: ئەگەر موسوڵمان ببی، سێ یەکی ماڵی خۆمت دەدەمێ، گاورەکە گوتی: دینی خۆم بە هەموو دنیا ناگۆڕمەوە، شێخ گوتی: نیوەی ماڵەکەت دەدەمێ، هەر جەوابی نەدایەوە و بە دوو بەشیشی جوابمی نەدایەوە. شێخ ئەبوو محمد چوو بۆ مەجلیسی «شێخ ئەبوو سەعید»، گاورەکە گوتی: با منیش بچم، بزانم ئەو شێخە دەڵێ چی، وا ئەو هەموو خەڵکە لێی کۆ دەبنەوە،

چوو لە پاش کۆڵەکەیەکدا، خۆی شاردەوە، کاتێ شێخ دەستی کرد بە فەرمایشت، ڕووی کردە لای کۆڵەکەو فەرمووی: ئەی کاکی گاور، لە پاش ئەو کۆڵەکە وەرە دەرەوە، ناچار هاتە خزمەت شێخ و شێخ فەرمووی؛ بڵێ، گوتی قوربان بڵێم چی؟! فەرمووی بڵێ:

من گبر بودم کنون مسلمان گشتم بد عهد بودم کنون به فرمان گشتم

کافرەکە زۆر بە خۆشییەوە گوتی: بەڵێ من گاور بووم، ئەوا بوومە موسوڵمان، بەد عەهد بووم، ئەوا هاتمە ژێر فەرمانی ئایینی ئیسلام. ئینجا شێخ فەرمووی: بچۆ بۆ لای ئەبوو محمدی جووەینی، با دەستووری ئیسلامەتیت پێ بڵێ و پێشی بڵێ، کە داخۆ ئەوەی نەزانیوە کە [إِنَّ الْأُمُورَ مَوْقُوفَةٌ عَلىٰ أَوْقاتِها، فَإِذا دَخَلَ اَلوَقْتُ لاٰ یَحْتاجُ إِلیٰ ثُلُثِ اَلمالِ وَ لاٰ إِلیٰ نِصفِهِ وَ لاٰ إِلیٰ ثُلُثَیْهِ] هەموو کار و فەرمانێک، کاتی دیاری کراوی هەیە و ئەگەر وەختی خۆی هات، پێویست بەوە ناکا، کە سێ یەکی ماڵت یان نیوەی یان دوو بەشی بدەی! شێخ ئەبوو محمد زۆری پێخۆش بوو، ئەوەندەی تریش عەقیدەی بە شێخ پەیدا کرد.

دووباره له چەند زانای گەورەی ئەو سەردەمە، بیستراوە کـە لەو کـاتەدا، کـە «شێخ ئەبوو سەعید» له شاری نیشابوور، بووە، تەواوی زانا و عولومای هەموو مەزهەبەکان بوونە موریدی، بە تایبەتی، ئەو چوار ئەبووبەکرە، کە لە نەیشابووردا وەفاتیان کردووە و زۆر عالم بون، دەڵێن ئەو چوار عالمە ئەوەندە گەورە بـوون لای خودا، کە ئەگەر یەکێک تووشی تەنگ و چـەڵەمەیەک بـووبایە، دەچـووە خزمەتیان، دەیکردنە واسیتەی لای خوا و ڕزگاریان دەبوو. ڕۆژێک یەکێک لەو چوار زانایە، کە قازی ئەبووبەکری حیرەیی بوو، تـەواوی عـالمی ئـەوناوچەی دەعوەت کردبوو، «شێخ ئەبوو سەعیدیش» تەشریفی حازر بوو، جا هەروەکوو عادەتی مەلایانە، دەستیان کرد بە موزاکرە و باسی مەسئەلەیەکیان کرد و هەرکەسە بە بۆ چوون و مەزهەبی خۆی بەڵگە و دەلیلێکی دێنایەوە و مەزهەب و دەلیلی ئەوانی تری بە تاڵ دەکردەوە. لە ئاخریدا، بڕیاریان دا، کە «شێخ ئەبوو سەعید» بکەن، بە حەکەم قورئان بگرێتەوەو، بە نیەتی هەرمەزهەبێکەوە قورعەکە هـاتە دەرەوە، ئەوەیان لە هەموویان ڕاستتر بێ. ناوەکـانیان نـووسین و خستیانە نـاو زەرفێکەوە و شێخ قورئانی هێناو لە دوای [بِسْمِ اللّٰه] لێکی کردەوە ئـەو ئـایەتە هات، کە لە سوورەی یونس‌دا، دەفەرموێ: ﴿وَ يَسْتَنْبِؤُنَكَ اَحَقٌ هو قُل اي وَ رَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ﴾ واتە ئەوانە پرسیار دەکەن لە تۆ، کە داخۆ ئەوە حەقە؟ تۆ بڵێ: بـەڵێ: قەسەم بە خوا، ئەوە زۆر حەق و ڕاستە، دەفەرموێ؛ «شێخ ئـەبوو سـەعید» کـە قورئانەکەیان بۆ هێنا، فەرمووی: پێغەمبەری خوا هـەمیشە بـۆ کـاری خـێر لای ڕاستی وە پێش خستووە، لە کاتی گرتنەوەی قورئانەکەدا، تەماشا لاپـەڕەی لای ڕاستی کرد و فەرمووی: [إِنَّ الله وِترٌ يُحِبُّ اَلوَتْرَ] خوای تەعالا، تـاکـەو تـاکـی پێخۆشە، لە تاکەوە دەست پێدەکەم، حـەوت ئـایەتی ژمـارد و سـەری ئـایەتی حەوتەمی خوێندەوە، کە ئەو ئایەتەی پێشەوە بوو، جا بە نیەتی مەزهەبی ئیمامی شافیعی دەستی برد: قورعەکە بە ناوی ئەوەوە هـات. زانـاکـان واقـیان وڕمـا و قبووڵیان کرد کە مەزهەبی شافیعی زۆر هەقە.

پەند و ئامۆژگاری لەو باسەدا ئەوەیە، کە ئەگەر تووشی تەنگ و چەڵەمەیەک بووین، دروستە تەفەئول بە قورئان بکەین، چونکە لەو کاتەدا، ئیمامی محمدی جووەینی و ئیمامی حەرەمەین و قازی ساعد و عەلی مەندەلی و ئەبووبەکر ئیسحاق و مامۆستا ئیسماعیلی صابوونی و شێخ ئەبولقاسمی قوشەیری لەوێ حازر بوون و ڕەخنەیان نەگرت.

«شێخ ئەبوو سەعید» زۆر دانا و زانا بوو. جارێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، فەرمووی: جارێک حەزرەتی عومەر، (ڕەزای خوای لێ بێ) لە کەعبولئەحباری پرسی، فەرمووی: کام ئایەتە، لە تەوراتا زۆر کورتە؟ لە وەڵامدا گوتی، ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: [أَلاَ مَنْ طَلَبَنِي وَ جَدَنِي، وَ مَنْ طَلَبَ غَيْرِي لَمْ يَجِدْنِي] واتە ئاگادار بن، هەر کەسێک کە بەڕاستی داوای من بکا، بە من دەگا و ئەوەی داوا لە غەیری من بکا، تووشی من نابێ و نامبینێ. [قَدْ طَالَ شَوْقُ ٱلأَبْرَارِ إِلىٰ لِقَائِي وَ أَنَا إِلىٰ لِقَائِهِم أَشْوَقُ] ئەوەشی نووسی، کە خوای گەورە، دەفەرموێ: پیاو چاکان ئارەزووی لیقای منیان زۆرە، بەڵام من ئارەزووی چاو پێکەوتنی ئەوانم زۆرترە، فەرمووی: زانایان فەرموویانە: [وَ لِدْنَا بَاكِياً وَ ٱلنَّاسُ يَضْحَكُونَ فَاجْتَهِد بِأَنْ تَمُوتَ ضَاحِكاً وَ ٱلنَّاسُ يَبْكُونَ] ئێمە کاتێ لە دایک بووین، دەگرین و خەڵک پێدەکەنێ، وەرە با من و تۆ وا بە ڕوو سووری بمرین، کە لەو کاتەدا، کەس و کار بۆمان دەگرین، ئێمە پێ بکەنین.

دەفەرموێ: خۆ مردن زۆر لە ئینسان نزیکە و لە کۆڵ پیاو نابێتەوە. فەرمووێ: شێخی شبلی (ڕەزای خوای لێ بێ)، کە زکری خوای دەکرد، هەر دەیفەرموو [ٱللهُ. ٱللهُ ٱلله] عەرزیان کرد، قوربان ئەوە بۆ، کە زیکر دەکەی، هەر دەفەرمووی: [ٱلله، ٱلله] و جارێک نافەرمووی [لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ ٱلله]؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر لەوە دەترسم کە بڵێم: [لاٰ إِلٰهَ] مەرگ مەودام نەداو بگاتە سەرم و نەگەم بڵێم: [إِلاَّ ٱللهُ]

فەرمووی دەخیلتان بم، بۆ ماڵی دنیا خۆتان بە هیلاک مەدەن، چاوتان لەو کەسانەوە نەبێ، کە زۆر خۆیان ماندوو دەکەن و زۆر خۆرن، ئەگەر خواوەندی

گەورە، ماڵ و سەروەتی دانێ، لە ڕێگـەی چـاکـەو پـیاوەتیدا، خـەرجـی کـەن. پێغەمبەری خۆشەویست، لە حەدیسێکدا فەرموویەتی: [إنَّ اَوَّلَ مَنْ يَقْرِعُ أَبْوابَ اَلجَنَّةِ مِنْ أُمَّتِي فُقَرَاؤُها وَ أَكثَرُ اَهلِ اَلجَنَّةِ مِنْ اُمَّتي ضُعَفاؤُها وَ أَشْرارُ أُمَّتي مَنْ يُساقُ إلىٰ اَلنَّارِ الأَقْماعُ، قيل يا رَسُولَ اَللهِ وَ مَنِ اَلأَقْماعُ؟ قال الَّذينَ إِذا أَكَلُوا لَمْ يَشْبَعُوا وَ إذا جَمَعُوا لَمْ يُنْفِقُوا] یەکەم کەس، کە لە دەرگای بەهەشت دەدا، لە ئوممەتی من، فەقیرەکانن و زۆریەی ئەهلی بەهەشت لە ئوممەتی مـن بـێ دەسـەڵاتەکـانن و خەراپترین ئوممەتی من کە سەوق دەدرێن بۆ دۆزەخ، ئەو کەسانەن کە تێر ناخۆن و چاوی تەماعیان پڕ نابێ و کە زۆریشیان بوو، پیاوەتی بە سەرەوە ناکەن.

فەرمووی: لە کتێبی «کلیله و دمنه»دا دەڵێ: کەس ناتوانێ لە بەرانبەر زاڵمی بە دەسەڵاتا، خۆ ڕاگرێ، هەر دەبێ سەری بۆ دانەوێنێ، فەرمووی: ئەوە وەکوو ئەوە وایە، کە دەبینی چڵە گیایەک، تا تەڕ و ناسکە، کە بای هـەڵکرد، خـۆی بـە دەم بایەکەوە دەدا و هەڵی دەسووڕێنێ و بەم لاو ئەولای دا دەدا، نارەحەتی دەکا و ئاخری ڕزگاری دەبێ، چونکە گیاکە نەرمە، بەڵام داری بە تاقەت، بەر بەرەکانی، بایەکە دەکا و خۆی بە هیلاک دەبا و بایەکە لە بن و بێخی هەڵدەکەنێ، یان کاتێ تووشی شێرێک بووی، بەرانبەری مـەوەستە، خـۆت لە خـۆڵێ وەردە، ئـەگـەر ترسای تا شێرەکە، بە زەیی پێتا بێتەوە، چونکە شێر زۆر خاوەن کەرەمە.

هەروەها فەرمووی: وریابن، ئەگەر دوژمنتان زەعیف بوو، بە سەهو و نەچن، ئاگاتان لە خۆتان بێ، هیچ نەبێ چاو لە حەیوانات بکەن، نابینن کە ئێسترێکی بە تاقەت، چۆن خۆی لە شت دەپارێزێ و تەنانەت لە شاخێکی بچووکیش، سڵ دەکاتەوە!

وشیار بن، ئەگەر تووشی عەداوەت بوون، زوو چارەسەری بکەن، چـونکە ئاگر چۆن دەستە چیلە و فتیلە دەسووتێنێ، دوژمنکاری و عەداوەتیش، ئاوا کەس و کار و خزم و قەبیلە دەسووتێنێ.

فەرمووی ئەوەی دەیەوێ ئینسانی ئەحمەق ئامۆژگاری بکا، وەکوو ئەوە وایە،

کە ئاوبکاتە ژێر کاڵەکە مارەوە، تا ئاوی زۆرتر بێ، تاڵتر دەبێ، ئینسانی ئەحمەقیش لەوە خراپترە.

فەرمووی: پاشایەک لە وەزیرێکی پرسی، کە پیاو چ سیفەت و خەسڵەتێکی تێدا بێ، دەبێتە پیاو چاک؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەی پاشا، هەر کەسێک هیممەتی ئازادەگان و شەرمی وەک شەرمی کچان و تەوازوعی عەبد و بەندەگان و سەخاوەتی عاشقان و سیاسەتی پاشایان و عیلم و تەجروبەی پیران و عەقڵی عاقڵانی بوو، ئەوە بەو حەوت خەسڵەتی دەبێتە پیاو چاک.

«شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر» پیاوێکی زۆر عەجایب بوو، دنیای بەلاوە مەتڵەب نەبوو. ڕۆژێک لەگەڵ چەند سۆفی و موریددا، بە کۆڵانێکدا دەڕۆن، لەو کاتەدا، زێرابێکیان پاک دەکردەوە، سۆفیەکان، لووتی خۆیان گرت تا بۆن نەکەن، شێخ ڕووی تێکردن و فەرمووی: ئەی سۆفینە، ئەوەی ئێستا ئێوە لووتی خۆتان لە بەر بۆنی گرتووە، پێتان بۆگەن و پیسە، بە زمانی حاڵ، قسەم لەگەڵ دەکا و دەڵێ: پێیان بڵێ: خۆ من هەر ئەو تەعامە بۆن خۆش و بەلەزەتەم، کە ئێوە تەواوی زێڕ و زیو و پووڵ و پارە و ئاسایشی خۆتان خەرج دەکرد، تا کوو ئێمەتان بە دەست دێنا، بەڵام ئێمە هەر کە بووینە ڕەفیقی ئێوە، بە شەوێک ڕەنگ و بۆنی ئێوەمان گرت. ئەی بۆچی لە بەرمان ڕا دەکەن؟! خۆ دەبوو ئێمە لە دەستی ئێوە هاوارمان بکردایە. فەرمووی: [أَوْحىٰ اللّٰهُ إِلىٰ داوُدَ، قُلْ لِعِبادي إِنّي لَمْ أَخْلُقْهُم لِأَرْبَحَ عَلَيْهِمْ وَ لٰكِنْ خَلَقْتهم لِيَرْبَحوا عَلَيّ] خواوەندی گەورە، وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی داوود و فەرمووی: ئەی داوود، بە بەندەکانی من بڵێ: خۆ من بۆیەم خەڵق نەکردوون تا قازانجیان لێ بکەم، بەڵکوو بۆ ئەوەم خەڵق کردوون، تا ئەوان سوود لە من وەرگرن.

جاری واش بوو زۆر قسە فەرمایشتی شۆخی و خۆشی دەفەرموو، فەرمووی: جارێک پیاوێک بە وەکیلەکەی گوت: کەرێکم بۆ بکڕە، نە زۆر گەورە بێ، نە زۆر بچووک بێ، کەرێکی وابێ، کە لە هەوراز و نشێو بەرم نەداتەوە و لەناو ڕێگادا

نەمێنێ و بە کاو و جۆی کەم ڕازی بێ و ئەگەر زۆری بۆ تێکەی، ئیش باشتر بکا. وەکیلەکە، لە وەڵامدا گوتی: ئاغا، ئەوە سیفەتانەی کە تۆ باسیان دەکەی، لە قازی ئەبوو یوسف دانە، بێ، نایان بینم، لەبەر خوا وەپارێ، تا بۆت بکا بەکەر و من بچم بۆت بکرم.

کاتێ ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە، ماوەی تەواو بوو، ڕۆژی جومعەی بیست و حەوتی مانگی رەجەبی ساڵی چوارسەد و چلی کۆچی، چوە سەر مینبەر و دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵک، ڕووی کردە خواجە عەلەیک و فەرمووی: بچۆ بۆ نیشاپوور، بە مامان رۆیگەر بڵێ: «ئەبوو سەعید»، سەلامی لێ دەکردی و دەیگوت: ئەو کراسەی، کە بۆ کفنی خۆت هەڵگرتووە، بۆم بنێرێ.

خواجە عەلەیک، دوای جومعە ڕۆی و سۆفی و موریدان دەستیان کرد بە گریان. شێخ ڕووی کردە خواجە عبدالکریم و فەرمووی: لە ژیاندا زۆرت زەحمەت پێوە کێشاوم، دەبێ لە کاتی مردنیشمدا، زەحمەت بکێشی و کفن و دەفنم بکەی، لە پاشان لە سەر مینبەرەکە هاتە خوارێ و ڕووی کردە پیاوێک، کە ناوی حەسەن موئەددەب بوو، فەرمووی: ئێسترەکە زین کە، لە پاشان شێخ هەستا سوار بوو، بە دەوری شاردا گەڕا، خوا حافیزی لە تەواوی ئەو شوێنانە کرد، کە خەڵوەتی تێدا کردبوون، بەڵام بە ئەمری خوا، لە گەڕانەوەدا نەخۆش کەوت. خواجە عبدالکریم دەڵێ: ڕۆژی پێنج شەممە چاوی هەڵێنا و فەرمووی: خواجە عەلەیک هاتەوە؟ عەرزم کرد، بەڵێ قوربان هاتووتەوە کراسەکەشی هێناوە. شێخ فەرمووی [اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ]، ئەوەی فەرموو: لە تەمەنی هەزار مانگیدا، واتە لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵ و چوار مانگیدا، وەفاتی فەرموو.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشت و وەفاتی «شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر». ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ.

خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت عەفوومان کەی. بە ئوممەتی پێغەمبەر قبوڵمان کەی. لەگەڵ پیاو چاکان حەشرمان کەی. شیفای نەخۆشمان بدەی. لە بەلا

و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین. وَ صَلَّیٰ اللهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ آلِهُ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّمْ

وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٢٨)

# باسی ڕابیعەی عەدەوی

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

أَلْحَـمْدُ لِلّٰهِ الْـبَدِيعِ الْـبارِي وَ مُودِعِ الأَنْوارِ وَ الأَسْرارِ
مِنَ العِبَادِ قَلْبَ مَـنْ يَشـاءُ مِـنْ بـعدِ مـا تمَّ لَهُ الجَـلاءُ
وَ افضَلُ الصَّلاةِ وَ السَّـلامِ عَلىٰ النَّـبِيِ الفَـاتِحِ الخِـتامِ
مُحَمَّدٍ وَ ٱلآلِ وَ الاَصْـحٰابِ ذَوي ٱلمُجٰـاهِداتِ وَ الآدابِ

خەڵکینە، وە نەبێ لە ناو بەرەی ئادەمدا و بە تایبەتی لە ناو موسوڵمانانداا، هەر پیاو، دەوری دین داری بوو بێ و ئافرەت، هیچ دەورێکی نەدیبێ!

فەرز و واجیباتی دینی و ئەمر و بە مەعرووف و نەهی لە مونکەر، هەروەکوو ڕوودەکەنە پیاو، ڕووشیان کردۆتە ئافرەت، نابینن زۆربەی حەدیس و یـاسای ئایینی لە حەزرەتی عایشە وە وەرگیراوە. جاکەواتە هەروەکوو لە ناو پیاواندا، پیاو چـاک و زانـا و دانـا و وەلی زۆر بـوون، لە نـاو ئـافرەتانیشدا، زۆر ئـافرەتی وا هەڵکەوتووە، مەقامی ویلایەتی بووە.

جا، با لەم چەند دەقیقەیەی داهاتووی ژیانماندا، بچینە مەجلیسی ئەو ئافرەتە پایە بەرزە، کە تا ئەو نەچووبایە بۆ مەجلیسی گەورە پیاو و ئەولیای وەک شێخ حەسەنی بەسری، شێخ مەوعیزەی نەدەکرد.

جا ئەو سەردەفتەرەی خاوەن شەرم و حەیایە، ئەو پەروانەی سووتاوی مۆمی عیشقی خوایە، ئەو ئافرەتە خاوێن و پاک داوێن و بێ وێنە، ئەوگەوهەری دریای

دین و ئاوێنە، ئەو سەرچاوەی ئەدەب و شەرەف و عیرفانە، ئەو ئەستێرە گەشە ئافرەتەی ئیمانە، ئەو پەروانەی بەرزەفڕی ئایینی محەمەدی‌یە، جەنابی با سەعادەتی «ڕابیعەی عەدەوی»یە، با هەروەکوو شێخ حەسەنی بەسری لە مەجلیسی ڕابیعەی عەدەویدا، بە ئەدەب دادەنیشت، ئێمەش لە مەجلیسی باسی بەسەرهات و ژیانیدا، بە ئەدەب دانیشن و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین، بە تایبەتی ئافرەتان و خووشکانی دینی، دەبێ خوو و ڕەوشت و دین و دیانەت و شەرم و حەیا و ئەدەب و ئیمانی، ئەو یەگانە ئافرەتە بکەنە سەرمەشقی ژیانیان، تا وەکوو ئەو ڕووسووری دنیا و قیامەت بن.

ڕاوی دەڵێ: ئەو شەوەی «ڕابیعەی عەدەوی» لە دایک بوو، ماڵی باوکی ئەوەندە فەقیر بوو، ئەوەندەیان پارە نەبوو، کە بچن هێندێک نەوتی پێ بکڕن و چرای پێ هەڵکەنو، ناوکی لە بەر ببڕن، هەروەها پارچە پەڕۆیەک نەبوو، کە تێیەوە بپێچن

دەڵێن: دایکی ڕابیعە، لە پێش ڕابیعەدا، سێ کچی تری ببوو. ڕابیعە چوارەم بوو، بۆیە پێی دەڵێن «ڕابیعە» واتە چوارەم.

دایکی ڕابیعە، بە باوکی ڕابیعەی گوت: بچۆ لەو ماڵە جیرانە، هێندێک ڕۆن بێنە با چراکەی پێ هەڵکەم، باوکی ڕابیعە، عەهدی کردبوو کە لە هیچ کەس، قەت هیچ داوا نەکا، بەڵام ئەو جارە لە بەر دڵی دایکی ڕابیعە چوو، جا نازانم، داخۆ هەروەکوو ئێمە لێیان دەترسین و ناوێرین بێ ئەمریان بکەین، ئەویش وابوو، یان نا، ناچار دەستی لە دەرگای دراوسێکەدا و هاتەوە گوتی دەرگایان نەکردەوە، بەو غەمەوە خەوی لێ کەوت، لە خەوەکەیدا، بە خزمەت پێغەمبەر گەیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرمووی: غەم مەخۆ، ئەو کچە زۆر گەورەیە و هەفتا هەزار گوناهباری ئوممەتی من بە هۆی شەفاعەتی ئەوەوە، لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان دەبێ، لە پاشان فەرمووی: هەستە بچۆ بۆ لای ئەمیری بەسرە و لە سەر کاغەزێک بۆی بنووسە، بڵێ: بەو ناو و نیشانە، کە هەر شەوەی، سەت سەڵەوات

لە سەر پێغەمبەر لێدەدا و شەوی جومعان چوار سەد جار، بەڵام ئەم شەوی جومعەی ڕابردووە فەرامۆشت کرد و لە بیرت چوو، سەڵەوات لێ بدەی، فەرمووی: بڵێ، دەبێ لە کەفارەتی ئەوەدا، چوارسەد دینارت بداتێ. باوکی ڕابیعە کە لە خەوەکەی خەبەر هات، بە گریانەوە هەستا و ئەوەی نووسی و چوو دای بە دەرگەوانی ئەمیری بەسرە، کاتێ ئەمیر نامەکی خوێندەوە، ئەمری کرد گوتی: دەهەزار درەم بدەن بە دەروێشان، لە شوکرانەی ئەوەدا، کە پێغەمبەر یادی منی کردوەتەوە و چوار سەد دیناریش بدەن بەو پیاوە و بڵێن: ئەمیر دەڵێ: زۆرم پێخوشە، بێتە ژوورەوە، بەڵام چونکە ئەو فرستادەی پێغەمبەرە و پەیامی هێناوە من بە خزمەتی دەگەم، ئەمیر هات دەستی ماچ کرد و گوتی: دەبێ لەم ڕۆ بەدواوە، هەرچی پێویست بوو داوا بکەی.

«ڕابیعە» گەورە بوو، بەڵام زۆری نەخایاند، باوک و دایکی وەفاتیان کرد. لە پاشساڵێک گرانی و قاتی کەوتە ناو شاری بەسرەوە و لە گەڵ خوشکەکانی لێکبڕان، زاڵمێک «ڕابیعە»ی کردە عەبد و جاری یەی خۆی و فرۆشتی، کابرا زۆری نارەحەت دەکرد، کاری گرانی پێ دەکرد، ڕۆژێک بە فرسەتی زانی ڕایکرد، لە ڕاکردنەکەدا، کەوت و دەستی شکا، بە غەریبی سەری وەسەر خاک کرد و دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەی خوای گەورە، غەریب و بێکەسم، دەسم شکاوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕەزای تۆم دەوێ، گوتی: زۆرم پێ خۆشە، بزانم داخۆ تۆ لێم ڕازیی یان نا؟ ڕاوی دەڵێ: گوێی لە دەنگێک بوو لە غەیبەوە بانگی کرد و گوتی: ئەی «ڕابیعە»، هیچ غەم مەخۆ، مەرتەبەت ئەوەندە بەرز دەبێتەوە، مەلائیکەی ئاسمان شانازیت پێوە دەکەن. «ڕابیعە»، کە ئەو موژدەیە بیست، زۆر دڵخۆش بوو، هەستا هاتەوە بۆ ماڵی خاوەنەکەی و بە ڕۆژ، خزمەتی خواجە و بە شەو، خەریکی عیبادەت و خواپەرستی بوو، هەمیشە بە ڕۆژ و بوو، شەوێک خواجە لە خەو بە خەبەر هات و دەنگێکی هاتە بەر گوێی، تەماشای کرد «ڕابیعە»یە بە سوجدەدا کەوتووە و دەڵێ: ئەی خوای گەورە، خۆت دەزانی کە دڵی

من ڕەزای تۆی دەوێ و چاوی لە ئەمر و فەرمانی تۆیە، ڕووناکی دووچاوی من بە خزمەت کردنی دەرگا و ئاستانەی تۆیە، ئەگەر بە دەستی خۆم دەبوو، ساعەتێک بێ خزمەت کردنی تۆ دانە دەنیشتم، بەڵام تۆ منت کردۆتە، ژێر دەستی یەکێک لە بەندەگانی خۆت. خواجە سەرنجی‌دا، ژوورەکە، بەبێ چرا، وەک ڕۆژ ڕووناک بووە، کە ئەوەی دی، لە بەر خۆیەوە گوتی: ئینسانێکی وا، بۆ ئەوە نابێ خزمەتی من بکا، بەڵکوو دەبێ من کەمەری خزمەت، لە خزمەتیدا ببەستم، بەیانی کە ڕۆژ بووەوە، بانگی کرد و دڵخۆشی «ڕابیعە»ی دایەوە و گەردنی خۆی پێ ئازاد کرد و گوتی: ئەگەر پێشت خۆشە، لێرە وەمێنی لە خزمەتتدام، وە ئەگەر دەشڕۆی، خۆت سەر پشک بە.

«ڕابیعە» خوا حافیزی کرد و هاتەوە دەستی کرد، بە خوا پەرستی و زۆر جاریش دەچوە مەجلیسی شێخ حەسەنی بەسری، گوێی لە ئامۆژگاریەکانی دەگرت.

«ڕابیعەی عەدەوی» ساڵێک چوو بۆ حەج، لە دەوری کەعبە، دەگریا و دەپاڕایەوە و دەیگوت: ئەی خوای گەورە، تۆ فەرمووتە، ئەی عەبد و بەندەکانی من، ئەی حاجیەکان، ئەوەی حەج بکا و حەجەکەی لێ قبوول بکرێ، ئەوە پاداشتی باشی ئەدەمەوە و عەفووی دەکەم. ئەوەی تووشی تەنگ و چەڵەمە بوو و سەبری لە سەر بگرێ و ناشوکور نەبێ پاداشتی باشی دەدەمەوە. جا ئێستا ئەگەر حەجەکەم قبووڵ نیە، خۆ تەنگ و چەڵەمە و موسیبەت لەوە گەورەتر نابێ، ئەی کوا سەواب و پاداشتی ئەو موسیبەتە؟! ڕاوی دەڵێ: لە غەیبەوە بانگ کرا، ئەی «ڕابیعە» [مَنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ شِبْراً تَقَرَّبْتُ إِلَيهِ ذِرَاعاً] مژدە بێ، هەرکەسێک، بستێک لە ئێمە نزیک وەبێ، ئێمە گەزێکی لێ نزیک دەبینەوە و هیچ هەنگاوێک بێ پاداشت نابێ.

«ڕابیعەی عەدەوی»، نموونەی ئافرەتی خاوەن ئیمان و پەرهێزگاری بوو، دەڵێن: ڕۆژێک لەسەر حەسیرێک نوێژی دەکرد، لە سوجدەدا، پەلە حەسیرێکی

لە چاوی هەڵچوو وە سەر خۆی نەهێنا و نوێژەکەی نەبڕی.

شێخ حەسەنی بەسری، (ڕەزای خوای لێ بێ)، دەفەرموێ: شەو و ڕۆژێک لەگەڵ «ڕابیعەی عەدەوی» باسی تەریقەت و حەقیقەتمان دەکرد، نە من وەمزانی کە پیاوم نە ئەو بە خەیاڵیدا هات کە ئافرەتە، ئاخری کە هەڵستام، خوا حافیزیم لێ کرد، خۆم بە موفلیس دی و ئەو بە موخلیس هاتە بەر دڵەوە.

دەفەرموێ، جارێکیتر بە خەیاڵمدا هات و گوتم: «ڕابیعە»، ئەوە بۆ شوو ناکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەی حەسەنی بەسری، ئەگەر غەمی سێ شتم لەبیر دەبەیەوە و وەڵامی بەڕاستی ئەو سێ شتەم دەدەیەو، ئەوە لە سەر دەستی تۆ، شەرت بێ شوو بکەم، دەفەرموێ: گوتم، بڵێ! بزانم، ئەو سێ شتە چیە؟

گوتی: ئەی حەسەنی بەسری، پێم بڵێ، بزانم لە کاتیمردندا، ئیمان بە سەلامەتی دەردەبەم یان نا؟ گوتم خوا دەزانێ، نازانم. گوتی: دووەم، ئەوەیە داخۆ، لە کاتی موحاسەبدا، نامەی عەمەلم دەدەنە دەستی ڕاستم یان نا؟ گوتم نازانم، خوا دەزانێ. گوتی: سێیەم، ئەوەیە ئایا، لەو ساعەتەدا، کە کۆمەڵێک لە لای ڕاستی مەیدانی مەحشەر دەبەن بۆ بەهەشت و کۆمەڵێک لە لای چەپی دەبەنە دۆزەخ، من لە کام دەستە دەبم؟ گوتم: نازانم خوا دەزانێ، گوتی: جا تو خوا من ئەو هەمووو ترسەم لە پێشەوە بێ، چۆن هۆشی شوو کردنم بێ؟!

«ڕابیعەی عەدەوی» جارێ بەلای کابرایەکدا دەڕوا، تەماشای دەکا، ئەوا خەریکی گۆشت برژاندنە، بەر خێکی سەر بڕیوە و دەی برژێنێ، «ڕابیعە» هات بە دیاریەوە ڕاوەستا و دەستی کرد بە گریان، کابرا وای زانی ئارەزووی لە گۆشتە، بۆیە دەگری، چوو سەلامی لێ کرد و گوتی: گۆشتی برژاوە فەرموو، ئەگەر ئارەزووت لە گۆشت خواردنە، «ڕابیعە» بە گریانەوە گوتی: براکەم، ئارەزووم لە گۆشت نیە، لە بەر ئەو ناگریم، بۆ ئەوە دەگریم، دەبینم حەیوانات بە سەربڕاوی و مردووی دەچنە ناو ئاگرەوە، بەڵام ڕۆژێک دەبێ ئادەمیزاد بە زیندوویی دەخەنە ناو ئاگرەوە، بۆ ئەوە دەگریم!

«ڕابیعەی عەدەوی» ئەوەندە خوا پەرستێکی گەورە بوو، دەڵێن: شێخ حەسەنی بەسری (ڕەزای خوای لێ بێ)، حەفتەی جارێ، کە مەوعیزەی دەکرد، دەی ڕوانی، ئەگەر «ڕابیعە» لە مەجلیسەکەدا حازر نەبوایە، ئامۆژگاریەکەی نەدەکرد و دەستی لێ هەڵدەگرت. ڕۆژێک عەرزیان کرد، قوربان، ئەو هەموو خەڵکە و پیاوە گەورانە، ئامادەی مەجلیسەکەت دەبن، بە حازر نەبوونی پیرێژنێک، تەرکی مەوعیزەکە دەکەیت؟! لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئەو پیاڵە شەربەتەی، کە من لە ئامۆژگاریەکانمدا، بۆ قورگی فیلم، ساز کردووە، لە گەرووی مێروولاندا، ناچێتە خوارەوە، یەعنی هەر «ڕابیعەی عەدەوی»یە، کە بتوانێ بە تەواوی پیاڵەی شەربەتی موحیببەتی خوا نۆش بکا. کاتێ شێخ حەسەن، لە مەوعیزەدا گەرم دەبوو، ڕووی دەکردە «ڕابیعە» و دیفەرموو: [هذا مِنْ حُمُراتِ قَلْبِکِ یا سیِدَةُ] ئەوە لە گەرمی دڵی تۆوەیە یا سەییدە. گوتیان: قوربان، جا بۆ هەر بە هۆی ئەوەوە هەر شاد و کەیفخۆش دەبی و گەرم دادێت؟ فەرمووی: من بە زۆری خەڵک، دڵ خۆش نابم. بەو کەسە دڵ خۆش دەبم، کە زۆر لە خواترس بێ، بادەروێشێکیش بێ نەک «ڕابیعەی عەدەوی»!

شێخ حەسەنی بەسری، جارێک دەنێرێتە لای «ڕابیعەی عەدەوی»، دەڵێ: دەبێ ئامۆژگاریەکم بکا، «ڕابیعە» دەڵێ: بەڵێ، ها ئەو مۆم و سوژن و مووەی بۆ بەرن، با پەندی لێ وەرگرێ، کە بۆیان هێنا، شێخ حەسەن فەرمووی: بەڕاستی ئامۆژگاری چاکە، مەعنای وایە دەڵێ: ئەی حەسەنی بەسری، پیاوی خوا دەبێ، وەک ئەو مۆمە، خۆی بسووتێنێ، تا ڕووناکی بۆ خەڵک هەبێ. دەبێ وەک ئەو سووژنە، ڕووت بێ و هەمیشە لە کاردابێ، بۆ کاری خەڵک. دەبێ وەک ئەو مووە، نەرم و خۆ ڕاگر بێ.

جارێک کۆمەڵێک عالم و زانا، بۆ تاقی کردنەوە، چوون بۆ لای و گوتیان: ئەی «ڕابیعە»، تۆ دەزانی، کە تا ئێستا، هەرچی سیفەت و خەسڵەتی گەورەیە، لە لایەن خواوە، هەر دراوە بە پیاوان و کەمەری کەرامەت هەر لە پشتی پیاوان بەستراوە و

هیچ ئافرەتێک نەکراوە بە پێغەمبەر، گوتیان کەواتە تۆ ئەو لافە چیە لێ دەدەی؟ «ڕابیعە» لە سەر خۆ، لە وەڵامیاندا گوتی: بەڵێ، ئەوەی ئێوە دەڵێن، هەمووی وایە. بەڵام ئەوەش بزانن، کە تا ئێستا هیچ ئافرەتێک، بە زمانیدا نەهاتووە، داوای خوایەتی بکا، پیاو نەبێ. بەو وەڵامە کورتە، زاناکانی بۆڕدا.

جارێک شێخ حەسەنی بەسری و مالێکی کوڕی دینار و شێخ شەقیقی بەڵخی چوونە لای، باسی ڕاستیان دەکرد، کە ڕاستی چیە؟ شێخ حەسەنی بەسری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: [لَيْسَ بِصادِقٍ فِي دَعْواهُ مَنْ لَمْ يَصْبِرْ عَلىٰ ضَرْبِ مَوْلاهُ] بەو کەسە ناڵێن سادق و ڕاست و ڕاستگو، کە لە سەر بەڵاو موسیبەت و لێدانی مەولا، خۆڕاگر و سابیر نەبێ. «ڕابیعەی عەدەوی» بە وەڵامەکە و مەعنالێدانەوەکەی، شێخ حەسەن ڕازی نەبوو، گوتی: مەعنای تەواوی ڕاستی نیە، بۆنی خودبینی لێ دێ، جا، شێخ شەقیقی بەڵخی فەرمووی: [لَيْسَ بِصادِقٍ فِي دَعْواهُ مَنْ لَمْ يَشْكُرْ عَلىٰ ضَرْبِ مَولاهُ] ئەوەی لەسەر، زەربەی مەولای شوکرانە نەکا، ئەوە ڕاست و سادق نیە. «ڕابیعە» دووبارە بەوەش ڕازی نەبوو، گوتی وەڵامێکی لەوەش جوانترم دەوێ. مالیکی کوڕی دینار گوتی: [لَيْسَ بِصادِقٍ فِي دَعْواهُ مَنْ لَمْ يَتَلَذَّذْ بِضَرْبِ مَوْلاهُ] واتە لە گەڵ خوا ڕاست ناکا، ئەوەی لەزەت لە زەرەری مەولا وەرنەگرێ. «ڕابیعە» دووبارە گوتی: بۆ مەعنای ڕاستی، وەڵامی لەوەش جوانتر هەیە. ئینجا گوتیان دەی تۆ بڵێ، بزانین ئەو وەڵامە جوانترە کامەیە؟ [قالَتْ لَيسَ بِصادِقٍ فِي دَعْواهُ مَنْ لَمْ يَنْسَ اَلَمَ اَلضَرْبِ فِي مُشاهَدةِ مَوْلاهُ] فەرموی: ڕاست و ڕاستگۆ بەو کەسە دەڵێن، کە بە چاو پێکەوتنی مەولا و مەحبووبە خۆشەویستەکەی، ئێشی لێدانی لەبیر بچێتەوە، گوتی: نابینن کە ئافرەتەکانی میسری، بە چاوپێکەوتنی جەماڵی یوسف، دەست بڕینی خۆیان لە بیر چووەوە! ئەو سێ زانایە وەڵامەکەی «ڕابیعە»یان، زۆر بە دڵ بوو، ئافەرینیان کرد و داوای دوعایان لێ کرد.

لە باسی کەشف و کەڕاماتی «ڕابیعەی عەدەوی» دا دەڵێن: جارێک شێخ

حەسەنی بەسری و «ڕابیعەی عەدەوی»، لە قەراغ ئاوی فوراتا دانیشتبوون، شێخ حەسەن بۆ تاقی کردنەوەی «ڕابیعە»، چوو بەرماڵەکەی، لە سەر ئاوی فوڕات ڕاخست و فەرمووی: ئەی «ڕابیعە» وەرە، با یەکی دوو ڕەکات نوێژ لە سەر ئەو ئاوە بکەین. «ڕابیعە» هەر هەستا و بەر ماڵەکەی خۆی حەوادا بۆ هەواو چوو لە سەری ڕاوەستا و گوتی: ئەی حەسەنی بەسری» تۆ وەرە، بالێرە یەکی دوو ڕکات نوێژ بکەین. گوتی بەڵام ئەی حەسەنی بەسری وریابە، بە کەرامەت لە خۆت بایی نەبی و خۆت لێ نەگۆڕێ، کەرامات زۆر شەرت نیە، گوتی: چونکە ئەوەی تۆ بە کەرامات دەیکەی، ماسییەک دەیکا و ئەوەی منیش کردم، مێشوولەیەک دەتوانێ بیکا.

جارێک تووشی پیاوێک دەبێ، تەماشا دەکا، کابرا ناوچاوانی خۆی بەستووە، «ڕابیعە» دەڵێ: ئەو پەڕۆیە چیە بە ناو چاوانی خۆت ڕابەستووە، کابرا دەڵێ: لە بەر ژانەسەر بەستوومە، «ڕابیعە» دەڵێ: تەمەنت چەند ساڵە، کابرا دەڵی پەنجا، «ڕابیعە» دەڵێ: لەو پەنجا ساڵەدا، بەزۆری ساغ بووی، یان نەخۆش بووی؟ کابرا دەڵێ: زۆر ساغ بووم، «ڕابیعە» دەڵێ: باشە، لە ماوەی ئەو پانجا ساڵە ساغیەت، جارێک پەڕۆیەکی شوکرانەت لە سەر بەست؟ بێ گومان نە ء، بەڵام بۆ ژانە سەرێک گورج نارەزایی خۆت دەردەبڕی، بەندەی خوا ئاوا دەبێ؟!

کابرا ئامۆژگاری‌یەکەی زۆر پێ خۆش بوو، تۆبەی کرد، کە تاماوە لە بەرانبەر هیچ تەنگ و چەڵەمەیەکدا، ناشوکور نەبێ و نارەزایی دەر نەبڕێ.

«ڕابیعەی عەدەوی» دۆعای زوو گیرا بووە، دەڵێن: شەوێک دز دەچێ، هەموو ماڵەکەی دەگەڕێ، هیچی دەست ناکەوێ بیدزێ، دەگەڕێتەوە. «ڕابیعە» وە خەبەرەر دێ و دەزانێ، دزە. دەڵێ: ئەوە بۆ دەڕۆی؟ کابرا دەڵێ: ئەی چی بکەم؟ «ڕابیعە» دەڵێ، ئەوە ئاو، دەستنوێژێک بگرە و دوو ڕکات نوێژ بکە، کابرا بە قسەی دەکا، لەو کاتەدا، کە کابرای دز دوو ڕکات نوێژ دەکا، «ڕابیعە» لەبەر خوا دەپاڕێتەوە و دەڵێ: ئەی خوای گەورە، ئەو کابرایە ڕووی کردووتە ماڵی من و قاپی تۆ،

نائومێدی مەکە، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، کابرا دڵی نەرم بوو، لە سەر دەستی «ڕابیعە» تۆبەی کرد، کە جارێکیتر دزی نەکا.

جارێک «ڕابیعە» موناجاتی دەکرد، دەیگوت: ئەی خوای گەورە، ئەوەی لە دنیادا، بۆ منت داناوە، بیدە بە دوژمنەکانت وە ئەوەی لە قیامەتیشدا بۆت هەڵگرتووم، بیدە بە دۆستەکانت. چونکە لە دنیا و قیامەتدا من هەر تۆم بەسە.

دەیگوت: خواوندا، ئەگەر لە ترسی دۆزخ تۆ دەپەرەستم، لە دۆزەخدا بم سووتێنە وە ئەگەر بە هیوای بەهەشت دەتپەرستم، بەهەشتم لێ حەرام کە وە ئەگەر هەر لە بەر خاتری جەماڵی تۆ دەتپەرستم، جەماڵی خۆتم نیشاندە.

دەڵێن: کاتێ وەفاتی نزیک بووە و نەخۆش کەوت، زۆر لە پیاوە گەورەکان، لە خزمەتی بوون، چوون بۆ ئەحواڵ پرسی، لە نکاوێک ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: هەستن جێگا بۆ فرستادەکانی خوا چۆڵ کەن، عاڵەمەکە، لە ژوورەکەی هاتنە دەرەوە، بەڵام گوێیان لە دەنگێک بوو، لە ژوورەوە دەهات، دەیگوت: ﴿يَا أَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ٱرْجِعِي إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾ ئەی نەفسی قەرارگرتوو، بگەڕێوە بۆ لای خوای خۆت، لە خوا ڕازی بەو خواش لە تۆ ڕازی‌یە. لە پاشان ژوورەکە بێ دەنگ بوو، کە چوونە ژوور، تەماشایان کرد وەفاتی کردبوو. ﴿إِنَّا لِلَّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ لە ساڵی سەد و هەشتاد و پێنجی کۆچیدا، لە [بَيْتُ ٱلْمُقَدَّسْ] تەسلیم بە خاکیان کرد.

ڕاوی دەڵێ: لە خەوا، چاویان پێکەوت گوتیان: لە دەست نەکیر و مونکەر چۆنت ڕزگار بوو؟ لە وەڵامدا گوتی: کاتێ فرستادەی خوا هاتن و گوتیان: خوا کێیە؟ لە وەڵامدا گوتم: بچن عەرزی بارەگای خوا بکەن و بڵێن: «ڕابیعە» عەرزت دەکا. ئەو، لە ناو ئەو هەموو گیانلەبەرەدا، ئەو پیرێژنەی فەرامۆش نەکردووە، من کە هەر ئەوم هەیە، چۆن فەرامۆشی دەکەم؟! گوتی نەهاتنەوە.

ئەوە بوو بە کورتی باسی «ڕابیعەی عەدەوی»، ئومێد دەکەم، بە تایبەتی ئافرەتانی خاوەن ئیمان، چاو لە حەیا و شەرم و خوا پەرستی ئەو بکەن، تا خوای

گەورە، لە دنیا و قیامەت ڕزگاریان بکا.

وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٢٩)

## باسی فوزەیل کوڕی عەیاز

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلَّذي لَهُ النِّعَمْ مُشَرِّفَ الْعِلْمِ وَ مَنْ بِهِ اِعْتَصَمْ
وَ صَلَواتُهُ وَ تَسْلِيْماتُهُ عَلىٰ اَلنَبِيِّ عَظُمَتْ آياتُهُ...
وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ اَلنُّحاةِ نَحْوَ الهُدىٰ سَفائِنَ النَّجاةِ[1]

موسوڵمانینە، با لە مەجلیسی ئێستاماندا و لەم چەند دەقیقەی داهاتووی ژیانماندا، بچینە بارەگای ئەو کەسەی، کە زەمانێک سەردەستەی دزوو جەردان بوو، ڕێگە گرو پیاو خراپی زەمان و دەوران بوو، بەڵام تۆ لە کاری خوا گەڕێ کەویستی هیدایەتی کەسێک بدا، خوای گەورە ئەو پیاوەی کردە، پێشەوای تائبان و ڕۆژی ڕووناکی کەرەم و ئیحسان و بەحرو دەریای وەرع و عیرفان و زوهد و لە خوا ترسی کات و زەمان، جا ئەو سەرچاوە ڕوون و فەییازە «فوزەیلی کوڕی عەیاز»ە. با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین و بزانین لە چییەوە خوا کردی بە چی!

«فوزەیلی کوڕی عەیاز» لە کاتی لاویدا، زۆر بە دەسەڵات بوو، چوو بوو، لە دەشت و سەحرا خێوەتی هەڵدابوو، لیباسی پەلاسی پۆشی بوو، کڵاوێکی ئاوریشمی لە سەر نابوو، تەسبیحێکی سەد و یەک دەنگی لە مل کرد بوو، غوڵام و دەست و پێوەندێکی زۆری لە دەورەوە بوو، زۆربەیان دز و جەردە و ڕێگر بوون، هەر دزی و جەردەیی و تاڵانێکیان بهێنایە، ئەو دابەشی دەکرد، بە سەریاندا و

١ - شێخ مەعروفی نۆدێی.

ئەوەی خۆشی ئارەزووی لێ بوایە، بۆ خۆی هەڵی دەگرت. بەڵام لە لایەکی تریشەوە عادەتی وابوو، قەت نوێژی بە جەماعەت نەدەفەوتاند، دایما مەلایەکی ڕاگرتبوو نوێژی بە جەماعەت لە گەڵ دەکرد، هەر غوڵام و نۆکەر و دەست و پێوەندێکیشی نوێژی بە جەماعەت نەکردایە، ڕای نەدەگرت.

ڕۆژێک کاروانێکی زۆر لە دوورەوە دەر کەوت، بەڵام کاروانچیەکان بیستبوویان، کە لەو دەشت و سەحرایە، کۆمەڵە دزێکی لێ پەیدا بووە، کاروانیان ڕووت دەکەنەوە، زۆر دەترسان، لەوەکە ڕووتیان وەکەن. ڕاوی دەڵێ: پیاوێک لە گەڵ کاروانەکە بوو، پارە و ئاڵتوونێکی زۆری پێ بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: وا چاکە تا دزەکان نەهاتوون کاروانەکە ڕووتەوە کەن، من بچم لەو چۆڵ و بیابانە، ئەو پارە و ئاڵتوونە وەشارم. کابرا بە دزی ڕەفیقەکانی ڕووی کردە سەحرا و زۆری نەخایاند، لە دوورەوە خێوەتێکی ڕەچاو کرد و گوتی: بەڕاستی خوادای، با بچم بزانم ئەو خێوەتە چیە و ئی کێیە؟ کە نزیک بووەوە، تەماشای کرد، ئەوا کابرایەکی زۆر بەسام و هەیبەت و سەروسیما جوان، لە ناو خەیمەکەدا دانیشتووە و بەرماڵێکی ڕاخستووە و لەسەری دانیشتووە، بەرگی پەلاسی پۆشیوەو تەسبیحێکی گەورەی بە دەستەوەیە، تەسبیحات دەکا، کابرا لە دڵی خۆیدا زۆری پێ خۆش بوو، گوتی: زۆر باش ڕێک کەوت، پارەکەم بە ئەمانەت لای ئەو پیاوە موبارەکە دا ئەنێم، تا کاروانەکە ڕەد دەبێ، با دزەکان نەی بەن.

چۆە ژووری چادرەکە و سەلامی کرد و بە سەرهاتی خۆی و پارەکەی بۆ خاوەن خەیمەکە گێڕایەوە، کابرای خاوەن ماڵ زۆر لە سەر خۆ گوتی: بە خێر بێی، داینێ. کابرای کاروانچی پارەکەی دانا و گەڕایەوە بۆ لای کاروانەکە، تا هاتەوە دزەکان کاروانەکەیان ڕووت کردبووە و زۆربەی شتی کاروانەکەیان بردبوو، هێندێکی کەل و پەل مابوو، هەڵی گرت و هاتەوە بۆلای خێوەتەکە تا ئەمانەتیەکەی وەرگرێتەوە، کاتێ هاتەوە، تەماشای کرد ئەوا دزەکان تەواوی ماڵی کاروانەکەیان هێناوە و کابرای پەلاس لەبەر، کە ئەو بە پیاوی چاکی زانیوە و

پارەکەی لا داناوە، بە چۆکدا هاتووە و شتەکانیان لێ بەش دەکا!

کابرا واقی وڕما و بە ئەژنۆی خۆی دادا و گوتی: ئای بە دەستی خۆم، چۆنم ماڵی خۆم وێران کردا وەرە بە دەستی خۆت ئەو هەموو پارەیە بدەی بە دەستی ڕەئیسی دزان!

- «فوزەیلی کوڕی عەیاز»، کە لە دوورەوە چاوی بە کابرا کەوت: بـانگی کـرد، گوتی: کاکە، وەرە پێشەوە، کابرا بە نـاچاری و تـرس و لەرزەوە چـوە لایـان و سەلامی کرد و وەڵامیان دایەوە و «فوزەیل» گوتی: بۆ چـی هـاتووی؟ کـابرا بـە ترسەوە گوتی: قوربان بۆ ئەو ئەمانەتیەی کە لە لام داناوی، «فوزەیل» گوتی: وەرە ئەوەتا، هەر لەو جێگایەیە کە ئەو ڕۆژە لێت داناوە و کەس دەستی نەکـردوتێ، چوو بە ترسەوە هەڵی گرت و خوا حافیزی کرد و هاتەوە بۆ لای کاروانیەکان، دزەکان کە ئەویان چاو پێکەوت گوتیان: خۆ ئێمە لە ئەو کاروانەدا، هیچ پارەمان دەس نەکەوتووە، تۆ بۆچی ئەو پارەیەت دایەوە بەو کابرایە؟! «فوزەیل» گـوتی: ئاخر ئەو پیاوە، منی بە ئەمین زانی و منیش لەبەر ڕەزای خوا، خەیانەتم پێ نەکرد، بەڵکوو خواوەندی گەورە لەم ڕۆ بە دواوە هیدایەتم بدا و بمخاتە سەر ڕێگـای ڕاست.

- ڕاوی دەڵێ: لە پاشان کاروانێکی تر هات و ڕووتیان کردەوە و هاتن خەریکی نان خواردن بوون، یەکێک لە کاروانچیەکان هاتە لایان گوتی: ئەرێ ئەوە ئـێوە گەورە و ڕیش سپیەکتان نیە؟ لە وەڵامدا گوتیان: بەڵێ، هەمانە، ئەوا لە سەر ئەو ئاوە خەریکی دەست نوێژ گرتنە و نوێژ دەکا.

- کابرا گوتی باشە نوێژی چ وەخت دەکا؟! خۆ هێشتا وەختی هیچ نوێژێک نیە، گوتیان: نوێژی سوننەت دەکا، کابرا گوتی ئەی نایەت نانتان لەگەڵ بخوا؟ گوتیان: ئەو بە ڕۆژووە و نان ناخوا، کابرا گوتی کوڕە پیاوی چاک بن، بۆ گاڵتەم پێ دەکەن، ڕۆژوی چی؟! خۆ ڕەمەزان نیە، گوتیان کاکە عـادەتی وایـە، ڕۆژوی سـوننەت دەگرێ، کابرا زۆری لاعەجایب بوو، هەستا، هات بۆ لای «فوزەیل» و گوتی: تو

خوا هەر لە خۆت دەپرسم، نوێژ و ڕۆژوو دزی کوجا مەرحەبا؟!

«فوزەیل» ماوەیەک بێ دەنگ بوو، وەڵامی نەدایەوە و لە پاشان ڕووی کردە کابرا و گوتی: ئەرێ تۆ قورئانت خوێندووە؟ کابرا گوتی بەڵێ، خوێندوومە. «فوزەیل» گوتی، ئەی باشە تۆ قەت ئەو ئایەتەی سورەی تۆبەت نەخوێندوەتەوە، کە خواوەندی گەورە دەفەرموێ: ﴿وَ آخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلاً صالِحاً وَ آخرَ سَیئاً﴾ کۆمەڵێک ئیقراریان کردووە بە تاوانەکانیان و کردەوەی چاک و خراپ تێکەڵ دەکەن. بەڵام ﴿عَسىَ اللهُ اَنْ یَتُوبَ علیهِمْ إنَّ اللهَ غَفُورٌ رَّحِیمٌ﴾ ڕەجا وایە، خوا تۆبە لەو جۆرە کەسانە قبوڵ بکا، چونکە بەڕاستی خوا تاوان بەخش و خاوەن بەزەیی‌یە. کابرا لە قسەکانی گەورەی دزەکان واقی وڕما و نەیزانی چی بڵێ، ئەم قسانە و دزی لە کوێ! بەو قسانە کابرای بەڕێ کردەوە و ڕۆیشت. بەڵێ، لە کاتی جەردەییشدا ئەوەندە مەرد و بە تەبیعەت بوو، هەر کاروانێک ئافرەتی لەگەڵ بوایە ڕووتی نەدەکردەوە و ئەگەر کاروانچی یەکیش، شتی کەم پێ بوایە خۆی تێ وەر نەدەدا و ئەوا نەی ڕووتیشی دەکردنەوە، بەشێکی بۆ دەهێشتنەوە.

تا شەوێک هاتبوونە سەر ڕێگا بۆ ڕاو، و ڕووت. کاروانێک دەرکەوت، لەناو کاروانەکەدا، گوێی لێ بوو، یەکێک ئەو ئایەتەی سورەی حەدیدی دەخوێندەوە، کە دەفەرموێ: ﴿اَلَمْ یَأْنِ لِلَّذِینَ آمَنُو اَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِکْرِ اللهِ وَ مَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾ ئایا وەختی ئەوە نەهاتوە، کە ئەو کەسانەی خۆیان بە خاوەن ئیمان دەزانن و دڵیان نووستوە، دڵیان بەزکری خوا و بۆ ئەو حەق و ڕاستی یانە وە خەبەر بێ کە خوای گەورە نازڵی کردوون؟ ڕاوی دەڵێ: بیستنی ئەو ئایەتە وەکوو تیر و خەنجەری دەبان دای لە دڵی «فوزەیل» و کاری خۆی کرد و لە ناکاو نەعرەتەیێکی لێدا و هاواری کرد و گوتی: [بلیٰ جٰاءَ فَتابَ وَ اَنابَ] بەڵێ: ئەی خودای گەورە، وەختی هاتووە. هات و تۆبەی کرد و لە کردەوەی خۆی پەشیمان بووەوە، هەر لەوێ لیباسی جەردەیی دڕاندو خوا حافزی لە دزەکان کرد و ڕووی کردە چۆڵ و بیابان.

لە پاشان ماوەیەکی زۆر دەچێتە خزمەتی ئیمامی حەنەفی و دەرسی لا

دەخوێنێ، تا ڕۆژێک دەچێتەوە ماڵەوە و دەڵێ: ئافرەت من خەیاڵی زیارەتی ماڵی بەیت و حەجم هەیە، جا ئەگەر پێت خۆشە با تەڵاقت بدەم. ئافرەتەکە دەڵێ: پێی تۆ لە کوێ بێ، سەری من لەوێیە، هەرگیز لە تۆ جیا نابمەوە، هەستان و بە جووتە بەرەو ماڵی خواکەوتنە ڕێ، چوونە مەککە و حەجایان کرد و زۆر لە شاری مەککە مانەوە، خەڵکی شاری مەککە بە زانا و نەزانەوە ڕوویان تێکرد، لە دەوری کۆ دەبوونەوە و ئامۆژگاری بۆ دەکردن.

دەڵێن: لەو کاتەشدا کە لە بەغدا بوو، هارونە ڕەشید شەوێک بە فوزەیل بەرمەکی دەڵێ: دەبێ ئەمشەو بچین بۆ لای یەکێک لە پیاو چاکان و ئەو ئەولیایانەی کە لە شاری بەغدا دان، با تۆزێک دڵم بکرێتەوە، زۆر نارحەتم. هەستان چوونە بەر دەرگای سەفیانی کوڕی عویەینە، لە دەرگایان دا، گوتیان کێیە؟ گوتی: ئەوە ئەمیری موسوڵمانانە، هارونەڕەشیدە. سەفیانی کوڕی عویەینە گوتی: ئەی باشە بۆچی زوو خەبەرتان نەدا، تا خۆمان ئامادە بکەین؟ هارونەڕەشید کە ئەوەی بیست گوتی: ئەوە ئەو پیاوە نیە کە من لێی دەگەڕێم. سەفیان گوێی لە قسەکەی هارونەڕەشید بوو، گوتی: قوربان ئەو پیاوەی کە جەنابت دەت هەوێ، ئەوە «فوزەیل کوڕی عەیاز»ە. لەوێ وە هاتن بۆ بەردەرگای ماڵی «فوزەیل»، لەو کاتەدا کە گوێیان گرت، ئەو ئایەتەی سورەی جاسیە دەخوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ ئایا ئەوانەی خراپە دەکەن و گومان دەبەن کە ڕەفتاریان وەک ئەوانە لە گەڵدا دەکرێ کە چاکەیان کردووە؟ وانیە حیساب و کیتابی موسوڵمانان لە گەڵ بێ بڕوا و خراپکاران لێک جیاوازە. هارونەڕەشید زۆری پێ خۆش بوو. گوتی بۆ پەند و ئامۆژگاری ئەم ئایەتەم بەسە. لە پاشان لە دەرگایاندا. «فوزەیل» گوتی: کێیە؟ لە وەڵامدا گوتیان ئەوە ئەمیری موسوڵمانان، هارونەڕەشیدە. گوتی جا بەم شەوە چ کارێکی بە منە؟ پێی بڵێن من هیچ کارێکم بەو نیە، با لە کارم نەکا.

فوزەیلی بەرمەکی گوتی: ئاخر ئیتاعەی وەلی ئەمری موسوڵمانان واجبە.

فەرمووی: کەواتە ئارەزووی خۆتانە، هـارونەڕەشید چـوە ژوورەوە، «فـوزەیلی کوڕی عەیاز» چـراکـەی کـوژانـدەوە، تـا چـاوی بـە هـارونەڕەشید نـەکـەوێ. هارونەڕەشید دەستی خستە ناو دەستی «شێخ فوزەیل» فەرمووی: [مَا اَلْیَنَ هذا الكَفُ لَوْ نَجا مِنَ النارِ] واتە ئەو دەستە چەند نەرمە، ئەگەر بـە ئـاگـری دۆزەخ نەسوتێ و نەجاتی ببێ. ئەوەی گوت و نوێژی دابەست. هاروونەڕەشید دەستی کرد بە گریان، تا ئەو لە نوێژەکەی بوەوەوە، هەر گریا، لە پاشان گوتی: قـوربان ئامۆژگاریەکم بکە. فەرمووی: با پیری تۆ مامی پێغەمبەر بوو، ڕۆژێک عـەرزی پێغەمبەر دەکا و دەڵێ: ئەی ڕەسوولی خوا، دەبێ بمکەی بە ئەمیری ناوچەیەک پێغەمبەر دەفەرموێ: [إنَّ الامارَةَ یَوْمَ الْقیامَةِ النَّدامةُ] ئەمیری لە دنیادا، دەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە لە قیامەتا، فەرمووی ئەگەر یەک ساعات ئیتاعەی خوا بکەی، لەوە باشترە هەزار ساڵ خەڵک ئیتاعەی تۆ بکا، هارونەڕەشید گوتی زیاتر ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: ئەی هارون، کاتێ «عومەر»ی کوڕی عبدالعـزیزیان کردە خەلیفە، بانگی سالمی کوڕی عبدالله و ڕەجای کوڕی حەیات و محمدی کوڕی کەعبی کرد، کە هەر سێکیان پیاوی گەورە و زانا بـوون، گـوتی تـووشی ئەمیری و خەلافەت بووم چارم چیە؟ تەگبیرێکم بۆ بکەن. گوتیان: ئەی عومەری کوڕی عبدالعزیز، ئەگەر دەتهەوێ لە ڕۆژی قـیامەتا ڕزگـارت بـبێ و تـووشی عەزاب نەبی، پیرانی موسوڵمانان، وەک باوکت تەماشا بکە و گەنج و لاوەکانیان وەک برات و منداڵەکانیان وەک منداڵی خۆت و ئافرەتەکانیان وەکـوو دایک و خوشکی خۆت تەماشا بکە. هارونە ڕەشید زۆری پێ خۆش بوو، عەرزی کرد، قوربان زیاترم ئامۆژگاری بکە. فەرمووی: ئەی هارون، بزانە کە وڵاتی ئـیسلام، هەمووی وەک ماڵی تۆ وایە و خەڵک هەمووی وەک ئەهل و عەیالی تۆ وان، لە گەڵ باوەکاندا بە لوتف بەو لە گەڵ براکانت چاکە و کەرەمت هـەبێ و لە گـەڵ کوڕەکانت پیاوەتی بکە. ڕووی کردە هارونە ڕەشید و گوتی: زۆر دەترسم کە ئەو ڕەنگ و ڕووە جوانەت، بە ئاگری دۆزەخ بسۆتێ و ناشیرین ببێ. [كَمْ مِنْ وَجْهٍ

صَبيحٍ فِي ٱلنَّارِ قَبيحٌ وَكَمْ مِنْ أَميرٍ هُنَاكَ أَسيرٌ] فەرمووی: زۆر رووی ڕووناک لە ناو ئاگری دۆزەخدا، ناشیرین دەبن.زۆر ئەمیر لە وێدا ئەسیر دەبن. فەرمووی: ئەی هارون، وشیار بە، وەڵامی پرسیاری ڕۆژی مەحشەر ئامادە بکە، چونکە خواوەندی گەورە لە هەموو ژێر دەستێک، پرسیارت لێ دەکاتەوە، گوتی: ئەی هارون، ئەگەر شەوێک پیرەژنێک لە کەلاوەکەی خۆیدا، لە برسان سەر بنێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتا داوێنی تۆ دەگرێ و دەبێتە دوژمنت، چونکە ئامیری وەخت لە بەرانبەر هەموو کەس لێ پرسراو دەبێ، هارونە ڕەشید دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە گریا تا ماوەیەک بێ هۆش کەوت، ئاگای لە خۆی نەما، «فوزەیل بەرمەکی گوتی: یا شێخ، دەبەسە خۆ خەلیفەت کوشت. شێخ تووڕە بوو گوتی: بێ دەنگ بە ئەی هامان. تۆ و قەومەکەت دەی کوژن، هارونە ڕەشید بەو قسەیەی ئەوەندەی تریش گریا و گوتی: ئەی بەرمەکی، بۆیە بە تۆی گوت هامان، چونکە من بە فیرعەون دەزانێ.

شێخ جلال الدینی سیوطی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: «فوزەیل کوڕی عەیاز» لە زەمانی خۆیدا، لە هەموو کەس تاعەت و عیبادەتی زۆرتر بوو. ڕۆژێک تووشی عبداللهی موبارەک بوو، دەچوو بۆ لای، گوتی: ئەی عبدالله، لە کوێوە هاتووی هەر بە وێدا بگەڕێوە، دەنا من دەگەڕێمەوە. گوتی دەزانم بۆ ئەوەی هاتووی کۆمەڵێک قسە بۆ من وەگێڕی و منیش چەند قسەیەک بۆ تۆ بکەم لەو ماوەیەدا خوا پەرستیمان لە بیرەوەچێ. ڕاوی دەڵێ: ڕۆژێکی تر لە کێوی عەرەفات، ڕاوەستا بوو، تەماشای حاجیەکانی دەکرد و گوێی لە دەنگی گریان و پاڕانەوەی حاجیەکان ڕاگرتبوو، لە ناکاو نەعرەتەیەکی لێدا و هاواری کرد و گوتی: ئەی خوای گەورە، ئەگەر ئەو هەموو خەڵکەی هاتوەتە عەرەفات و لە بەرت دەپاڕێنەوە، ئەگەر بچنە لای پیاوێکی بەخیل و داوای لێ بکەن، نا ئومێدیان ناکا، ئەی خۆ تۆ خواوەندی گەورەی، سەخاوەت و کەرامەتی تۆ مەشهورە و عەفوو کردنی ئەو خەڵکە بۆ تۆ زۆر ئاسانترە لە پارەدانی کابرای بەخیل بە خەڵکەکە،

تکام وایە هەمووان عەفوو کەی.

سەفیانی سەوری و بشری حافی و عبداللّهی موبارەک و ئیمامی ئەحمەد (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەچوونە لای و پرسیاری زۆریان لێ دەکرد و زۆری لێ ڕازی بوون.

لە ئاخری تەمەنیدا، ئەوەندە لە خەڵک بێزار ببو، خوا خوای بوو چاوی بە کەس نەکەوێ و کەس نەی بینێ. سەفیانی سەوری دەفەرموێ: شەوێک چوومە لای و باسی ئایەت و حەدیسم دەست پێکرد. لە ئاخریدا گوتم: بەڕاستی شەوێکی موبارەک بوو، دانیشتنەکەمان زۆر خۆش بوو، زۆر لە تەنیایی خۆشتر بوو، ئەو لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ شەوێکی زۆر خۆش بوو، چونکە تۆ هەر خەریکی ئەوە بووی قسەیەکی وا بکەی من پێم خۆش بێ و وەڵامێکی وات بدەمەوە بەلاتەوە پەسەند بێ، هەردووکمان لە بەر قسەی یەکتر خوامان لە بیر چووبووە، ئەگەر هەریەکەمان بە تەنیا بووینایە زۆر باشتر بوو. دەیفەرموو: پێم خۆشە نەخۆش بکەوم تا بۆم ببێ بە عوزری نەچوونی جەماعەت و خەڵک نەبینم. دەیفەرموو: شەوم لە ڕۆژ پێخۆشترە، چونکە بە شەو خەڵوەتم و خەڵک نابینم، بەڵام کە ڕۆژ بوەوە غەمبار دەبم. لە بەر دیداری خەڵک، چونکە بە زۆری کاتی تەمەنی ئینسانی بە فیڕۆ دەدەن و بە خۆڕایی دەڕوا. دەیفەرموو: چەند عەجایبە کەسێک لە بەهشتا بگرِی و بڵێ ناخۆشە، چەند ئەوەندە عەجایبترە کە پیاو لە دنیادا هەر پێ بکەنێ و نەگری بۆ حاڵی خۆیی. دەیفەرموو: هەر کەسێک لە خوا بترسێ، هەموو گیان لە بەرێکی لێی دەترسێ، بەڵام ئەوەی لە خوا نەترسێ، هیچ گیان لە بەرێک لێ ناترسێ و ئەو لە هەمووان دەترسێ.

جارێک لە مەوعیزەدا، باسی خۆ بەکەم گرتن و تەوازوعی دەکرد فەرمووی: خۆ بەکەم گرتن و تەوازوع دەبێتە مایەی سەربڵندی و گەورەیی و خۆشەویستی ئەو کەسە لە لای خوا و خەڵک. فەرمووی: خوای گەورە وەحی کردوەتە سەر کێوان، کە یەکێکتان خۆی ئامادە بکا، تا بیکەم بە جێگای مولاقات و گفتوگۆ

لەگەڵ یەکێک لە پێغەمبەران، هەموانیان تەکەببوریان کرد، کێوی «تور» نەبێ. جا لە بەر ئەوەی خۆی بەکەم نیشاندا و تەوازوعی کرد، لای هەموو کەس قـەدر و حورمەتی هەیە و لە هەموو کێوێک خۆشەویستترە.

فەرموی هەر کەسێک بە ئاشکرا لەگەڵ برای دینی دۆست بێ و بە زمان خۆی بە برادەر لە قەڵەم دا و لە دڵدا ناخۆشی بوێ، خوا ئەو کەسە بە لەعەنەت دەکا. تا دەتوانن ڕەفاقەت و دۆستایەتی پیاوی با وەفا و زانا و عاقڵ بکەن، چونکە شەڕ لە گەڵ پیاوی دانادا، خۆشترە لە هەڵوا خواردن لەگەڵ پیاوی بێ عەهد و نەفامدا.

فەرمووی قەت بە تایبەتی لە عنەت لە کەسێکی دیاری کرا و مەکەن، چونکە ئەگەر تۆ لەعنەت لە حەیوانێکیش بکەی، ئەو بە زمانی حاڵ دەڵێ: ئامین لە من و تۆ کامەمان لە خوا عاسیتر بوو بە لەعنەت بێ، فەرمووی: ئەگەر لە غەیبەوە بڵێن: دۆعایەک بکە، خوا زوو گیرای دەکا. گورج ئەو دۆعایە بۆ ئامیری وەخت دەکەم، چونکە چاکی ئامیری وەخت چاکی و خۆشی هەموو کەسی پێوەیە، کە کار بە دەستی وڵات چاک بوو، زۆربەی خەڵک چاک دەبێ.

فەرمووی دوو سیفەت و خەسڵەت دڵی ئینسان فاسید دەکەن، زۆر خواردن و زۆر نووستن. هەر وەها دوو سیفەت لە هەر کەسێکدا بن، لە جاهیلی و نەزانی ئەو سەرچاوە دەگرن، پـێکەنینی زۆر، بـێ ئـەوەی شـتێکی عـەجایب بـیبنی و ئامۆژگاری خەڵک بکەی، بەڵام خۆت ئەو کارە نەکەی.

فەرمووی ئەو کەسە پیاوی تەواوە، کە چاکە لە گـەڵ دایک و بـاوکی بکـا و سیلەی ڕەحم بە جێ بێنێ و حورمەتی دۆست و برادەرانی لابێ و خولقی خۆش بێ و دینی بپارێزێ و چاکە و پیاوەتی هەبێ و دەست پیس نـەبێ و ڕەفـاقەتی پیاوی خراپ و تەنبەڵ نەکا و بێ کار دانەنیشێ.

ڕاوی دەڵێ: لە ماوەی چەند ساڵدا، جارێک پێ نەکەنی. بەڵام ئەو ڕۆژەی کە کوڕەکەی وەفاتی کرد زەردە خەنەیەکی کردو، عەرزیان کرد: قوربان، ئەوە چەند ساڵە پێ نەکەنیوی. ئەی بۆ لەم ڕۆژە ناسکەدا پێکەنی؟، لە وەڵامـدا فـەرمووی:

ئاخر زانیم کە خواوەندی گەورە بە مەرگی کوڕەکەم ڕازی بـوو، مـنیش لە بـەر ڕەزای خوا و لە خۆشیان پێکەنیم.

لە ئاخری تەمەنیدا ڕۆژێک مەوعیزەی دەکرد: فەرمووی: قەت حەسوودی بە پێغەمبەرانەوە نابەم، چونکە ئەوانیش وەکوو ئێمە بە ئاشکرا مردوون و غەمی گۆڕ و غەمی ڕۆژی قیامەت و دۆزەخ و غەمی پردی «سیرات»یان لە پێشەو، لە ڕۆژی قیامەتا هەر هاواری نەفسی خۆیان دەکەن. حەسوودی بە مەلائیکەتانیشەوە نابەم، چونکە ئەوان لە ئێمە زیاتر لە خوا دەترسن، بەڵام حەسوودی بەو کەسە دەبەم کە هەر لە دایک نابێ و تووشی تەنگ و چـەڵەمە نـابێ و بـاری ئـەمانەت نـاچێتە سەرشانی.

ڕاوی دەڵێ: کاتێ نەخۆش کەوت و وەفاتی نزیک بوەوە، دوو کچی بوو. بە ژنەکەی گوت: کە من مردم بچۆ سەر کێوی ئەبوو قوبەیس، ئەو کێوەی لە پشتی سەفا و مەڕوەوەیە، (ئێستا لە سـەرەوەی بـۆتە شـار و دەڕوانـێتە مـاڵی کـەعبە) فەرمووی: لەوێ سەر بەرزکەوە بۆ ئاسمان و بڵێ: ئەی خوای گەورە، پیاوەکەم عەرزی دەکردی تا زیندوو بووم ئاگاداری دوو کچەکەم دەکرد، بەڵام ئێستا کە بە ئەمری تۆ لە زیندانی گۆڕدا حەپسکراوم، ئەوا حەواڵەی تۆم کردنەوە، جا کەیفی خۆتە. ڕاوی دەڵێ: بە قودرەتی خوا کاتێ وەفاتی کرد و تەسلیم بە خاکیان کرد و ژنەکەی لە سەر وەسیەتی ئەو چوو، لە سەر کێوی ئەبوو قوبەیس، دەستی کرد بە دۆعا و پاڕانەوە و زۆر گریا و ئەوەی مێردەکەی گوتبووی عەرزی خواوەنـدی گەورەی کرد، لەو کاتەدا ئەمیری وڵاتی یەمەن هاتبوو بۆ عەمرە، بە خۆی و دوو کوڕەوە، گوێی لە گریان و پاڕانەوەکەی بوو، بەزەیی پێدا هاتەوە و پرسیاری کرد: ئەوە بۆ دەگری؟ ئافرەتەکەیان بانک کردو و وەسیەتی مێردەکەی بۆ گێڕایـەوە، ئەمیری یەمەن گوتی غەم مەخۆ، دوو کچەکەی لە دوو کوڕەکەی مارە کرد و بە کەیف و شادی و ئاهەنگ بۆی گواستنەوە.

گوێ گرینە، ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتەکانی

«فوزەیلی کوڕی عەیاز»، ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و لە بەر خواوەندی گەورە دەپارێینەوە، بتان خاتە سەر ڕێبازی ئەو پیاوە چاکانە. خوایە لە بەر خاتری گەورەیی خۆت و پێغەمبەر و پیاو چاکانی ئوممەتی پێغەمبەر، هیدایەتمان بدەی. ئیمان مان بە نەسیب کەی. تاعەتمان قەبووڵ بکەی. لە مردووانمان خۆش بی. زیندووانمان سەلامەت کەی. لە بەڵاو موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین.

وَ صَلىٰ اللهُ عَلَى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّم. وَ السَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٣٠)

## باسی داوودی تایی

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

أَحْمَـــدُ ذَا ٱلجَـلالِ وَ ٱلجَـمالِ وَالطَّوْلِ وَ الْإِكْرَامِ وَ الْإِفْضَالِ
مُصَلِّـياً عَـلىٰ ٱلنَـبِيِّ ٱلهٰـادِي وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ اَلأَمْجَـادِ...[١]

موسوڵمانینە، وەرن با لە چەند دەقیقەی ئەم دانیشتنەماندا، بچینە مەجلیسی باسی شەمعی دانش و بینش، گڵۆپ و چرای ئافەرینش، عاملی ڕێگای تەریقەت، عالمی دەریای حەقیقەت، زانای بەحری شەریعەت، زاهید و عابیدی بارەگای خوایی، جەنابی «شێخ داوودی تایی»

جا، با زۆر بە گوێی دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین. «شێخ داوودی تایی»، یەکێکە لە عەموود و کۆڵەکەی سیلسیلەی دووەمی تەریقە و ڕێبازی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، چونکە تەریقەی خالیدیە سێ ڕشتەی هەیە. ڕشتەی یەکەمیان، کە پێی دەڵێن [سِلْسِلَة الذَّهَبِیه] لە پێغەمبەرەوە (درروودی خوای لە سەر بێ)، بۆ حەزرەتی عەلی و لەوەوە بۆ گەورەی شەهیدان، حەزرەتی حوسەین و لە وێشەوە بۆ ئیمام زین العابدین و لەوەوە بۆ ئیمام باقر و لەوەوە بۆ ئیمام جەعفەری سادق و لەوەوە بۆ

١ - شێخ مەعروف.

ئیمام موسای کازم و لەوەوە بۆ ئیمام ڕەزاو لەوە وە بۆ شێخ مەعرووفی کەرخی تا خوارێ هاتووە. بەڵام ئەو زنجیرە دووەمە، لە پێغەمبەرەوە بۆ حەزرەتی عەلی و لە وەوە بۆ حەسەنی بەسری و لەوەوە بۆ حەبیبی عەجەمی و لەوەوە گەیوەتەوە دەستی ئەم «شێخ داوودی تایی»ەوە لە وێشەوە گەیوەتە دەست شێخ مەعرووفی کەرخی و لەوێوە تێکەڵ دەبنەوە.

«شێخ داوودی تایی»، یەکێک بوو لە گەورە پیاوەکانی ئوممەتی پێغەمبەر لە کاتی خۆیدا. ماوەی بیست ساڵ فەقێ و قوتابی ئیمامی ئەعزەم بوو. فوزەیل کوڕی عەیاز و ئیبراهیمی ئەدهەمی دیبوو، خەرقەی ئیرشادی لە دوای حەبیبی ڕاعی لەبەر کردبوو، حەبیبی ڕاعی پیری تەریقەتی بوو.

ڕۆژێک بۆ دەرس خوێندن دەچۆە خزمەت ئیمام حەنەفی، لە ڕێگادا، لە ماڵێکەوە، گوێی لە دەنگی ئافرەتێک بوو، دەگریا و شێعرێکی دەخوێندەوە، کە مەعناکەی ئاوا بوو: دەیگوت: تۆ خوا خۆشەویستەکەم پێم بڵێ، کامە لاجانگ و ڕومەتت لە گۆڕدا، لەسەر خاک داناوەو هەڵنەوەریوە؟ کامە چاوەجوانەکانت لەسەر زەوی نەکەوتووە. ڕاوی دەڵێ: بە بیستنی مەعنای ئەو شیعرە، موچرکەیەکی لە بەری پێڕا هات لە تەوقی سەری چوە دەرێ، ڕەنگی زۆر گۆڕاو قەراری لێ بڕاو واقی وڕما، بەو حاڵەوە چۆە خزمەت ئیمامی حەنەفی، ئیمامی حەنەفی کە چاوی پێکەوت، ڕەنگی زۆر گۆڕا بوو فەرمووی: کوڕم چیت لێ قەوماوە؟ بۆچی وا ڕەنگت تێک چووە؟ چی ڕووی داوە؟ «داوودی تایی» بە سەرهاتی ڕێگای بۆ گێڕایەوە و گوتی: مامۆستا، بە ڕاستی دڵم لە دنیا سارد بۆتەوە و شتێکم کەوتۆتە خەیاڵەوە، کە لە هیچ کتێبێکدا مەعنای ئەو شتە نایەتە بەر چاوم و نایبینم. ئیمامی حەنەفی فەرمووی: کوڕم، تاماوەیەک لە خەڵک دوور کەوەرە وە، ڕۆژێک ئیمامی حەنەفی تەشریفی چوو بۆ لای و فەرمووی: باشە خۆ من نەمگوت ئاوا تەرکی دنیا بکەو قەت مەیە دەرەوە! فەرمووی: هەستە وەرە ناو ئەو

زانایانە و ئەوەی تا ئێستا نەت بیستووە وەریگرە و تۆش زۆر شتی وایە لەوانی باشتر دەزانی پێیان بڵێ. قسەی مامۆستاکەی وەرگرت و ماوەی ساڵێک هاتەوە ناو حەڵقەی دەرس و لە ناو زاناکاندا مایەوە. بەڵام هیچی نەدەگوت. تەنیا گوێی گرتبوو. لە پاش ساڵێک ڕۆژێک هەستا چوە خزمەت شێخ حەبیبی ڕاعی و تەرکی دەرس و تەدریسی کرد و کتێبەکانی هەموو خستە ناو ئاوەوە و گۆشەنشینی دەست پێکرد.

[سُبْحَانَ ٱللهِ] لە گەورەیی و عەزەمەتی ئەو خوایە، کە ویست و ئارەزووی لە سەر شتێک بوو، لە بەردی ڕەق ئاو پەیدا دەکا. «داوودی تایی» دەکاتە ئەو پیاوە کە دەڵێن: جارێک نانی وشکی دەخوارد، لەو کاتەدا گاورێک بەلای داهات و بانگی کرد و لە نانەکە هێندێکی دایە، گاورە زانی کە ئەوە «داوودی کوڕی تائی»ە. نانەکەی لێ وەرگرت و بە متفەڕک خواردی. ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خواوەندی گەورە کە چوەوەماڵەوە، ئارەزووی بزووت و لە گەڵ خێزانەکەی جەمع بوو، لە پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و چەند دەقیقە کوڕێکیان بوو، بە هۆی ئەم لوقمە حەلاڵەوە ناویان نا مەعرووف، لە ئاخریدا ئەو کوڕە گاورە کە گەورە بوو، بوو بەو شێخ مەعرووفی کەرخی یە.

«شێخ داوودی تایی» وەها تەرکی دنیای کردبوو، تەنانەت دووری لە خەڵکیش دەکرد، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا زۆر لە پیاوە گەورەکان و زاناکان بۆ زۆر پرسیار دەچوونە خزمەتی و پرسیاریان لێ دەکرد و وەڵامی دەدانەوە.

ڕۆژێک عەرزیان کرد: قوربان، ئەوە بۆ لە گەڵ خەڵک دانانیشی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: لە گەڵ کێ دانیشم؟ ئەگەر لە گەڵ لە خۆم بچووکتر، دانیشم، هیچیان لە دینداری لا فێر نابم، ئەگەر لە گەڵ لە خۆشم گەورەتر دانیشم، ئەوە باسی عەیبەکان و چاکەکانم دەکەن و لەوانەیە بە قسەی ئەوان خۆم لێ بگۆڕێ و لە خۆم بایی بم. کەواتە وا چاکە هەر بە تەنیا دانیشم.

«شێخ داوودی تایی» شەو و ڕۆژ خەریکی تاعەت و خوا پەرستی بوو. دەستی لە خوێندن و کار و کاسبی هەڵگرتبوو، تەرکی دنیای کردبوو، ئەگەر بش هاتبایە دەرەوە بەلای خەڵکدا نەدەڕۆیی، لە ڕێگایەکی دوور و چۆڵەوە تێدەپەڕی.

عەرزیان کرد قوربان، ئەوە بۆ کە بچی بۆ سەفەریش هەر بە ڕێگای دوور و چۆڵدا دەڕوێ؟ خۆ ڕێگای نزیک و ئاوەدان هەیە. لە وەلامدا فەرمووی: [فِرْمِنَ النّاسِ فِرارَکَ مِنَ الأسَدِ] چۆن لە بەر شێر ڕادەکەی، دەبێ ئاواش لە بەر خەڵکی ئەم زەمانە ڕابکەی. چونکە خەڵکی ئەم زەمانە مەترسی زیاتر لە شێر لێ دەکرێ و زەرەری زۆر زۆر لە شێر زۆرترە.

جارێک بە جێگایەکدا دەڕوا، لە نکاوێک بەلادا دێو و بێ هـۆش دەکـەوێ. هەڵی دەگرنەوە و دەیبەنەوە بۆ ماڵەوە، لە پاشان کە بە هۆش خۆیی دێتەوە عەرزی دەکەن دەڵێن: قوربان، ئەو حاڵەتە چی بوو، بە سەرتدا هات و لەو جێگایە بێ هۆش کەوتی؟ لە وەلامدا فەرمووی: ئاخر لە کاتی خۆیدا لەو جێگایە جـارێک غەیبەتی پیاوێکم کردبوو، کاتێک گەیشتمە ئەوێ و وەبیرم کـەوتەوە و لە دڵـی خۆمدا گوتم، دەبێ ئەگەر ئەو کابرایە لە ڕۆژی قیامەتا لە حزوری خوادا داوای تۆڵە و سزای غەیبەتەکەم لێ بکاتەوە، خوا چیم لێ بکا و حاڵم چۆن بێ؟

هەروەها ئەبوو ڕەبیعی ئەعرەج دەڵێ: جارێک چوومە خزمەتی لە ماڵەوە بوو، لە دوای نوێژی مەغریب هەستا دوو سێ لەتکە نانی وشکی هێنان خواردمـان، زۆرم تینوو بوو، هەستام بچم ئاو بخۆم، کوپە ئاوێک لە وێ بوو، چـۆرێکم لێ خواردەوە زۆر گەرم بو، عەرزم کرد: قوربان، ئاوەکە زۆر گەرمە، کوپەیەکی تازە دابنێ با ئاوەکە سارد بکا، لە وەلامدا فەرمووی: جا ئەگەر لە دنیادا هەر ئاوی سارد بخۆم و خواردنی خۆش بخۆم و بەرگ و لیباسی جوان و چاک لە بەر کەم، ئەی چی بۆ قیامەت بهێڵم؟، عەرزم کرد: قـوربان، ئـامۆژگاریەکـم بکـە. فـەرمووی: [صَاحِبْ اَهْلَ التَّقویٰ اِنْ صَحِبْتَ، فَاِنَّهُمْ أقَلّ مُوءنَةً وَ اَحْسَـنُ مَـعُونَةً وَ لاٰ تَـدَعُ

اَلْجَمَاعَةَ، حَسْبُکَ هٰذا اِنْ عَمِلْتَ بِهِ] ڕەفاقەتی ئەهلی تەقوا بکە. ئەگەر ڕەفاقەتی خەڵک دەکەی، چونکە ئەوان باری ڕەفاقەتیان سووکترە و زەحمەتیان بۆ هاوڕێ و ڕەفیق کەمترە و یارمەتیان زۆرترە. فەرمووی: قەت تەرکی جەماعەت مەکە. ئەگەر عەمەل بەو ئامۆژگاریە بکەی، بۆ دنیا و قیامەت لێت زیادە.

فەرمووی: دەخیلتان بم، ئاگاتان لە خۆتان بێ زمانتان بەستن. ئەگەر هەر قسەش دەکەن، قسەی باشی پێ بکەن و بە خراپی مەگێڕن. بە ئەندازەی مانەوەتان لە دنیادا بۆ دنیا هەوڵ بدەن و بە ئەندازەی مانەوەشتان لە قیامەتا بۆ دوا ڕۆژ هەوڵ بدەن. چونکە شەو و ڕۆژی عومر و تەمەن وەکو مەنزڵی سەفەرێکی دوورن، تا زۆرتر بڕۆن و ڕێگا ببڕن و تێ پەڕن، لە مەقسەد نزیکتر دەبنەوە و تەمەن کۆتایی دێ. تەنانەت هیچ نەبێ زەخیرە و تۆ شووی چەند مەنزڵ، لە گەڵ خۆتان، یا لە پێش خۆتاندا، بەڕێ بکەن.

دەیفەرموو: لە گەڵ سەلامەتیدا، بەکەم لە دنیادا ڕازی بن. هەروەک ئەهلی دنیا و دنیا پەرست، لە گەڵ فەسادی دینیان بە دنیا ڕازین. ئەوە بۆ ئەو هەموو دەرد و بەڵا و موسیبەتە، بە سەر خۆتان و خەڵکا دێن و دەبینن، کە چی عیبرت وەرناگرن!

«داوودی تایی» ئەو پیاوە بوو، شەرمی لە کەس نەدەکرد، لە خوا نەبێ، لەکەس نەدەترسا، هەمیشە نانی خوساوی بە ئاوە وە، دەخوارد و ئاوی کەرمی دەخواردەوە و لە سەر زەوی دەنووست و خشتێکی لە بن سەری دانابو و سەری ئەخستە سەر، هیچی لە کەس وەرنەدەگرت، هێندێک پارە و خانووێکی گەورەیی بە میرات بۆ هاتبوەوە، گوزەرانی پێوە دەکردن.

ڕۆژێک هارونەڕەشید، کە خەلیفەی بەغدا بوو، بە قازی ئەبوو یوسفی گوت: لە گەڵی بچێ بۆ لای «داوودی تایی»، هەستان چوون بۆ بەر دەرگای ماڵەکەی و لە دەرگایاندا، دەرگای لێ نەکردنەوە، چوون بە دایکیان گوت: دایکی هات تکای بۆ کردن هەر نەی کردەوە و گوتی: دایە من هیچ کارێکم بە زاڵم و ئەهلی دنیا نیە.

دایکی گوتی: له بەر خاتری ئەو شیره که له مەمکی منت خواردووه، ڕێگایان بده با بێن. ڕووی کرده ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەوره، خۆت فەرمووته موراعاتی دڵی دایک و باوک بکەن، چونکه ڕەزای من به ڕەزا بوونی دڵی دایک و باوکه، دەنا من هیچ کارم به وانه نیه!

فەرمووی: وەرنه ژوورەوه، چوون سەلامیان کرد و دانیشتن. له پاش ماوەیەک له کاتی خوا حافیزیدا، هارونەڕەشید کیسەیەک پارەی دانا، قبوڵی نەکرد و فەرمووی: هێندێک پاره و خانووێکم به میرات به دەست کەوتووه، له خوام داوا کردووه که ئەوان تەواو بوون، زوو گیانم بستێنێ، تا چاو له دەستی خەڵک نەبم. فەرمووی ئۆمێدیشم وایه، که خوای گەوره دۆعاکەم گیرا بکا. له پاشان قازی یوسف له وەکیلی شێخی پرسی ڕۆژێ چەند خەرج دەکا؟ گوتی: ڕۆژی دانگی دینارێک. پرسی چەند ماوه؟ گوتی ده دینار.

دووباره دەڵێن: محمد و قازی یوسف، له مەسئەلەیەکدا کێشەیان بوو، هەستان چوونه لای «داوودی تایی» و کردیان به حەکەم. کاتێ دەستیان کرد به قسه کردن، زۆری ڕوو نەدەکرده ئەبوو یوسف، که قسەشیان دەکرد، ئەگەر قسەکەی محمد ڕاست بوایه دەیگوت: قسەی محمده ڕاست دەکا. بەڵام که قازی یوسف قسەی دەکرد و ڕاست دەبوو ناوی نەدەبرد و دەیگوت قسەی ئەوه.

عەرزیان کرد: قوربان، خۆ محمد و قازی یوسف، هەردووکیان زۆر عالم و زانان، ئەی بۆ چی ڕوو دەکەیه محمد و گوێ نادەیه قازی یوسف؟! له وەڵامدا فەرمووی: ئاخر له بەر ئەوەی که محمدی کوڕی حەسەن، له سەر ناز و نیعمەت ڕا هاتووه، خوێندویەتی به هۆی زانیاری یەوه، له خۆی بایی نەبووه. بەڵام ئەبوو یوسف له دەست کورتی و فەقیری‌یەوه دەستی پێ کردووه، به خوێندن و به عیلم و زانیاری، ڕوتبەو مەقامی دنیای دەست کەوتووه و به عیلمەکەی دەنازێ. کەواته محمد و ئەبوو یوسف فەرقیان زۆره.

فەرمووی ئەبوو حەنیفە، کە مامۆستای هەر دووکیان بوو، دارکاریان کرد، قەزاوەتی قبووڵ نەکرد. بەڵام ئەبوو یوسف زۆر تامەزرۆی قەزاوەت بوو، زوو قبووڵی کرد، فەرمووی: جا هەر شاگرد و قوتابیەک، ڕێگای مامۆستاکەی خۆی ڕەچاو نەکا، من قسەی لەگەڵ ناکەم.

فوزەیل کوڕی «عەیاز دەفەرموێ: من فەخر بەوە دەکەم، کە لە ژیانمدا، دوو جار بە خزمەت داوودی تایی» گەیشتووم. فەرمووی: جارێک چوومە خزمەتی لە هەیوانە ڕوخاوێکدا دانیشتبوو، گوتم: قوربان هەستە با بە سەرتدا نەڕووخێ. فەرمووی: ئەگەر باوەڕ دەکەی تا ئێستا تەماشام نەکردووە تا بزانم دەڕووخێ یان نا. فەرمووی: جاری دووەم، عەرزم کرد قوربان، ئامۆژگاری یەکم بکە، فەرمووی: تابۆت دەکرێ، دووری لە خەڵک بکە. چونکە خەڵکی ئەم زەمانەش تا لێیان دوورتر بی ئاسوودەتری.

شێخ مەعروفی کەرخی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموویەتی: هیچ کەس وەک «داوودی تایی»، دنیای لە لا بێ نرخ نەبوو، تەواوی دنیا و ما فِیهای لە لا وەک چنگە کایەک بوو، بەڵام فەقیر و دەروێش زۆر خۆش دەویستن.

شێخ جونەیدی بەغدادی دەفەرموێ: ڕۆژێک کابرایەکی بانگ کرد، کە لە شاخی لێ گرت و دینارێکی دایە، عەرزیان کرد، قوربان، ئەوە ئیسراف نەبوو، ئەو دینارەت دا بەو کەڵە شاخ گرە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: [لا دینَ لِمَنْ لا مُرُوةَ لَـهُ] ئەوەی پیاوەتی نەبێ دینی تەواو نیە.

هەروەها دەڵێن: شەوێکی مانگە شەو چوە سەریان و ئەوەندەی تەماشای ئاسمان کردوبیری کردەوە و گریا، تا بێهۆش کەوت و بەر بووە سەر بانی دراوسێ کەیان، کابرای دراوسێ لە خەو ڕاپەری و وای زانی دزە، بازی دایە سەر بانەکەیان، بە پەلە هات تەماشای کرد ئەوە «شێخ داوودی تاییە»، دەستی گرت و بردیەوە و عەرزی کرد: قوربان، ئەوە چی بوو؟ فەرمووی: نازانم ئاگام لە خۆم

نەبوو، چۆن کەوتوومە خواریّ؟

دەڵێن: کە دەچوو بۆ مزگەوت، زۆر بە توندی ڕای دەکرد. ڕۆژێک عەرزیان کرد: قوربان، بۆ کە دەچی بۆ مزگەوت ئاوا بـە تـوندی ڕادەکـەی؟ لە وەڵامـدا فەرمووی: ئاخر لەشکرێک، لە دەرەوەی شار چاوەڕوانی من دەکا، عەرزیان کرد: قوربان کام لەشکرە؟! فەرمووی لەشکری مردووەکانی گۆڕستان، مەبادا بە دوامدا بنێرن و فریای نوێژەکەم نەکەوم.

یەکێک لە پیاو چاکان دەفەرمویّ: «داوودی تایی» پیاوێکی ئەوەندە گەورە و عەجایب بوو، ئەگەر لە زەمانی پێغەمبەرەکانی پێشوودا بوایە، خواوەندی گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، باسی ژیان و گەورەیی و بە سەرهاتی ئەوی بۆ دەگێڕاینەوە.

ڕۆژێک عەرزی دەکەن و دەڵێن: قوربان، تۆ لە دنیادا زۆر بەکەم ڕازیـی. لە وەڵامدا فەرموی. پێتان بڵێم، کێ لە من بەکـەمتر ڕازیـە؟ عـەرزیان کـرد: بـەڵێ، بفەرموو. فەرمووی: ئەوەی دنیای بە تەواوی لە باوەش گرتووە، قیامەتی بە دنیا فرۆشتووە، ئەوە بە کەمتر ڕازیە لە من.

ڕۆژێک قازی ئەبوو یوسف لە میحرابی مزگەوتا، پاڵی دابـووە و پـارەکـەی «داوودی تایی» کەوتەوە یاد، کە حیسابی کرد، لە پارەکەی هەر بەشی ئەو ڕۆژەی مابوو، گوتی کوڕینە، ئیمڕۆ «داوودی تایی» وەفات دەکا، گوتیان قوربان بە چیا دەزانی؟ فەرمووی: ئاخر لە پارەی نەفەقەکـەی هـەر بـەشی ئـەم ڕۆژی مـاوە و دەشزانم خواوەندی گەورە دۆعای قبوڵ دەکـا، چـونکە ئـەو ڕۆژە کـە لە گـەڵ هارونەڕەشیددا چوینە لای، دۆعای کرد و گوتی: خوایە، هەر ڕۆژێک ئەو پارەیە تەواو بوو، گیانم بکێشە با موحتاجی دەستی کەسێک نەبم. کاتێ چوون لە دایکیان پرسی گوتیان: ئەم ڕۆ حاڵی چۆنە؟ گوتی: تا نزیک بەیانی هەر نوێژی دەکـرد، بەڵام لە لای بەیانیدا سەری لە سوجدە کردو سەری بەرز نەکردەوە، کاتی نوێژی بەیانی چووم، گوتم: ئەی کوڕی خـۆشەویستم، سـەر هـەڵبڕە لە سـوجدە، کـە

تەماشام کرد وەفاتی کردووە.

هەر لەو شەوەشدا یەکێک لە پیاوە گەورەکان، لە خەویدا بینی «داوودی تایی» بە هەوادا دەفڕێ و دەڵێ: ئۆخەی ئەم ساعەتە لە بەندیخانە ڕزگار بووم. بەیانی زوو هەستا چوو خەونەکەی بۆ وەگێڕێ، کە تەماشای کرد وەفاتی کردووە و خەریکی کفن و دفنێ.

هێندێک دەڵێن: ساڵی سەد و شەست و دوو بوو، کە هەر لەو ساڵەدا ئیبراهیمی ئەدهەم وەفاتی کردبوو، بەعزێکی‌تر دەڵێن: ساڵی سەد و شەست و پێنج و شەست و شەش بوو، یەکێک لە زانایان دەڵێ: ڕۆژی وەفاتی «داوودی تاییم» وەک ڕۆژی حەشر هاتە بەرچاو، چونکە تەواوی خەڵکی شار بە ژن و پیاو، پیر و لاوەوە بە دوای جەنازەکەیەوە بوون، بۆ سەر قەبران، تا گەیشتنە ناو گۆڕستان سێ تابووتیان شکاند، لە بەر زۆری خەڵکی شاری بەغدا، کە خۆیان دەخستە ژێر تابووتەکەوە و هەمووکەس دەیویست شانی وە بەر داو خێرێکی بگاتێ.

کاتێ تەسلیم بە خاکیان کرد، لە دوای تەڵقینی ئیبنو سەمماک چوو لە لای گۆڕەکەی ڕاوەستا و لە بارەی زوهد و تەقوا و تاعەت و عیبادەت و خواپەرستی «داوودی تائی»وە دەستی کرد بە قسە و فەرمووی: خەڵکینە، «داوودی تایی» زۆر شتی بە پێچەوانەی خەڵک بوو، تاقانەی ڕۆژگار بوو، ئەهلی دنیا بۆ ژیانی خۆش و ماڵی دنیا زۆر پەلە دەکەن، نازانن کە حیسابی دوا ڕۆژ زۆر سەخت دەبێ، ئارەزووی دنیا و دنیا پەرستی ئینسان لە دنیا و قیامەتا ماندوو دەکا، بەڵام تەرکی دنیا و قناعەت و ڕازی بوون بە کەم و خۆ ماندوو نەکردن بە دنیاوە، ئینسان لە دنیا و قیامەتا ئاسوودە دەکا.

«داوودی تایی» وەک خەڵک نەبوو. ئەوەی خەڵک دڵی پێ خۆش بوو، ئەو لای بێ نرخ بوو، بە چاوی دڵ لە دنیای دەڕوانی، چاوی دڵی چاوی تەماعی کوێر کردبوو، ئەوەی ئەو دەی دی و دەی زانی، بە خەیاڵی خەڵکدا نەدەهات، لە لایەک

خەڵک ئەویان لا عەجایب بوو کە ئاوا دەژیا، لە لایەکی ترەوە ئەو هەموو کەسی پێ عەجایب بوو کە ئاوا ڕویان کردوتە دنیا و بۆ دوا ڕۆژ هەوڵ نادەن. «داوودی تایی» تاقە ئینسانێک بوو زیندوو لە ناو ئەو هەموو خەڵکە دڵ مردووەدا دەژیا.

ئینجا ڕووی کردە گۆڕەکەو گوتی: ئەی ڕۆحی شادیِ «داوودی تایی»، تۆ زۆر عەجایب بووی، لە دنیادا زۆر بێ دەنگ بووی، هەتکی نەفسی خۆت زۆر دەکرد، بەڵام بەو خوو و ڕەوشتەو بە ئیهانەی نەفست، کەرامەتت دەست کەوت، بە زەلیل کردنی نەفست، عیزەتت پەیدا کرد، بە خۆ بە کەم گرتن، خۆشەویست بووی، خۆت ماندوو کرد، بە عیبادەتەوە، تا لە قیامەتا ئاسوودە بی. بە برسی‌یەتی، لە دنیادا، خۆت لە قیامەتا، تێر کرد، خۆت تێنوو کرد، تا ئاوی کەوسەر بخۆی، لیباسی دڕاو و خراپت لە بەر دەکرد، تا ئەتڵەس و حەریری بەهەشت لە بەر کەی، خواردنی کەم و تەعامی بێ تامت دەخوارد، تا تەعامی بەلەززەتی بەهەشت بخۆی.

ئیبنوو سەمماک ڕووی کردە خەڵک و گوتی: خەڵکینە، ئێوە زۆر بەتان دەزانن کە «داوودی تایی» ئاوا ژیا، تا لە دوا ڕۆژدا، ئاوا بە سەربەستی بچێتە بارەگای خوا، بەو هەموو عیلم و عیرفانەوە ئاوا ژیا، تا ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، دەرسی لێ وەرگرین. ئنجا ئیبنوو سەمماک بە گریانەوە ڕووی کردە گۆڕی «داوودی تای» و گوتی: ئەی ڕۆحانیەتی «داوودی تایی»، ئەگەر ئێستا بە چاوی سەر، چاوت لەو خەڵکە دەبوو، کە چۆن تەرم و جەنازەکەت لە سەر دەستان هەڵ دەگرن و تاگەیونە ناو گۆڕستان، سێ دارە مەیتیان لە بندا شکاندوی، لە بەر زۆری خەڵک کە دەیان ویست بە شان هەڵت گرن، شوکرانەی خوات زیاتر دەکرد، گوتی: ئەی «داوودی تایی»، دیارە کە ئەمڕۆ، تەواوی پاداشتی کردوەکانت، بە تەواوی لە لایەن بارەگای خواوە پێ دەگا و خواوەندی گەورە لێت خۆش دەبێ. خۆزگەمان بە خۆت.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و زوهد و تەقوا و تاعەت و قەناعەتی «داوودی تایی»، ئومێد دەکەم کە خواوەندی گەورە، بە گەورەیی خۆی لە بەر خاتری ئەو پیاو چاکانە عەفوومان بکا. لێمان خۆش بێ. تاعەت و عیبادەتمان قبوڵ کا. لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بمان پارێزێ و لە ژێر بەیداغی پێغەمبەر، لە ڕۆژی مەحشەرا لە گەڵ ئەو پیاوە چاکانەدا حەشرمان بکا. ئامین.

وَ صَلىٰ اللهُ عَلَى سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّم. وَ السَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٣١)

## باسی ئەبوو سولەیمانی دارایی

﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ﴾

أَحْمَدُكَ اَللّٰهُمَّ وٰاسِعَ النَّدىٰ مُصَلِّياً عَلىٰ النَّبِيِّ اَحْمَدا

وَ آلِهِ ذَوِي اَلصَّفاءِ وَ الْوَفا وَ اَهْلِ بَيْتِهِ الْكِرامِ الشَّرَفا

وَ صَحْبِهِ الْبَرَرَةِ الْأَمْجادِ وَ نٰاهِجِي مَسالِكِ الرَّشادِ[1]

ئەی برای گوێ گری موسوڵمان، وەرە با بۆ فەرەحی، دڵ و ئاسوودەیی گیان، لەم چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینە مەجلیس و کۆڕی باس و ژیان و بەسەرهات و ئامۆژگاریەکانی ئەو کەسەی، کە لە دەورانی خۆیدا، مەجەڕڕەدی زاهیر و باتین بوو، موسافیری حازر و غایب بوو، خاوەن مەعریفەت بوو، دەریای شەریعەت و حەقیقەت بوو، ئەستێرەی ئاسمانی ویلایەت بوو، ڕۆژی ڕووناکی وڵاتی شام بوو، چرای زانیاری بۆ خاس و عام بوو، تاقە سواری مەیدان بوو، لە قودەمای مەشایخ بوو، لە عولەمای حەقایق بوو، ئەو ڕێحانەی بۆن خۆشی موسڵمانیە، جەنابی «شێخ ئەبوو سولەیمانی دارایی»یە. جا زۆر بە ئەدەب گوێ بگرن بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

---

١ - شێخ مەعرووف.

شێخ ئەبوو عبدالرحمنی سوللەمی (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە کتێبی «طَبَقٰاتُ الْصُّوفِيه»دا دەفەرموێ: «شێخ عبدالرحمن ئەبوو سولەیمانی دارایی» لە تەبەقەی یەکەمی ئەولیای ئوممەتی پێغەمبەرە.

دەڵێن لە ناو پیاو چاکان و ئەولیادا، هیچکەس وەک ئەو نەی توانیوە لە سەر برسی‌یەتی سەبر بگرێ و بۆ تێنوێتی خۆی ڕاگرێ.

«ئەبوو سولەیمانی دارایی» یەکێک بوو لە پیاوە گەورەکانی ئوممەتی پێغەمبەر (دروودی خوایان لە سەر بێ). «شێخ عبدالرحمن ئەبوو سولەیمانی دارایی» ئاگاداری خەیاڵ و خەتەرەی دڵان بوو، ئەوەندە خاوەن فەراسەت و عیرفان بوو، ئاگای لە ئافات و عەیبی نەفسی ئینسان بوو، لە ئامۆژگاری کردندا کەلیمات و ئیشاراتی زۆر جوانی دەفەرموون، دڵی هەموو خاوەن دڵێکی ڕووناک دەکردەوە.

دەڵێن جارێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد فەرمووی: خەڵکینە، تاعەت و عیبادەت بکەن، خێر و خێرات بکەن، خو و ڕەوشتتان خۆش و باش بێ، ڕوو بکەنە پیاوەتی و پیاو چاکان. فەرمووی:

[ذَهَبَ الْمُطِيعُونَ لِلّٰهِ بِلَذِيذِ الْعَيْشِ فِي الْدُّنيا وَ الآخِرَةِ، يَقُولُ اللّٰهُ تَعالىٰ لَهُمْ يَومَ الْقِيامَةِ رَضيتُمْ بِي بَدَلاً دُونَ خَلْقِ وَ آثَرْتُمُونى عَلىٰ شَهَواتِكُمْ فِي الدُّنيا، فَعندي الْيَومَ فَبٰاشِرُوها، فَلَكُمُ الْيَومَ عِنْدي تَحِيّاتي وَكَرٰامَتي، فَبي فَاْفْرَحُوا وَ بِقُرْبي فَتَنَعَّمُوا فَوعِزَّتي وَ جَلالي مٰا خَلَقْتُ الجَنّاتِ اِلاّ مِنْ اَجْلِكُمْ]

ئەوانەی کە لە دنیادا پیاوی چاک بوون و بێ ئەمری خوایان نەکردو ئیتاعەتیان کرد، ئەوە ئەو کەسانە، لە دنیا و قیامەتا زۆر بە لەززەت ژیان و خواوەندی گەورەش، لە ڕۆژی قیامەتا دەفەرموێ: لە بەر ئەوەی ئێوە لە دنیادا بە من ڕازی بوون و بە قسەی خەڵکتان نەکرد و لە بەر ڕەزا بوونی من تەرکی ئارەزوو شەهوەتی دنیاتان کرد، ئەوا ئیمڕۆ خۆشی دنیا و قیامەت بۆ ئێوەیە و ئیمڕۆ ئێوە، لە لای من زۆر خاوەن کەرامەتن و سەلامتان لێ دەکەم، کەواتە حەقی خۆتانە، کە

بە من کەیفخۆش بن و لە نزیک بوونەوە لە من لەززەت وەرگرن. فەرمووی: بە عیززەت و جەلالی خۆم قەسەم، لە بەر خاتری ئێوە نەبوایە بەهەشتم خەڵق نەدەکرد، تەنیا لە بەر خاتری ئێوەم خەڵق کردووە.

شێخ زە نونەی میسری (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: «ئەبوو سولەیمانی دارایی» ئەوەندە خۆشەویست بوو لە لای خوا، نازی بە سەر خوادا دەکرد. فەرمووی: جارێک گوێیان لێ بوو لە بەر خوا دەپاڕایەوە دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە، ئەگەر داوای نیەتی دڵ و نەهێنیم لێ بکەی و بفەرمووی: بۆچی نیەتت زۆر خالیس نەبوو؟ لە وەڵامدا دەڵێم: ئەوەندە بەسە کە تۆم بە تاک و تەنیا زانیوە. وە ئەگەر بفەرمووی: ئەو گوناهانە چین کردووتن؟ لە وەڵامدا عەرزت دەکەم و دەڵێم: گوناحەکانی من لە بەرانبەر کەرەمی تۆدا، زۆر کەمن و هیچ نین. ئەی خوای گەورە، ئەگەر بە جەهەندەمیم لە قەڵەم دەدەیت و دەم خەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە لە لای دۆزەخیەکان دەڵێم: تەماشا کەن خەڵکینە، لە لای خۆی ئەمن خوای گەورەم زۆر خۆش دەویست، کەچی ئاوای پاداش دامەوە!.

فەرمووی قەسەم بە خوا، ئەگەر هەموو عالەم لە خودایەتی خوادا بکەوێتە شکەوە، من بە تەنیا هەر دەی پەرستم وهیچ شکم لە خوایەتی خوادا نیە، فەرمووی: ئیمانتان بە خوا بێ، چونکە زانایان فەرموویانە: [مَنْ وَثِقَ باللهِ فی رِزْقِهِ زَادَ فِي حُسْنِ خُلُقِهِ، وَ اَعْقَبَهُ الحِلْمَ، وَ سَخَتْ نَفْسُهُ فی نَفَقَتِهِ، وَ قَلَّتْ وَساوِسُهُ فِي صَلاٰتِهِ]

هەر کەسێک لای وابێ کە بە ڕاستی خوای گەورە ڕازقە، ئەوە خوڵق و خوی زیاتر خۆش دەبێ و لە سەر خۆتر دەبێ و سەخاوەت زۆرتر دەنوێنێ و لە نوێژدا خەیاڵ و خەتەرە و وەسوەسەی نامێنێ.

فەرمووی: دڵتان زۆر بە دنیا ئاوەدان مەکەنەوە، چونکە خەیاڵ و خەتەرە و بیر کردنەوەی زۆر وەکوو دز وان، نابینی دز و جەردە، قەت ڕوو ناکەنە کەلاوە

کۆنێک، چونکە هیچی تێدا شک نابەن. بەڵام کە زانیان خانوێک ئاوەدانە و شتی زۆری تێدایە با قفڵیش درابێ، هەر خۆیانی دەگەیەننێ و قفڵەکەی دەشکێنن و تالآنی دەکەن و خاوەنەکەی بە سەر هەواری خاڵیدا دەچێتەوە.

فەرمووی: لۆمەی خەڵکی ئەم زەمانە مەکەن و ڕەخنەیان لێ مەگرن، چونکە خەڵکی ئەم دەور و زەمانە، ئەگەر ڕەخنەیان لێ گرتن، یان ئامۆژگاریت کردن، وە نەبێ بە قسەت بکەن و دەست لە خراپە هەڵگرن، بەڵکوو تووڕە دەبن و زۆر لە جاران خراپتر دەکەن و لە جیاتی ئەوەی کە لێت مەمنوون بن، هەزار و یەک عەیبت لێ دەبیننەوە، جا کەواتە هەر لێیان گەڕێی باشترە. بەڕاستی خەڵکینە، دەڵێی «شێخ عبدالرحمن ئەبوو سولەیمانی دارایی» لە چەرخ و زەمانی ئێستای ئێمەدا ژیاوە، چونکە خەڵکی ئێستا بە زۆری کە ئامۆژگاری دەکەی ڕقی پێ هەڵدەستێ و وەڵامت ناداتەوە و بە قسەت ناکا.

یەکێک عەرزی کرد قوربان، وەسوەسەم زۆرە، چی بکەم تا لە کۆڵمەوە بێ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: هەر کاتێ خەیاڵ و خەتەرە و وەسوەسەت پەیدا بوو، خۆت کەیف خۆش کە، وەسوەسەکەت نامێنێ، چونکە وەسوەسە لە شەیتانەوەیە و کە ئینسان کەیف خۆش بوو ئەو، ناڕاحەت دەبێ و لێت دوور دەکەوێتەوە و وەسوەسەکەت نامێنێ.

جارێکی تر لە مەوعیزەیەکدا فەرمووی: [مَنْ اَحْسَنَ فِي نَهٰارِهِ كُوفِيءَ في لَيْلِه، وَ مَنْ اَحْسَنَ فِي لِيلِهِ كوُفِيءَ فِي نهارِهِ. وَ مَنْ صَدَق فِي تَرْكِ شَهَوَةٍ ذَهَبَ اللهُ بِهٰا مِنْ قَلْبِهِ وَ اللهُ اكْرَمُ مِنْ اَنْ يُعذِّبَ قَلْباً بِشهوةٍ تُرِكَتْ لَهُ]

هەر کەسێک بە ڕۆژ چاکەیەک بکا، خواوەندی گەورە لە شەوەکەیدا پاداشتی دەداتەوە و ئەوەی بە شەویش چاکە بکا، لە ڕۆژدا پاداشتی دەدرێتەوە. وە ئەوەی بەڕاستی تەرکی شەهوەت و ئارەزووی نەفس بکا، خوای گەورە ئەو شەهوەت و ئارەزووەی لە دڵ دەباتەدەرەوە و خوا لەوە گەورەترە کە دڵێک لە بەرخاتری

ڕەزامەندی ئەو تەرکی ئارەزووی نەفسی کردبێ، عەزابی بدا.

فەرمووی: ئەی ئەو کەسانەی خۆتان بە پیاوی باش لە قەڵەم ئەدەن و ئامۆژگاری خەڵک دەکەن و بە خەڵک دەڵێن تەرکی دنیا بکەن و پوول و پارەتان نەوێ. ئەوان چۆن بە قسەتان دەکەن، کە چاویان لە ئێوە بێ، شەو و ڕۆژ هەوڵی بۆ بدەن؟! ئەگەر ئەوان فڕێی دەن، ئێوە هەڵی دەگرنەوە.

فەرمووی: هەر وەکوو لوقمانی حەکیم، ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد و گوتی: ڕۆڵە، ئەوەندە مەچۆ ناو دنیاوە، کە زەرەر بە دوا ڕۆژت بگەیێنێ و بە تەواویش تەرکی دنیا مەکە با نەبیە بار بە سەر شانی خەڵکەوە.

فەرمووی: خۆ خوا پەرستی و عیبادەتی ڕاستەقینە، ئەوە نیە کە تۆ هەمیشە لە سەفی جەماعەتا بی و لە نوێژ قاچت جووت بکەیت و یەکێ‌تر نانت بداتێ، بەڵکوو دەبێ لە پێش هەموو شتێکدا، دوو نان پەیدا بکەیت، ئنجا بچی دوو ڕەکات نوێژ بکەیت.

فەرمووی: ئەو دڵە خاوەن بەرەکەتە خێری تێدایە، کە ئاوا بژی، نەک چاوەڕوانی ئەوەبێ، یەکێک لە دەرگا بدا و شتێکی بۆ بێنێ.

فەرمووی: دەبێ ئومێدت هەر بە خوا بێ. نەک وەک کابرا کە بە ئاوی زەمزەم دەژیا و ئومێدی هەر بەو بوو. فەرمووی: لە شاری مەککەدا موریدێکم دی ئاوی زەمزەم نەبوایە هیچی نەدەخوارد. ڕۆژێک پێم گوت: باشە ئەگەر ئاوی زەمزەم وشک بوو چ دەخۆیەوە؟ هەستایە سەر پێ و گوتی: یا ڕەببی خوا جەزای بە خێرت بداتەوە، بە خوا ڕاست دەکەی، ئەوە چەند ساڵە من زەمزەم پەرستم، ئێستا لە خوا پەرستی حاڵی بووم، تا ئێستا بە هەڵەدا چووم بووم.

ئەحمەدی حەواری، کە موریدی بوو دەفەرموێ: جارێک لە خزمەتیدا چووین بۆ حەج، کاتێ ئیحرامماں بەست، خەڵکەکە دەستی کرد بە گوتنی [لَبَّیْکَ اللّٰهُمَّ لَبَّیْکَ]، کەچی ئەو هیچی نەگوت. عەرزم کرد: قوربان، ئەوە بۆ زیاد لە

هەموو ئەو حاجیانە، تۆ تەرکی ئەو سونەتەت کرد؟ لە وەڵامدا گریا و فەرمووی: ئەی ئەحمەدی حەواری، ڕۆژێک خوای گەورە وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی مووسا و فەرمووی: یا مووسا، بە زاڵمانی ئەممەتەکەت بڵێ، بایادی من نەکەنەوە، چونکە ئەوەی یادی من بکاتەوە، لە کاتێکدا دەست لە زوڵم هەڵناگرێ، من لەعنەتی لێ دەکەم. فەرمووی: بیستوومە: کە هەر کەسێک بە ماڵی حەرام و شوبهەدار حەج بکا و لە پاش ئیحرام بەستن بڵێ: [لَبَّیْکَ اللّٰهُمَّ لَبَّیْکَ] خواوەندی گەورە لە وەڵامیدا دەفەرموێ: [لاٰ لَبَّیْک وَ لاَ سَعْدَیْکَ حَتّیٰ تَرُدَّ مٰا فِي یَدَیْکَ] ئەی حاجی کە بە ماڵی حەرام هاتووی بۆ حەج، نە بۆ لای من هاتوی و نە بە خێر بێیت، تا ئەوەی بە دەستتەوەیە لە ماڵی خەڵک نەی دەیتەوە. فەرمووی: جا لەوە دەترسم بڵێم و ئاوا وەڵامم بدەنەوە. فەرمووی:بەڵێ لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی گوتووە: لە خوا بترسە، بەڵام قەت لە ڕەحم و کەرەمیشی نائومێد مەبە. فەرمووی [لَیْسَ یَنْبَغي لِمَنْ اُلْهِمَ شَیْأً مِنَ الْخَیْرِ اَنْ یَعْمَلَ بِهِ حَتّیٰ یَسمَعُهُ فِي الأَثرِ، فَإذا سَمِعَهُ فِي الأَثرِ عَمَلَ بِهِ، وَ حَمِدَ اللهَ عَزَّ وَ جَّلَّ عَلیٰ مٰا واُفَقَ مٰا فِي قَلْبِهِ]

واتە نابێ هەر کەسێک بە بیر و باوەڕ و ئارەزووی نەفسی خۆی شتێکی پێ باش بوو، گورج بیکا، تا نەزانێ کە وێنەی لە حەدیس و شەریعەتا هاتووە، جا کاتێ زانی وێنەی هەیە، ئەو کاتە بیکا و حەمد و سەنای خوای گەورەی لە سەر بکا، لە شوکرانەی ئەوەی، کە ئەوەی، لە دڵی ئەودا هاتووە، موتابیقی فەرموودەی پێغەمبەر و شەریعەتی ئیسلامە.

دەیفەرموو: ئاگاتان لە خۆتان بێ، زۆر خواردن مەکەن بە عادەت و زۆر مەخۆن، چونکە ئینسانی زۆر خۆر تووشی شەش جۆرە نەگبەتی دەبێ: یەکەم، ئەوەیە ئینسانی زۆر خۆر، لەززەت لە عیبادەت وەرناگرێ. دووەم، ئینسانی زۆر خۆر، شتی زوو لە بیر دەچێتەوە. سێیەم، بەزەیی بە خەڵکدا نایەتەوە و کەم ڕەحم دەبێ چوارەم، عیبادەت و خوا پەرستی زۆر بە لاوە گران دەبێ. پێنجەم، زۆر

خــۆر، شــەهوەت و ئـارەزووی نـەفسی زۆر دەبـێ. شـەشەم، لە کـاتێکدا کـە موسوڵمانان دەیان هەوێ بچنە مزگەوت، ئەو لە شوێنێکی تر دەگەڕێ.

فەرمووی: کەم خواردن و قەناعەت، خەزنەیەکە خواوەندی گەورە، ئەیدا بە دۆستانی خۆی. دیانەت و تەقوای ئەو زاتە بەرزە ئەوەندە بێ وێنە بوو مەگەر هەر خوا بزانێ، ئەگەر یەکێک باسی گوناهی لا بکردایە، دەستی دەکرد بە گـریان و دەیفەرموو: بە خوا ئەوەندەمان ناتەواوی و ئافەت لە تاعەتا هەیە، پێویست بـە گوناه ناکا بیکەین.

ڕۆژێک مەوعیزەی بۆ خەڵک دەکـرد. فـەرمووی: خـەڵکینە، دڵـی ئـینسانی موسوڵمان، بە یاد و زکری خوا ڕووناک دەبێتەوە، زکری خوا قووەتی دڵێ خاوەن ئیمانە، ئولفەت بە زکر و یادی خوا، ڕاحەتی دڵە و مزگەوت دووکانی ئـینسانی موسوڵمانە، کەسابەتەکەی عیبادەتە و دەس مایەکەی قورئانە و دنیا مەزرەعەی قیامەتیەتی و قیامەتیش سەر خەرمانیەتی و پاداشی خواوەندی گەورەش، سوود و سەمەرەی ڕەنج و کار و کۆششیەتی.

فەرمووی: خەڵکینە، هەر کەسێک لە ڕۆژی جومعەدا، لە پێش ئەوەیدا بڕوا بۆ جومعە، لە بارەگای خوادا، داوای لێ خۆش بوون بکا و دوو قەترە فرمێسکی لە چاوان بێتە خوارێ. خوای تەعالا وەحی دەکا بۆ مەلائیکەی سەر شانی چەپی ئەو موسوڵمانە و دەفەرموێ: ئەی مەلائیکەی شانی چەپی، سەحیفەی ئەعمالی ئەو بەندەیە وە پێچەو تا ئەو کاتەی جومعەی داهاتوو، هیچی لە سـەر مـەنووسەو. فەرمووی: جا چی لەو موژدەیە گەورەتر و خۆشترە!

فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا خواوەندی گەورە، تەواوی خەڵک لە مـەیدانـی مەحشەردا کۆ دەکاتەوە، هەر کەسە خەریکی نەفسی خۆیەتی، ئەوەی کردەوەی چاکی کـردبێ، زۆر کـەیف خـۆشە و ئـەوەی خـراپـیشی زۆر بـێ، لەو ڕۆژەدا شەرمەزارە.

فەرمووی: تەقوای خواتان هەبێ و عیبادەت زۆر بکەن، چونکە تاڵی عیبادەت و تەقوا لە دنیادا، دەبێتە مایەی سەربەرزی و شیرینی لە ڕۆژی قیامەتا. فەرمووی ئینسان لەو ڕۆژەوە کە هاتۆتە سەر دنیا و لە دایک بووە، وەک لە سەفەردا بێ، وایە و ڕۆژ بە دوای ڕۆژ، لە مەنزڵی ئاخری نزیک دەبێتەوە، جا بە ڕاستی ئەوەی لە گەڕانەوەدا لە سەفەر هیچ دەستمایەی پێ نەمابێ، یان قازانجی نەکردبێ، ئەوە ئەو کەسە بە هیلاک دەچێ، چاکە بکەن تا لە گەڕانەوەدا بە سەربەرزی بچنە ماڵ و مەنزڵی ئەبەدیتان. فەرمووی: خواوەندی گەورە بە عەبد و بەندەگان دەفەرموێ: ئەی عەبد و بەندەی من، ئەگەر بە ڕاستی تۆبە بکەیت و لە گوناه بگەڕێیتەوە و شەرم لە من بکەی، ئەوە عەیبەکانت لە لای خەڵک ئاشکرا ناکام و خەتاکانت لە لوح المحفوظ دا دەکوژێنمەوە و لە ڕۆژی قیامەتا حیسابت ئاسان لە گەڵدا دەکەم.

فەرمووی: تا دەتوانن خۆتان لە ئینسانی شەیتان سیفەت بپارێزن. چونکە بەلای منەوە، شەیتانی ئەجینە سەلامەت ترە و زەرەری کەمترە، لە ئادەمی شەیتان و شەیتان سیفات، ئینسانی شەیتان سیفەت لە کۆڵت نابێتەوە و بە ئاشکرا دێ خۆت پێ هەڵدەواسێ تا تووشی گوناهت دەکا، بەڵام شەیتانی ڕاستەقینە کە [اَعُوذُ بِاللهِ] هیت لێ کرد، دوور دەکەوێتەوە.

فەرمووی دڵی ئینسان وەک ئاوێنە وایە، بە ژەنگ و تۆز و غوباری گوناح و کردەوەی خراپ، تاریکی مەکەن، فەرمووی: چونکە چۆن کە ئاوێنە پاک و بێ گەرد بوو، لە مێشوولەیەکەوە تا فیلێک وێنەی هەڵدەگرێ و نیشانی دەداتەوە، دڵی ئینسانیش وایە، چی نیشان بدەی وێنەی ئەوت نیشان دەدا.

دەیفەرموو: لە بەر خوا وەپاڕێن و داوای دنیا و قیامەتی لێ بکەن، بێ دڵێتان ناکا فەرمووی: ئەمن شەوێک لە مزگەوت بوم، زۆرم سەرما بوو، لە سەرمادا ئارامم نەبوو، دەستم کرد بە دوعا و پاڕانەوە، بەڵام لەسەرمان هەردەستێکم بەرز دەکردەوە و ئەوەی ترم لە سەرمان دەباخەڵی دەنایەوە و بە هۆی پاڕانەوەکە

ئاسوودەییێکی زۆرم پێ گەیشت و خەوم لێ کەوت لە خەوەکەمدا بانگیان کردم و گوتیان: ئەی «عبدالرحمن ئەبوو سولەیمان دارایی» ئەو ڕاحەتی و ئاسوودەییەی کە پێت گەیشت، ئەوە بەشی ئەو دەستە بوو، کە بەرزت دەکردەوە، لە کاتی دۆعا کردنەکەتدا، ئەگەر دەستەکەی تریشت بەرز وەکردایە، بەشی ئەویشمان دەنارد و زیاتر ئاسوودە دەبوویت. فەرمووی: جا لەو ڕۆ بەدواوە شەرتم کردووە، بە سەرما و گەرما، لە کاتی دۆعا کردندا هەردوو دەستەکانم بەرز کەمەوە.

دووبارە دەفەرموێ: ڕۆژێک لە قەراخ دەریا، لە شام عەلقەمەی کوڕی یەزیدی، لە زمان با پیریەوە بۆی گێڕامەوە کە فەرموویەتی: لە گەڵ شەش کەسی تردا لە قەومەکەی خۆم چووینە مەدینە، بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ)، کاتێ چووینە خزمەتی، قسەمان لە گەڵ کرد و سەر و شکڵ و لیباسەکەی ئێمەی چاو پێکەوت، زۆری لا عەجایب بوو، فەرمووی: ئێوە کێن و چ کەسن؟ عەرزمان کرد: قوربان، ئێمە موسوڵمانین. زەردە خەنەیەکی هاتێ و فەرمووی: [اِنَّ لِكُلِّ قَوْلٍ حَقِيقَةً، فَمَا حَقِيقَةُ قَوْلِكُمْ وَ اِيمَانِكُمْ] عەلقەمە دەڵێ: باپیرم گوتی: عەرزمان کرد: قوربان، حەقیقەت و عەلامەتی ئیمانی ئێمە پانزدە سیفەت و خەسڵەتن. پێنجیان نوێنەری جەنابت ئەمری پێ کردووین کە ئیمانیان پێ بێنین و پێنجیشیان هەر نوێنەری تۆ ئەمری پێ کردووین کە عەمەلیان پێ بکەین و پێنجەکەی تریش هەر لە زەمانی جەهالەتەوە کردوومانن. پێغەمبەر دروودی خوای لە سەر بێ فەرمووی: [وَ مَا الْخَمْسُ الَّتِي أَمَرَتْكُمْ رُسُلِي اَنْ تُؤْمِنُوا بِهَا]؟ ئەو پێنجانە کامانەن کە نوێنەری من ئەمری پێ کردوون ئیمانیان پێ بێنن؟ گوتمان: ئەمری پێ کردووین کە ئیمان بە خوا و پێغەمبەر و مەلائیکە و کوتوب و ڕۆژی قیامەت بێنین. ئنجا فەرمووی: [وَ مَا الْخَمْسُ الَّتِي أَمَرَتْكُمْ اَنْ تَعْمَلُوا بِهَا]؟ ئەی ئەو پێنجانە کامانەن کە گووتوویەتی عەمەلیان پێ بکەن؟ عەرزمان کرد قوربان، ئەمری پێ کردووین کە بڵێین: [اَشْهَدُ اَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاَّ اللّٰهُ وَ أَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰهِ]

هەروەها نوێژ بکەین و زەکات بدەین و بە ڕۆژوو بین و ئەگەر تواناتان بوو حەج بکەن. فەرمووی: [وَ مَاالْخَمْسُ اَلَّتِي تَخَلَّقْتُمْ بِها اَنْتُمْ فِي الْجاهِلِيَّةِ] ئەی ئەو پێنج خەسڵەتە کامانەن کە لە زەمانی جەهالەتەوە خووتان پێ گرتوون؟ عەرزمان کرد: قوربان، لە کاتی هەرزانی و فەرەحیدا شوکری خوا دەکەین و لە کاتی بەلاّ و موسیبەتدا خۆڕاگر و سابیر دەبین و لە کاتی مولاقاتدا ڕاست گۆ و بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی دەبین و کە دوژمن لۆمەی کردین دەنگ ناکەین.

پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرمووی: [وَ اَنَا أَزِيدُكُمْ خَمْساً فَتَتِمُّ لَكُمْ عِشْرُونَ خَصْلَةً فَلاَ تَجْمَعوا مالاً تَأْكُلُونَ، وَ لاَ تَبْنَوْا مٰا لا تَسْكُنُونَ وَ لاَ تَنافَسُوا فِي شَيْءٍ اَنْتُمْ عَلَيهِ غَداً زائِلونَ وَ أَتَّقُوااللهَ الَّذي اِلَيْهِ تُـرْجَعُونَ وَ إِلَـيْهِ تُـعْرَضُونَ، وَ ارْغَبُوا فِيما عَلَيْهِ تُقدِّمُونَ وَ فِيهِ تَخْلُدُونَ] با منیش پێنج خەسڵەتی ترتان لە سەر زیاد بکەم، تا ببنە بیست. فەرمووی: ئەوەی نایی خۆن کۆی مەکەنەوە، لە سوکنای خۆتا زیاتر خانوو مەکەن، لە سەر ئەوشتەی کە لەوانەیە بەیانی بە جێی بێڵن، هەروا کێشە مەکەن، لەو خوایە بترسن کە لە پاش مردنتان دەگەڕێنەوە بۆ لای و موحاسبەتان دەکا و ڕوو بکەنە ئەو کردەوانە کە دەبنە هۆی بە هەشتی ئەبەدی و نەبڕاوە.

لە پاڕانەوەکەیدا «شێخ ئەبوو سولەیمان» دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە! ئەو کەسەی کە لە دنیادا خزمەتکارت نەبووبێ، چۆن شایستەی بە خزمەت گەیشتنی تۆیە، یان چۆن ئومێدی بە کەرەم و ڕەحمی تۆیە، ئەو کەسەی کە شەرم لە تۆ ناکاو گوناه دەکا.

دەیفەرموو: خەڵکینە، دنیا هەروا ڕوون نابێ و ئێوەش هەروا ساغ و سەلامەت نابن و تاسەر ڕای نابوێرن، تکا تان لێ دەکەم، خۆتان لە ئاهی مەزلوومان بپارێزن. [لَوْ اَنَّ مَحْزوناً بَكَیٰ فِي أُمَّةٍ لَرَحِمَ اَللهُ تِـلْكَ الاُمَّـةَ] چونکە ئەگەر ئینسانێکی مەحزوون لە ناو گەل و کۆمەڵێکدا بگری، لە بەر خواوەندی گەورە وەپاڕێ،

خوای گەورە لە بەر خاتری دڵی وی لەو کۆمەڵ و گەلە خۆش دەبێ.

جا ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە و ئەولیا گەورەیە کە شێخی نەوەوی لە «بستان العارفین»دا باسی دەکا و دەفەرموێ: یەکێک لە پیاوە گەورەکان و خاوەن کەشف و کەرامات بوو، خەڵکی وڵاتی شام فەخریان پێوە دەکرد، لە ساڵی دووسەت و پازدەی کۆچیدا، وەفاتی کرد و هەر لە ئاواییەکەی خۆیدا، بە خاکیان سپارد. ڕۆحی شاد بێ.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتەکانی «شێخ ئەبوو سولەیمانی دارایی»، ئومێد دەکەم ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن و لەبەر خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لە گوناهانمان خۆش بێ. ئیمانمان بە نسیب کا. شیفای نەخۆشمان بدا. لە ڕۆژی قیامەتا لەگەڵ ئەولیا و چاکاندا حەشرمان بکا. ئامین.

وَ صَلىٰ اللهُ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ أَصْحَابِهِ وَ أَتْبَاعِهِ أَجْمَعِين وَ السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكَاتُهُ

# (٣٢)

## باسی ئیمام یەحیای ڕازی

﴿بِسْمِ اللهِ اَلرَّحْمٰنِ اَلرَّحِیمِ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلىٰ مٰا اَنْعَمْ وَ عَلَّمَ الْاِنْسانَ ما لَمْ یَعْلَمْ
وَ اَکْمَلُ الصَّلاةِ وَ التَّحِیَّة عَلىٰ النَّبِیِّ اَفْضَلِ الْبَرِیَّةِ[1]

موسوڵمانینە، با وەکوو کۆڕ و مەجلیسەکانیترمان، لە دانیشتنی ئێستاشماندا، بچینە لای باسی ئەو کەسە، کە لە کاتی خۆیدا سەرچاوەی باغی ڕەزا بوو، نووقتەی کەعبەی ڕەجا بوو، ناتیقی حەقایق بوو، واعیزی خەلایق بوو، زمانی تەریقەت بوو، خۆشەویستی حەقیقەت بوو، لەتیفە گۆی ڕۆژگار بوو، خاوەنی دەیان تەئلیفات بوو، مورید و موراد بوو، قسەی ناوی حەیات بوو، مەحبوویی بارەگا بوو، چون خادەمی دەرگا بوو، عالمی باعەمەل بوو، جێگای ئومێد و ئەمەل بوو، جا ئەو دەرکەوانی بارەگای باریە، جەنابی «ئیمام یەحیای کوڕی مەعازی ڕازی»یە. دەی با زۆر بە ئەدەبەوە گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتە بە نرخەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

شێخ عبدالرحمنی سوللەمی (ڕەزای خوای لێ بێ)، لە کتێبی «طَبقاتُ اَلأولیا». دەفەرمووێ: «یەحیای کوڕی مەعازی ڕازی»، (خودای لێ بێ ڕازی)، لە تەبەقەی یەکەمی ئەولیا، لە ناو ئەولیادا چوارەمین کەسە.

«ئیمام یەحیای ڕازی» ئەوەندە زمان پارا و زمان خۆش و نەفسێکی پاکی بوو،

---

١ - شێخ مەعروف.

لە ناو شێخ و مەشایخدا دەیانگوت: خواوەندی گەورە دوو یەحیای بووە، یەکێکیان لە ناو تەبەقەی ئەنبیادا کە حەزرەتی یەحیای پێغەمبەری کوڕی حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەر بوو، (دروودی خوایان لە سەر بێ)، ئەوی تریان لە ناو تەبەقەی ئەولیادا، کە «ئیمام یەحیای کوڕی مەعازی ڕازی»ە یەحیای پێغەمبەر ڕێگای لە خوا ترسانی گرتبوە بەر و ئەوەندە لە خوا دەترسا کە هەموو پیاو چاکان بە هۆی ترسانی ئەوەوە، لە ڕزگاری خۆیان نائومێد ببون و دەیان گوت: لە جێگایەک کە پێغەمبەر، ئەوەندە لە خوا بترسێ، دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێ. بەڵام «ئیمام یەحیای ڕازی» ڕێبازی ڕەجای گرتبوە بەر، ئەوەندەی ئومێد بە کەرەم و ڕەحمی خوا بوو، زۆربەی خەڵک ئومێدی پەیدا کردبوو.

جا بە ڕاستی ئەو حەدیسانەی کە «ئیمام یەحیای ڕازی» ڕیوایەتی کردوون و ئەو فەرمایشتانەی کە ئەو بە ئامۆژگاری فەرموونی، بۆ ئەوە دەبن کە بە ئاوی زێڕ وەنووسرێن و وەک ئاڵقەیەک بکرێتە گوێی دڵ و پەند ئامۆژگاریان لێ وەرگیرێ.

دەڵێن «ئیمام یەحیای ڕازی» برایەکی بوو، لە خوراسانەوە چوو بۆ کەعبە و لەوێ مابوەوە، ئەو برایەی کاغەزێکی بۆ ناردبوو، نووسیبووی، کاکە، لە دوای دۆعا و سەلام و دەست ماچ کردن، ئەمن لە ژیانی دنیادا سێ ئارەزووم هەبوو. حەمد بۆ خوا دووانیان هاتوونەتەدی، یەکیان ماوە بێتە دی، دۆعام بۆ بکە کە خواوەندی گەورە ئەویش بێنیتەدی. نووسی بووی، یەکەم ئارەزووم ئەوە بوو، کە لە ئاخری عومرمدا بچمە جێگایەکی موبارەک، ئەوە خوا بە نسیبی کردم هاتوومە کەعبە، کە گەورەترین شوێنە. ئارەزووی دووەمم ئەوە بوو، یەکێک هەبێ خزمەتم بکا و ئاوی دەست نوێژم بۆ ئامادە بکا، خواوەندی گەورە کەنیزەکێکی باشی بۆ ناردووم خزمەتم دەکا. سێیەم ئارەزووم ئەوەیە، تا ماوم و نەمردووم، جارێکی دی خوای گەورە بە دیداری تۆم شاد وەکا و بە خزمەتت بگەمەوە و دیدار ئاخیرەت نەبم.

جا بڕوانن و تەماشا بکەن، کە جەنابی «ئیمام یەحیای ڕازی» چۆنی وەڵام

دەداتەوە! بۆی دەنووسێ و دەفەرموێ: ئەوە کە گوتوتە ئارەزووم بوو، لە ئاخری تەمەنمدا بچمە پیرۆزترین جێگا، کاکە، بۆ ئینسان مەکان و جێگا زۆر شەرت نیە، تۆ خۆت باشترین ئینسان بەو لە کوێ دەبی ببە، چونکە نە ئەتۆ بە هۆی جێگاوە خۆشەویست دەبی، نەجێگا کە بە هۆی تۆوە زۆر پیرۆز دەبێ، ئەوەش کە نووسیوتە ئارەزووی ئەوەم بوو خادمێکم هەبێ و خوا بۆی ناردووم، کاکە، ئەگەر تۆ پیاوی باش بویتایە، بەندەی خوات نەدەکردە خادمی خۆت، چونکە ئەوە ئارەزووی مەخدوومییەتە و مەخدوومییەت سیفەتی عەبد نیە، سیفەتی خوایە، عەبد دەبێ خۆی خادم بێ، ئەگەر داوای خزمەتکاری کرد، ئەوە ئارەزووی فیرعەونی لە سەردایە. ئەوەشیان کە گوتوتە: ئارەزووی دیداری تۆم هەیە، کاکە، ئەگەر بە تەواوی لەگەڵ خوا بوویتایە، ئاوات یادی من نەدەکرد، چونکە لەو جێگایەدا کە ماڵی بەیتە، پیاوانی خوا، کوڕی خۆشیان دەکەن بە قوربانی، چ جایەکی برایان، نووسی کاکە، ئەگەر بە خوات گەیشتووی، منت بۆ چیە و ئەگەر هەروەک خۆتی، من چیت لێ بکەم؟!

«ئیمام یەحیای ڕازی»، لە دوای خولەفای ڕاشیدین یەکەم کەس بوو، کە بۆ مەوعیزە چوەتە سر مینبەر و ئامۆژگاری خەڵکی کردووە.

مەوعیزە و ئامۆژگاری «ئیمام یەحیای ڕازی» ناو بانگی دەرکردبوو، لە کاتی خۆیدا و زۆر بە تەئسیر بوو، زۆر جاری وابوو بە ئامۆژگاریەکانی خەڵک ئەوەندە دەگریان، بێ هۆش دەبوون، تەنانەت جاری واش بوو زۆر کەس ئەوەندە دەگریا و بێ هۆش دەبوو و وەفاتی دەکرد.

ڕۆژێک ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، لە کاتی ئامۆژگاری کردنەکەیدا، چاوی لێ بوو باوکێک کوڕەکەی ماچ کرد، ڕووی کردە کابرا و فەرمووی: کاکە کوڕەکەت زۆر خۆش دەوێ؟ کابرا گوتی: بەڵێ زۆرم خۆش دەوێ. شێخ فەرمووی: خەڵکینە، ئەو پیاوە بۆیە ئەوەندەی کوڕەکەی خۆش دەوێ، چونکە لەو بەوەلەد بووە، جا دەبێ ئەو خوایەی کە عەبد و بەندەی خۆی خەڵق دەکا و لە بازاری

عەدەم و نەبوونەوە دەیهێنێتە دەشت و سەحرای وجوودەوە، چەندی خۆش بوێ؟! بەڵام هەروەک کوڕەکە، کە ئەگەر نارەسەن بوو، بێ ئەمری باوکەکەی خۆی کرد، ئەو خۆشەویستییەی لە لای باوکەکەی نامێنێ، ئەگەر عەبد و بەندە بێ ئەمری خوا و خالق و ڕازقی خۆی بکا، دیارە زیاتر بێ قەدر دەبێ، لە لای خواوەندی گەورە. فەرمووی: لە پێش ئەوەدا، دنیاتان پێ بە جێ بێڵن، ئێوە تەرکی دنیا پەرستی بکەن، لە پێش مولاقاتی خوادا بۆ موحاسەبە، خوا لە خۆتان ڕازی بکەن و لە پێش ئەوەدا، بچن بۆ ماڵەکەتان، کە گۆڕە، ئاوەدانی وەکەن.

دەیفەرموو: خەڵکینە، دنیا جیسر و پرد و ڕێبازی دوا ڕۆژە، بە سەریدا برۆن و ئاوەدانی مەکەنەوە، بەو مەعنایەی وا بزانن کە هەر لە دنیادا دەمێننەوە. پیاوی خاوەن عەقڵ، شتی وا ناکا، خانوو لە سەر ڕێبازدا ناکا، ئەوەندەی خۆ پێوە خەریک مەکەن کە دواڕۆژتان لە بیر بەرێتەوە.

شەوێک مەوعیزەی دەکرد، شەمعێکیان لە پێش دانابوو، لە ناکاو شەمعەکە کوژایەوە و «ئیمام یەحیا» دەستی کرد بە گریان، عەرزیان کرد: قوربان، ئەوە بۆ دەگری؟ هەر ئێستا هەڵی دەکەنەوە، فەرمووی: بۆ کوژانەوەی شەمعەکە ناگریم، لەوە دەترسم، کە ڕەشەبای بێ نیازی خوا، ڕۆژێک گێژەڵووکەیەک بکا و شەمعی ئیمان و چرای تەوحیدی سینگمان وەکوژێنێ.

جارێک عەرزیان کرد: قوربان، لامان وایە کە دنیا بە هۆی مردن و هاتنی ئیزرائیلەوە، دەنکە جۆیەک ناهێنێ. فەرمووی: نە ، وانیە، ئەگەر مردن و ئیزرائیل نەبوونایە، دنیا دەنکە جۆیەکی نەدەهێنا. فەرمووی: چونکە گوتویانە: [اَلْمَوتُ جِسْرٌ يُوصِلُ الْحَبِيبَ اِلىٰ الْحَبِيبِ] مردن و مەرگ ئەو پردەیە کە خۆشەویست بە خۆشەویست دەگەیەنێ. فەرمووی: [مِسْكِينٌ اِبنُ آدَمَ، لَوْ خَافَ اَلنَّارَ كَمَا يَخَافُ اَلفَقرَ دَخلَ اَلجَنَّةَ] بنیادەم زۆر فەقیر و بەستە زمانە، ئەگەر ئەوەندەی لە ژیانی دنیادا، لە فەقیری دەترسێ، لە ئاگری دۆزەخ بترسایە، دەچوە بەهەشت.

عەرزیان کرد: ئەی قوربان، تۆ بۆچی دایمە غەمباری؟ غەمی چیت هەیە؟ لە

وەڵامدا فەرمووی: خەمی ئەوە دەخۆم، نازانم داخۆ خوا منی بۆچی خەڵق کردووە؟! فەرمووی: من هەرگیز لە مردن ناترسم، لەوە دەترسم بە ئارەزووی خۆم نەگەم.

فەرمووی: بەڵام ئەی خوای گەورە، هەر وەکوو تۆ بە هۆی گوناهەوە، عەتا و بەخششی خۆت لە عەبد ناگریەوە، منیش بە هۆی گوناهەوە، لە ڕەحمەتی تۆ نائومێد نابم. فەرمووی: ئەگەر خواوەندی گەورە، لە ڕۆژی قیامەتا بفەرموێ: ئەی «یەحیا» چی داوا دەکەی؟! لە وەڵامدا عەرزی دەکەم: ئەی خوای گەورە، دەمهەوێ بمنێری بۆ ناوەڕاستی جەهەننەم و لە سەر تەختی مالیکی دۆزەخ دانیشم و ئەمرم پێ بفەرمووی: لە شنەبای ئەو خۆشەویستیە کە لە سەری دۆستانی تۆدایە، هەناسەیەک هەڵێنم و بە ئاگری گەرمی هەناسەکەم، مالیکی دۆزەخ و دار و دەستەکەی بەرمەوە بازاری عەدەم و سەحرای نەبوونەوە.

فەرمووی: خەڵکینە، ئێوە چەند دۆستی خوا بن، خەڵکیش بەو ئەندازە دۆستی ئێوە دەبێ. چەند لە خوا بترسن، ئەوەندەش خەڵک لە ئێوە دەترسێ. تا زیاتر خواتان خۆش بوێ، خواش ئێوەی زیاتر خۆش دەوێ. فەرمووی: کوڕینە، ئاگادار بن، زانای ئاینی و عالمی باعەمەلتان، زۆر خۆش بوێ، فەرمووی: [لِأَنَّ ٱلعُلَمَاءَ ٱلعَامِلِينَ اَرْأَفَ بِأُمَّةِ مُحَمَّدٍﷺ وَ اَشْفَقَ عَلَيْهِمْ مِنْ آبائِهِم وَ أُمهاتِهِم] چونکە عالمی باعەمەل، بۆ ئوممەتی «پێغەمبەر» لە باوک و دایک میهرەبانتر و بە ڕەحمترە. عەرزیان کرد: قوربان، چۆن وایە؟ فەرمووی: [لِأَن آبائَهُمْ وَ أُمَّهاتَهُمْ يَحْفَظُونَهُم مِنْ نارِ ٱلدُّنْيا وَ ٱلعُلَمَاءَ يَحْفُظونَهُمْ مِنْ نارِ ٱلاٰخِرَةِ] لە بەر ئەوە کە باوک و دایک، ئەولاد لە ئاگری دنیا دەپارێزن، بەڵام عالمی دینی بە هۆی ئامۆژگاری، ئینسان لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ.

فەرمووی: ئێوە لە قیامەتیشا موحتاج بە عالمن، گوتیان: قوربان، چۆن لە قیامەتا موحتاج بە عالمین؟ فەرمووی: ئاخر لە بەهەشتا، لە لایەن خواوەندی گەورەوە ڕۆژێک بانگ دەکرێ و دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە، داوا بکەن تا

ئارەزووتان بێنمە دی، خەڵکە کە نازانن داوای چی بکەن، پەنا دەبەنە بەر زاناکانیان و ئەوان داوای چاوپێکەوتنی جەماڵی خوایان بۆ دەکەن.

فەرمووی: دەبێ خەڵک لە تۆوە یەکێک لەو سێ شتانەی پێ بگا، جا بە پیاوی چاک لە قەڵەم دەدرێی: یەکەم، ئەگەر نەتوانی چاکەیان لەگەڵ بکەی، نابێ زەرەریان لێ بدەی. دووەم، ئەگەر نەتوانی دڵیان خۆش کەی، نابێ غەمباریان بکەی. سێیەم، ئەگەر مەدحیان ناکەی، غەیبەت و زەمیشیان مەکە.

فەرمووی: وریا بن ئەگەر تۆبەتان کرد، لە پاشان گوناە مەکەنەوە، چونکە گوناهێک کە لە پاش تۆبە کردن بکرێ، لە هەفتا گوناهی پێش تۆبە ناشیرین ترە، فەرمووی: هات و چۆی لای پیاوی چاک بکەن، چونکە پیاوی چاک وەک ڕاوچی وایە، چۆن ڕاوچی حەیوان لە دەمی گورگ دێنێتە دەرەوە، ئەویش خەڵک لە دەست شەیتان ڕزگار دەکا، خۆ پیاوی چاک ئەگەر لە تەمەنیدا، نەفەرێکیش ڕزگار کا، ئەویش هەر زۆرە.

فەرمووی: سێ کەس بە ئاقڵ لە قەڵەم دەدرێن. یەکەم، ئەو کەسە کە لە پێش ئەوەدا بمرێ، گۆڕەکەی خۆش دەکا و زەخیرەی خۆی بەرێ دەکا. دووەم، ئەو کەسەیە کە تەرکی دنیا دەکا و بە ئەندازەی پێویست نەبێ، خۆی بە دنیاوە ماندوو ناکا. سێیەم، ئەو کەسەیە کە لە پێش ئەوەدا کە بە حزوور خوا بگا، بۆ موحاسەبە، خوا لە خۆی ڕازی بکا.

فەرمووی: بۆ ئینسان لە دنیادا، دوو موسیبەت لە هەموو موسیبەتێک گەورەترن: یەکەمیان ئەوەیە، کە بە هەزار زەحمەت و نارەحەتی، ماڵێک کۆ بکەیتەوە و لێت بستێنن. دووەم موسیبەت ئەوەیە، کە لە یەکەمیان زۆر خەراپترە، کە لە دوا ڕۆژدا، لە سەری موحاسەبە دەکرێت.

ڕۆژێک لە خزمەتیدا باسی فەقیری و دەوڵەمەندیان دەکرد، فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتا نە فەقیری بایەخی هەیە، نە دەوڵەمەندی، بەڵکو ئەوەی لە دوا ڕۆژدا سوودی زۆر بێ، تەنیا سەبر لە سەر تاعەت و بەڵا و موسیبەتە و شوکرانە لە

سەر ناز و نیعمەتە. عەرزیان کرد: قوربان، زۆر کەس هەیە غەیبەتت زۆر دەکا. فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە بە عەبد و بەندەی خۆی قبوڵم کا، ئەوە بە غەیبەتەکەی ئەوان زەرەرم پێ ناگا. ئەگەریش قبوڵم ناکا، ئەوە شایانی ئەو غەیبەتەم.

دەیفەرموو: وریا بن، دنیا دووکان و بازاڕی شەیتانە، هیچی لێ نەدزن، چونکە شەیتان دواتان دەکەوێ، لە جیاتی ئەوەی کە لێتان دزیوە، ئیمانتان لێ دەستێنێ. فەرمووی: ئای بەداخەوە ڕۆژێک دێ، کە زاناکانمان خانووەکەیان وەک قەسری قەیسەری و بینایان کیسرەوی و عیمارەتیان شەددادی و تەکەببوریان عاد و سەموودی دەبێ و سیفەتێکی موحەممەدیان تێدا نابینم.

فەرمووی: خۆشبەخت ئەو کەسەیە کە دوژمنی زانا بێ، بەڵام بە داخەوە دوژمنی من زۆر نەزانە، گوتیان قوربان دوژمنی تۆ کێیە کە ئەوەندە نەزانە؟ فەرمووی: نەفسی خۆمە، چونکە بەهەشت دەفرۆشێ بەو هەموو خۆشی و لەززەتەوە، بە ئارەزوو شەهوەتێکی کاتی دنیایی.

فەرمووی: دەخیلتان بم، ئەگەر لە ڕووی نەزانینیشەوە، خراپەیەکتان کرد، زوو تۆبەی لێ بکەن، چونکە ئەو کەسەی تۆبە لە گوناە دەکا، تووشی سەربەرزی و فەرەحیەک دەبێ، هیچ خۆشی و لەززەتێک نای گاتێ، بە هۆی ئەوەوە کە خوای گەورە بە تۆبەی بەندەی خۆی زۆر کەیف خۆش دەبێ و زۆری پێ خۆشە، جا چی لەوە فەخرترە کە ئینسان کارێ بکا خوا پێی خۆش بێ!

دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، ئەوە بۆ پەرۆشی ئەوشتانەتان نیە، کە بە خۆڕایی لە دەستتان چووە؟ ئەی بۆچی بەو شتە دڵخۆشن، کە مردن پێتان بە جێ دێڵێ؟ فەرمووی: ئەی برای موسوڵمان! [لا تَكُنْ مِمَّنْ يَفْضِحُهُ يَوْمَ مَوْتِهِ مِيرَاثُهُ وَ يَوْمَ حَشْرِهِ مِيزَانُهُ] وریا بە وەک ئەو کەسانە مەبە، کە لە ڕۆژی مردندا، میراتی زۆر ئابڕوویان دەبا و لە ڕۆژی مەحشەریشدا، تەرازووی عەداڵەتی خوا خەجاڵەتیان دەکا.

چونکە زۆر کەسی وا هەیە، بە هەزار دەردی سەری ماڵی دنیا کۆدەکاتەوە و گوێ ناداتێ لە ڕێگای حەڵاڵەوە بێ یان حەرام، زەکاتی لێ نادا و پیاوەتی بەسەرەوە ناکا و زۆر چاو برسیە، چاوی تەماعی پڕ نابێ، تا ئەو ڕۆژەی دەمرێ، کەس نازانێ کە چەند دەوڵەمەندە و چی کۆ دەکاتەوە، بەڵام کە ئەجەل بوو بە میوانی و ماڵ ئاوایی لە دنیا کرد، لە پاش فاتیحە و سەرخۆشی، واریسەکانی دێنە سەر میرات بەشکردنی و ئەوەی ئەو چەند ساڵ بوو، دەی شاردەوە ئاشکرای دەکەن و لە بەینی خۆیاندا دابەشی دەکەن. جا ئەو کاتە خەڵکدەزانێ چی کۆ کردوەتەوە و عەیبی ئاشکرا دەبێ، ئەگەر لەو کاتەدا زیندووی بکەیتەوە و چاوی بەو حاڵە بکەوێ دەبێ چی بکا؟!

دەیفەرموو: دڵی ئینسان لە ناو سینگدا وەک دیزە وایە، چی تێدابێ، کوڵی ئەوە دەدا و زمان کەوچک و ئەسکۆییەتی، جا کاتێ قسەی بە زمانی کرد، ئەو کاتە دەزانێ چی لە دڵ دایە و ئەوەی بە زمانی لە دیزەی دڵەوە دەری دێنێ، شیرین بێ، ترش بێ، تاڵ بێ، سوێر بێ، ئاگادارت دەکاتەوە و چاکە و خراپەی دڵی خاوەنەکەی دەر ئەخا.

دەیفەرموو: دنیا و ماڵی دنیا هی خوان و خەڵکیش عەبدی خوان. جا ئەو عەبدانە، یان لەو ماڵەدا خەیانەت دەکەن، یان ئەمێنن، ئەگەر ماڵی دنیا کەوتە دەست ئەوانەی خەیانەت دەکەن و لە ڕێگای نامەشروعدا خەرجی دەکەن، ئەوە دەبێتە هۆی ماڵ وێرانی دنیا و قیامەتی ئەو کەسە و وێران کردنی وڵات و ماڵ و، سەروەتەکە هیچ تاوانبار نیە، وە ئەگەر کەوتە دەست پیاوی ئەمین و لە ڕێگای مەشروعدا خەرجی کرد، ئەوە دەبێتە هۆی شەرافەت و کەرامەتی ئەو کەسە و ئاوەدان کردنەوەی وڵات و خزمەت بە خەڵک. مەعنای وایە چاکە و خراپە و سەواب و عەزاب، ڕوو دەکەنە کردەوەی ئینسان و خەتایی سەروەت و ماڵ مەگرن، ئەگەر کردەوەی باش بوو پاداشی باش و ئەگەر خراپ بوو پاداشی خراپە.

دەیفەرموو: ئەوەی یادی مردن بکاتەوە، لە پێش ئەجەلیدا نامرێ و زوو تۆبە دەکا و بەکەم ڕازی دەبێ و زیاتر لە خوا دەترسێ و زۆرتر خوا پەرستی دەکا. بەڵام ئەوەی یادی مردن نەکاتەوە، ئەوە زۆر خۆی ماندوو دەکا، و لە فەقیری دەترسێ و قەناعەت ناکا و خۆی بە سەروەتێکەوە ماندوو دەکا کە ڕۆزی و ڕزقی ئەو نیە.

فەرمووی: چۆن خواوەندی گەورە، ڕزقی ئیمڕۆی تۆ نادا بە یەکێتر، تۆش یەکێتر مەپەرستە، چۆن لەو ڕزقە کە بۆ تۆی ناردووە، کەس ناکاتە شەریکت، دەتۆش شەریک بۆ خوا پەیدا مەکە، چۆن خوای گەورە داوای واجباتی بەیانیت لێ ناکا، تۆش داوای ڕزقی بەیانی لە خوا مەکە.

ڕۆژێک ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، تۆ حەزرەتی مووسا و هارونت نارد بۆ ئەو تاغیە باغیە کە فیرعەون بوو، کەچی فەرموت: ئەی مووسا و هارۆون، ئەگەر چوونە لای لە سەر خۆ و بەنەرمی قسەی لەگەڵ بکەن. گوتی ئەی خوای گەورە، ئەوە لوتفی تۆیە لەگەڵ کەسێک کە داوای خوایەتی دەکرد و دەیگوت: ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَىٰ﴾، ئەمن خوای گەورەی ئێوەم. ئەی دەبێ لوتف و کەرەمت لە گەڵ ئەو عەبدا نەدا چۆن بێ، کە ڕۆژی چەند جار دەڵێن: [سُبْحَانَ رَبِّيَ ٱلأَعْلَىٰ]!

دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە، سەروەتی من لە دنیا بەڕە، شڕێکە، ئەگەر یەکێک داوام لێ بکا، بێ دڵی ناکەم، ئەی تۆ کە خاوەن خەزنەی ڕەحمەتی و پێش موحتاج نی و چەندین هەزار داما و هەیە، چۆن دەبێ بێ بەشیان بکەی لە ڕەحمەتی خۆت!

دەی فەرموو: ئەی خوای گەورە، ئەوەی لە دنیادا بۆ منت داناوە، بیدە بە کافران و ئەوەی لە قیامەتیشدا بۆت داناوم، بیدە بە موسوڵمانان، چونکە من لە دنیادا تۆم بەسە و لە قیامەتیشا دیداری تۆم بەسە.

ئەی خوای گەورە! خۆ ئەگەر عەبد نەتوانێ دەست لە گوناه هەڵگرێ، تۆ دەتوانی

عەفووی کەی. ئەی خوای گەورە، چۆن بە هۆی گوناه کردنەوە، دەست لە پاڕانەوە هەڵدەگرم؟ خۆ تۆ بە هۆی بێ ئەمری ئێمەوە، دەست لە بەخششی خۆت هەڵناگری.

دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە، لە قورئاندا فەرمووتە: ﴿مَنْ جاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِنْها﴾ ئەوەی چاکەیەک بکا، پاداشی باشتری ئەدەمەوە، خۆ هیچ چاکەیەک لە ئیمان باشتر نیە، ئیمانیشت داوینێ، کەواتە دەبێ ئەو پاداشە باشترە لیقای خۆت بێ. [سُبْحانَ اَللّٰه] ﴿إِذا جاءَ اَجَلُهُمْ لا يَسْتَقْدِمُونَ ساعَةً وَ لا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ هەر کاتێ ئەجەلی ئینسان هات، نەساعەتێک پێش دەکەوێ و نە ساعەتێک دوا دەکەوێ. دەبێ لە ماوەی دیاری کراودا وەفات بکا، جا بە هەر سەبەبێکەوە بێ، بۆ نموونە تەماشای چۆنیەتی ئەو پیاوە گەورەیە، بکەن کە کاتێ ماوەی تەواو بوو، چۆن وەفاتی فەرموو!

«ئیمام یەحیای ڕازی» زۆر سەخی تەبع بوو، زۆری خزمەتی عولەما و سۆفی و دەروێش و فەقیر و هەژار دەکرد. بەو هۆیەوە، سەد هەزار درهەم قەرزار بوو. لە شەوی جومعەدا، پێغەمبەری، لە خەودا، دی فەرمووی: یا «یەحیا»، دڵ تەنگ مەبە، کە هەستای بڕۆ بۆ خۆراسان، نەفەرێک سەد هەزار درهەمە قەرزەکەی بۆ داناوی. لە خەوەکەیدا عەرزی حەزرەتی کرد، لە خۆراسان لە کوێیە و چ کەسەیە؟ حەزرەتفەرمووی: تۆ بڕۆ حەقت نەبێ، شار بە شار بڕۆ و مەوعیزەی خۆت بکە. چونکە ئامۆژگاریەکانت شیفای دڵانە و من هەر وەکوو هاتمە خەوی تۆ، چوومە خەوی ئەو کەسەشەوە.

«ئیمام یەحیا» هاتە شاری نەیشابوور و مینبەریان بۆ دانا، دەستی کرد بە مەوعیزە، لە ئاخریدا فەرمووی، من بە ئیشارەی پێغەمبەر ئەو ئامۆژگاریانە دەکەم، جا لەوێ وە هات بۆ بەڵخ و ماوەیەک لەوێ مایەوە، ئنجا هاتە شاری «هەڕا» و لە مەوعیزەدا، باسی خەونەکەی گێڕایەوە، کچی ئەمیری شاری «هەڕا» لە مەجلیسەکەدا بوو، هەستایە سەرپێ و گوتی: ئەی ئیمام، خەمی قەرزەکەت نەبێ،

ئــەو شــەوە مــنیش ئــەو خــەونەم دی، عــەرزی حــەزرەتم کــرد گــوتم: ئــەی خۆشەویستی خوا، من بچم بۆ لای، یا ئەو دێ بۆ ئێرە؟ فەرمووی: ئەو دێ بـۆ لات. گوتی: ئەوە چەند وەختە چاوەڕوانی تـۆ بـووم، سـەت هـەزار درهـەم و چەندین شتی‌تریشی دایە تا بۆ مورید و مەنسوبەکانی خەرج کا و لە پاش چەند ڕۆژ گەڕایەوە.

لە ڕێگادا شەوێک بەری بەیانی بوو، بە سوجدەدا کەوتبوو، کوڕەکەی لە لای بوو، شەیتان چوە کەلێنەی کوڕەکەیەوە و گوتی: خۆ کە باوکت گەیشتەماڵەوە، ئەو هەموو پارەیە لە قەرز دەداتەوە و هیچی بۆ تۆ نامێنێتەوە، هەستا بـەردێکی گەورەی هێنا و بە سەری بـاوکی دادا و کـوشتی، شـێخ ئـەوەندەی زمـان کـەڕا فەرمووی: پارەکە لە قەرزەکان بدەنەوە و وەفاتی فەرموو.

﴿إِنَّا لِلّٰهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ راجِعُونْ﴾ لە پاشان جەنازەکەیان هێنایەوە شاری نەیشابوور و لە ڕۆژی دوو شەممەی شازدەی مانگی «جمادی‌الاول» ساڵی دووسەد و پەنجا و هەشتی کۆچیدا، تەسلیم بە خاکیان کرد. ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بـە سەرهات و فەرمایشتەکانی «ئیمام یەحیای ڕازی» (خوای لێ بێ ڕازی). ئومێد دەکەم پەند و ئامۆژگاریتان لێ وەرگرتبێ. لە خوای گـەورە داوا دەکـەم کـە، لە گوناهانمان خۆش بێ و شیفای نەخۆشمان بدا. ئیمانمان سەلامەت کا. لە شەڕی شەیتان و بەڵای ناگەهان بمان پارێزێ. ئامین. وَ صَلىٰ الله عَلَى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّم. وَ السَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكاتُهُ

# (٣٣)

# باسی یۆسفی کوڕی حوسەین

﴿بِسْمِ اللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

| | |
|---|---|
| اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ اَلْجَوادِ اَلْمُنْعِمِ | اَلْمَانُّ بِالْهُدىٰ وَ دَفعِ النِّقَمِ |
| وَ صَلَواتٌ وَ تَحايَا لاٰ انتِها | لَها عَلىٰ اجلُّ اَرْبابِ النُّهىٰ |
| وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ الْكِرَامِ | كاٰنُوا ذَوِي بَلاغَةِ الكَلامِ[1] |

موسوڵمانینە، چەند خۆشە لە چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینە مەجلیسی ئەو کەسەی کە هەمیشە لە بارەگای باریدا، موعتەکیفی دایم بوو، لە حەدیقەی ویلایەتدا بەڵگەی ﴿وَ لا يَخافُ لَوْمَةَ لائِمْ﴾ بوو. ڕۆژی ون لە دنیای فانیدا بوو، ئاوی حەیات لە تاریکایی زیندەگانیدا بوو، عالم بە عیلمی زاهیر و باتین بوو، ئەستێرەی ئاسمانی مەشایخ بوو، پێشەوای ئەولیایان بوو، پیری دەستگیری شاخ و کوێستان بوو، موریدی شێخ زەننون میسری بوو، ڕەفیقی شێخ ئەبوو توراب و ئەبوو سەعیدی خەڕڕاز بوو، خاوەن هیممەتی عالی بوو، کەشف و کەراماتی ئانی بوو.

جا ئەو باز و شابازی کەونەینە، جەنابی «شێخ یۆسفی کوڕی حوسین»ە. با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی و سودیان

---

١ - شێخ مەعروف.

لێ وەرگرین.

ئەو «شێخ یۆسف»ە، یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی عێراقی عەجەم و زەنگان و هەمەدان، زۆر دانا و زانا بوو، خاوەن زمانێکی پاراو و فەسیح بوو، ئاگاداری زۆر نەهێنی بوو، دارای کەرامەت بوو، خاوەن مەقامات بوو، یەکانە ئەولادی زەمانی خۆی بوو.

ڕاوی دەڵێ: بەڵێ، هەر لە تەمەنی لاویدا، با ئەدەب و ویقار بوو، بەڵام زۆر خۆش گوزەران و بەرگ و لیباسی پاک بوو، بە زۆری خەریکی ڕابواردن و ڕاوە شکار بوو، تا جارێک لە گەڵ چەند سوار، ڕێیان کەوتە ناو خێڵێکی عەرەبەوە و چوون بوون بە میوانی گەورەی خێڵەکە، کاتێ کچی شێخی عەرەب، چاوی بە جوانی جەماڵی «یۆسف» کەوت، بە دڵ وەک زولەیخا ئاشقی «یۆسف» بوو.

لە دوورەوە تەماشای دەکرد و لە خۆشیان و خۆشەویستیان، وەک مێژۆکێ دە لەرزی و ئارەقی بە سەر ڕومەتیدا، وەک دانەی مرواری دەهاتە خوارێ، ئاخری خۆی بۆداگیر نەکرا و لە ناکا و، خۆی هاویشتە باوەشی «یۆسف»ەوە بەڵام، چونکە «یۆسف» تا ئەو کاتە کاری خراپی نەکردبوو، هەر خەریکی ڕاو و ڕاوەشکار ببوو، زۆر پاکداوێن و بەشەرم بوو، لە خەجاڵەتیاندا ئارەقی کرد و پاڵێکی بە کچەکەوەناو بێ خوا حافزی هەستان ڕۆیشتن، چوون بۆ ناو هۆزێکی‌تر، ئەو شەوە تا لای بەیانی لە داخان خەوی لێ نەکەوت، لای بەیانی خەوی لێ کەوت، خەونی دی، لە خەویدا چاوی کەوت بە جێگایەک بە عومری خۆی شوێنی وای نەدیبوو، تەماشای کرد، کۆمەڵێکی سەوز پۆش ڕاوەستاون، یەکێک لە ناوەڕاستیاندا وەک پاشا لەسەر تەختێک دانیشتووە، وەک مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، زۆری پێ خۆش بوو، کە بزانێ ئەوانە کێن و چ کەسن و ئەوەی لە ناویاندایە کێیە، لە خەوەکەیدا لێیان نزیک بووەو، گوتیان: وەرە پێشەوە، چوو سەلامی کرد و وەڵامیان دایەوە، پرسی، ئێوە کێن و ئەوەی لە ناوتانا

دانیشتووە کێیە؟ لە وەڵامدا گوتیان: ئێمە مەلائیکەین و ئەوی داش نیشتووە، ئەوە حەزرەتی یۆسف پێغەمبەرە، هاتووە بۆ زیارەتی «یۆسفی کوڕی حوسەین»، دەڵێ کە ئەوەم دی، لە خەوما دەستم کرد بە گریان، زۆر گریام، لە پاشان عەرزم کردن باشە، «یۆسفی کوڕی حوسەین» کوا ئەو قەدر و قیمەتەی هەیە تا حەزرەتی یۆسف بێتە مولاقاتی؟! دەڵێ لەو کاتەدا تەماشام کرد، حەزرەتی یۆسف لەسەر تەختەکە هاتە خوار و هات بۆ لام، لە خەوەکەمدا باوەشی پێدا کردم و بردمی لە تەنیشت خۆی دای نام و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، من کەی لایەقی ئەو لووتفەم فەرمووی: لەو کاتەدا کە کچی ڕەئیسی خێڵە عەرەبەکە، بەو هەموو جوانی و شۆخ و شەنگیەوە خۆی هاویشتە باوەشی تۆوە و تۆ ئاوا خۆت بە خوا سپارد و مەردانە خۆت ڕزگار کرد، خواوەندی گەورە فەرمووی: ئەی یۆسف، تۆ ئەو یۆسفە بووی کە زولەیخا بەهانەی پێ گرتی و قەسدی ئەوەت کرد لە کۆڵ خۆتی بکەیتەوە، بەڵام تەماشا کە «یۆسفی کوڕی حوسەین» کە، تەنانەت ئەو قەستەشی نەکردووە، خۆی ڕزگار کرد. فەرمووی: جا خواوەندی گەورە منی لە گەڵ ئەو مەلائیکەتانەدا نارد، بۆ لای تۆو بەشارەتیشی پێ داوین کە تۆ دەبیە یەکێک لە گەورە پیاوانی ئوممەتی پێغەمبەری ئاخری زەمان. فەرمووی: بەڵام ئەی «یۆسفی کوڕی حوسەین»، ئەوە بزانە کە خوای گەورە لە هەموو دەورو زەمانێکدا، ئیسمی ئەعزەم بە یەکێک لە پیاو چاکان دەڵێ، بچۆ بۆ لای زەنون میسری، ئێستا ئیسمی ئەعزەم لای ئەوە. دەڵێ: لەوە دابووم وەخەبەر هاتم، تەواوی بەدەنم وەسەر ئاو گەڕاو شەوق و زەوقێکی زۆر عەجایب ڕووی تێکردم.

دەڵێ هەر لە بەیانی ئەو شەوەدا دەستم لە هەموو شتێک هەڵگرت و ڕووم کردە وڵاتی میسر، کاتێ چوومە خزمەت شێخ زەنون میسری، لە مزگەوت بوو، ماوەیەکی زۆر لە گۆشەیەکی مزگەوت دەستم کرد بە عیبادەت و ڕووی ئەوەم

نەبوو پرسیاری لیّ بکەم، تا خۆی فەرمووی: کوڕم لە کوێوە هاتووی؟ گوتم: قوربان لە شاری ڕەی‌یەوە، لە ئێران، ڕۆژێکی‌تر شێخ فەرمووی: کوڕم بۆ چی هاتووی؟ عەرزم کرد: قوربان، بۆ زیارەتی تۆ، تا چەند مانگێک هیچی‌تری نەفەرموو، ڕۆژێک فەرمووی: کوڕم کارێکت هەیە؟ گوتم: قوربان، هاتووم، ئیسمی ئەعزەمم فێر کەی، شێخ ڕاچەنی و هەتا یەکسالی دی پرسیارێکی‌تری لیّ نەکردم، لە پاشان ڕۆژێ بانگی کردم و فەرمووی: کوڕم وەرە ئەو کاسەیە بۆ فلان کەس کە لە فلان جێگایە بەرە، بەلاّم چی پیّ گوتی لە بیرت نەچیّ بۆم وەگێڕە.

دەڵیّ: وتم: بەڵیّ قوربان، کاسەکەم وەرگرت، تەماشام کرد کاسەیەکی‌دار بوو، سەرەکەی بە پەڕۆیەک داپۆشرابوو، توند بەسترابوو، کە گەیشتمە سەر پردی ئاوی نیل، دڵم کەوتە وەسوەسە و خەیاڵ و خەتەرە گوتم: باشە دەبیّ ئەو کاسە چی تێدابیّ، کە شێخ ئاوا بە پەلە دەینێریّ بۆ لای ئەو پیاوە گەورەیە؟، دەڵیّ کاتیّ سەرنجمدا، شتەکە لە ناو کاسەکەدا وەک بجووڵیّ وابوو، بە سپاوی پەڕۆی پیّ بەستنەکەم کردەوە، تەماشای کەم، لە ناکاو مشکێک لە ناو کاسەکە دەرپەڕی، زۆرم لا عەجایب بوو، واقم ورما، گوتم: باشە ئەوە چ سیرڕێکە؟ دەبیّ شێخ گاڵتەی بە من کردبیّ، یان تازە بە دەستی بەتاڵەوە چۆن بچم بۆ لای کابرا؟ یان ئەگەر نەچم، چۆن بچمەوە بۆ لای شێخ؟ چونکە ئەو فەرمووی: چی گوت، دەبیّ بۆم وەگێڕی،

ناچار هەر چووم بۆ لای کابرا و کە لە دوورەوە چاوی پێکەوتم، زەردە خەندەیەکی کرد و فەرمووی: کوڕم نارەحەت مەبە، دیارە داوای ئیسمی ئەعزەمت لە زوننون میسری کردووە، عەرزم کرد بەڵیّ قوربان، فەرمووی: ذوالنون، خۆ ڕاگرتن و سەبری تۆی تاقی کردوەتەوە، [سُبْحَانَ ٱللَّٰهِ] کە تۆ لەوێوە تا ئێرە خۆت ڕانەگری و نەتوانی مشکێک ئاگاداری بکەی، چۆن دەتوانی ئاگاداری ئیسمی ئەعزەم بکەی؟ دەڵیّ: زۆر ناراحەت بووم، دەستم ماچ کرد و هاتمەوە بۆ مزگەوت، شێخ کە چاوی پێکەوتم: فەرمووی: دویّ شەو حەوت جار

داوام لە خودای گەورە کرد کە ئیجازەم بدا ئیسمی ئەعزەمت فێر کەم، فەرمووی: وەختی نیە، بۆیە تاقیم کردیەوە، ئێستاش ئەو سەفەرە بچۆوە بۆ وڵاتی خۆتان، تا کاتی خۆی دەنگ مەکە.

دەڵێ عەرزم کرد: قوربان، ئامۆژگاریەکم بکە. فەرمووی: سێ ئامۆژگاریت دەکەم: یەکیان ئەوەیە، ئەوەی تا ئێستا نووسیوتە و خوێندووتەوە، فەرامۆشی بکە، با پێی مەغروور نەبی و پەردەی حیجاب لە سەر دڵت لا چێ. گوتم: قوربان، ناتوانم ئەوە بکەم. فەرمووی: ئامۆژگاری دووەمم ئەوەیە، کە من فەرامۆش بکەیت و ناوی منت لە بیر وەچێ، چونکە کاتی خۆی، پیری من وای فەرمووە. گوتم: قوربان، تازە ئەوەشیان ناتوانم. فەرمووی: ئامۆژگاری سێیەمم ئەوەیە، هەمیشە ئامۆژگاری خەڵک بکەی، بەڵام بەو شەرتە خود پەسەند نەبی. دەستم زیارەت کرد و هاتمەوە، کاتێ گەیشتمەوە شاری ڕەی، تەواوی خەڵکی شار بە پیرمەوە هاتن و زۆر بە حورمەتیان وەرگرتم.

کاتێ مەجلیسم ئارایشدا و دەستم کرد بە باسی تەسەووف و حەقایق، عولەمای زاهیری، زۆریان پێ ناخۆش بوو، خەڵکیان لێ دوور خستمەوە، تا وای لێهات جاری وابوو، مەوعیزەم دەکرد کەس دانەدەنیشت، ڕۆژێک چوومە مزگەوت بۆ مەوعیزە، کەسی لێ نەبوو، ویستم بگەڕێمەوە، پیرێژنێک لە دوورەوە بانگی کردم و گوتی: ئاخر تۆ لەگەڵ شێخ زوننون میسردا، شەرتت نەکرد لە بەر ڕەزای خوا، مەوعیزە بکەیت و خودپەسەند نەبی؟ ئەی بۆ دەگەڕێیەوە؟ دەڵێ: قسەی پیرێژنم زۆر لا عەجایب بوو، بڕیارم دا دەست لە ئامۆژگاری هەڵنەگرم، پەنجا ساڵ ئامۆژگاری خەڵکم کرد.

جا خەڵکینە، ئەو «یۆسفی کوڕی حوسەین»ە لە ئاخریدا بوو بەو پیاوە کە شێخ ئیبراهیمی خەواس، بەرەکەتی لەوەوە وەرگرتووە و زۆر شتی لێوە ڕیوایەت کردووە.

دەڵێ: شەوێک لە خەودا گوتیان: بەیانی بچۆ بە «شێخ یوسف» بڵێ: تۆ لە قاپی ڕەحمەت دەرکراوی، کە وەخەبەر هاتم ئەوەندەم پێ ناخۆش بوو، وەکوو کێوێکم لە سەرشان دانێن، وابوو، شەوی دووەم هەمان خەونم دیبەوە، بۆ شەوی سێیەم گوتیان: ئەگەر بەیانی نەچی پێی بڵێی: وەهات لە عەرز ئەدەین قەت بەرز نەبیەوە. فەرمووی: هەستام زۆر بە غەمبارییەوە چوومە مزگەوت، شێخ لە میحرابی مزگەوتا بوو، کە چاوی پێکەوتم فەرمووی: وەرە بزانم هیچ شێعرێکت لەبەرە؟ گوتم: بەڵێ، لە بەرمە، فەرمووی: بۆم وەخوێنە، شێعرێکی عەرەبیم بۆ خوێندەوە، زۆری پێخۆش بوو، زۆر بە پێوە ڕاوەستا، ئەوەندە گریا و فرمێسکی خوێناوی بە سەر ڕوومەتانیدا هاتە خوارێ و ڕیشی موبارەکی تەڕ بوو، لە پاشان بێ ئەوەی کە من خەونەکەی بۆ وەگێڕم فەرمووی: لە بەیانیەوە تا ئێستا قورئانیان بۆ خوێندمەوە، فرمێسکم لە چاوان نەهاتوەتە خوارەوە و حاڵەتێکم بەسەردا نەهاتووە، بەڵام بە بیستنی ئەو شێعرە حاڵەتێکم بەسەردا هات، تۆفانی ئاوی چاوم هەستا، فەرمووی: خەڵک ناحەقی نیە کە دەڵێن: «یۆسف» زەندیق و بێ دینە، کەسێک چەند ساعەت قورئانی لا وەخوێنن و وەکوو مردوو بێ دەنگ بێ، بەڵام بە خوێندنەوەی شێعرێک ئاوای بە سەر بێ، ئەی ئیبراهیمی خەواس، حەقی خۆیەتی لە قاپی ڕەحمەت دەرکرێم. ئیبراهیمی خەواس دەفەرموێ: زۆرم لا عەجایب بوو، کە ئەو پیاوە ئاوا خاوەنی کەشف و کەرامات بێ و لە قاپی ڕەحمەتی خوا دەرکرێ! دەڵێ: عەقیدەم گۆڕاو ترسام و ڕووم کردە دەشت و سەحرا، تووشی حەزرەتی خدر بووم، فەرمووی: ئەی ئیبراهیمی خەواس، «یۆسف» زەخم خوردەی حەقە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگای «أعلاٰ عِلِّیِنَ»، چونکە ئەوەی لە مەیدانی خوا پەرەستیدا لە پاشایەتی بکەوێ، لە وەزیری ناکەوێ.

خەڵکینە، هەر چەند بە هۆی بەعزە حاڵەتێکەوە، عولەمای زاهیری دیعایەی

خراپەیان بۆ دەکرد، تا لە ناو خەڵکدا سووکی کەن،بەڵام ئەو لە ڕوتبەو مەقامێکدا بوو، دەربەست بە لۆمەی خەڵک نەبوو، ئاگای لە زۆر نهێنی بوو، ڕازی دڵانی دەزانی، دەردی دڵی زۆر کەسی تیمار دەکرد.

لە شاری «نەیشابوور» بازرگانێک کە نیزەکێکی بە هەزار دینار کڕی بوو، زۆر جوان و خاوەن حوسن و جەماڵ بوو، زۆری خۆش دەویست، ئەو بازرگانە قەرزی لەسەر کابرایەک بوو لە شارێکی‌تر و قەرزەکەی نەدەدایەوە، بازرگان ناچار بووەوە دوای کەوێ، بەڵام لە کەس ئەمین نەبوو کە نیزەکەی لە لا بەجێ بێڵێ، تا دەگەڕێتەوە لە سەفەرەکەی، هەستا هاتە ماڵی شێخ ئەبوو عوسمانی حیری کە پیاوێکی ناسراو بوو، گوتی: قوربان لە کەس ئەمین نیم، لە جەنابت نەبێ، تا لە سەفەر دەگەڕێمەوە، باکەنیزەکەکەم لە ناو ئافەرەتەکانی حەرەم سەرای ئێوە بن، زۆری لە بەر پاڕایەوە، ئەبوو عوسمان گوتی: باشە.

ڕۆژێک بە بێ ئیختیار ئەبوو عوسمان چاوی پێ کەوت، عاشقی جەماڵ و جوانی کەنیزەک بوو، ئارامی لێ بڕاو قەراری نەما، ناچار بوو پەنای برد بۆ لای ئەبوو حەفسی حەدداد و کارەساتی بۆ گێڕایەوە، ئەبوو حەفس گوتی: دەبێ بچی بۆ لای «شێخ یوسف»، ئەبوو عوسمان بەرەو شاری ڕەی، کەوتە ڕێ.

کاتێ گەیشتە شاری ڕەی، لە ماڵی «شێخ یوسفی» پرسیار کرد، لە وەڵامدا گوتیان: وا دیارە تۆ سۆفیەکی دڵ ڕووناک و غەریبی و دیارە لیباسی پیاو چاکانت لە بەردایە، بەڵام ئەگەر لە ئێمە دەپرسی، ئێمە «شێخ یوسف» بە پیاوی باش نازانین، چونکە شتی بە زاهیر بێ شەرعی دەکا، ئەغڵەب ئەو شار و دێیانەی کە شێخ نشینن، دانیشتووەکانیان شێخەکەی خۆیان خۆش ناوێ. ئەبوو عوسمان گوتی ناچارم دەبێ چاوم پێ بکەوێ، ماڵەکەیان نیشاندا، کاتێ چوو سەلامی کرد، پیرێک کوڕێکی گەنجی جوان و لووسی لایەو سوڕاحییەکی بە دەستەوە گرتووە، نووری لە چاوان دەبارێ، گوتی: یا شێخ بۆ خاتری خوا ئەوە چ حاڵەتێکە؟ بۆ ئەو

کوڕەگەنجەت بە سوراحی‌یەکەوە لە بەر دەمی خۆت ڕاگرتووە؟

«شێخ یوسف» فەرمووی: ئەبوو عوسمان وەرە دانیشە! ئەوە کوڕی خۆمە، دەرسی قورئانی پێدەڵێم، ئەو سوراحییەش لەو باغەدا کەوتبوو، گۆزەمان نەبوو ئاوی تێکەین، ناچار هەڵمان گرتەوە، بۆ ئاو پێ خواردنەوە، ئیتر فکرت مەگۆڕە، ئێمە شەراب خۆر و هەوەس باز نین، ئەبوو عوسمان گوتی: یا شێخ بۆ چی ئاوا خۆت نیشانی خەڵک ئەدەی تا بە خراپت ناو بەرەن؟ «شێخ یوسف»زەردە خەنەیێکی کرد و فەرمووی: بۆ ئەوەی خەڵک بە چاک و ئەمینم نەزانن و کەنیزەکەیان بە ئەمانەت نەهێنن بۆ ماڵی من و وەک تۆم لێ بە سەر نەیێ.

ئەبوو عوسمانی حیری کە ئەوەی لە شێخ بیست، خۆی هاویشتە سەر دەست و پێیانی و گوتی: یا شێخ تۆ بە فریام کەوە، ئەبوو عوسمان لە سەر دەستی «شێخ یوسف» تۆبەی کرد و خۆشەویستی کەنیزەکی لە بیر خۆی بردەوە و گەڕایەوە بۆ نەیشابوور.

«شێخ ئەبوو یوسف» زۆر زانا و ئەدیب بوو؛ موریدی شێخ زوننون میسری بوو، شاگردی ئیمامی ئەحمەد بوو، خاوەنی زوهد و تەقوا بوو، خاوەنی کتێبی «الطَبقاتُ الصوفیه» لە تەبەقەی دووەمی سۆفیاندا حیسابی کردووە، بۆ نموونە دەفەرموێ: جارێک عەرزی ئیمامی ئەحمەدم کرد، گوتم: قوربان حەدیسێکی پێغەمبەرم بۆ وەگێڕە، با لە زمانی تۆوە، بۆ خەڵکی باس بکەم و دۆعای بە خێرت بۆ بکەم. فەرمووی: [أُهْدِيَ إِلَىٰ ٱلنَّبِيِّ ﷺ طَائِرانِ فَأَكَلَ طَيْراً. فَلَمَّا أَصْبَحَ قالَ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ غَداءٍ فَقَدَّمَ إِلَيْهِ ٱلآخَرُ. فَقالَ مِنْ أَيْنَ ذا؟ فَقالَ بِلالٌ خَبَأْتُهُ لَكَ يا رَسُولَ ٱللهِ. فَقالَ يا بِلالُ لا تَخَفْ مِنْ ذي ٱلعَرْشِ إِقْلالاً. إِنَّ ٱللهَ يَأْتِي بِرِزْقِ كُلِّ غَدٍ] دوو تەیریان بە دیاری بۆ پێغەمبەر هێنابوو، یەکی خوارد و بۆ بەیانی فەرمووی: هیچ خواردنتان لایە؟ تەیرەکەی تریان بۆ هێنا، فەرمووی ئەوەتان لە کوێ بوو؟ بیلالی حەبەشی گوتی: قوربان بۆ تۆم هەڵگرتبوو، فەرمووی: ئەی بیلال، لە خاوەنی

عەرش مەترسە کە کەمی بکاتەوە، خوا ڕزقی هەموو ڕۆژێک دەنێرێ.

جارێک مەوعیزەی دەکرد، فەرمووی: ئاگاداری خۆتان بن، دنیا بە تەماع تەفرەتان نەدا، فەرمووی: چونکە زەلیل‌ترین ئادەمیزاد ئەو کەسەیە، تەماعی زۆر بێ و شەریفترین ئینسان ئەو دەروێشەیە، ڕاست و ڕاست گۆ و سابیر و خۆڕاگر بێ.

دەڵێن لە کاتی مەوعیزەدا چاوی سوور هەڵدەگەڕان، دەتگوت، خوێنیان تێکراوە، ڕۆژێک لە خوشکەکەیان پرسی، کە تاعەت و عیبادەتی کاکت چۆنە؟ لە وەڵامدا گوتی: کە نوێژی خەوتنانی کرد، تا بەری بەیانی بە پێوە ڕادەوەستێ، نە سوجدە دەبا و نە دەچێتە ڕکوع، لە پاشان لە خۆیان پرسی گوتیان: دەڵێن: تا ڕۆژ بە پێوە ڕادەوستی، ئەوە کەی عیبادەتە؟ فەرمووی لە پاش نوێژی خەوتنان تا لای بەیانی ڕادەوەستم، تواناى «الله اکبر»م نیە،

کاتێ لە بەر خوا دەپاڕایەوە دەگریا و دەیگوت: ئەی خوای گەورە، خۆ ئێمە شیناوردی زەراعەتی نیعمەتی تۆین، تۆ گەورەیی خۆت بە داسی بەڵاو موسیبەت درەومان مەکە.

دەیفەرموو: [إِنَّ فِي ٱلدُّنْيا طَغْيانانِ، طَغْيانُ الْعِلْمِ وَ طُغْيانُ ٱلْمالِ. فالّذي يُنْجيکَ مِنْ طُغْيانِ الْعِلْمِ، ٱلعِبادَةُ وَ الَّذي يُنْجيکَ مِنْ طُغْيانِ ٱلْمالِ الزُّهْدُ فِيهِ] واتە ئینسان لە دنیادا، بە هۆی دوو شتەوە توغیان دەکا و خوا و خەڵکی لە بیر دەچێتەوە: یەکەم، بە هۆی عیلمەوە. دووەم، بە هۆی ماڵ و سەروەتەوە.

توغیانی عیلم بە هۆی عیبادەتەوە چاری دەکرێ، توغیانی ماڵ و سەروەت بە هۆی چاکە و پیاوەتی پێکردنی و زوهد و تەقوا لە ماڵەکەدا، بەو مەعنایە زەکاتی لێ دەرکا، چاری دەکرێ.

لە نەخۆشی وەفاتیدا چوونە خزمەتی، گوێیان لێ بوو دەیفەرموو: [اَللّٰهُمَّ إِنِّي نَصَحْتُ خَلْقَکَ ظاهِراً، وَ غَشَشْتُ باطِناً، فَهَبْ لی غَشّي لِنَفْسي لِنُصْحي لِخَلْقِکَ]

ئەی خوای گەورە، بە ئاشکرا ئامۆژگاری خەڵقم کردووە، و لە باتیندا غـەشم لە نەفسی خۆم کردووە، تکایە غەشەکـەم بـە ئـامۆژگاریەکـانم ببەخشە، ئـەوەی فەرموو، وەفاتی کردو لە ساڵی سێ سەد و چواری کۆچیدا، بە خاکیان سپارد، ڕەحمەت لە گۆڕی.

لە پاش وەفاتی لە خەودا، چاویان پێکەوت، گوتیان: خوا چی لێ کردی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: عەفووی کردم، گوتیان بە هۆی چیەوە؟ فەرمووی: بە هۆی ئەو چەند کەلیمەوە کە لە کاتی سەرەمەرگدا عەرزی بارەگای خوام کردن.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشتەکانی «شێخ یوسف»، ئومێد دەکەم فائیدەی بووبێ. لە خوای گەورە داوا دەکەم، عەفوومان کا. لە گوناهانمان خۆش بێ. لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەتا بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ اللهُ عَلَی سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّم. وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٣٤)

## باسی ئەبوو حەفسی حەدداد

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

اَحْمَدُکَ اَللّٰهُمَّ مُؤْتِي الْحِکَمْ وَ وارِثَ الْخَلقِ وَ باعِثَ الرِّمَمْ

مُصَلِّياً عَلیٰ نَبِيِّکَ اَلَّذي هَدیٰ اِلیٰ مَنْهَجِ دِينِکَ الشَّذِي

وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ الْکِرامِ وَ العَصَباتِ وَ ذوي الأَرْحامِ[1]

گوێ گرینە، با لەم چەند دەقیقەی داهاتوودا، بە ئیمانەوەو، بە بیر و باوەڕەوە و، بە دڵێکی ساف و بێگەردەوە و بە ڕووی خۆش و گەشەوە، بچینە کۆڕ و مەجلیسی ئەو پیاو چاکەی کە لە زەمانی خۆیدا پێشەواو قیدوەی ریجال بوو، نوختەی پەرگاری دایرەی کەماڵ بوو، عابیدێکی ڕاستگۆ و سادق بوو، زاهیدێکی باوەفا و عاشق بوو، سوڵتانی دیوانی عالەم بوو، ئوستادی ئەفرادی ئادەم بوو، خەلیفەو جێنشینی بە حەق بوو، شێخ و والی مەشایخ بوو، جا ئەو قوتبی عالەم و گەورەی ئەفرادە، جەنابی «شێخ ئەبوو حەفسی حەددادە».

[سبحان الله]، لە عەزەمەت و گەورەی خوا، کە ئیرادەی کرد و ویستی هیدایەتی کەسێک بدا و بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست و حەقیقەت، چۆن دەرووی ڕەحمەتی لێ دەکاتەوە و چی بۆ دەرەخسێنێ؟.

---

١ - شێخ مەعروف.

بەڵێ، ئەو «شێخ ئەبوو حەفسی حەدداد»ە، لە کاتی لاویدا خوێندبووی، بەڵام شوغڵی ئاسنگەری بوو، کاتێ خواوەندی گەورە، ئیرادەی کرد و ویستی بیکا بە یەکێک لە پیاوە بەرزەکانی ئوممەتی پێغەمبەر و بیکا بە خاوەنی کەشف و کەرامات و بیکاتە تاقانە مەرجەعی فتوا لەو کاتەدا، بە ئەمری خوا دڵی چوە سەر کەنیزەکێک و عاشقی بوو، ئارام و قەراری لێ هەڵگیرا، هەر چەند پەنای دەبردە بەر پیر و پیاو چاکان، هیچ فایدەی نەبوو، نە ئافرەتەکە ئەوی خۆش دەویست و نە خاوەنەکەشی ڕازی بوو بیداتێ.

ڕۆژێک، دۆست خوایەک پێی گوت: دەڵێن لە شاری نەیشابوور، جوولەکەیەک هەیە، بە سیحر و جادوو ئاو لە بەردی ڕەق پەیدا دەکا و دڵی دڵ ڕەقان نەرم دەکا و خۆشەویستی لە بەینی دوو دڵاندا دەبزوێنێ، گوتی: دەردی تۆ بەو نەبێ دەرمان ناکرێ، تا زووە خۆیی بگەیێنێ.

جا هەر وەکوو ئێستاش بە زۆری خەڵک، با خوێندەواریش بن، عەقیدە و باوەڕیان بە خورافات هەیە و لەو بارەوە، زۆر نەخوێندەوارن، خەڵکی ئەو کاتەش زۆر باوەڕیان بەو شتانە بوو.

کاکی ئاسنگەریش هەستا چوو بۆ شاری نەیشاپوور، بۆ لای جوولەکەی جادووگەر و بە سەرهاتی خۆی و عاشق بوونی بە کەنیزەکەکەی، بۆ بەیان کرد. جوولەکەکە گوتی: دەبێ چل شەو و ڕۆژ لە سەریەک هیچ عیبادەتێک نەکەیت و هیچ نیەتێکی چاکت بە خەیاڵدا نەیە، جا ئەو کاتە من دەتوانم بە ئارەزووی خۆت بگەیەنم. «ئەبوو حەفس» گوتی: بەڵێ، هەستا ڕۆیی چل شەو و ڕۆژ عیبادەتی نەکرد و گەڕایەوە، لە ڕێگادا تەماشای کرد، گابەردێک هاتبووە سەر چەقی ڕێگا و ڕێگای خەڵکی گرتبوو، زۆری پێ ناخۆش بوو، هەر چۆنێ بوو لە سەر ڕێگاکەی لای برد، کاتێ هاتە لای جوولەکەو، جوولەکە دەستی کرد بە سیحرو تەلیسم و جادو، هەر چەند کردی و خەریک بوو، وەک جاران کاری نەکرد و هیچ تەئسیری

نەبوو، جوولەکە گوتی: ئەی کاکی ئاسنگەر وادیارە لەم ڕۆژانەدا کارێکی باشت کردووە، بۆیە هەر چەند دەکەم جادوەکەی من کاری خۆی ناکا. «ئەبوو حەفس» گوتی: لەم چل شەو و ڕۆژەدا، بە ئاشکرا هیچ کارێکی خێرم نەکردووە، ئەوە نەبێ کاتێگەڕامەوە، بە ردێکی گەورە ڕێگای هات و چۆی خەڵکی گرتبوو، لە سەر ڕێگا لام برد، دەنا هیچی ترم نەکردووە. جوولەکە کە ئەوەی لە ئاسنگەر بیست، تۆزێک ڕاماو، لە پاشان ڕووی کردە «ئەبوو حەفس» و گوتی: دەخیلە تا ماوی قەت بێ دڵی ئەو خوایە مەکە، کە ئەوەندە بە ڕەحم و بە بەزەیی و میهرەبانە، لە گەڵ بەندەکانی خۆیدا. گوتی تۆ نازانی ئەوە چل شەو و ڕۆژە تۆ بۆ خاتری، وە دەست هێنانی دڵی ئافرەتێک، بێ ئەمری خودا دەکەی، بەڵام خوای گەورە لە گەڵ ئەوەشدا ڕەنجی تۆی بە زایع نەدا و بە هۆی لابردنی بەردێک لە سەر ڕێگای هات و چۆی خەڵک، بێ پاداشی نەکردی و جادووەکەی منی بەتاڵ کردەوە. جوولەکەکە گوتی: [أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ ٱللهُ، وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ ٱللهِ] شادە و ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو.

کاتێ «ئەبوو حەفسی حەدداد»، ئەوەی چاو پێکەوت، ئاگرێکی لە دڵ بەربوو، حاڵی گۆڕاو ئاگای لە خۆی نەما، بە شین و گریانەوە، هات خۆی هاوێشتە سەر دەست و پێی جوولەکەکەی تازە موسوڵمان و لە سەر دەستی ئەو تۆبەی کرد و خۆشەویستی کەنیزەکی لە بیر چووە و ڕووی کردە کەسابەت و خوا پەرستی.

فەرمووی: ماوەی بیست ساڵ، حاڵی خۆم لە لای کەس باس نەکرد، ڕۆژی دینارێکم لە ئاسنگەری دەست دەکەوت، کە شەو دادەهات، دینارەکەم بە سەر دەروێشاندا، دابەش دەکرد، یان دەچووم بە دزیەوە، دەمهاوێشتە ماڵی پیرێژنانەوە.

ئێواران ئەوەندەم پەیدا دەکرد، ڕۆژوی پێ بشکێنم، یان دەچوومە ناو ئەو حەوزانەوە، کە میوەیان تێدا دەشتەوە و ئەوەی تێدا دەمایەوە، دەرم دێنا و

دەمخوارد، ماوەیەک بەو جۆرەم ڕام بوارد، حاڵم زۆر باش بوو، کەس ئاگای لە دەردم نەبوو، زۆرم لەزەت لە خواپەرستی دەبرد، تا ڕۆژێک، کوێرێک بە دووکانانەوە دەگەڕا، قورئانی دەخوێند، کاتێ هاتە بەر دووکانەکەی من و گوتی: ﴿أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ ٱلشَّيْطَانِ ٱلرَّجِيمِ، بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ؛ وَ بَدَا لَهُمْ مِنَ ٱللهِ مَـالَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾ ئەو ئایەتەی سورەی زومەڕی خوێندەوە، کە دەفەرموێ: جاری واهەیە لە لایەن خواوەندی گەورەوە، نەهێنیەک ئاشکرا دەبێ، کە بە خەیاڵی کەس دا نەهاتبێ. دەفەرموێ کە گوێم لەو ئایەتە بوو، حاڵم گۆڕا و دڵم مەشغوڵ بوو، ئاگام لە خۆم نەما، دەستم برد لە ناو کورەکەدا، ئاسنی سوور بووەم هێنایە دەرێ و لە سەر سندانەکەم دانا و بە شاگردەکانم گوت: بیکوتن، شاگردەکان کە ئەوەیان چاو پێکەوت، واقیان وڕما، زۆریان لا عەجایب بوو، گوتیان مامۆستا بۆ خاتری خوا ئەوە چ حاڵەتێکە؟ دەفەرموێ: دووبارە بە سەر شاگردەکانمدا نەڕاند و گوتم: حەقتان نەبێ بە سەرەوە، ئێوە بیکوتن، گوتیان: کوێ بکوتین؟

دەڵێ: کاتێ هاتمەوە سەر خۆ و ئاسنی تواوەم لە دەستی خۆمدادی، زانیم کار لە کار ترازاوە و ڕازی نهێنیم ئاشکرا بووە و ئەو ئایەتەی سوڕەی زومەڕ، کە کوێرەکە خوێندیەوە، کاری خۆی کردووە، دووکانم داخست و ڕووم کردە ڕیازەت و گۆشەگیری و موڕاقەبە.

دەڵێن وەهای تەرکی عەلاقە بە خەڵک و دنیاوە کردبوو، لە نزیک ماڵەکەی، ڕۆژانە کۆمەڵێک کۆ دەبوونەوە و مامۆستایەک، حەدیسی پێدەگوتن و بۆی شەرح دەکردن. ڕۆژێک عەرزی «ئەبوو حەفسیان» کرد، گوتیان: قوربان، ئەو مامۆستایە فەرمایشتەکانی زۆر جوان مەعنا دەکا، ئەوە بۆ جەنابیشت نایەی گوێی لێ بگری؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئەوە چەند ساڵە دەم هەوێ، خۆم لە ژێر باری یەک حەدیسی پێغەمبەر ڕزگار بکەم، تا ئێستا نەم توانیوە، جا چۆن بێم گوێ لە حەدیسی تر بگرم! گوتیان: قوربان، ئەو حەدیسە کامەیە؟ فەرمووی: ئەو

حەدیسەیە کە حەزرەت (دروودی خوای لە سەر بێ)، فەرموویەتی: [مِنْ حُسنِ إِسلامِ المَرْءِ تَرْكُهُ مَالاٰ يَعْنِيهِ] لە جوانی ئیسلامیەتی ئینسانە، تەرکی ئەوشتانە بکا، کە بە کاری ئەو نایەن و خۆی لەو شتانە هەڵ نەقووتێنێ، کە مەتڵەبی ئەو نین.

شێخ ڕۆژێک لە گەڵ چەند هاوڕێی، دەچێتە دەشت و سەحرا و لە نکاوێک ئاسکێک لە دوورەوە ڕا دێ و دەچێ لە تەنیشت شێخ ڕادەوەستێ، شێخ دەست دەکا بە لە خۆدان و گریان و هاوار، تا ئاسکەکە دەڕواتەوە، کاتێ شێخ هاتەوە سەرخۆ عەرزیان کرد: قوربان، ئەوە چی بوو، بۆ وات کرد؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر لە پێش ئەوەدا کە ئاسکەکە بێ، بە خەیاڵمدا هات گوتم: خۆزگە من مەڕێک بوومایە و ئەم شەو ئەو خەڵکەم تێر بکردایە لە گۆشت، فەرمووی: من لە خەیاڵەکەم نەبوومەوە، کە خوای گەورە ئەو ئاسکەی بۆ ناردین. گوتیان قوربان کەسێک کە خواوەندی گەورە ئاوای فریا کەوێ، بۆ دەبێ ئاوا ناڕەحەت بێ و بگری و لە خۆی ڕاکێشێ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئێوە مەعنای ئەوە نازانن، نازانن کە زۆر لەوانەی کە خوای گەورە ئارزوویان پێک دێنێ، ئەوە عەلامەت و نیشانەی دەرکردنیانە، لە قاپی ڕەحمەتی خوا. گوتیان قوربان، چۆن وایە وکەی وا بووە؟ فەرمووی: ئەی خوای گەورە، ئارەزووی فیرعەونی پێک نەهێنا و ئاوی نیلی بۆ جاری نەکرد، کە چی لە قاپی ڕەحمەتی خواش دەرکرا، فەرمووی: منیش لەوە ترسام، بۆیە بە گریانەوە ئاسکەکەم ناردەوە.

زۆر جاری وابوو، کە لە سەر شتێک توورە دەبوو، بۆ ئەوەی توورە بوونەکەی نەمێنێ، ڕووی خۆی خۆش دەکرد و بە قسەی خۆش لە بیری خۆی دەبردەوە.

کەس بە قەد «شێخ ئەبوو حەفسی حەدداد» زەرەر و زیانی خەڵکی پێ ناخۆش نەبووە، ڕۆژێک تووشی پیاوێک بوو، دەگریا و هاواری دەکرد و لە خۆی دەدا، شێخ فەرمووی: کاکە بۆ وا دەکەی؟ کابرا گوتی: یا شێخ لە سەروەت و ماڵی دنیا کەرێکم بوو، ئێستاش خوا نەبێ، کەس نازانێ چی لێ بەسەر هاتووە. شێخ زۆری

بەزەیی پێدا هاتەوە و ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، قەسەم بە عیززەت و عەزەمەت و جەلالی تۆ، هەنگاو هەڵناهێنمەوە، تا کەرەکەی پەیدا نەبێتەوە، بە ئەمری خوا زۆری نەخایاند کەرەکەی هاتەوە.

ئەبوو عوسمانی حیری دەفەرموێ: جارێک عەرزم کرد: قوربان، ئیجازەم بدە، زۆرم پێخۆشە لەم ڕۆ بەدۆاوە ئامۆژگاری خەڵک بکەم، لە وەڵامدا فەرمووی: چی هەڵی ناوی بۆ ئەوەی ئامۆژگاری خەڵک بکەی؟ گوتم: قوربان، ڕەحم و شەفەقەت پاڵی پێوە ناوم. فەرمووی: باشە دەرحەق بە خەڵک تا چە ئەندازەیەک بە ڕەحمی؟ گوتم: قوربان، تا ئەو ئەندازەیە، کە ئەگەر خواوەندی گەورە، لە جیاتی هەموو موسوڵمانان من بەرێتە دۆزەخ و عەزابم بدا، پێم خۆشە و فەخری پێوە دەکەم.

فەرمووی: دەفەرموو: لەم ڕۆ بە دواوە، دەست پێ بکە، بەڵام ئاگادار بە، لە پێشدا ئامۆژگاری نەفسی خۆت بکە، لە خۆت بایی نەبی و کۆبوونەوەی خەڵک لە دەورت مەغرورت نەکا و خۆت لێ نەگۆڕێ و بزانە کە خەڵک بە ئاشکرا موراقەبەت دەکەن، بەڵام خواوەندی گەورە، بە نهێنی موراقەبەت دەکا.

ئەبوو عوسمان دەڵێ: چووم مەجلیسم ئارایشدا و چوومە سەر دوانگە، دەستم کرد بە مەوعیزە و ئامۆژگاری، نەمزانی بوو کە شێخ بە نهێنی هاتوەتە نێو مەجلیسەکەوە، لە ئاخیری مەوعیزەکەدا بووم، کابرایەک هەستایە سەر پێ و گوتی: خەڵکینە، کراسم لە بەردا نیە، کراسێکم بدەنێ، ئەبوو عوسمان دەڵێ: منیش لە پێش خەڵکەکەدا، کراسەکەی خۆم بۆ کابرا داکەند و دامێ.

تەماشام کرد شێخ زۆر بە توورەییەوە لە ناو خەڵکەکەدا ڕاست بووە و گوتی: [يَا كَذَّابُ اِنْزِلْ مِنَ الْمِنْبَرِ] ئەی درۆزن، وەرە خوارێ لە سەر ئەو مینبەرە، دەڵێ: زۆر خەجاڵەت بووم و هاتمە خوارەوە، چووم عەرزم کرد: قوربان، چ درۆیەکم کردووە، ئاوات خەجاڵەت کردم؟ فەرمووی: ئاخر تۆ لە لای من نەتگوت، من

خەڵکم زۆر خۆش دەویٚ؟ ئەی بۆ چی ڕانەوەستای تا خەڵک کراس بدەن بەو کابرایە و خێرەکە بۆ ئەوان بیٚ؟ تۆ گورج کراسەکەی خۆت بۆ دانا، تا خێرەکەی بۆ خۆت بیٚ، ئەگەر ڕاستت بکردایە، دەبوو تۆزێک ڕاوەستی تایە و بتزانیایە داخۆ کەس دەیداتیٚ، یان نا؛ جا ئەگەر کەس نەیدایە، ئەو کاتە تۆ بتدایە، مادام وات نەکرد، دیارە تۆ درۆزنی و دوانگە، جێگای تۆ و ئەمساڵی تۆ نیە.

دەڵێن ساڵێک لە خۆراسانەوە، تەشریفی هات بچیٚ بۆ حەج، مەنسوب و موریدێکی زۆری لە خزمەتا بوو، کاتیٚ گەیشتە بەغدا، شێخ جونەیدی بەغدادی تەواوی مورید و سۆفی خانەقای نارد بە ئیستیقبالیەوە، کە هاتە خانەقاکەی شێخ جونەید، پیاوە گەورەکانی شاری بەغدا، خەبەریان زانی و هاتنە خزمەتی.

ئەوانەی لە ئێرانەوە لە خزمەتیدا هاتبوون، لە ناو خۆیاندا گوتیان: بە ڕاستی زۆر ناخۆشە کە گەورەترین عالم و شێخی خوراسان، بێتە بەغدا و ئەو هەموو پیاوە گەورانە بێنە خزمەتی و نەزانیٚ بە عەرەبی قسەیان لەگەڵ بکا.

ڕاوی دەڵیٚ: بەڵام [سبْحَانَ اَللّٰه]، کاتیٚ هاتنە خزمەتی و دەستی کرد بە قسە، عەرەبیەکی وا جوان و فەسیحی دەست پیٚ کرد، دەتگوت چەند ساڵ لە عەرەبستان ژیاوە، تەواوی ئەوانەی هاتبوونە خزمەتی لایان عەجایب بوو.

«شێخ ئەبوو حەفس» لە ناو خەڵکدا ئەوەندە بە سام و هەیبەت بوو، هیچ سۆفی و موریدێک نەی دەتوانی، پڕ بە چاوان تەماشای بکا و لێی بڕوانیٚ، نەیان دەتوانی تا ئەمریان پیٚ نەکا دانیشن.

دەڵێن جارێک شێخی شبلی دەعوەتی کرد و یەک دوو مانگ مەرەخەسی نەکرد، هەر ڕۆژە تەعامێکی بۆ ئامادە دەکرد، ئەو ڕۆژەی کە گەڕایەوە، لە کاتی خوا حافیزیدا، ڕووی کردە شێخی شبلی و فەرمووی: ئەی ئەبوو بەکری شبلی، ئەگەر تۆ هاتی بۆ نەیشابوور، فێری میوانداریت دەکەم، شێخی شبلی فەرمووی: بۆ، یا شێخ چیم کردووە؟ فەرمووی: خۆت زۆر بە ئێمەوە ناڕەحەت کردووە و تەکلیفی

زیادت کێشا.

لە پاش ماوەیەک شێخی شبلی چوو بۆ نەیشاپوور، بوو بە میوانی «شێخ ئەبوو حەفسی حەددادا»، شێخ ئەمری کرد چل و یەک چرایان بە شەو هەڵکرد، بەڵام لە خواردندا، خواردنێکی زۆر سادەیان دانا، شێخی شبلی ڕووی کردە شێخ و گوتی: قوربان، تۆ لە بەغدا نەتفەرموو: نابێ بۆ میوان زیاد خەرجی بکەی؟ ئەی بۆ چی جەنابت ئەو هەموو چرایەت هەڵکردووە؟

فەرمووی: دە هەستە ئەوەی بۆ خوا نیە و زیادەیە بیکوژێنەوە، شێخی شبلی هەستا، لەو چل و یەک چرایە، یەکێکی بۆ کوژایەوە، زۆری لا سەیر بوو. گوتی: یا شێخ، ئەوە چ حاڵەتێکە؟ فەرمووی: ئاخر ئێوە چل کەس میوانن، بۆ هەر یەکێک لە ئێوە چرایەکم داگیرساندووە و بۆ خۆم یەک، جا ئەوەی لە بەر خاتری ڕەزای خوا، بۆ ئێوەم هەڵکردووە، بە تۆ ناکوژێتەوە و ئەوەی لە بەر خاتری خۆم بوو کوژایەوە.

فەرمووی: بەڵام ئەوەی لە بەغدا تۆ دەتکرد، تەکلیفی تێدا بوو، لە بەر خاتری من بوو، زۆرم پێ ناخۆش بوو، فەرمووی: نابێ بە هاتنی میوان زەحمەتی زۆر بکێشی و باری سەرشانت گران بکەی، نەوەک میوانی ئەم زەمانە کە دەبێتە بارێکی زۆر گران لە سەر شانی خاوەن ماڵ و دەبێ زیادە مەسرەفی زۆری بۆ بکا. دیارە ئەو جۆرە میوانانە، زۆربەی خاوەن ماڵ بە هاتنیان باری سەرشانیان گران دەبێ و بە ڕۆیشتنیان دڵخۆش دەبێ.

شێخ ئەبوو عەلی سەقەفی، (ڕەزای خوای لێ بێ)، دەفەرمووێ: جارێک شێخ مەوعیزەی بۆ خەڵک دەکرد. فەرمووی:

[مَنْ لَمْ یَزِنْ اَفْعَالَهُ وَ أَحْوالَهُ فِي كُلِّ وَقْتٍ بِالْكِتَابِ وَ السُّنَّةِ وَ لَمْ یَتَّهِمْ خَواطِرَهُ فَلاٰ تُعَدَّهُ فِي دیواٰنِ اَلرِّ جالِ] هەر کەسێک قەول و فیعل و کردەوە و ئەحواڵی خۆی، بە تەرازووی قورئان و حەدیس هەڵنەکێشێ و وەزنی نەکا و لە خۆی ڕازی بێ، نابێ

لە دیوانی پیاواندا ناوی بنووسرێ.

عەرزیان کرد: قوربان، پیاو بێ دەنگ بێ باشترە، یان قسە بکا؟ فەرمووی: ئەگەر ئینسان ئافەتی قسە کردنی بزانیایە و لەززەتی بێدەنگی وەربگرتایە، لە بەر خوای گەورە دەپاڕایەوە، کە دوو ئەوەندەی حەزرەتی نووح تەمەنی درێژ بوایە و لە بێدەنگی‌دا سەرفی بکردایە.

عەرزیان کرد: ئەی قوربان، ئەحکامی فەقیری و ئادابی دەروێشی و دەروێش کامەیە؟ [قالَ: حِفظُ حُرُماتِ اللهِ وَ حُرماتِ المَشايخِ وَ حُسنُ العِشرَةِ مَعَ الأَخوانِ وَ النَّصيحةُ لِلأَصاغِرِ وَ تَركُ الخُصوماتِ في الأَرزاقِ وَ مَلازَمَةُ الايـثارِ، وَ مُجانَبَةُ الأدخارِ وَ تَركُ صُحبَةِ مَنْ لَيسَ مِنْ طَبَقَتِهِمْ وَ المُعاوِنَةُ في أمُورِ الدِّينِ] فەرمووی: ئەحکام و ئادابی دەروێشی و دەروێش ئەوەیە، کە ئەوەی خوا حەرامی کردووە، خۆی لێی بپارێزێ و حورمەتی پیاوی چاک و مەشایخی لابێ و لە گەڵ برای دینیدا بە مودارابێ و ئامۆژگاری لە خۆی بچوکتر بکا و بۆ ژیان خۆی تووشی کێشە نەکا و چاکەی خەڵکی بوێ و شت زۆر زەخیرە نەکا و ڕەفاقەتی پیاوی خراپ نەکا و لە کاری و باری دیندا یارمەتی خەڵک بدا. فەرمووی: [قالَ الکَرَمُ طَرْحُ الدُّنيا لِمَنْ يَحتاجُ إلَيها وَ الأَقبالُ عَلیٰ اللهِ لاِحتِياجِکَ إلَيهِ] کەرەم و پیاوەتی ئەوەیە، دنیا حەواڵەی ئەو کەسە بکەی کە پێویستی پێیە و ڕوو بکەیتە ئەو خوایەی کە تۆ پێی موحتاجی.

فەرمووی: خەڵکینە، ترس لە خوا، چرای دڵی ئینسانە و چاکە و خراپە، خێر و شەڕی دڵ، بە چرای ترس دەبیندرێ و گەورەترین وەسیلە، بۆ بە خوا گەیشتن، ڕازی بوون بەو بەشەیە، کە خوای گەورە بۆی قەرار داوی، و ئەویە پەیڕەوی لە سوننەت و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر بکەن و داوای قووتی حەڵاڵ بکەن.

گوتیان: ئەی قوربان تۆ بۆ دنیات ناخۆشدەوێ؟ فەرمووی: لە بەر ئەوەی هەر سەعاتە، ئینسان تووشی گوناهێکی تر دەکا. گوتیان: ئەی عەبدایەتی ڕاستەقینە

کامەیە؟ فەرمووی: عەبدایەتی ڕاستەقینە ئەوەیە، کە ئەوەی ئەمر بە کردنی کراوە بکەیت و ئەوەی نەهی لێ کراوە نەی کەی.

فەرمووی: ئێوە نازانن کە گوناه قاسید و بەرید و پەیکی کوفرە، چۆن ژەهریمار بەریدی مەرگە، گوناە کردنیش ئاوا بەریدی کوفرە، فەرمووی: ئەوەی ئیمانی وابێ کە لە پاش مردن زیندوو دەکرێتەوە و حیسابی لە گەڵ دەکرێ، بەڵام دەست لە گوناە هەڵنەگرێ، ئەوە مەعنای وایە کە ئیمانی بە دوا ڕۆژ نیە.

یەکێک عەرزی کرد: ئامۆژگاریەکم بکە. فەرمووی: لە قاپی دەرگا و بارەگای خوا دوور مەکەوە رەوە پەکت ناکەوێ و پیاوی یەک سەیید بە، تا ساداتی دنیا سەری تەعزیمت بۆ دانەوێنن.

دەڵێن جارێک تەوافی کەعبەی دەکرد، تەماشای کرد فەقیر زۆر لە حەرم دا کۆبوونەوە، کە ئەوەی دی حاڵەتێکی بە سەردا هات، جەزبەی گرت و دەستی دایە بەردێک و ڕووی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی خاوەنی کەعبە، قەسەم بە گەورەیی خۆت، ئەگەر شتێک بۆ ئەم هەژارانە نەنێری، تەواوی چراکانی حەرەم دەشکێنم، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، یەکێک هات کیسە دراوێکی دایە، تا دابەشی بکا بە سەریاندا.

جا ئەو زاتە بەرزە، لەساڵی دوو سەد و شێست و چواری کۆچیدا، لە شاری نەیشاپوور وەفاتی فەرموو. ئەوەبوو بە کورتی باسی «شێخ ئەبوو حەفسی حەدداد»، ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ و خوای گەورە لە هەموو لایەکمان خۆش بێ و عەفوومان کاو لە شەڕی شەیتان و بەڵای زاڵمان بمان پارێزێ و ئیمانمان سەلامەت کا. [ئامین یٰا رَبَّ ٱلعٰالَمِینْ.]

**وَ صَلیٰ الله عَلَی سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّم وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ**

# (٣٥)

## باسی ئەبووسەهلی توستەری

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَـمْدُ لِلّٰهِ عَـلىٰ مـا أنْـعَمَا حَمْداً بِهِ يَجْلُو عَنِ ٱلقَلْبِ الْـعَمىٰ
ثُمَّ الْـصَّلَوةُ بَـعدُ وَ السَّـلامُ عَـلىٰ نَـبِيّيٍ دِيـنُهُ الإِسْـلاَمُ
مُحَـمَّدٍ خَـاتَمِ رُسْـلِ رَبِّـهِ وَ آلِهِ مِـن بَـعْدِهِ وَ صَـحْبِهِ[1]

موسوڵمانینە، تا ئێستا زۆر کات و سەعاتی تەمەنمان بە فیڕۆ ڕۆیشتووە و هیچ سوودمان لێ دەست نەکەوتووە، وەرن با لە چەند دەقیقەی دهاتووی ژیانماندا، بچینە کۆڕو و مەجلیسی گەڕیدەی دەشتی تەریقەت، مەلەوانی دەریای حەقیقەت، ڕۆژی ئاسمانی عیبادەت، مانگی چواردەشەوی، شەوی سەعادەت، لە کەرامەت دا بێ نەزیر، لە حەقیقەتدا بێ وەزیر، لە زانیاریدا بێ وێنە، لە مەعانیدا ئاوێنە، سەرچاوەی ڕەزا، شەرەفی ئەولیا، نوختەی دائیرەی وەفا، پەروانەی شەمعی ڕەجا، شێخی دانای ڕەببانی، جەنابی «شێخ سەهلی خۆراسانی». جا با بە گوێی دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

خەڵکینە، خۆ ئەگەر لە گوێ ڕاگرتن و دانیشتن لە کۆڕ و مەجلیسی هەر یەک

---

١ - شێخ مەعروف.

لەو پیاوە گەورانەدا، تەنیا ڕۆژێ لە چەند چرکە ساعەتێکدا، پەند و ئامۆژگاریەک وەرگرین و زاخاوی بیر و باوەڕ و عەقیدەمانی پێ بکەینەوە و مشت وماڵی چڵک و ژەنگی بێ بڕوایی پێ بکەین، ئەوە هەر زۆر قازانج دەکەین، خۆ هەمووتان دەزانن، کە زۆربەی کاتی تەمەنمان بە فیڕۆ دەڕوا و لە دەستمان دەچێ، بە خۆڕایی. بەڵام خاتر جەمع بن لە گوێ گرتن بۆ باسی بەسەرهات و فەرمایشتی ئەو پیاوە گەورانەدا بێ ئەجر نابن.

«شێخ سەهلی توستەری خوراسانی»، یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی ئەهلی تەسەووف و لە گەورەی ئەولیای سەردەم و زەمانی خۆی، عولەمای زاهیر زۆر بە کەمی باوەڕیان بە شێخان هەیە، بەڵام سەبارەت بە «شێخ سەهل» فەرموویانە: «شێخ سەهلی خوراسانی»، یەکێک بووە لەو ئەولیایانەی، کە عیلمی زاهیر و باتنی بووە.

دەڵێن: هەر لە کاتی گەنجی و لاویدا، ئاساری گەورەیی بە ناوچاوانەوە دیار بووە، لە کاتێکدا کە ئەو منداڵ بوو، خاڵی شەو نوێژی دەکرد، ئەویش وەک خاڵی هەڵدەستا و دەستی دەکرد بە نوێژ کردن، تاوای لێهات شیرینی لەززەتی عیبادەتی چێشت و زکری «الله»ی دەست پێکرد.

ڕۆژێک خاڵی گوتی: وەرە با بت بەم بۆ لای مامۆستا دەرست پێ بڵێ، لە وەڵامدا گوتی: خاڵە، بە شەرتێ دەچم کە هەر ساعەتێک لای مامۆستا بم و لە دوای دەرسەکەم، بگەڕێمەوە سەر کاری خۆم، بەو قەرارە لە گەڵ خاڵیدا چوە خزمەت مامۆستا و قورئانی خەتم کرد و لە تەمەنی حەوتساڵیدا، دەستی کرد بە ڕۆژووو گرتن و بە خواردنی نانی جۆ.

خۆی دەفەرمۆی. کاتێ تەمەنم گەیشتە دەساڵی، تووشی مەسئەلە و ڕووداوێک بووم، بە کەس حەل نەکرا، داوام کرد لە خاڵم ڕێگایەکم نیشاندا، حەواڵەی شاری بەسرای کردم، کاتێ گەیشتمە بەسرا و چوومە لای زاناکان،

ئەوانیش پێیان حەل نەبوو. ناچار گەڕامەوە و هاتمە ئابادان، پرسیارم کرد گوتیان: پیاوێکی زانای بەرز، بە ناوی حەبیبی حەمزە لێرەیە، چوومە خزمەتی و شەرحی مەسئەلەکەم بۆ کرد، گورج وەڵامی دامەوە، زۆری لە خـزمەتدا مـامەوە و زۆرم ئیستفادە لێ کرد، لە پاشان گەڕامەوە توستەر و هاتمەوە خوراسان.

دەڵێن بە زۆری لە مانگی شەعباندا بە ڕۆژوو دەبوو، لە مانگی ڕەمەزانیشدا تا بەیانی هەر شەو نوێژی دەکرد. ڕۆژێک فەرمووی: خەڵکینە، تۆبە کردن واجبە لە سەر عەبد و بەندەکانی خوا، چ گوناهبار و عاسی بن، ئەو عەبد و بەندانە، یا پیاو چاک و بەدین بن، چونکە ئینسان خاڵی لە نوقسان نیە.

لە شاری توستەردا، پیاوێک بوو لە ناو خەڵکدا بە پیاو چاکیان ناو دەبرد، ئەو پیاوە ڕەخنەی لە قسەکەی ئەو گرت و لە ناو خەڵکدا دیعایەی خراپی بۆ دەکرد و دەیگوت: سەهل فتوای بێ شەرعی دەدا، چۆن تۆبە لە سەر چاک و خراپ و بە دین و بێ دین فەرزە؟ دەیگوت: چۆن دەبێ پیاوی بە دین تۆبە لە دین بکا؟!

ڕاستە ئەو پیاوە لە ناو خەڵکدا بە پیاوی باش و بە دین بە ناو بانگ بوو، بەڵام نەگەیشتبوو ئەو دەرەجە کە زانیاری تەواوی هەبێ و لە قسەی هەموو زانایەک حاڵی بێ. «شێخ سەهلیش» زۆر پێی خۆش نەبوو کێشەی لە گەڵ بکا، تا ڕۆژێک عیشق و سۆزی دین بەرەنگاری هات و داوێنی گرت و تەواوی مڵک و ماڵ و باغ و باغات و فەرش و ئەشیای ناو ماڵ و پوڵ و پارە و هەر کەل و پەلێکی بوو، هەر یەکەی لە پـارچـە کـاغەزێکی نـووسی و بـانگی کـرد، تـەواوی خـەڵکی شـار کۆبوونەوە و هەر هات و هەموو پارچەکاغەزەکانی بە سەر خەڵکەکەدا هەڵدان و، ئەوەی پارچە کاغەزێکی وەرگرتایە، ناوی چی لە سەر نووسرابوو، ئەو شتە بـۆ ئەو بوو.

ئەویش لە شوکرانەی ئەوە کە عالەمەکە بە قسەیان کرد و هاتن شتەکانیان قبوڵ کرد، سوجدەی شوکری برد و خوا حافیزی لە خەڵکی شار کرد و بەرەو وڵاتی

حیجاز و مەکە و «مەدینە» کەوتە ڕێ.

لە ڕێگادا ڕووی قسەی کردە نەفسی خۆی و گوتی: ئەی نەفسی هەوەس باز، بزانە کە ئیتر هیچم نەماوە، تکات لێدەکەم دان بە خۆتدا بگرە و لەوە زیاتر ئارەزووی شت مەکە، چونکە تازە لە لایەن منەوە هیچت دەست ناکەوێ.

بەڵام کاتێ گەیشتە شاری کوفە نەفس ڕووی کردە شێخ و گوتی: تا ئێرە هیچم لێ داوا نەکردی، بەڵام ئێستا ئارەزووی نان و گۆشتی ماسی دەکەم، تەماشای کرد کابرایەکی ئاشەوان، وشترێکی بەستبووە و بەرداشەکەی پێ هەڵدە سوڕاند و ئاشی پێ لێ دەکرد، چوە لای ئاشەوان و گوتی: کاکی ئاشەوان، کرێی ئەو وشترە ڕۆژانە چەندە؟ ئاشەوان گوتی: بۆ چی دەپرسی؟ ڕۆژی دوو دەرهەمە. شێخ گوتی: ئەگەر ڕازی دەبی، وشترەکە بەرەڵا بکە، ڕۆژێ بە دەرهەمێک من کاری ئەوت بۆ دەکەم، کابرا زۆری پێ خۆش بوو، گورج چوو وشترەکەی کردەوە و ئەو چو دەستی کرد بە هەڵسوڕان تا ئێوارە، ئێوارە دەرهەمەکەی وەرگرت و چوو، دای بە نان و گۆشت ماسی و دەرخواردی نەفسی داو ڕووی کردە نەفسی و گوتی: ئەی نەفسی تەماعکار، بۆ ئارەزووی تۆ تووشی شوغلی وشترو ئێسترانیش دەبم، تکایە ئارەزووی شتی زۆر نەکەی.

ئینجا لە شاری کوفەوە ڕۆیشت بۆ حیجاز و زۆر لە شاری مەککەدا مایەوە و بە خزمەت زۆر لە پیاو چاکان و مەشایخان گەیشت و بە تایبەتی کە چاوی بە زوننون میسری کەوت عاشقی بوو، بوو بە خەلیفە و موریدی و هاتەوە ئەهواز و خوراسان.

بەڵام ئەوجارە، بە پێچەوانەی جاران، پشتی نەدەکردە دیوار تا ڕوو بکاتە خەڵک و قاچی ڕانەدەکشایەوە و قەت ئامۆژگاری نەدەکرد و وەڵامی پرسیاری کەسی نەدەدایەوە و نەدەچوە سەر مینبەر.

چوار مانگ لە سەریەک قامکی پێی ڕابەست، کەس نەیزانی بۆچی ڕای

بەستووە، تا ڕۆژێک دەروێشێک عەرزی دەکا و دەڵێ: قوربان، ئەوە قامکت بۆ ڕابەستووە؟ چی لێ هاتووە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: دەروێش هیچی لێ نەهاتووە. دەروێش وەڵامەکەی بە دڵ نابێ بەڵام دەنگ ناکا، تا واڕێکەوت، دەروێش لە پاش ماوەیەک لە خوراسانەوە چوو بۆ میسر و لەوێ چوو بۆ زیارەتی شێخ زوننون میسری، کە تەماشای کرد شێخ زوننون قامکی قاچی پێچاوە! عەرزی کرد: قوربان، ئەوە قامکت چیەتی و لەکەیەوە بەستووتە؟ شێخ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە ماوەی چوار مانگ و چەند ڕۆژە ئازاری پێگەیوە و بەستوومە. فەوری دەروێش «شێخ سەهلی» کەوتەوە یاد و زانی کە هەر لە بەر ئەزیەتی قامکی ئوستادەکەی، قامکی خۆی بەستبوو، زانی کە ئەو کاتە وەڵامەکەی بە ڕاست دابوەوە کە فەرمووی هیچی نیە!

جا سەیری کەشف و کەراماتی زوننون میسری بکەن، لەو کاتەدا کە دەروێش ئەو پرسیارەی لێ کردو وەڵامی دایەوە؛ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: خەڵکینە، پیاوی باش زۆرن، تا ئێستاش پیاوی واهەیە ئاگای لە ئازار و دەردی ئێمە هەبێ و لە بەر ڕەزای خوا و لە بەر حورمەتی ئوستادی، قامکی خۆی ببەستێ.

[يٰا مُحَوِّلَ الْحٰالِ وَ الأَحْوالِ حَوِّلْ حٰالَنٰا اِلیٰ أَحْسَنِ الْحٰالِ] دەڵێن بە ئەمری خوا ڕۆژێک حاڵی گۆڕاو و لە پاش خوێندنی سوورەی فاتیحا و گریانێکی زۆر، هات دەستنوێژی تازە کردەوە و بە پێچەوانەی لەمەو بەری، بە چۆکداهات و پشتی کردە دیوار و ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: [سَلُونِي عَمّٰا بَدالَكُمْ] پرسیارم لێ بکەن، لە هەرچی بە دڵتاندادێ، تا وەڵامتان بدەمەوە، خەڵک زۆری پێ عەجایب بوو، کە تا دوێنێ چۆن بوو، ئێستا چۆنە؟ عەرزیان کرد: ئەی قوربان، بۆ تا ئێمرۆ وا نەبووی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر ئێوە نازانن، تا ئوستاد تەشریفی حازر بێ و لە حاڵی حەیاتدا بێ، نابێ قوتابی و شاگردی وەڵامی پرسیاران بداتەوە، دەبێ بە

ئەدەب بێ و شەرم لە ئوستادەکەی بکا و بێ ئەدەب نەبێ، ئەو قسەشیان زۆر لا سەیر بوو. کاتێ خەبەری وەفاتی شێخ زوننون میسری گەییە خوراسان، کە ئوستادی «شێخ سەهل» بوو، کە حیسابیان کرد لەو ڕۆژەدا وەفاتی کردبوو.

دەڵێن «شێخ سەهل» دۆعای زۆر زوو گیرا دەبوو. جارێک عەمرولەیس، کە حاکمی وڵاتی خوراسان بوو، تووشی نەخۆشییەک بوو، بە هیچ دەوا و دەرمان و دکتۆر چاری نەدەکرا، زۆر ناڕەحەت بوو، گوتیان: ئەگەر «شێخ سەهلی» خوراسانی بێت و دۆعای بە سەردا بخوێنێ، شیفای بۆ دێ، ناردی بە دوای‌دا، شێخ لەبەر ئەوەی دەبێ بە قسەی وەلی ئەمری موسوڵمانان بکەی، هەستا چوو، کاتێ چوەلای سەلامی کرد و دانیشت فەرمووی: دوعا بۆ کەسێک گیرا دەبێ، کە تۆبە لە گوناه بکا و وەگەڕێ بۆ لای خوا. فەرمووی: وەک زانیومە تۆ چەندکەست زیندانی کردووە، دەبێ هەمووان ئازاد بکەیت و تۆبە بکەیت، جا دۆعات بۆ دەکەم. عەمرولەیس فەوری ئەمری کرد، گرتووەکانیان بەردا و خۆشی تۆبەی کرد، ئنجا شێخ ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە! هەروەکوو زەلیلی گوناهت نیشانی عەمرولەیس دا، عیززەتی عیبادەتیشی نیشان بدە، وە هەروەکوو لە باتیندا لیباسی پەشیمانیت لە بەر کرد، بە زاهیریش لیباسی عافیەتی لە بەر بکە. ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا هەر کە لە دۆعاکە بووەوە، عەمرولەیس شیفای بۆ هات و چاک بووەوە. بەڵێ دۆعای عەبدانی ڕاستەقینە زوو گیرا دەبێ.

«شێخ سەهل» خاوەنی کەشف و کەرامات بوو، زۆر جار دەیاندی بە سەر ئاودا دەڕوا و تەڕ نابێ. عەرزیان کرد: قوربان، بە سەر ئاودا دەڕۆی و لیباسەکانت تەڕ نابن! لە وەڵامدا فەرمووی: بچن لە مجێوری مزگەوت پرسیار بکەن، کاتێ لە مجێوریان پرسی، گوتی: لەم ڕۆژانەدا شێخ خەریکی غوسڵ بوو، چوە ناو حەوزی مزگەوتەوە، ئەگەر فریای نەکەوتمایە دەخنکا.

شێخ ئەبوو عەلی دەقاق دەفەرموێ: «شێخ سەهل» کەشف و کەراماتی زۆر

بوو، بۆیە بە ئاشکرا چووڵە حەوزی مزگەوتێ ئاوا خۆی نواند تا لە پێش چاوی خەڵک دایان پۆشێ.

شێخ جارێک فەرمووی: شەوێک لە خەومدا ڕۆژی قیامەت بوو، تەواوی خەڵک لە مەیدانی مەحشەر ڕاوەستابوو، لە ئاکاوێک تەیرێکی سپی دەهات و لە ناو خەڵکەکەدا یەکێکی هەڵدەگرت و دەی برد بۆ بەهەشت. دەڵێ: لە خەوەکەمدا پرسیارم کرد ئەوە چ تەیرێکە؟ گوتیان: ئەوە خواوەندی گەورە ڕەحمی بە هێندێک لە عەبد و بەندەکانی خۆی کردووە، دەیان بەن بۆ بەهەشت. دەفەرموێ: لە خەوەکەمدا لەو گفتووگۆیەدا بووم، لە ناکاو کاغەزێک لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە، کە تەماشام کرد، نووسرابوو ئەو تەیرە ناوی وەرعە، هەر کەسێک لە دنیادا وەرع و تەقوای بووبێ، لەو ڕۆژەدا فریای دەکەوێ و بە بێ موحاسەبە دەی با بۆ بەهەشت.

شێخ لە مەوعیزەدا زۆر شتی جوانی دەفەرموو، دەیفەرموو: قاعیدە و ئوسولی ئێمەی دەروێش لە سەر شەش شت دامەزراوە: یەکەم، پەیرەوی لە قورئان. دووەم، ئیقتیدا بە سوننەتی پێغەمبەر. سێیەم، خواردنی لوقمەی حەڵاڵ. چوارەم، ئازار نەدانی دڵی خەڵک، با ئەوانیش ئێمە ئازار بدەن. پێنجەم، دوور کەوتنەوە لە گوناە و بێ شەرعی. شەشەم، پەلە کردن لە پێویستی سەرشانمان و واجباتدا.

دەیفەرموو: شوکرانەی عیلم، عەمەل بە عیلمە و شکورانەی عەمەلیش زیاد بوونی عیلمە و ئەوەی حەرام خۆر بێ تووشی گوناە دەبێ. دەیفەرموو: خوای گەورە لە هەموو دەقیقە و سەعاتی شەو و ڕۆژدا، ئاگای لە هەموو نەفس و دڵێک هەیە، جا هەر دڵ و نەفەسێک پەنا بۆ غەیری خوا بەرێ، خوا شەیتانی بەسەردا زاڵ دەکا.

دەیفەرموو: دەبێ بە تایبەتی سۆفی و دەروێش سێ شت لە بیر نەکەن: یەکەم، ئەسراری خۆیان ئاشکرا نەکەن. دووەم، فەرز و واجباتیان بە تەواوی ئەدا بکەن.

سێیەم، چاویان لە فەقیری خۆیانەوە بێ و زیادە ڕەوی نەکەن.

دەیفەرموو:خەڵکینە! ئینسان تا ئەو چوار خەسڵەتەی تێدا نەبێ شایانی ئەوە نیە کە ببێتە ڕەئیس و گەورەی وڵات. یەکەم، ئەوەیە جاهیلانە لە گەڵ خەڵک نەجووڵێتەوە. دووەم، خۆی بۆ جەهل و نەفامی خەڵک ڕابگرێ. سێیەم، چاوی لەو شتەنەبێ کە بەدەست خەڵکەوەیە چوارەم، لەوەی هەشیەتی بەشی خەڵکی بدا.

دەیفەرموو ئینسانی خاوەن ئیمان و ڕاست و ڕاستەقینە دەبێ نە بە ڕاست و نە بە درۆ سوێند نەخوا، دەبێ غەیبەتی خەڵک نەکا، دەبێ ڕازی نەبێ، کە خەڵک غەیبەتی لە لا بکا. دەبێ زۆر، زۆر خۆر نەبێ. دەبێ وەعدە بە خیلافی نەبێ. دەبێ خو و ڕەوشتی بەرزی بێ. دەیفەرموو: ئێوە بە زۆری و بە هۆی دوو شتەوە خۆتان بە هیلاک ئەدەن: یەکەم، بە هۆی داوا کردنی ڕووتبەو مەقامی بەرزەوە. دووەم، بە هۆی ترسان لە فەقیری. نازانن کە خواوەندی گەورە بەخشندەو ڕەزاقە.

لە هەموو ئان و ساعەتێکدا خوای گەورە عەتا و بەخششی خۆی دابەش دەکا بە سەر خەڵکدا، بەڵام گەورەترین عەتا و بەخششی خوا ئەوەیە، کە بخاتە دڵتەوە زکری خوا بکەیت و خوات لە بیرت نەچێتەوە، دەیەفەرموو: ئەوەی چاوی لە ماڵی حەرامەوە نەبێ تووشی چاو ئێشە نابێ و لە عەرشی خواوە تا فەرشی زەوی هیچ مەکانێک لە دڵی خاوەن ئیمان پیرۆزتر نیە، بۆیە گەورەترین عەتا و بەخششی خوا، کە بریتیە لە خواناسین، لە ناو دڵی ئینسانی خاوەن ئیماندا دانراوە.

دیفەرموو: ڕۆژ نیە کە مەلائیکەیەک لە لایەن خواوەندی گەورەوە جاڕ نەدا و نەڵێ: ئەی عەبد و بەندەی خوا، تۆ زۆر بێ‌ئینسافی، خوای گەورە یادی تۆ دەکاتەوە، بەڵام تۆ یادی خوا فەرامۆش دەکەی، خوا بانگی تۆ دەکا، کەچی تۆ پەنا بۆ یەکێتر دەبەی، خوا بەڵا و موسیبەت لە سەر تۆ لا دەبا، کەچی تۆ لە خراپە ناگەڕێتەوە. دەڵێ: ئەی عەبدی خوا، بەیانی لە ڕۆژی قیامەتا چ عەرزێکت بە دەستەوەیە؟

دەیفەرموو: تەنیا شەرتی ئینسانی چاک ئەوە نیە چاکە بکا، چونکە چاکە پیاوی خراپیش دەیکا، ئینسانی باش ئەوەیە خراپە نەکا. دەیفەرموو: یـادی دوا ڕۆژ و مردن و قەبر و قـیامەت بکـەنەوە، ئـەوەی یـادی دوا ڕۆژ نـەکـاتەوە، تـووشی وەسوەسەی شەیتان دەبێ، عەرزیان کرد: قوربان، نیشانەی گەورەی بـەدبەختی ئنیسان چیە؟ فەرمووی: نیشانەی بەدبەختی ئینسان ئەوەیە، خوا زانات کا، بەڵام تۆفیقی ئەوەت نەدا عەمەلی پێ بکەی، یان عەمەلی پێ بکەی، بەڵام ڕیایی تێدا بکەی.

فەرمووی بەڵام دەخیلتان بم زۆر قەدری زانا و پیاو چاکان بگـرن، چـونکە ڕۆژێک خوای گەورە وەحی کرد بۆ لای حەزرەتی داوود و فەرمووی: [یٰا داوُدُ اِذا رَأَیْتَ طٰالِباً فَکُنْ لَهُ خادَماً] ئەی داوود، هەر کاتێ زانا و خوا پەرەستێکت دی، خزمەتی زۆر بکە. فەرمووی: حەزرەتی داوود لە پاش ئەو وەحیە دەیـفەرموو: خەڵکینە، خزمەتی عالم و پیاو چاک و دۆستانی خوا بکەن. دەی فـەرموو: جـا ئەگەر ئێمە بیر لەو فەرمایشتە بکەینەوە کە خوای گەورە بە حـەزرەتی داوودی فەرمووە: دەبێ خادمی ئەو کەسانە بکەین کە عالم و تالیبی خـوان، نـابێ قـەت عالممان ناخۆش بوێ و دەبێ بە گیان و دڵ خزمەتیان بکەین و گوێ ڕاگرین بۆ ئامۆژگاریەکانیان.

دەیفەرموو: خوای گەورە دەفەرموێ: خۆشی بۆ ئەو کەسانەی کە منیان ناسی و وەڵامیان دامەوە ئیتاعەتیان کردم، ڕزقم دان و حەمد و سەنایان کردم، شتم پێ بـەخشین و شـوکریان لەسـەر کـرد، تـووشی بـەڵا و مـوسیبەت بـوون و ناشوکریاننەکرد.

دەیفەرموو: لە بارەگای خوا وەپاڕێن، ئەگەر تووشی تەنگ و چەڵەمە بوون، چونکە لەو کاتەدا کە عـەبد و بـەندە تـووشی مـوسیبەت دەبـێ و لە بـەر خـوا دەپاڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی مەلائیکەینە، ئەگـەر لەو کـاتەدا کـە عەبدی من تووشی موسیبەت دەبێ و لە بەرم دەپاڕێتەوە، ئەگـەر لە بـەر ئـەوە

نەبوایە کە ئەو عەبدە تەحەممولی کەلامی من ناکا، لە وەڵامدا دەمگوت «لَبّیکَ» یەعنی ئەی بەندە من حازرم لە خزمەتتدا، دەیفەرموو: زکری [لاٰ اِلٰهَ اِلاّٰ اَللّٰه] زۆر بکەن، چونکە پاداشتی زکر، تەماشا کردنی جەماڵی خوایە لە قیامەتا.

دەیفەرموو: هەر تەنگ و چەڵەمە و بەڵا و موسیبەتێک، سەبری لە سەر نەگرن پاداشتی نیە، چونکە پاداشت بۆ کردەوەی خۆتە و زۆریەی بەڵا و موسیبەتیش بە کردەوەی تۆ پەیدا نابن.

فەرمووی: زۆر خۆتان بە دنیا ماندوو مەکەن و تەمەنی خۆتان بە حەممالی بۆ واریسان بە فیڕۆ مەدەن، لە خۆتان زیاد خانوو بەرە دروست مەکەن، چونکە زۆری پێ ناچێ دەبێتە کەلاوە، بە خواردنی زۆر خۆتان ناڕەحەت مەکەن؛ زۆری پێ ناچێ دایدەنێنەوە و خوو زۆر مەدەنە دۆست و ئەحباب، زۆری پێ ناچێ لێک جیا دەبنەوە، تەنیا بە زۆری چاکە و خوا پەرستی بکەن.

«شێخ سەهلی خوراسانی» واعیزێکی زۆر حەقیقی بوو. ئەو ڕۆژە کە وەفاتی نزیک بوەوە، چوارسەد موورریدی عالمی لە دەور بوو، عەرزیان کرد: یا شێخ، ئەگەر خوا نەخواستە وەفات بکەی، کێ جێنشینت دەبێ و دەچێتە سەر مینبەر؟ تەماشایەکی خەڵکەکەی کرد و فەرمووی: شاد دڵی گاور خەڵکەکە لای وابوو شێخ ئاگای لە خۆی نەماوە و دەبزرکێنێ، دەنا چۆن زیاد لەو چوارسەد موریدە گاورێک دەکاتە جێ نشین؟! «شێخ» فەرمووی: کۆڕی زکر دابەستن و «شاد دڵ» بانگ کەن، دەستیان کرد بە زکر و «شاد دڵ» یان بانگ کرد، هاتە خزمەتی شێخ، شێخ فەرمووی: ئەی «شادی دڵ»، سێ ڕۆژ لە دوای مردنی من، لە پاش نوێژی بەیانی، بچۆ سەر مینبەر و ئامۆژگاری خەڵک بکە. ئەوەی فەرموو و وەفاتی کرد.

لە پاش سێ ڕۆژ تازیە و فاتیحا، «شاد دڵ»ی گاور کڵاوێکی گەرگەڕی لە سەربوو، زیدناری لە پشت بوو، هات چوو بۆ سەر مینبەر و گوتی: خەڵکینە، هەمووتان دەزانن کە شێخ منی کرد بە جێ نشینی خۆی و فەرمووی: وەختی ئەوە هاتووە کە زیدناری گاوری هەڵبڕی و بێتە مەیدانێ، هەر لە پێش چاوی خەڵکەکە

چەقۆیەکی پێ بوو، هێنایە دەرو زیننارەکەی پێ هەڵبڕی و کڵاوەکەی دانا و بە دەنگی بەرز و گریانەوە گـوتی: [اَشْهَدُ اَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاَّ اَللّٰه وَ اَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اَللّٰه] «شاد»ە و ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو.

لە پاشان ڕووی کردە خەڵک و گوتی: خەڵکینە، شێخ فەرمووی: پێتان بـڵێم، ئەوەی کە تا ئێستا پیری دەستگیر و ئوستادی ئێوە بـوو، وەفـاتی کـرد و زۆری ئامۆژگاری بۆ کردن، شەرت ئەوەیە، بە دڵ وەرتان گرتبێ.

گوتی ئەوا منیش ناوم «شاد دڵ»ەو تا ئێستا گاور بووم، زیننارى زاهیریم بڕی و فڕێم دا، دەی ئێوەش ئەگەر دەتان هەوێ لە ڕۆژی قیامەتا بە خزمەت شێخ بگەن، زیننارى باتینی بوغزو کیبر و نیفاق ببڕن. خەڵکەکە، کە ئـەوەیان بـیست و ئـەو حاڵەتەیان چاو پێکەوت، دەستیان کرد بە گریان و وەک ڕۆژی حەشری لێهات، کەس ئاگای لە کەس نەما، وەزعێکی زۆر سەرسام ئاوەر پەیدا بوو، ڕاوی دەڵێ: تەواوی خەڵکی شار ڕۆژی وەفاتی شێخ لەگەڵ جەنازەکەی بوو، جوولەکەیەکی هەفتا ساڵە، هاتە ناو خەڵکەکەوە هاواری کرد و گوتی: تو خوا خـەڵکینە، ئـێوە ئەوانە دەبینن، گوتیان کامانە؟ بۆ تۆ چی دەبینی؟ گوتی تەماشا بکەن، مـەلائیکە دەستە بە دەستە دێنە خوار و دەچنە ژێر جەنازەی شێخەوە، هاوری کـرد و بـە دەنگی بەرز گوتی: [اَشْهَدُ اَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاَّ اَللّٰه وَ اَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اَللّٰه] تەواوی خەڵکەکە «شاد»ەیان هێنا و عەهد و پەیمانیان تازە کردەوە.

گوێ گرینە، ئەوە بوو باسی ژیان و بە سـەرهات و فـەرمایشتەکـانی «شـێخ سەهلی خوراسانی»، کە لە ساڵی دووسەد و هەشتا و سێی کۆچیدا و لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا وەفاتی فەرمووە، لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ڕەنجمان بە زایع نەدا و عەفوومان کا و عیبادەتمان قبوڵ کا و لەگەڵ پیاو چاکان حەشرمان کا و لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ اَللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ اَلْسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اَللّٰهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٣٦)

## باسی ئەبول حوسەینی نووری

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَـمْدُ لِلّٰهِ عَـلىٰ الأِسْـلامِ وَ الشُّكْـرُ لِلّٰهِ عَلىٰ الأَنْـعٰامِ
وَ أَفْـضَلُ اَلصَّـلٰوةِ وَ الثَّـنٰاءِ عَـلىٰ اَلنَّـبِيِّ خَـتمِ الأَنْـبِياءِ
وَ آلِهِ أهلِ اَلهُـدىٰ وَ صَـحْبِهِ وَ جُنْدِهِ أهلِ التُّقىٰ وَ حِزْبِهِ[1]

جا ئێستا لە چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، دەچینە ناو باغ و حەدیقەی ژیان و بەسەر هاتی یەکێک لە پیاو چاک و ئەولیای خوا، کە لە زەمانی خۆیدا مەجزووبی وەحدەت بوو، مەسلوبی عیززەت بوو، نوختەی ئەسراڕ بوو، قیبلەی ئەنوار بوو، یەگانەی عەهد بوو، قودوەی وەخت بوو، زەریفی ئەهلی تەسەووف بوو، شەریفی ئەهلی موحیبەت بوو، لە ڕیازەتا بەرگوزیدە، لە موعامەلاتا پەسندیدە، لە ڕموزاتا عەجایب، لە نوکاتا غەرایب، خاوەن نەزەری سەحیح و ساحب فەراسەتی دەقیق، لە عیشقا باکەماڵ، لە شەوقا وەک باڵدار، موفتی عالمان، پێشەوای چاکان، ئەو خۆ کوشتەی لە دەرد و بەلا دووری‌یە، جەنابی «شێخ ئەبولحوسەینی نووری‌یە».

جا زۆر بە بێ دەنگ، گوێ بگرن و مەجلیسەکەمان بە یادی باسی ئەو زاتە بەرزە وەڕازێنین و سوود و فایدەی لێ وەرگرن.

«شێخ ئەبولحوسەینی نووری» لە ئەسڵدا باوک و دایکی خەڵکی وڵاتی

---

١ - شێخ مەعروف.

خوراسان بوون، بەڵام خۆی لە شاری بـەغدا، لە دایک بـووە. هـەر لە تـەمەنی منداڵیدا ئاساری فەڕاسەت و گەورەیی و پیاو چاکی لە ناوچاواندا دیار بوو، زۆر زوو تەواوی عیلمەکانی خوێند بوو، بە ئوستادی زۆر لە زاناکان، هەر چەند لە تەریقەتا موریدی سەڕی سەقەتی بوو، چاوی بە زۆر لە پـیاو چـاکـانی بـەغدا کەتبوو، وەکوو شێخ ڕەقام و ئەحمەدی حواری و شێخ جونەیدی بەغدادی و سەڕی سەقەتی و ئیمامی ئەحمەد و زۆر لە زاناکان. بەڵام خۆی ئەوەندە لە خوا ترس و خاوەن وەرع و زاهید و بە تەقوا بوو، هەر لە زەمانی ئەواندا، بوو بە خاوەن ئیجتیهاد، لە تەریقەتا و ساحب مەزهەب، لە دیندا. عالم و پیاو چاکان زۆریـان خۆش دەویست، لە بەر ئـەوەی کـە زۆر دارای زەکـاوەت و فـەڕاسـەت بـوو، قازانجی خەڵکی زۆر پێ خۆش بوو، ئاگای لە ڕاز و نیازی دڵان بوو. ناویان نابوو [أميرُالقُلُوبِ وَ قَمَرُ الصُّوفيّةِ] واتە ئەمیری دڵان و مانگی نـاو کـۆمەڵی سـۆفیان. قاعیدەی لە تەریقەتا وابوو، تەرجـیحی تـەسەووف دەدا بـە سـەر فـەقیریدا، لە موعامەلەتا زۆر موافیقی شێخ جونەیدی بەغدادی بوو، نووری مەعنا و تەریقەت لە ناو چاوانیدا بە ئاشکرا دیار بوو، ڕێبازی ئەو وابوو، دەیفەرموو: ڕەفاقەت بەبێ ئیسار حەرامە، واتـە دەبـێ ڕەفـیق و هـاوڕێ هـەمیشە قـازانـج و مـەسڵەحەتی هاوڕێکەی لە پێش قازانج و مەسڵەحەتی خۆی بخا.

دەیفەرموو: ڕەفاقەتی دەروێشان وەکوو فەرز وایە و گۆشەگیری پەسەند نیە. دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، ئێستا لە ناو هـەموو شـتێکدا دوو شت زۆر نـایابن: یەکەم، عالمێک کە عەمەل بە عیلمەکەی بکا. دووەم، عارفێک قسە لە حەقیقەت بکا. دەیفەرموو: هەموو شتێک سزای هەیە و سزای خواناس و عارف ئەوەیە، لە زکر دوور کەوێتەوە.

دەڵێن: لە بەر ئەوە پێیان گـوتووە «شـێخ ئـەبولحوسەینی نـووری»، چـونکە ئەوەندە خاوەن ئیمان بووە، کە ئەگەر بـە شـەوی تـاریک قسـەی بکـردایـە، لە ژوورێکی تاریکدا، بە نووری دەمی، کە نـووری لێ دەبـاری، ژورەکـە ڕوونـاک

دەبووە و بە نووری زەکاوەت و فەڕاسەت، ئەسراری دڵی زۆر کەسی دەزانی.

لە قەراغ شاری بەغدا، نوێژخانەیەکی درست کردبوو، کە دەچوە ناوی، بە بێ چرا، تەواوی ژورەکە و دەورو بەری ڕووناک دەکردەوە و خەڵک دەهاتن تەماشایان دەکرد.

شێخ ئەبوو ئەحمەدی مەغازلی دەفەرموێ: تەنانەت شێخ جونەیدی بەغدادیشم نەدیوە کە وەک «شێخ ئەبولحوسەینی نووری» عیبادەت زۆر بکا. دەفەرموێ: زوو دوکانی دانابوو، بەیانی کە دەچوە سەر دووکان، دوو نانی لەگەڵ خۆی دەبرد، لە ڕێگادا دەی کردن بە خێر و دەچوو بۆ مزگەوت، تا نیوەڕۆ نوێژی دەکردن، لە پاشان دەهات بۆ دووکان و ئێوارە دەچووە لە ماڵەوە، وایان دەزانی لە دووکان نانی خواردووە، ماوەی بیست ساڵ ئاوای ڕەفتار کرد و هەر بە ڕۆژوو بوو، بەڵام لە ماڵەوە نەیاندەزانی و ئاگادار نەبوون.

«شێخ ئەبولحوسەینی نووری» بە واسیتە، چەند حەدیسی لە حەزرەتەوە ڕیوایەت کردووە کە یەکێکیان ئەو حەدیسەیە کە دەفەرموێ: [مَنْ قَضىٰ لأخيهِ حاجةً كانَ لَهُ مِنَ الأجرِ كَمَنْ خدِمَ اللهَ عُمرَهُ] هەر کەسێک کاری برایەکی موسڵمان جێبەجێ بکا، وەکوو ئەوە وایە کە لە ماوەی تەمەنیدا، خوا پەرستی کردبێ.

دەڵێن جارێک موردیدیک نوێژی دەکرد، لە نوێژەکەیدا دەستی بە ڕیشەکەی خۆیدا دێنا، وەک یاری پێبکا وابوو، شێخ زۆری لێ تووڕە بوو و گوتی: دەروێش یاری بە ڕیشی خوا مەکە، ئەو قسەیە بە مەلاکان گەیشتەوە، کۆبوونەوە و گوتیان: شێخ خۆی کافر کردووە، خوا ڕیشی لە کوێ بووە، دەبێ بکوژرێ، چوون خەلیفەی ئیسلامیان ئاگادار کرد و شێخیان برد بۆ لای خەلیفە، خەلیفە ڕووی کردە شێخ و گوتی: ئەتۆ ئەو قسەت کردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، کردوومە. خەلیفە گوتی: جا چۆن وات گوتووە؟ خۆ مەلاکان، بە کەلیمەی کوفریان داناوە، فەرمووی: ئەی خەلیفە لە تۆ دەپرسم ئینسان عەبد و بەندەی کێیە؟ خەلیفە گوتی: ئی خوایە، گوتی: ئەی خەلیفە کەواتە من کەلیمەی کوفرم نە گوتووە. ئەوەی

کە خەلیفە ئیقراری پێ دەکا هەر ئەوەم گووتووە، مادام عەبد، بەندەی خوا بێ، ڕیشەکەشی ئی خوایە، خەلیفە گوتی: ڕاست دەکەی، حەمد بۆ خوا کە تووشی کوشتنی بە ناحەق نەبووین.

بەڵام عولەمای زاهیر هەروەکوو هەمیشە، زۆربەیان زۆر مونکیری ئـەولیا و کەشف و کەرامات بوون، ئەوە بوو یەکێک لە کۆلکە شێخەکان بە ناوی غولام خەلیلەوە، کە دەیویست خۆی بە ڕێتە پێشەوە و خەڵک بە باشی بزانن، دەستی کرد، بە دوژمنایەتی و عەداوەتی پیاو چاکان و چوو بۆ لای «المتضد باللە»، کە لەو سەردەمەدا خەلیفەی بەغدا بوو، لە عەبباسیەکان بوو، زۆر بـە دەسـەڵات بـوو، ناحەقی لەکەس قبوڵ نەدەکرد، گوتی: قوربان، کۆمەڵێک بە ناوی پیاوی چـاک پەیدا بوون لە بەرگ و لیباسی ئەولیا و پیاوی ئایینیدا، زۆر شتی وا دەکەن، هیچ عەلاقەی بە دینەوە نیە و لە دین لایان داوە، ئەگەر ئەوانە لە بەین نەچن، ئاساری دین و ئیسلامیەتی ڕاستەقینە نامێنێ. خەلیفە قسەکەی بە ڕاست زانی و زۆر تووڕە بوو، ئەمری کرد، شێخ ئەبوو حەمزەی بەغدادی و شێخ ڕەقم و شێخ جونەیدی بەغدادی و شێخی شبلی و «شێخ ئەبولحسین‌ی نووری»یان هێنا بـۆ بـارەگـای خەلیفە. خەلیفە زۆریان لێ تووڕە بوو، ئەمری کرد، بیان بەن سەریان ببڕن، کاتێ بردیانن سەریان ببڕن، یەکەم کەس کە جەللاد بانگی کرد، شێخ ڕەقام بوو. بەڵام «شێخ ئەبولحسین‌ی نووری» گورج هەستایە سەرپێ و چوە بـەردەمی جـەللاد ڕاوەستا و گوتی: فەرموو لە پێشدا سەری من ببڕە، تەواوی ئـەو خـەڵکەی کـە هاتبوونە تەماشا کردنی ئـەو قـەسابخانە، بـە وەزیـر و وزەرا و پـیاو مـاقووڵ و ئەهلیەوە، واقیان وڕما و سەریان سڕما و زۆریان لا عەجایب بوو، بەڵام کابرای جەللاد زۆر دانا و وریا بوو گوتی: یا شێخ، نازانی کە شمشێر شتێک نیە کە ئینسان پەلەی بۆ بکا و بچێتە بەردەمی؟ خۆ جەنابت ئێستا نۆرەت نەهاتووە، بـۆ پـەلە دەکەی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ دەزانم. بەڵام ئەتۆ نازانی کە ڕێباز و تەریقەتی من، ڕێباز و تەریقەتی ئیسارە، ئێستا کە عەزیزترین و خۆشەویسترین شت لە

لای من، ئەو چەند دەقیقەی تەمەنی داهاتووی دنیا من، دەمەوێ پیاوەتیان پێوە بکەم و بیان بەخشم بەو برادەرانەم، هەر چەند کە بە لای منەوە یەک هەناسە لە ژیانی دنیا هەزار ساڵ ژیانی دوارۆژ دێنێ، چونکە دنیا دوکان و بازاری خزمەت کردنە، بەڵام دوارۆژ سەرای قورپەتە، قورپەت و نزیک بوونەوەش بە خزمەت نەبێ نابێ، ئەی کاکی جەللاد، جا بۆ ئەوەی ئەو برایانەم چەند دەقیقەیەک لە دوای من لە بازاڕ و سەرای خزمەتدا وەمێنن، عومری عەزیزی خۆمیان پێش کەش دەکەم، کابرای جەللاد کە ئەوەی لە شێخ بیست دەستی ڕاگرت و هەستا چوو بە پەلە کارەساتی «شێخ نووری» بۆ خەلیفە گێڕایەوە، خەلیفە زۆری پێ خۆش بوو، زۆری لا عەجایب بوو، گوتی: کەواتە مەیان کوژن، حەواڵەی قازی شەرعیان بکەن.

کاتێ بردیانن بۆ لای قازی، کە لەوکاتەدا قازی بەغدا، قازی ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاق بوو، زۆر دانا و زانا بوو، گوتی: تا خراپە و بێ شەرعیان لە سەر ئیسبات نەبێ، ناتوانم هیچیان پێ بڵێم.

قازی ئیسماعیل دەیزانی کە شێخ جونەیدی بەغدادی لە هەموو عیلمێک دا دەستێکی باڵای هەیە و قسەی شێخ نووریشی بیستووە، گوتی واچاکە پرسیار لەو دێوانە بکەم، ڕووی کردە شێخ ئەبووبەکری شبلی و گوتی: داوەرە پێشەوە، بڵێ بزانم، داخۆ بە شەرع، لە بیست دیناردا، چەندە زەکات هەیە و دەبێ خاوەنەکەی چەند زەکاتی لێ بدا؟ شێخی شبلی فەرمووی: دەبێ بیست و نیو دینار زەکات بدا. قازی گوتی: جا باشە تا ئێستا چ موسڵمانێک لە بیست دینار ئەوەندەی زەکات داوە؟ شێخی شبلی فەرمووی: ئەی ئاگات لێ نیە کە حەزرەتی ئەبووبەکر چل هەزار دیناری هەبوو، هەمووی دا و هیچی بۆ خۆی نەهێشتەوە. قازی گوتی: باشە ئەی ئەو نیو دینارە بۆ بدا؟ شبلی گوتی: لە جەریمەی ئەوەدا بیدا، کە ساڵێک ئەو پارەی ڕاگرتووە و نەیداوە بە داماوان.

ئنجا قازی ڕووی کردە «شێخ ئەبولحوسەینی نووری» و چەند پرسیارێکی لێ

کرد و فەوری وەڵامی دایەوە، قازی زۆری لا عەجایب بوو، زۆر خەجاڵەت بوو جا «شێخ ئەبولحسینی نووری» ڕووی کردە قازی و گوتی: جەنابی قازی، تۆ ئەوەندەت پرسیار لە ئێمە کرد، ئەی بۆ ئەو پرسیارەت لێ نەکردین، کە داخۆ خوای گەورە چەند پیاوی وای هەیە، کە ڕاوەستانیان بە دەست خوابێ و دانیشتنیان بە دەست خوا بێ و زیندوو بوونیان بە دەست خوا بێ و هەمیشە تەماشای نووری جەماڵی خوا بکەن و ئەگەر لە حزەیەک نووری جەماڵی خوایان لێ ون بێ، نەژین؟ گوتی: قازی، زانینی ئەوە عیلمە، نەک ئەوەی تۆ پرسیارت لێ کرد.

قازی لە قسەکانی «شێخ ئەبولحسینی نووری» سەری سوڕما و دەستی کرد بە گریان و ناچار هەستا چوو بۆ لای خەلیفە و گوتی قوربان، ئەگەر ئەو جەماعەتە بێ دین بێ، کورەی زەوی خوا پەرستێکی تێدا نیە، گوتی: تا ئێستا من نەمزانیوە کە ئەو پیاوانە ئەوەندە دانا و زانا و پیاو چاکن.

خەلیفە کە ئەوەی لە قازی بیست، ناردی زۆر بە ڕێز و حورمەتەوە هێنایانن بۆ بارەگای خەلیفە و زۆری عوزوور خوایی کرد و زۆر گریا و داوای عەفووی لێ کردن و عەفوویان کرد و هەر کەسە گەڕایەوە مەقامی خۆی.

دەڵێن جارێک، چەند دەروێش هاتنە خزمەت شێخ جونەیدی بەغدادی و عەرزیان کرد قوربان! ئەوە سێ شەو و ڕۆژە«شێخ ئەبوالحسینی نووری» جەزبەی گرتووە و لە سەر یەک خشت هەڵدەپەری و «الله الله»یەتی، نە نانی خواردووە، نە ئاوی خواردووەتەوە، نە خەوی لێ کەوتووە، بۆ کاتی نوێژ نەبێ لەسەر خشتەکە نایەتە خوارێ، ئەوانەی لە خزمەت شێخ جونەید بوون، گوتیان: وادیارە «شێخ ئەبولحسین» بە دەرەجەی «فنا فيِ آلله» نەگەیشتووە، هەر لە حاڵەتی وشیاریدایە، دەنا چۆن ئەگەر فانی بێ، ئاگای لە کاتی نوێژ دەبێ.

شێخ جونەید فەرمووی: وانیە کە ئێوە دەڵێن، چونکە ئەوانەی کە دەکەونە حاڵەتی وەجدەوە، خوای گەورە بۆ وەختی واجبات مەحرومیان ناکا، ئاگاداریان

دەکاتەوە، شێخ جونەید هەستا چوو بۆ لای «شێخ نووری» و فەرمووی: ئەی «نووری»، ئەگەر دەزانی مان گرتن و خرۆش لە گەڵ خۆدا سوودی هەیە، تا منیش دەست پێ بکەم، ئەگەر دەشزانی ڕەزای بە قەزا باشترە، تەسلیم بەو وەرە خوارێ تا دڵت ئاسوودە دەبێ. «شێخ نووری» ڕووی کردە شێخ جونەید و گوتی: بەڕاستی ئوستاد، مامۆستای چاکی بۆ ئێمە، بە قسەی کرد و هاتەوە سەر خۆ.

«شێخ ئەبولحسینی نووری» حاڵەتی زۆر عەجایب بوو، دەڵێن: جارێ تەماشایان کرد لە گەڵ کابرایەک دانیشتووە و دەگرین و زۆری نەخایاند کابرا ون بوو، لە پاشان ڕووی کردە خەڵک و گوتی: زانیتان ئەوە کێ بوو؟ گوتیان: نەخێر نەمانزانی، فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو، هاتبوو حیکایەتی تاعەت و عیبادەتی خۆی بۆ دەگێڕامەوە و باسی دەردی دووری فیراقی خۆی دەکرد و گریا و منیش لەگەڵی دەستم کرد بە گریان.

شێخ جەعفەری خدری دەفەرموێ: ڕۆژێک «شێخ نووری» لە خەڵوەتا بوو، موناجاتی دەکرد، چووم گوێم لێ ڕاگرت بزانم لە پاڕانەوەکەیدا دەڵێ چی، گوێم لێ بوو دەیگوت: ئەی خوای گەورە، تۆ جەهەندەمیان عەزاب دەدەی، خۆ هەموویان ئافەریدەی تۆن. ئەی خوای گەورە! خۆ تۆ تەوانات هەیە لە جیاتی هەمووانا جەهەندەم بە من پڕ بکەی و ئەوان بەریە بەهەشت.

شێخ جەعفەر دەڵێ: زۆرم لا عەجایب بوو، ئەو شەوە لە خەومدا یەکێک هات و گوتی: ئەی جەعفەر، خواوەندی گەورە، دەفەرموێ: بەیانی بچۆ بە «شێخ ئەبولحسینی نووری» بڵێ، کە بە هۆی ئەو ڕەحم و شەفەقەتەی کە دەرهەق بە خەڵک هەیەتی، ئەوا لە هەموانیان خۆش بووم، شێخ جەعفەر دەڵێ: کە بەیانی چووم عەرزم کرد و خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، جەزبەی کرد و دەستی کرد بە گریان و تا ماوەیەکی زۆر بێ هۆش کەوت، جا هاتەوە سەر خۆ.

هەروەها شێخی شبلی دەفەرموێ: ڕۆژێک چووم بۆ لای «شێخ ئەبولحسینی نووری»، تەماشام کرد وەها کەوتبو موراقەبەوە، هەستی لە خۆی

بڕی بوو، حەرەکەی نەدەکرد و یەک مووی لە بەدەن نەدەجوولا، لە پاش سەلام و وەلام گوتم: یا «ئەبولحسین» ئەو موراقەبە جوانە لە کێ وە فێر بووی؟ دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەی شبلی، زۆر بەداخەوە ئێمەی ئادەمیزاد، تا ئێستاش هەر ناتەوانین و شت کەم دەزانین و دەبێ زۆر شت لە حەیوانان فێر بین، فەرمووی: ئەو موراقەبە و خۆمات کردنە، لە پشیلە فێر بووم کە لە زالکی کونی مشکێک خۆی مەڵۆس دابوو، زۆر لە من بێ حەرەکەتر بوو، چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی مشکەکەی دەکرد، فەرمووی: ئەی شبلی، بزانە کە حەیوان بۆ کار و مەرامی خۆی چەند وریایە و چۆن خۆی ئامادە دەکا، کەچی ئێمەی ئادەمیزاد چەند بێ موبالاتین و بە ئەندازەی حەیوانێکی وەک پشیلە، بیر لە قازانجی خۆمان ناکەینەوە و فرسەت لە دەست دەدەین.

جا خەڵکینە، خۆ وەنەبێ ئەو پیاوە گەورانە، ئەو پلە و پایەیان بە خۆڕایی دەست کەوتبێ، زۆریان خۆماندو کردوە، زۆریان تەرکی ئارەزووی نەفس کردوە، زۆریان ناڕەحەتی و عەزاب دیوە، تا بەو پلە و پایەیە گەیشتوون.

شەوێک خەڵکی شاری قادسیە، گوێیان لە دەنگێک بوو لە غەیبەوە بانگی دەکرد، ئەی خەڵکی قادسیە، یەکێک لە ئەولیای خوا لەو دەشتەیە، ئەگەر بە فریای نەکەون بە هیلاک دەچێ، زۆربەی خەڵکی شار ڕوویان کردە ئەو شوێنە کە بە وادی سوباع، بە ناو بانگ بوو، کە تەماشایان کرد، ئەوا «شێخ ئەبولحسینی نووری» گۆڕێکی هەڵکەندووە، چوەتە ناوی و تێیدا دانیشتووە، زۆری لە بەر پاڕانەوە تا لە گەڵیان هات بۆ ناو شار و لە پاشان گوتیان: یا شێخ ئەوە چ حاڵەتێک بوو؟ لە وەڵامدا فەرمووی: چەند ڕۆژ بوو لە سەحرا بووم، خواردنم دەست نەدەکەوت، هاتم بەرەو شار، چاوم بەو دارخورمایانە کەوت، نەفسم ئارەزووی خورمای کرد، گوتم: ئەی نەفس، وادیارە ئێستا ئارەزووت هەر ماوە، دەبێ بت بەمە ناو ئەو وادی سوباعە، بەڵکوو دڕەندەیەک بتخوا و لە کۆڵم وەبی، بەڵام ئێوە فریای کەوتن.

«شێخ ئەبولحسینی نووری» کەشف و کەراماتی زۆری نواندووە و زۆر دۆعای گیرا بوو، دەڵێن: جارێک چوو لە ناو ئاوێک دا غوسڵ بکا، ئەو خەریکی خۆ شۆردن و غوسڵ بوو، دزێک دێ لیباسەکانی دەدزێ و دەیان با، هێشتا ئەو لە ناو ئاوەکە ناهتبوە دەرەوە تەماشای کرد، ئەوا کابرای دز لیباسەکانی ئەوی بەدەستەوەیە و دەستی وشک بوون، شێخ گریا و ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، تو و بارەگای خواوەندیت چۆن ئەو کابرایە لیباسەکانی منی بە سەلامەتی هێنایەوە تۆش ئاوا دەستەکان بە سەلامەتی بدەوە، دەڵێن بە ئەمری خوا، دەستەکانی کەوتنە حەرەکەت و کابرا لە خزمەت شێخ تۆبەی کرد و بوو بە موریدێکی زۆر باش.

جارێک «شێخ نووری» نەخۆش دەکەوێ، شێخ جونەیدی بەغدادی دەچێ بۆ عەیادەتی و گوڵ و میوەی بۆ دەبا، لە پاش ماوەیەک شێخ جونەید نەخۆش دەکەوێ. «شێخ نووری» لە گەڵ چەند مورید، دەچنە لای و «شێخ نووری» ڕوو دەکاتە موریدەکان و دەڵێ: برادەرینە، هەریەکەتان نەختێک لە نەخۆشیەکە لابەرن، گوتیان: بەڵێ ئەوا قبوڵمان کرد، بە ئەمری خوا فەوری شێخ جونەید شیفای بۆ هات. «شێخ نووری» ڕووی کردە شێخ جونەید و گوتی: یا شێخ، ئەگەر جارێکی‌تر چووی بۆ لای نەخۆشێک ئاوا برۆ، نەک وەک ئەو جارەی گوڵ و میوەی بۆ بەری.

موسوڵمانێک عەرزی دەکا و دەڵێ: قوربان، زۆرم پێ خۆشە ئامۆژگاری یەکم بکەی. لە وەڵامدا دەفەرموێ: ڕۆلە، لەو دە نەفەرە خۆت بپارێزە: یەکەم، لەو کەسەی داوای پیاو چاکی دەکا و کردەوەی شەرعی نیە. دووەم، لەو کەسەی کە لەگەلەکەی خۆی هەڵدەگرێتەوە و پەنا دەباتە بەر بێگانە. سێیەم، لەو کەسەی کە زۆر ئارەزووی لە ڕیاسەتە. چوارەم، لەو کەسەی کە فەقیرە و ناشوکرە و ڕوو دەکاتە دنیا پەرستی. پێنجەم، لەو کەسەی بە زانیاریەوە دەنازی و قەت لە جەهلی ئەمین مەبە. شەشەم، لەو کەسەی داوای کەشف و کەرامات دەکا و بە زاهیر خراپە.

حەوتەم، لەو کەسەی کە لە خۆی ڕازیە. هەشتەم، لەو سۆفی و دەروێشەی دەچێتە حەلقەی زکرەوە و دنیا پەرستە. نۆیەم، لەو کەسەی خۆی بە سۆفی و دەروێش دەزانێ و ناچێتە ناو حەلقەی زکرەوە. دەیەم، لەو کەسەی کە بەڕاستی باوەڕی بە هەموو دۆست و برادەرێک بێ.

عەرزیان کرد: قوربان، ئەوەی ئامۆژگاری خەڵک دەکا، دەبێ چۆن بێ؟ فەرمووی: دەبێ زانا بێ و شت بزانێ و بێ شەرعی نەڵێ، دەنا بەڵای ئامۆژگاریکە تەوای عیباد و بیلاد دەگرێتەوە.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی «شێخ ئەبولحسین‌ی نووری» کە لە ساڵی دووسەد و نەوەد و پێنجی کۆچیدا، وەفاتی فەرمووە. ڕۆژی وەفاتی شێخی شبلی کە خەبەری زانی، دەستی کرد بە گریان و بە جەزبەوە هاواری دەکرد و دەیفەرموو: ئاگر لە دنیا بەردەن، چونکە لە پاش «ئەبولحسین‌ی نووری» نووری عیلم لە دنیادا نەما.

داوا دەکەین لە خوا کە لە بەر خاتری گەورەیی خۆی و پیاو چاکان عەفوومان بکا. شیفای نەخۆشمان بدا. ئیمانمان بە نسیب بکا. لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ اللهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکاٰتُهُ

# (٣٧)

## باسی ئەبوو عوسمانی حیری

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَمْدُ لِلهِ اَلَّذي اَبْدانا مِنْ عَدَمٍ اَزْواحاً أَوْ أَبْدانا
تَصلِيَّةٌ اَيَّتُها أَفْضَلُها تَسْليمةٌ اَيَّتُها اَكْمَلُها[1]
سُحَّتْ عَلىٰ نَبِيِّنا مِنْ سُحْبِهِ مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ...

با لەم مەجلیسەدا، گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتە جوانەکانی ئەو کەسەی کە لە زەمانی خۆیدا، حازری ئەسراری تەریقەت بوو، نازری ئەنواری حەقیقەت بوو، جگەر سووتاوی جەزبەی ڕبوبییەت بوو، بە ئەدەبی دەرگای عبودییەت بوو، لە گەورە پیاوانی خوراسان بوو، باوەڕ پێکراوی زومرەی عیرفان بوو، لە عیلم و زانین‌دا بێ نەزیر بوو، لە کەشف و کەڕاماتدا بێ وەزیر بوو، مەجلیسی پڕ بەرەکەت بوو، قسەی نیعمەت و بە لەزەت بوو، جا ئەو زاتە بەرز و عالیە، جەنابی «شێخ ئەبوو عوسمان حیری»یە. زۆر بە ئەدەب دانیشن و گوێ بگرن و لەززەت بەرن و گوێ لە فەرمایشتەکانی بگرن و پەند و ئامۆژگاری وەرگرن.

«شێخ ئەبوو عوسمان حیری» لە ناو ئەهلی تەریقەتی زەمانی خۆیدا، ئەوەندە

---

١ - مەولەوی تاوگۆزی.

بەرز و گەورە بوو، دەیان گوت تا ئێستا لە دوای پێغەمبەران و خولەفای ڕاشدین، هەر سێ پیاوی گەورە لە ناو موسوڵماناندا هەڵکەوتوون و چوارەمیان نیە.

«شێخ ئەبوو عوسمان حیری»لە شاری نیشاپوور دا، شێخ جونەیدی بەغدادی لە بەغدا و شێخ ئەبوو عبداللەی جەلا لە وڵاتی شام.

یەکێک لە پیاو چاکان و زانایان، بە ناوی ئەبوو عبداللەی کوڕی محمدی ڕازیەوە دەفەرموێ: بە خزمەت زۆر پیاوی گەورە گەیشتووم، وەکوو شێخ جونەیدی بەغدادی و شێخ ڕووەیم و شێخ یوسف و محمدی کوڕی فەزل و شێخ ئەبوو عەلی گورگانی و زۆری تریش. بەڵام بەلای منەوە هیچیان بە ئەندازەی «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» لە خوا نەترساون. «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» یەکەم کەس بوو کە تەسەووفی لە خوراساندا ئاشکرا کرد و ڕەفاقەتی شێخ جونەیدی بەغدادی و شێخ ڕووەیم و شێخ یوسف و شێخ محمدی کوڕی فەزل کردبوو.

سێ پیری دەستگیری هەبوو، کە بریتی بوون لە ئیمام یەحیای ڕازی، کە مەقامی ڕەجای لەوە وە دەست کەوت و لە شا شوجاعی کرمانی، عیززەتی لەوەوە دەست کەوت و لە شێخ ئەبوو حەفسی حەدداد، کە مەقامی شەفەقەتی لێ دەست کەوت. هیچ کەسێک وەک «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» بەهرە و بەرەکەتی لەو سێ پیاوە گەورەیە وەرنە گرتووە.

شێخ عبدالرحمنی سوللەمی، لە کتێبی «طبقات الصوفیه»دا «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» بە سێیەم کەسی تەبەقەی دووەمی ئەولیا داناوە. محمدی بە ڵحنی دەفەرموێ: خواوەندی گەورە، «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» بە هەموو نەوعە عیبادەتێک ڕازندۆتەوە وە دەفەرموێ: ئەی عەبد و بەندەکانی من، بچن عەبدایەتی و بەندەگی لە «عوسمانی حیری» فێر بن.

«شێخ ئەبوو عوسمان»، جارێک فەرمووی: لە ئەووەڵی لاویمدا، دڵم هەمیشە

داوای حەقیقەتی دەکرد و دەیگوت: عوسمان شەریعەت بێ ئەسرار نیە، دەبێ غەیری ئەو عیلمە زاهیریە، حەقیقەتێک هەبێ و تەنیا ئەو نەختە زانیاریە کافی نیە.

دەڵێن باوکی زۆر دەوڵەمەند بووە، جارێک بە منداڵی «ئەبوو عوسمان» کە دەچێتە مەدرەسە، قوتوو قەڵەمدانێکی زێڕی پێ دەبێ و کڵاوێکی زێر کفتی لەسەر دەبێ و لیباسی چاک و عەبای پارچەی کرمانی بە شانەوە دەبێ و چوار غوڵامی لە دواوە دەڕۆن، یەکیان ڕۆمی و یەکیان تورکی و یەکیان حەبەشی و یەکیان کشمیری دەبێ. بەلای کاروان سەرایەکدا دەڕۆن، تەماشا دەکا، کەرێک لە کۆڵانی کاروانسەرا ڕاوەستاوە پشتی ئەوەندە بریندارە، قەوارەی تێکەوتووە و قەلە ڕەشەیەک لە سەر پشتی هەڵنیشتووە و بە دەندوک گۆشتی لێ دەپچڕێ و دەخوا، کەرەکەش دەمی نەدەگەیشتەوە پشتی قەلەکە دەرکا، «ئەبوو عوسمان» کە ئەو دیمەنەی دی، زۆری بەزەیی بە کەرەکە داهاتەوە، ڕووی کردە غوڵامەکان و گوتی ئێوە بۆچی بەدوای منەوەن؟ لە وەڵامدا گوتیان: بۆ ئەوەی هەر کاتێک هەر کارێکت بوو ئامادە بین، گوتی وەرن یارمەتیم بدەن، هەر هات و عەباکەی دانا و پشتی کەرەکەیان دادا و دەسرەکەی سەری لێ کردەوە لە سەر عەباکەوە وەک تەنگە و قەیاسە لە سەریان بەست و ڕۆیشتن. ڕاوی دەڵێ: کەرەکە بە زمانی حاڵ لە بارەگای خواوەندی گەورە دەپاڕایەوە و دۆعای بۆ دەکرد، کە پاداشتی ئەو ڕەحم و شەفەقەت و بەزەییەی بداتەوە.

دەڵێن و هێشتا «ئەبوو عوسمان» بە تەواوی نەگەی بووەوە ماڵەوە، کە حاڵی گۆڕاو دایک و باوکی بە جێ هێشت و چوو بۆ مەجلیسی ئیمام یەحیای ڕازی، بۆ گوێ گرتن لە ئامۆژگاریەکانی و ڕیازەتێکی زۆری کێشا، تا ڕۆژێک کۆمەڵێک لە خزمەت شا شوجاعی کرمانیەوە هاتن و باسی پیاو چاکی شا شوجاعیان لە لا کرد، بە تەعریفەکەیان ئارەزووی کرد، بچێ بۆ لای شا شوجاع و ئیجازەی لە ئیمام یەحیای ڕازی وەرگرت و بەرەو شاری کرمان کەوتە ڕێ. بەڵام دەڵێن: شا شوجاع

لە ئەووەڵەوە ڕێگای نەدا و فەرمووی: تۆ لە لای ئیمام یەحیای ڕازی خووت بە ئادابی ڕەجاوە گرتووە، فەرمووی: چونکە مەقامی ئیمام یەحیای ڕازی مەقامی ڕەجایە و ئەوەی پەروەردەی ڕەجاش بێ، ناتوانێ سلووک بکا، لە بەر ئەوەی تەقلید لە ڕەجادا تەنبەڵی لێ پەیدا دەبێ.

دەڵێن بیست ڕۆژ لە بەر دەرگای خانەقای شا شوجاع دا مایەوە، تا شا شوجاع ڕێگای دا بچێتە ژوورەوە، ماوەیەک لە خزمەت شا شوجاعدا لە کرمان مایەوە و ئیستفادەیەکی زۆری لە خزمەت شا شوجاع کرد، تا شا شوجاع هات بۆ زیارەتی شێخ ئەبوو حەفسی حەدداد بۆ نەیشاپوور، ئەویش لە خزمەتیدا هات.

«ئەبوو عوسمانی حیری» زۆری ئارەزوو بوو لە خزمەت ئەبوو حەفس‌دا وەمێنێ، بەڵام شا شوجاع ئەوەندە بە سام و هەیبەت بوو، «ئەبوو عوسمان» زاتی نەکرد عەرزی بکا، لە بەر خوا پاڕایەوە کە بە بێ پێخوش بوونی شا شوجاع هۆیەکی بۆ برەخسێنێ و ببێتە هۆی مانەوەی لە نەیشاپوور لە خزمەت ئەبوو حەفس‌دا، ڕۆژێک شا شوجاع نیازی گەڕانەوەی بوو بۆ کرمان، ئەبوو حەفس ڕووی کردە شا شوجاع و فەرمووی: زۆرم پێ خۆشە ئیجازەی «ئەبوو عوسمان» بدەی لێرە وەمێنێ، شا شوجاع ڕووی کردە «ئەبوو عوسمان» و فەرمووی: دەمێنیەوە، گوتی: بەڵێ قوربان، شا شوجاع گەڕایەوە بۆ کرمان و «ئەبوو عوسمان» لە نەیشاپوور مایەوە، تا بوو بەو پیاوە کە لەم مەجلیسەدا باسی دەکەین.

دەڵێن: ئەبوو حەفسی حەدداد ئەوەندەی لێ ڕازی بوو، ڕۆژێک «ئەبوو عوسمانی» بانگ کردە لای خۆی و مریەم خانمی کچی خۆی لێ مارە کرد. دەفەرموێ: خواوەندی گەورە وای بۆ کردم کە لە ماوەی چڵ ساڵدا، حاڵم نەگۆڕاو لە هیچ تووڕە نەبووم.

بەڵگەش لە سەر ئەو قسەیە ئەوەیە، کە کابرایەکی زۆر دەوڵەمەند، زۆری «ئەبوو عوسمان» ناخۆش دەویست و زۆری مونکیر بوو. ڕۆژێک دەعوەتی بۆ

«ئەبوو عوسمان» کرد و چوو تا گەیشتە بەر دەرگای سەرای کابرا، کابرا هاتە دەرەوە و بە توورەیی گوتی: ئەی سک زلی زۆر خۆر، هیچمان نیە بگەڕێوە، «ئەبوو عوسمان» بە بێ دەنگ گەڕایەوە. جارێکی دی دەعوەتی بۆ کردەوە دووبارە چوەوە، کابرا هاتە دەرەوە گوتی: یا شێخ بەرد نەبێ، هیچمان نیە بخۆی، شێخ بێ دەنگ گەڕایەوە. تا سێ جار ئەو کابرایە زۆر بە ناشیرینی دەیناردەوە، بەڵام شێخ هیچ وە سەر خۆی نەدێنا و توورە نەدەبوو، کابرا کەوای زانی شێخ ئەو پیاوەیە و ئەوەندە لە سەر خۆیە و قەت توورە نابێ، لە کردەوەی خۆی پەشیمان بوەوە و چوو بە گریانەوە دەستی شێخی ماچ کرد و لە ئاخریدا بوو بە یەکێک لە موریدە باشەکانی شێخ و گوتی: یا شێخ، بە ڕاستی ئەوە تۆ چ پیاوێکی کە من سێ کەڕەت ئاوا بە ناشیرینی وەڵامی تۆم دایەوە، کەچی توورە نەبووی؟ شێخ لە وەڵامدا زۆر بە ڕوو خۆشی و لە سەر خۆی فەرمووی: ئەوە کارێکی زۆر سەهل و ئاسانە، زۆر گرنگ نیە، سەگیش ئەو سیفەتەی هەیە، بانگی بکەی بە دەنگتەوە دێ و دەری کەی دەگەڕێتەوە، فەرمووی: پیاوی دەروێش نابێ بەو جۆرە کارانە بگۆڕێ، خوو ڕەوشتی پیاوی خوا، دەبێ زۆر لەوە بەرزتر بێ.

دەڵێن «شێخ ئەبور عوسمان» ئەوەندە خۆ بە کەم گرتوو و ئەوەندە لە سەر خۆ، بووە، جارێک لە گەڵ چەند دەروێش بە کوچەیەکدا دەڕۆن، لە سەر بانێکەوە ئافرەتێک خۆڵە مێش دەڕێژێ و هەمووی بە سەر سەری شێخدا دەکا، دەروێش و موریدەکان توورە دەبن و دەیان ئەوێ قسە بە ئافرەتەکە بڵێن، شێخ ناهێڵێ و دەڵێ: خوایە هەزار جار شوکر کە من شایانی ئەوەم ئاگرم بە سەردا ببارێنی، کەچی بە خۆڵەمێش سوڵحت لەگەڵ کردم، زۆر زۆر شوکر بۆ تۆ.

شێخ ئەبوو عەمر دەفەرموێ: «شێخ ئەبوو عوسمان» ئەوەندە بە ڕەحم و میهرەبان بوو، تەنانەت بە هۆی میهرەبانیەکەیەوە، پیاوی خراپیش دەهاتە سەر ڕێگای ڕاست. دەڵێ: لە ئەووەڵەوە لە خزمەت ئەودا تۆبەم کرد و هەر دەچوومە

مەجلیسی، بەڵام لە پاش ماوەیەک تۆبەکەم شکاند و تووشی گوناه بوومەوە، لە بەر ئەوە تەرکی مەجلیسی شێخم کرد و ئەگەر لە دەرەوەش چاوم لێ بوایە، خۆم لێ لادەدا، تا ڕۆژێک لە کوچەیەکدا تووشی بووم، زۆر بە شەرمەوە دەستم ماچ کرد، بە لام ئەو زۆر بە ڕووخۆشییەوە فەرمووی: کوڕم، دەمێکە دیار نی و وادیارە لە بەر ئێمە ڕادەکەی! فەرمووی: لەگەڵ دوژمنەکانی خۆت دامەنیشە بە گوناهەوە، چونکە دوژمن عەیبی تۆ دەبینێ و بە عەیبداری تۆ دڵشاد دەبێ و تۆناڕەحەت دەبی. فەرمووی: ئەگەر هەر گوناهیش دەکەی، وەرە لای خۆمان با عەیبت ئاشکرا نەبێ و دوژمنت دڵشاد نەبێ، دەڵێ کە شێخ ئەوەی فەرموو: دڵم پڕ بوو، گوناهم لە پێش چاو ڕەش بوو، لە سەر دەستی شێخ تۆبەیەکی نەسوحیم کرد.

دووبارە دەڵێن: کوڕێکی گەنجی بێ موبالات بە دین، ڕۆژێک تار و ڕوبابێکی بە دەستەوە دەبێ و کاکۆڵان بەردەداتەوە و وەک مەستان ئاگای لە خۆی نەبوو، لە نکاو تووشی «ئەبوو عوسمان» بوو، کە چاوی پێکەوت لە شەرمان گورج کاکۆڵەکانی وەبن کڵاوەکەی دان و ڕوبابەکەی وەبن فەقیانەکەیدا، وەی زانی شێخ موحاسەبەی دەکا، بەڵام شێخ زۆر بە ڕوو خۆشی ڕووی تێکرد و فەرمووی: کوڕم شەرم مەکە، ئێمە هەموومان برای یەکین، کوڕەکە لە سەر دەستی شێخ تۆبەی کرد کە ئیتر شەراب نەخواتەوە و خراپە نەکا، شێخ هەر لەوێ وە ناردی بۆ خانەقا و غوسڵی تۆبەی پێ کرد و لیباسی لێ گۆڕی و شێخ ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، ئەوەی بە دەست من بوو کردم، دەتۆش ئەوەی بە دەستی تۆیە سەبارەت بەو کوڕە بیکە، ڕاوی دەڵێ: ئەو کوڕە بە ئەمری خوا وەها گۆڕا، کە «ئەبوو عوسمان» سەری لە کاری خۆی سوڕ مابوو، ڕووی کردە ئەبوو عوسمانی مەغریبی و گوتی: یا شێخ کاری خوا ئاوایە و بە زۆری کردەوە نیە و بە ڕاکێشانە بە کۆشش نیە، بە خالقە بە مەخلووق نیە، فەرمووی گەورەیی بۆ خوا،

ئەوەی ئێمە لە تەواوی تەمەنماندا، ئارەزووومان بوو، خوای گەورە بە لەحزەیەک دای بەو کوڕە، کە ئێستاش لە چاو ئێمە هەر بۆنی ئارەقی لێ دێ.

«شێخ ئەبوو عوسمان» خەڵکی هەڵدەنا بۆ تۆبە کردن، ڕۆژێک کابرایەک عەرزی کرد: قوربان، من بە زمانم زکری خوای گەورە دەکەم، بەڵام دڵم ئاگای لێ نیە، چارم چیە؟ فەرمووی: باشە شوکری خوا بکە، خۆ هیچ نەبێ ئەندامێکت لە ژێر فەرمانی خوادایە، ئومێد دەکەم کە دڵیشت موافیقی زمانت بێ.

مریەم خانمی خێزانی دەڵێ: ڕۆژێک بە تەنیا لە خزمەتی دابووم، عەرزم کرد: قوربان، تا ئێستا لە ماوەی ژیانتدا چیت زۆر پێ خۆش بووە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: تازە ڕووم کردبوە خوا پەرستی، ئافرەتێک لە نامەیەکدا ناو و نیشانی خۆی بۆ ناردم، نووسی بووی کچی فلان خەیاتم، وەرە بم خوازە، فەرمووی: منیش ناردم بۆ خوازبێنی و زۆریان پێ خۆش بوو، دایانمێ کاتێ گواستمەوە، تەماشا دەکەم ئافرەتێکی یەک چاوی خێلی ناشیرین بوو، خزمەکانم زۆریان پێ ناخۆش بوو، تا لە پاش پانزدە ساڵ وەفاتی کرد. دەفەرموێ: لە تەواوی تەمەنمندا ئەوەم پێ لەهەموو شتێک خۆشترە کە لە ماوەی ئەو پازدە ساڵەدا، دڵم نەشکاند و بێ دڵیم نەکرد.

«شێخ ئەبوو عوسمان حیری» یەکێک لەو ڕاویانەیە، کە حەدیسی کەفارەتی ڕۆژووی لە عبداللهی کوڕی حەزرەتی عومەرەوە ڕیوایەت کردووە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ)، فەرموویەتی: [مَنْ ماتَ وَ عَلَيْهِ صَومُ رَمَضانَ، اَطْعَمَ عَنْهُ وَلِيُّهُ كُلَّ يومٍ مِسْكيناً] هەرکەسێک مرد و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی لە سەر بوو، با واریسەکەی لە باتی کەفارەتی هەر ڕۆژێک، هەژارێک تێرکا.

ئەوا لێرەشدا چەند فەرمایشتی جوانی ئەو پیاوە گەورەیە دەگێڕمەوە، ئومێد دەکەم سوودیان لێ وەرگرن: دەفەرموێ: ئەوەی بیەوێ لە خوا نزیک وەبێ، دەبێ زۆر بە ئەدەب بێ و بەردەوام بێ لە سەر ئاگاداری و موراقەبەی نەفسی خۆی، تا

تووشی غەڵەت و بێ شەرعی نەبێ. فەرموویەتی: ئەوەی دەیەوێ لە قیامەتا بە خزمەت پێغەمبەر بگا، دەبێ ئاگای لە سوننەتی پێغەمبەر بێ و عەمەل بە زاهیری شەریعەتی ئیسلام بکا. فەرمووی: دەبێ سەبارەت بە پیاو چاک و ئەولیای خوا زۆر بە ئەدەب و ئیحترام بێ و زمان پاک و ڕووخۆش بێ و بە ناحەق ڕەخنە لە پیاو چاکان نەگرێ و لە گەڵ ماڵ و منداڵدا، ئەگەر گوناهبار نەبوون ڕووخۆش بێ، دەرهەق ئینسانی نەزان و نەفام دەبێ دەم بە دۆعا بێ و داوای کەرەم و ڕەحمی خوایان بۆ بکا، فەرمووی: هەر موریدێک لە ئوستادەکەی شتێک فێر بێ، فەرامۆشی نەکا و عەمەلی پێ بکا، تا ئاخری عومری نووری ئەو عیلمە لە دڵیدا دەمێنێتەوە و لە دوا ڕۆژدا سوودی لێ دەکا.

فەرمووی: ئەوەی عەمەل بە سوننەتی پێغەمبەر بکا، ئەوە دەبێتە خاوەن حیکمەت و زانیاری و ئەوەی بە قسەی هەوای نەفسی بکا، ئەوە تووشی بیدعەت دەبێ و هیچ کەس عەیبەکانی خۆی بە خراپ نازانێ، بەڵام لەو لاوە سەد عەیب لە خەڵک دەگرێ و تەنانەت لە وانەیە عەیب لە پیاوێک بگرێ، کە قەت لە خۆی ڕازی نەبووبێ و خۆی بە باش نەزانیبێ، دەیفەرموو: ئینسان بە تەواوی نابێتە عەبدێ لە پیاو باشەکانی خوا، تا بە دڵ تەماشای چوار شت، وەک یەک نەکا و لە لای وەک یەک نەبن، ئەگەر بە بوون و نەبوون و عیززەت و زیللەت وەک یەک بوو و نەگۆڕا و ناشوکری نەکرد، ئەوە پیاو چاکە.

فەرمووی: عەزیزترین و بە حورمەترین بە لای منەوە لە سەر کورەی زەوی سێ شتە: یەکەم، عالم و زانایەک کە لە عیلمی خۆی بدوێ و بڵاوی بکاتەوە. دووەم، سۆفی و دەروێشێک کە تەماعی نەبێ و قەناعەت بکا. سێیەم، کەسێک خوا ناس و عارف بە خوا بێ.

دەیفەرموو: زاهید ئەو کەسەیە دەست بە دنیا نەگرێ و بێ باک بێ لەوە داخۆ دنیا ڕو دەکاتە کێ و کێ دەوڵەمەند دەبێ.

دەیفەرموو: ئەو کەسەی کە خواوەندی گەورە، بە نووری ئیمان دڵی ڕووناک دەکاتەوە و خۆی بە خاوەن ئیمان لە قەڵەم دەدا و بە هۆی نووری ئیمانەوە خوای ناسیوە و عەزیز بووە لای خوا، زۆر شوورەیە بە گوناهو مەعسیەت خۆی ڕیسوای بارەگای خوا بکا.

دەیفەرموو: خۆشەویستی دنیا، خۆشەویستی خواتان لە بیر دەباتەوە و ترس لە غەیری خوا ترس لە خواتان لە دڵدا ناهێڵێ.

جارێک یەکێک عەرزی کرد: قوربان، عەلامەت و نیشانەی سەعادەت و شەقاوەتی ئینسان چیە و چۆن بزانین ئەو ئینسانە سەعادەتمەندە یان نا؟ یا خۆش بەختە یابەدبەختە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: [عَلاٰمَةُ ٱلسَّعٰادةِ اَنْ تُطَيع اللهَ وَ تَخٰافَ أنْ تكونَ مَرْدوداً وَ عَلاٰمَةُ الشَّقاوةِ أنْ تَعْصِي ٱللهَ وَ تَرْجوُ أنْ تَكونَ مَقْبُولاً] عەلامەت و نیشانەی سەعادەت و خۆش بەختی ئینسان ئەوەیە، ئیتاعەی خوا بکا و لە گەڵ ئەوەشدا بترسێ لەوە، داخۆ خوا لێی وەرگرتووە یان نا، عەلامەت و نیشانەی شەقاوەتیش، ئەوەیە ئینسان خوا نەکردە بێ ئەمری خوا بکا و ڕەجاشی وابێ کە لە لای خوا خۆشەویست و مەقبوڵە.

دەیفەرموو: کەسێک لە خوا بترسێ، بە خوا دەگا و ئەوەی خۆی بە زل بگرێ و تەکەبوری هەبێ، لە خوا دوور دەکەوێتەوە و ئەوەی بە چاوی سووک لە خەڵک بڕوانێ، ئەوە ئەو کەسە تووشی نەخۆشیەک بووە، کە قەت شیفای نیە.

دەیفەرموو: خەڵکینە، تۆبە بکەن و لە گوناهو خراپە وەگەڕێن، چونکە خواوەندی گەورە لە سوورەی ئەنعام، لە ئایەتی پەنجا و چواردا واجبی کردووە لە سەر خۆی و دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ رَبُّكُم عَلىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ سُوءاً بِجَهٰالَةٍ ثُمَّ تٰابَ مِنْ بَعْدِهِ وَ اَصْلَحَ فَإِنَّهُ غَفُورٌ رَحيمٌ﴾ ئەی عەبد و بەندەی من، خوای ئێوە لەسەر خۆی نووسیوە، بە قەڵەمی قودرەت و ڕەحمەتی، کە ئەگەریەکێک لە ئێوە لە ڕووی جەهالەتەوە، کردەوەیەکی خراپ بکا، ئەوە خوا

غەفور و ڕەحیمە.

دەیفەرموو: ئینسانی ئاقڵ و ژیر بەو کەسە دەڵێن، کە ئەو شتەی لێی دەترسێ، لە پێش ئەوەدا کە ڕوو بدا، بەرگری لێ بکا، تا ڕوو نەدا، ئەوەی دوای ئارەزووی نەفسی خۆی دەکەوێ، ئەوە لە بەندیخانەدایە، وەختێ ڕزگاری دەبێ کە هەموو فەرمانێکی حەواڵەی خواوەندی گەورە بکاتەوە و دوای نەفس و شەیتان نەکەوێ.

دەڵێن کابرایەک لە شاری فەرغان وە، هات بۆ شاری نەیشاپوور، بۆ زیارەتی «شێخ ئەبوو عوسمان حیری» و لە وێشەوە بڕوا بۆ حەج، کاتێ گەیشتە خزمەت «ئەبوو عوسمان» سەلامی کرد، شێخ وەڵامی نەدایەوە، کابرا لە دڵی خۆیدا زۆری پێ ناخۆش بوو، گوتی: چۆن دەبێ موسوڵمانێک سەلام لە موسوڵمانێک بکا و وەڵامی نەدرێتەوە؟، زۆر ناڕەحەت بوو، لە پاشان «ئەبوو عوسمان» سەری بەرز کردوە و فەرمووی: تەماشا خەڵکی ئێستا، ئاوا حەج دەکەن! دایکیان بە نەخۆشی و زەلیلی و بێکەسی لەماڵەوە بە جێ دێڵن و دێن بۆ حەج، بە ڕاستی ئەوە کارێکی زۆر خراپە و باش نیە. کابرا کە ئەوەی لە شێخ بیست، ئەوەندە خەجاڵەت بوو لە شەرمان ئارەقی کرد و بە گریانەوە پەلاماری دەستی شێخی دا و گوتی: قوربان، ڕاست دەکەی، تۆبە، دەچمەوە دڵی دایکم ڕازی دەکەم، گەڕایەوە بۆ لای دایکی و تا دایکی وەفاتی کرد هەر خزمەتی کرد، جا لە پاشان هاتە خزمەت شێخ، زۆری بە خێرهاتن کرد و بوو بە موریدی شێخ و ئینجا چوو بۆ حەج.

ئەم «شێخ ئەبوو عوسمانی حیری»ە ئەوەندە ڕووخۆش و نیک نەفس بوو، ڕۆژێک چوە سەر مینبەر، ئامۆژگاری خەڵک بکا، کەچی ماوەیەکی زۆر لە سەر مینبەرەکە دانیشت و دەنگی لێوە نەهات، یەکێ لە حازران عەرزی کرد: قوربان، دەشتێکمان بۆ بفەرموو، سەری بەرز کردەوە و بە گریانەوە فەرمووی:

وَ غَيرُ تَقِيٍ يَأْمُـرَ النَّـاسَ بِـالتُقىٰ      طَبيبٌ يُداوِي وَ الطَّبِّيبُ مَرِيضٌ

ئاخر کەسێک بۆ خۆی تەقوای خوا نەکا و بە دین نەبێ، بەڵام ئامۆژگاری خەڵک بکا و بڵێ: تەقوای خوا بکەن و لە خوا بترسن، وەکوو ئەوە وایە کە دکتۆرێک خەڵک تەداوی بکا و بۆ خۆی نەخۆش بێ، مەعنای وایە دەبێ ئەوەی ئامۆژگاری خەڵک دەکا، لە پێش هەموو کەسدا، کردەوەی خۆی چاک بێ، جا خەڵک سوودی لێ وەر ئەگرێ ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی «شێخ ئەبوو عوسمان حیری»، کە لەساڵی دووسەد و نەوەدو هەشتی کۆچی‌دا، لە شاری نەیشاپوور، وەفاتی فەرمووە. سا خوای گەورە لە هەموو لایەکمان خۆش بی، ئیمانمان بە نسیب کە وە بەر شیفاعەتی پێغەمبەرمان بخا، لە گوناهمان خۆش بە. لە بەلاو موسیبەت بمانپارێزی. ئامین [یٰا رَبَّ ٱلعٰالَمِین]

وَ صَلیٰ ٱللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ ٱلْسَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللّٰهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٣٨)

## باسی موحەمەد حەکیمی ترمزی

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ مُنْشِي الْخَلْقِ مِنْ عَدَمٍ ثُمَّ الصَّلٰوةُ عَلَى الْمُخْتَارِ فِي الْقِدَمِ
وَ اذَنْ لِصُحْبِ صَلٰوةٍ مِنكَ دٰائِمَةٍ عَلَى النَّبِيِّ بِمُنْهَلٍ وَ مُنْسَجِمِ
وَ الآلِ و الصَّحْبِ ثُمَّ التَّابِعِينَ لَهُمْ اَهِلُ التُّقَى وَ النُّقىٰ وَ الْحِلْمِ وَ الْكَرَمِ[1]

جا با وەک ڕۆژانی ڕابردوو، لە چەند دەقیقەی داهاتووی ژیانماندا، بچینە بارەگا و مەجلیسی ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە، کە لە زەمانی خۆیدا هەڵگری ئاڵا و بەیداخی سوننەت بوو، گەورە و پێشەوای مەجلیسی میللەت بوو، موجتەهیدی زومرەی ئەولیا بوو، یەگانەی جوملەی ئەسفیا بوو، لە مەعنا و تەفسیر قورئاندا بێ وێنە بوو، لە شەرح و بەیانی حەدیساندا ئاوێنە بوو، خاوەن کەشف و کەرامات بوو، ساحب نەهێنی و ئەسرار بوو، عالمێکی گەورەی ڕەببانی بوو، خو و ڕەوشتی بەرز و ئینسانی بوو، لە خواناسی‌دا، دانا و فانی بوو، لە زانیاریدا، ماموستای مانی بوو، جا ئەو مەحرەمی بارەگای ئیززەدیە، جەنابی «شێخ محەمەدی» ناسراو بە «حەکیمی ترمزی»یە. با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرین.

---

١ - قەسیدەی بوردیە.

«شێخ حەکیمی ترمزی» بە خزمەت شێخ ئەبوو تورابی نەخشەبی و شێخ یەحیای جەلاء و شێخ ئەحمەدی خەزرەوی و چەند پیاوی بەرزی تریش گەیشتووە و هاو چەرخی شێخی بەڵخی و شێخی بوخاری بووە و لە گەڵ ئیمام یەحیای ڕازی گفتوگۆی زۆری کردووە.

«شێخ حەکیمی ترمزی» زۆر بە ڕەحم و میهرەبان بووە، زۆر ڕوو خۆش و خۆش خولق بووە، ڕیازەتی زۆری کێشاوە، خاوەن کەشف و کەرامات بوو، لە هەموو عیلمەکان دەستێکی باڵای بووە، لە شەریعەت و تەریقەتا موجتەهید و ئوستاد بووە، بناغەی مەزهەبی لە سەر ئەساسی عیلم بووە، ساحیب حیکمەت و ئەسرار بووە، ئەوەندە دارای فەراسەت و زانیاری بووە لە ناوخەڵکدا بە «حەکیمی ترمزی» بە ناو بانگ بووە، دانراو و تەسنیفات یەکجار زۆر بووە، یەکێک بووە لەو زانایانەی کە حەدیسیان ڕیوایەت کردووە، خولاسەی کەلام عالمی ڕەببانی بووە، جارێک لەگەڵ زانای گەورە، ئەمیر یەحیای مەعازی ڕازی، دەکەوێتە موجادەلەوە، ئەمیر یەحیای ڕازی لە مونازەرەو فەساحەت و بەلاغەتی سەری سڕ دەمێنێ و لای عەجایب دەبێ.

لە سەرەتای لاویدا، لەگەڵ دوو فەقێدا پەیمانیان بەست، کە سێ بە سێ بڕۆن بۆ خوێندن و تا ئیجازە وەر نەگرن نەگەڕێنەوە. کاتێ بەتەواوی خۆیان ئامادە کرد و دوو فەقێکە هاتن بە دوایدا، دایکێکی پیری بوو دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئەی کوڕی خۆشەویستم، خۆت دەزانی کە من لە تۆ بەولاوە کەسم نیە، ئاگاداریم بکا، من بە هیوای کێ بە جێ دێڵی؟ یان شەرع چۆن فتوا دەدات؟

ئەو قسەیەی دایکی زۆری کار تێکرد و بە ناچار لە سەفەرەکەی پەشیمان بوەوە، بەڵام دوو فەقێکە خوا حافیزیان لێ کرد و ڕۆیشتن، تا پێنج مانگ زۆر غەمبار و ناڕەحەت بوو، زۆر پەرۆشی دەرسەکان و خوێندنەکەی بوو، ڕۆژێک هەستا چوە سەر قەبران و دەستی کرد بە گریان و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: ئەی

خوای گەورە، چۆن ئەو خوێندنەم لە کیس چوو! چۆن عومرم بە زایع ڕۆیی! ڕەفیقەکانی من سبەینێ بە کۆڵێ عیلم و زانیاریەوە دەگەڕێنەوە و منیش بە عەوامی دەمێنمەوە، ئەو لەو قسانەدا بوو لە ناکاو پیاوێکی نوورانی پەیدا بوو، لە دوای سەلام کردن گوتی: کوڕم ئەوە بۆ بە تەنیا لێرە دانیشتووی و بۆ دەگری؟

لە وەڵامدا بە سەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە. پیاوە پیرە نوورانیەکە گوتی: کوڕم جا ئەوە گریانی بۆچیە؟ ئەگەر حەز لە خوێندن دەکەی، وەرە هەموو ڕۆژێک من لەو سەعاتەدا خۆم دەرسێکت پێ دەڵێم، تا هەموو عیلمەکان تەواو دەکەی، گوتی بە ئومێدی خوا کارێکی وادەکەم کە لە خوێندندا پێش فەقێکان بکەویەوە، «حەکیمی ترمزی» بە قسەی کابرای پیرە وەک گوڵێک گەشایەوە و هەموو ڕۆژێک لە کاتی خۆیدا دەهاتە ناو گۆڕستانەکە و دەرسێکی زۆر باشی دەخوێند، لە پاش سێ ساڵ دەرس خوێندن، بۆی مەعلووم بوو کە ئەوە حەزرەتی خدرە، هەموو ڕۆژێ دێ دەرسی پێ دەڵێ.

ڕۆژێک مامۆستاکەی گوتی: کوڕم، بزانە کە تۆ ئەو بەرەکەتەت، بە هۆی دڵ ڕاگرتنی دایکتەوە دەست کەوت و هەر ئەولادێک دڵی دایک و باوکی ڕاگرێ و ئازاریان نەدا، خواوەندی گەورە لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەک دەی پارێزێ و فریای دەکەوێ و دەلیلێکی بۆ دەرەخسێنێ، بە تایبەتی ئەو «حەکیمی ترمزیە» بە هۆی دڵ ڕاگرتنی دایکی، خواوەندی گەورە کردی بە دانا و عالم و ئەولیایەکی وا کە لە زەمانی خۆیدا بە حەکیمی ناو ئەولیایان ناو دەبرد.

شێخ ئەبوو بەکری وەڕڕاق دەفەرموێ: جارێک «حەکیمی ترمزی» فەرمووی: ئیمرۆ وەرە دەتبەم بۆ جێگایەک بە هرەی زۆری لێ وەردەگری، دەفەرموێ لە خزمەتیدا ڕۆیشتم تا گەیشتمە جێگایەک، تەماشام کرد دەشت و بیابانێکە، هەتا چاو هەرەکەت دەکا، هەر دەشتە، بەڵام کە نزیک بووینەوە تەماشام کرد لە بن دارێک سەرچاوەیەک ئاوی خۆش دێتە دەرەوە و لە سەر تەختە بەردێک

پیاوێکی زۆر نورانی دانیشتووە.

شێخ چوو دەستی پیاوەکەی زیارەت کرد و ساعەتێکی پێ نەچوو کە لە هەر چوار لاوە چل کەس کۆبوەوە و دەستیان کرد بە قسەکردن، بەڵام من هیچیان لێ حاڵی نەدەبووم، لە ئاخریدا شێخ پرسیارێکی لە پیاوە پیرەکە کرد و وەڵامی دایەوە و خواحافیزیان لە یەک کرد و هاتینەوە، لە ڕێگادا عەرزی شێخم کرد قوربان، ئەو پیاوە پیرە بەسام و هەیبەتە نوورانیە کێ بوو؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە قوتبی مەدار بوو، عەرزم کرد ئەی ئەو جێگایە کوێ بوو و دەتانگوت چی؟ فەرمووی: تۆ کارت بە سەر ئەوە وە نەبێ.

دووبارە هەر شێخ ئەبووبەکری وەڕڕاق دەفەرموێ: ڕۆژێک بانگی کردم فەرمووی: وەرە ئەو کتێبە بەرە بیخە ناو ئاوی جەیحونەوە، گوتم: بەڵێ، لە ڕێگەدا تەماشام کرد دانراوی خۆی بوو باسی حەقایقی دەکرد، زۆرم پێ حەیف بوو بیفەوتێنم، دڵم فتوای نەدا بیخەمە ناو ئاوەکەوە، بردمەوە بۆ ماڵەوە دامنا و هاتم عەرزم کرد قوربان جێبەجێم کرد، فەرمووی: باشە چیت دی؟ گوتم قوربان، هیچم نەدی. فەرمووی: دیارە کتێبەکەت نەخستوەتە ناو ئاوەکەوە. زۆرم لا عەجایب بوو، دووبارە فەرمووی: بڕۆ بیخە ناو ئاوەکەوە، ناچار بووم لە ماڵەوە هێنامەوە و چووم خستمە ناو ئاوی جەیحوونەوە، دەڵێ: بە ئەمری خوا لە پێش چاوم، لە ناو ئاوەکەدا سندوقێک سەری هەڵپچرا بوو، کتێبەکە چۆە ناو سندووقەکەوە و سەری سندووقەکە وێک کەوتەوە، زۆرم لا عەجایب بوو، کە ئەوەم دی گەڕامەوە، شێخ فەرمووی: ئەوجار دەزانم خستتە ناو ئاوەکەوە، عەرزم کرد: قوربان، تۆ خواوەندی گەورە ئەگەر ئەو سیرڕەم پێ نەڵێی. فەرمووی: ئەی ئەبوو بەکر، لە عیلمی تەسەووفدا، شتێکم نووسی بوو کەم کەسی لێ حاڵی دەبوو، حەزرەتی خدر فەرمووی: خواوەندی گەورە سندووقێکی بە ماسی یەکدا ناردووە بۆ ناو ئاوی جەیحوون، کتێبەکەت بنێرە تا بیخەنە ناوی.

دەڵێ زاهیدێک لە خوراسان زۆری ڕەخنە لە «حەکیمی ترمزی» دەگرت و عەداوەتی دەکرد، ساڵێک شێخ چوو بۆ حەج، تا تەشریفی لە سەفەری حەج گەڕایەوە، سەگێک چوو بوو لە حەوشی ماڵەکەیدا ترەکی بوو، کە هاتەوە چاوی پێکەوت، نەی ویست بە زۆری دەری کاو تولەکانی وەدەرنێ، ئەو ڕۆژی چەند جار دەهات خۆی نیشانی سەگەکە دەدا، بەڵکوو بە ئارەزووی خۆی سەگەکە تولەکانی وەگوێزێ، بۆ شەوێ پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لە سەر بێ)، چوو خەوی زاهیدەکەوە و فەرمووی: تۆ عەداوەتی کەسێک دەکەی کە نای هەوێ دڵی سەگێکیش بێشینێ، لە خەوەکەیدا پێیان گوت: ئەگەر دەتهەوێ لە دنیا و قیامەتا خۆش بەخت بی، بەیانی بچۆ دەستی «حەکیمی ترمزی» ماچ کەو کەمەری خزمەتی، لە خزمەتدا ببەستە. زاهید کە تا ئەو شەوە، ئەوەند موخالیفی شێخ بوو وەڵامی سەلامیشی نەدەدایەوە، بە دڵ و گیان بوو بە یەکێک لە موریدە باشەکانی شێخ.

«حەکیمی ترمزی» ئەوەندە لەسەر خۆو بێ وەی بوو، تەنانەت بە دەگمەنیش دڵی ماڵ و منداڵی خۆشی نەدێشاند. جارێک بە شێخ ژنیان گوت: ئەرێ قەت وا هەیە کە شێخ توورە ببێ و ئەگەر توورە بوو چۆن فەرقی پێ دەکەن؟ لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، توورە دەبێ، ئەگەر توورەش بوو ئەو ڕۆژە لە هەموو ڕۆژێک چاکەمان زۆرتر لە گەڵ دەکا و هیچ ناخوا و دەگری و لە بەر خوا دەپاڕێتەوە دەڵێ: ئەی خوای گەورە، دەبێ من چ گوناحێکم کردبێ تا بەو هۆیەوە تووشی ئەو توورەییەوە بوویم، دەیگوت: ئەی خوای گەورە، تۆبە، شێخ ژن دەڵێ: جا دەچووینە خزمەتی و توورەییەکەی نەدەما، دەڵێن جارێک لە کۆڕ و مەجلیسێکدا باسی حەیا و حورمەت و ئەدەبی ئەویان دەکرد، کابرایەک گوتی: بەڵێ ئەوەندە بە حەیا و بە ئەدەبە، تا ئێستا لە لای ماڵ و منداڵی خۆشی دەستی بۆ لووتی خۆی نەبردووە و پاکی نەکردوەتەوە، یەکێک لە دانیشتووەکان باوەڕی بەو قسە نەکرد و

گوتی وانیە، دەبێ من بچم تاقی بکەمەوە، کابرا هەستا هات بۆ خزمەت شێخ، لەو کاتەدا شێخ لە مزگەوت بوو، لە پاش ماوەیەک شێخ هەستا هاتەوە بۆ ماڵەوە و کابرا دوای کەوت و لە دڵی خۆیدا گوتی: خۆزگە دەمزانی داخۆ ئەو قسەی گوتیان ڕاستە یا درۆیە. شێخ بە فەڕاسەت زانی ڕووی وەرگێڕا و دەستی بۆ لووتی خۆی برد و پاکی کردەوە، کابرا لە دڵی خۆیدا گوتی: دەبێ خەڵک بە درۆ وایان گوتبێ، یان شێخ ئەو بەردەی بە من دادا، تا جارێکی‌تر داوای ئەسراری پیاو چاکان نەکەم، کابرا دەڵێ: شێخ دووبارە ڕووی وەرگێڕایەوە و فەرمووی: کوڕم، خەڵک درۆی نەکردووە، بەڵام کەتۆ دەتەوێ ئەسراری خەڵک بزانی نابێ ئاشکرای کەی، چونکە ئەوەی بە نەهێنی و ئەسراری پاشایەکی بزانێ، نابێ لە لای خەڵک بڵاوی بکاتەوە، دەنا بۆ ڕەفاقەت نابێ، کابرا زۆری لا عەجایب بوو، دەستی ماچ کرد و بوو بە یەکێک لە موریدەکانی و گەڕایەوە.

لە ئامۆژگاریەکەدا، ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: وریا بن، نەفس و شەیتان بە سەهوتان نەبا و دەست بکەن بە وردە گلەیی لە خوا، فەرمووی: جارێک نەخۆش کەوتم و لە دۆعا و پاڕانەوەی عادەتی خۆم دواکەوتم، و بە تەواوی بۆم نەکرا، دەفەرموێ: لە دڵی خۆمدا گوتم: حەیف بۆ کاتی ساغی و سەلامەتی، ئەگەر نەخۆش نەبوومایە ئەو خێر و چاکەم لە دەست دەهات، بەڵام ئێستا کە نەخۆش کەوتووم هێچم لە دەست نایە، دەفەرموێ؛ ئەو قسەم بۆنی گلەیی لێ دەهات، فەرمووی: لە غەیبەوە گوێم لە دەنگێک بوو، بانگی کرد و گوتی، ئەی «حەکیمی ترمزی»، ئەوە چ قسەیەکت ووت! تۆ نازانی تۆ و ئەمسالی تۆ لە عەبد و بەندەگان دەیکەن، وەکوو کاری ئێمە نیە! کەم وایە خاڵی بێ لە سەهوو نیسیان، بەڵام کار و فەرمانی خوا ڕاستە و بێ حیکمەت نیە، دەفەرموێ: بەو عیتابە لە قسەکەی خۆم پەشیمان بوومەوە و تۆبەم کرد، کە جارێکیتر لە بەرانبەر ئەمر و فەرمانی خوادا غەڵەت نەکەم و قەت ڕەخنە بە خەیاڵ و خەتەرە شەوە لە کار و فەرمانی

خواوەندی گەورە نەگرم.

جا خەڵکینە، ئەو فەرمایشت و حیکایەتەی شێخ دەرس و عیبرەتە بۆ هەموو موسوڵمانێک، کە لە ژیانیدا وریا بێ، ئەگەر تووشی ناخۆشی و تەنگ و چەڵەمە بوو، شەیتان بە سەهوی نەبا و غەڵەتی پێ نەکا، ئیعتراز لە کاری خوا بگرێ، بەڵکوو دەبێ بە پێچەوانەی ئەوە خۆڕاگر و سابیر بێ، تا خواوەندی گەورە بێ ئەجر و پاداشتی نەکا.

ئەو زاتە بەرزە هەروەک دانا و زانا و پیاو چاک و وەلی بووە، حەدیسیشی زۆر بە واسیتە ڕیوایەت کردووە، بۆ نموونە لە عبداللەی کوڕی عەبباسەوە، نەقلی کردووە دەفەرموێ: جارێک پێغەمبەری خوا (درووود و سەلامی لە سەر بێ)، ئەو ئایەتەی ژمارە سەت و چل و سێی سورەی ئەعرافی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ﴾، حەزرەتی مووسا لە سەر کێوی «تور» عەرزی بارەگای ئەقەدەسی خوای گەورەی کرد و گوتی: زۆر حەز دەکەم خۆتم نیشان بدەی، تا تەماشات کەم، حەزرەت فەرمووی: [قالَ اللهُ يا مُوسىٰ إِنَّهُ لا يَراني حَيٌّ إلّاماتَ وَ لا يابِسٌ إِلاّ تَدَهْدَهَ، وَ لا رَطْبٌ إِلاّ تَفَرَّقَ، وَ إِنَّما يَراني أَهْلُ الْجَنَّةِ الَّذِينَ لا تَمُوتُ أَعْيُنُهُمْ وَ لا تُبْلىٰ أَجْسادُهم] خوا فەرمووی: یا مووسا، هەر گیان لەبەرێک لە دنیادا من ببینێ، خۆی ڕاناگرێو دەمرێ و هەر وشک و بێ گیانێکیش چاوی بە من بکەوێ، دەکەوێتە سەما و لێک جیا دەبێتەوە و هەر گژ و گیا و دارو درەختێکی تەڕیش بمبینێ بە حەوادا دەچێ و لێک جیا دەبێتەوە، تەنیا ئەوانە دەتوانن بمبینن، کە ئەهلی بەهەشتن و چاویان نامرێ و بە دەنیان نارزێ.

جا لە بەر ئەوە کە زۆر لە زانا و عولەمای ئیسلام، بیروڕایان لە سەر ئەوەیە، کە پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ)، لە شەوی میعراجدا، چاوی بە سەرچاوەی نووری خوا کەوتووە، جا بەهەر جۆرە چاوپێکەوتنێک بووبێ، گوتویانە: کە چاوی پێغەمبەر هەمیشە گەشە و جەستەی شەریفی هەتا هەتایە،

هەر وەکوو خۆیەتی و قەت لە گۆڕدا نارزێ و ناگۆڕێ و هەر وەک خۆیەتی.

«شێخی ترمزی» مەوعیزەی زۆر بە نرخی دەفەرموون، لە ئامۆژگاریەکەیدا فەرمووی: باری منەت لە چاکەی خەڵک، کە چاوەڕوانی بی لە گەڵت بکەن لە هەموو بارێک گرانترە، لە بەر ئەوەی؛ ئەوەی چاکەت لەگەڵ دەکا، وەک ئەوە وایە کە بە گوریسی ئەو پیاوەتی و چاکەیە وەت بەستێتەوە، بەڵام ئەوەی چاکەت لە گەڵ ناکا وەک کاری بە سەرەتەوە نەبێ و بەر هەڵات کا وایە.

دەیفەرموو: خەڵکینە، بیر لە حاڵی خۆتان بکەنەوە، وامەزانن کە هیچ عەیب و عارێکتان نیە، چونکە خوای گەورە نەبێ کەس بێ عەیب نیە، تەنانەت بۆ عەیبداری ئینسان ئەوەندە بەسە، کە زۆر جاری وایە بەو شتەی کە زەرەری دینی تۆی تێدایە کەیف خۆش دەبێ، پیاوی زانا و عاقڵ بەو کەسە دەڵێن، کە تەقوا بکا و موحاسەبەی نەفسی خۆی بکا.

دەیفەرموو: سوود و قازانج و سەلاحی پێنج تاقم، لەو پێنج جێگایەدایە: یەکەم، قازانج و سەلاحی منداڵ، لەوەدایە کە بچێتە لای مامۆستا و بخوێنێ و فێری ئەدەب ببێ، بەڵام با ئەوەندە بڵێین، نەک وەک هێندێک لە قوتابی ئێستا، کە زۆر بەداخەوە، نەک هەر بە ئەدەب نابن، بەڵکوو زۆر بێ ئەدەبتر دەبن و وەکوو ئەوەکە تەنیا هەر چوو بن دەرسی بێ ئەدەبی بخوێنن وایە. دووەم، قازانج و سەلاحی جەردە و ڕێگر، ئەوەیە لە بەندیخانەدا بن، تا هەم خۆیان و خەڵکیش لە دەستیان ئاسوودەبێ. سێیەم، سوود و سەلاحی ئافرەت، لەوەدایە کە ئیش و کاری ماڵەوە بکا و ئاگای لە ماڵ و منداڵ بێ، تا هەم لە چاوپێکەوتن و قسەی خەڵکیش لە ئەمان دابێ. چوارەم، بۆ کوڕە گەنجەکانیش وا باشە، کە خەریکی عیلم و ئەدەب بن و بێکار و فەرمان نەجۆڵێنەوە. پێنجەم، بۆ پیاوی وەنا و کەوتوو وا باشە کە ئەگەر کاری نەبوو، پێی لە مزگەوت نەبڕێ و هات و چۆی مزگەوت بکا و لە کۆڵانان دانەنیشێ.

دەیفەرموو: مەترسن خوا زامنی ڕزقی عەبد و بەندەگانە، بەڵام لە سەر عەبد و بەندەگانی فەرز کردووە کە پشت بە خوا ببەستن و خەریکی کار و کاسبی بن، تا خوا تۆفیقیان بدا. [اِجْعَلْ مُراقَبَتَکَ لِمَنْ لا یَغیبُ نَظَرَهُ اِلَیْکَ، وَ اجْعَلْ شُکْرَکَ لِمَنْ لا تَنْقَطِعُ نِعَمُهُ عَنْکَ، وَ اجْعَلْ خُضوعَکَ لِمَنْ لا تَخْرُجُ عَنْ مُلکِهِ وَ سُلْطانِهِ]

لە ئامۆژگاریەکەی‌دا ڕوو دەکاتە هەر یەکە لە ئێمە و دەڵێ: ئەی فلان کەس، ئاگات لەو کەسە بێ و بێ ئەمری ئەو کەسە مەکە، کە هەمیشە چاوی لە تۆیە و ئاگای لە هەموو کار و کردەوە و هەستان و دانیشتنی تۆیە، شوکرانەی ناز و نیعمەتی ئەو کەسە بکە، کە قەت نیعمەتی خۆی لە تۆ نابڕێ، با بێ ئەمریشی بکەی، سەری تەعزیم بۆ ئەو کەسە دانەوێنە کە هەرگیز تۆ ناتوانی لە ژێر دەسەڵات و موڵکی ویدا نەبی و بچیە دەرێ.

دەیفەرموو: بەڵێ دنیا و ماڵی دنیا بۆ ئەو کەسانەی کە ئەهلی دنیان و دوا ڕۆژیان زۆر لا مەتڵەب نیەو، وەک بووک وایە و پێشوازی لێ دەکەن و لە باوەشی دەگرن، بەڵام لای ئەو کەسانەی کە دوا ڕۆژیان مەتڵەبە، دنیا وەک ئاوێنەیەک وایە، کە هەموو جوان و ناشیرینێک نیشان دەدا، ئەوان جوانەکەی وەر دەگرن و خۆیان لە ناشیرینەکەی دەپارێزن.

دەیفەرموو: قەت ئینکاری حەقایق و ئەولیای ڕاستەقینە مەکەن، چونکە [لاٰ یُنکِرُ الْکَرامٰاتِ اِلاّ الْقُلُوبَ الْمَحْجُوبَةُ عَنِ اللهِ تَعالیٰ] ئینکاری ئەولیا و کەرامات ناکا، ئەو دڵانە نەبن، کە دوورن لە ڕەحمەتی خوا.

یەکێک عەرزی کرد: قوربان تەقوا و پیاوەتی چیەو کامەیە؟ فەرمووی: تەقوا و پیاوەتی ئەوەیە و بەو کەسە دەڵێن پەرهێزگار و پیاوی باش، کە لە ڕۆژی قیامەتا کەس داوێنی نەگرێ و حەقی کەسی بە سەرەوە نەبێ و ئەویش داوێنی کەس نەگرێ و لەبەر ڕەزای خوا داوای حەقی خۆی نەکاتەوە، ئەو کەسە عەزیز و خۆشەویستە، کە بە هۆی گوناهەوە خۆی ناشیرین نەکردبێ و ئەوە ئازادە تووشی

داوی تەماع نەبوویێ. دەیفەرموو: زۆر سەیرە! پیاو لە هەرچی بترسێ لە بەری ڕادەکا، بەڵام ئەوەی لە خوا بترسێ، دەبێ زیاتر لە خوا نزیک وەبێ.

دەیفەرموو: ئەو کەسەی بە ڕاستی خاوەن ئیمان بێ، هەموو کارێکی بۆ خێرە و ئەوەی ڕووی لە دنیا بێ، دینی بیر دەچێتەوە و خێر لە چاکەکانیشی نابینێ.
دەیفەرموو: سەت گورگ بکەوێتە ناو مێگەلێکەوە، ئەوەندەی زەرەر نیە، کە یەک لەحزە بە قسەی نەفس و شەیتان بکەی، بە تایبەتی ئەو خراپەی کە نەفسی خۆت لە گەڵت دەکا، بە سەت شەیتان ناکرێ، جا کەوایە، مەرد بەو ئاگات لە خۆت بێ، بە سەهوت نەبەن.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بەسەرهات و ئامۆژگاریەکانی «شێخی ترمزی» کە لە ساڵی دوسەد و پەنجا و پێنجی کۆچیدا، وەفاتی فەرمووە. ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ و لە خوای گەورە داوا دەکەین لەو پیاو چاکانە و لە ئێمەش خۆش بێ. عەفوومان بکا. زەلیلمان نەکا. چاو لە دەستمان نەکا. لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ اَللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ أَصْحٰابِهِ وَ أَتْبٰاعِهِ أَجْمَعِین وَ اَلسَّـلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اَللّٰهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٣٩)

## (باسی ئەبوو بەکری وەڕڕاق)

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ الْكَرِيمِ الْمُنْعِمِ     بِمَا اسْتَحالَ حَصْرُهُ مِنْ نِعَمِ
وَ صَلَوٰاتٌ مٰا لَهٰا اِنْتِهاء     ثُمَّ تَحِيٰا مٰا لَهٰا انْقِضاءُ...
مِنهُ عَلىٰ رَسُولِهِ وَ حِبِّهِ     مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ[1]

گوێ گرینە چەند خۆشە کە ئینسان ڕۆژێ جارێک لە کاتی بەهاردا، بە ئارەزووی خۆی، بچێتە ناو باغ و باغات و گوڵ و گوڵزار و دەشت و سەحرا و تەماشای مەنزەرە و دیمەنی جوان بکا، بۆنی خۆشی ئەو گوڵ و گوڵزارە هەڵمژێ و هەوای ئازادی لێ بدا.

بەلای منەوە ئەگەر ئینسانی خاوەن هەستی موسوڵمان، ڕۆژێ چەند دەقیقەیەک بچێتە بارەگا و مەجلیسی باسی یەکێک لە گوڵەکانی باغی ویلایەت و گوێ بگرێ لە باسی ژیان و بەسەرهات و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرێ، زۆر لە چوونی دەشت و سەحرا کە خۆشترە و سوودی دنیا و قیامەتی زیاتر دەست دەکەوێ.

جا، با ئێستا لەم چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینە بارەگای

١ - شێخ مەعرووف.

مەجلیسی «شێخ ئەبوو بەکری وەڕڕاق»، کە لە زەمانی خۆیدا خەزنەی بازاری عیلم و حیکمەت بوو، یەگانە ئادەمیزادی عیلم و عیسمەت بوو، پشت و پەنای زاهیدان بوو، نامووس و شەڕەفی عابیدان بوو، لە وەرع و تەقوادا بێ نەزیر بوو. لە تەجرید و تەفریددا بێ وەزیر بوو، ئەوەندە بە حەیا و بە حورمەت بوو، ئەوەندە بە ئەدەب بوو، لە ناو خەڵکدا ناوبانگی بە موئەددەبی ئەولیا ڕۆیشتبوو. زۆر کتێبی لە بابەت ڕیازات و موعامەلات و ئاداب دا، دانابوو حەدیسی ڕیوایەت کردبوو، بە خزمەت شێخ حەکیمی ترمزی و ئەحمەدی حەزرەوی و محمدی زاهید و محمدی خۆشنامی بەڵخی گەیشتبوو.

یەکێک لەو حەدیسانەی کە لە ئەبوو سەعیدی خدریەوە ڕیوایەتی کردووە، ئەوەیە کە دەڵێ: ئەبوو سەعیدی خدری فەرموویەتی: [قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّ مِنْ شِرارِ النَّاسِ مَنْزِلَةً عِنْدَاللهِ يَوْمَ القِيامَةِ رَجُلٌ يُفْضِي إِلىٰ اِمْرَاتِهِ وَ تُفْضي إِلَيهِ ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّها] پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ)، فەرمووی: ئەی ئەسحابی من، ئاگادار بن و بە خەڵک ڕابگەیێنن کە ئەگەر لە گەڵ ماڵ و عایلەی خۆیان، لێک نزیک بوونەوە و قسەیان بە یەکتر گوت، چاویان بە ئەعزا و ئەندامی یەکتر کەوت، ئەوە گەورەترین ئەمانەتە، دەبێ زۆر بە ڕێزەوە ئەو ئەمانەتە بپارێزن و ئاگاداری بکەن و لای خەڵک باسی نەکەن، چونکە لە ڕۆژی قیامەتا ئەو ژن و پیاوەی کە لە دنیادا، لای خەڵک، باسی یەکتر دەکەن و ناوی یەکتر دەبەن و عەیب و عاری یەکتر ئاشکرا دەکەن، پایە و مەرتەبەیان لە لای خواوەندی گەورە، زۆر نزم دەبێتەوە و بە چاوی سووک تەماشایان دەکرێ.

«شێخ ئەبوو بەکری وەڕڕاق» دەفەرمووێ: زۆر دەمێک بوو ئارەزوی چاوپێکەوتنی خدری زیندەم بوو، دەمگوت خوزگە ڕۆژێک بە خزمەتی دەگەیشتم. دەفەرموێ ماوەیەکی زۆر بەو ئارەزووەوە هەموو ڕۆژێ دەچوومە گۆڕستان و لە چوون و هاتنەوەدا جزمێکم قورئان دەخوێند، دەفەرموێ: ڕۆژێک

دووباره هەر بەو نیازە پێم لە دەروازە وە دەرنا، پیاوێکی زۆر نوورانیم تـووش بوو، سەلامی کرد و وەڵامم دایـەوە و گـوتی ڕەفـاقەتم دەکـەی؟ گـوتم: بـەڵێ، دەفەرموێ: لە گەڵ کابرا پیرەی نوورانی وەڕێ کەوتین و لە ڕێگادا هەر قسەی بۆ دەکردم و لە قسەکانیدا ئاوڕی دایەوە و گوتی: ئەی «ئەبووبەکری وەڕڕاق»، زۆر دەمێکە تۆ ئارەزووی ئەوەت بوو چاوت بە من بکەوێ، ئەوا ئیمڕۆ چاوت بە من کەوت، فەرمووی: تکایە جارێکی‌تر ئارەزووی شتی وا مەکە، فەرمووی: تەماشا کە ئیمڕۆ بە هۆی ڕەفاقەتی منەوە، قورئانەکەت بۆ نەخوێندرا، بـەڵام ڕۆژان تـا دەگەیشتیە سەر قەبران نیو جزمت دەخوێند. «شـێخ ئـەبوو بـەکـر»دەفـەرموێ: ئەوەی فەرموو خواحافیزی کرد و لە پێش چاوانم غایب بوو.

جا خەڵکینە، ئەو چەند کەلیمە پەند و ئاموژگاری زۆری تێدایە. ئەگەر ئێمە بە وردی سەرنجیان بدەینێ، چونکە لە جێگایەک ڕەفاقەتی حەزرەتی خدر ئاوا بێ و حەزرەتی خدر ئاوا بفەرموێ، دەبێ ڕەفاقەتی خەڵکی ئەم زەمانە چـۆن بـێ! دەبێ زۆر وریا بین خۆمان لە ڕەفیقی خراپ بپارێزین، دەبێ وەدوا هەموو کەس نەکەوین، دەبێ خەڵک تاقی بکەینەوە، نابێ زوو بە قسەی هەموو کەس بە سەهو بچین، ئەگینا زۆری پێناچێ لە ڕەفاقەتیان پەشیمان دەبینەوە، مەعناشی وانیە کە نابێ ڕەفاقەتی کەس بکەین، چونکە زۆر هاوڕێ سوودی هەیە.

«شێخ ئەبوو بەکری وەڕڕاق» ئەوەندە بە حەیا و بە ئەدەب بوو، کـە دەچـوە مزگەوت، نوێژ و ویرد و ئەورادی خۆی تەواو دەکرد و دەگەڕایەوە، وەهـا بـە ئارامی و لە سەر خۆ دەهـاتەوە، دەتگـوت لە دزی دەگـەڕێتەوە، یـان تـووشی گوناهێک بووە و خەڵک زانیوەتی و تەماشای دەکەن.

دەڵێن: کوڕێکی هەبوو، ناردبوویە قوتابخانە لای مامۆستا دەرسی دەخوێند، ڕۆژێک کوڕەکە بە گریانەوە هاتەوە بۆ ماڵ، شێخ کە چاوی پـێکەوت دەگـریا، پرسی و گوتی: کوڕم بۆ دەگری؟ کوڕەکە لە وەڵامدا بە گریانەوە گوتی: بـاوکە،

ئیمڕۆ مامۆستا ئەو ئایەتەی سورەی مززە ملی پێ گوتم، کە خواوەندی گـەورە لەوێدا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِنْ كَفَرْتُمْ يَوْماً يَجْعَلُ الْوِلْدانَ شِيباً﴾ ئەگەر ئێوە ئیمان بە خوا نەهێنن و باوەڕتان بە پێغەمبەر نەبێ کافرن، چۆن خۆتان دەپارێزن لە تۆڵە و سزا لە ڕۆژی قیامەتا، کە ڕۆژێکی ئەوەندە ناخۆش و سەختە و ئەوەندە بە سامە، منداڵی ساوا لەو ڕۆژەدا پیر دەبێ، کوڕەکە گوتی: ئەی باوکە، لەوەتی ئەو ئایەتەم خوێندووتەوە، خۆم ڕاناگرم و ئاگام لە خۆم نیە، «شێخ ئـەبووبەکـری» باوکی دەستی کرد بە گریان و بە گریانەوە دەیگوت: ئەی خاک بەسەری باوکت، ئەوە چەند ساڵە ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە و خەتمی قورئان دەکا، کە چی تا ئێستا تەئسیری تێ نەکردووە.

جارێک «شێخ ئەبووبەکر» ئامۆژگاری خەڵکی دەکـرد، فـەرمووی: [اَلنّـاسُ ثَلاثَةٌ، أَلْعُلَماءُ، وَ اَلأُمَراءُ، وَ اَلْفُقَراءُ] تەواوی بەرەی ئادەمیزاد و ئەو خەڵکەی کە تۆ دەیبینی، دەکرێن بە سێ تاقم لە ژیانی دنیادا، ئەوەی دەیبینی و هەیە و مەوجوودە، یان زانا و عالمە، یان ئەمیر و گەورە و کاربە دەستە، یان فەقیر و دەست کورت و هەژارە. فەرمووی: [فَاذا فَسَدَ اَلْعُلَماءُ فَسَدَتِ اَلطّاعاتُ، وَ إذا فَسدَ اَلأُمَراءُ فَسَـدَ اَلْمَعاشُ، وَ اِذا فَسَدَ اَلْفُقَراءُ فَسَدَتِ الأَخْلاقُ] فەرمووی: جا هەر کاتێ تاقمی زانا و عالم فاسد بوو، بەو مەعنایە وەرع و تەقوایان نەما و عەمەلیان بە عـیلمەکـەیان نەکرد و لە شەرعیان لادا و ڕوویان کردە دنیا و دنیا پەرستی و دەربەست بە حەڵاڵ و حەرام نەبوون، ئەوە خراپەی ئەوان سەر دەکێشێ، بۆ خراپ بوونی تـەواوی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە و دینیان فاسد دەبێ و تاعەت و عـیبادەتیان، زۆریـەی لەبەر لۆمەو لەقەبی یەکتر دەکەن و زۆر عیبادەتیان دەبێ بە عادەت و بۆ خوا نابێ. فەرمووی ئەگەر ئومەڕا و کار بە دەسـتیش فـاسید بـوون، ئـەوە لەبـەر ژیـان و ڕابواردن و تەماعی خۆیان، ئاگایان لە ژیانی خەڵک نامێنێ و دەربەست بە ژیان و زۆری و کەمی مەعاشی خەڵک نابن و کار و کاسبی لەو وڵاتەدا کز دەبێ و وڵات

بەرە و ویرانی دەڕوا و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژیانی خەڵک ناخۆش‌تر دەبێ و زۆربەی خەڵک دەکەوێتە ژیانێکی زۆر ناخۆش و ناڕەحەت و ڕەورەوەی ژیان دەگۆڕێ.
فەرمووی: ئەگەر تاقمی فەقیر و هەژارانیش فاسید بوو، ئەوە زۆر وایە بە زۆری ڕوودەکەنە بەد ئەخلاقی و خوو و ڕەوشتی بەرزی ئینسانیان نـامێنێ و دەست دەکەن بە دزی و جەردەییو ڕێگری و خراپەی یەکتر و چاکەی یەکتریان ناوێ و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، دەبێ چاوە ڕوانی ناخۆشتر لە ژیاندا بکەن و تووشی ڕۆژی ڕەشتر بن.

جارێک یەکێک لە موریدەکان عەرزی دەکا: یا شێخ، ئامۆژگاریەکم بکە، شێخ لە وەڵامدا دەفەرموێ: براگیان، ئامۆژگاری من بۆ تۆ و هەموو برادەرانـی دیـنی ئەوەیە، ئەگەر دەتانەوێ خێری دنیا و قیامەتتان دەست کەوێ و لە دنیا و قیامەتا سەرفیراز بن و بە خۆشی و شادی و ئاسوودەیی بژین، قەناعەت بکەن و بە بەشی خۆتان ڕازی بن و بۆ زۆری ماڵی دنیا خۆتان بە هیلاک مەدەن، فەرمووی: چونکە من لە تەمەنی خۆمدا تاقیم کردوەتەوە، کە خێری دنیا و قیامەت لە قەناعەت و کەمی ماڵی دنیادایە و بە پێچەوانەشەوە نەگبەتی لە دنیا و قیامەتا، بە ناڕازی بوون و زۆری سەروەت و ماڵ و تێکەڵاوی زۆر لە گەڵ خەڵک دایە.

ڕۆژێکی‌تر لە مەوعیزەدا دەفەرموێ: ئاگادار و وریان بن، دڵی ئینسان شەش سیفەتی پێوە دەلکێ، چونکە ئەو دڵە، یان دڵێکی زیندووە، یان دڵێکی مردووە، یان دڵێکی ساغ و سەلامەتە، یان دڵێکی نەخۆش و ناساغە، یا دڵێکی بە خەبەر و ئاگادارە، یا نووستووە و بێ ئاگایە. جا دڵی زیندوو، ئەو دڵەیە کە ڕووی کردبێتە ڕێگای ڕاست و خواوەندی گەورە هیدایـەتی دابـێ و بـە تـاعەت و چـاکـە و خواپەرستی شاد و کەیف خۆش بێ. دڵی مردووش بەو دڵە دەڵێن، کە ڕێگـای چەوت و خراپی گرتبێتە بەر و خاوەنەکەی تووشی زەلالەت و گومراهی بێ. دڵی ساغ و سلامەتیش بەو دڵە دەڵێن، کە پاک بێ، لە بوغز و غەرەز و کینە و حەسادەت

و بەخالەت و نیفاقی تێدا نەبێ و خاوەن خوو و ڕەوشتی بەرزی ئینسانی بێ. دڵی ناساغ و ناخۆشیش بەو دڵە دەڵێن، کە پڕ بێ لە تەکەببور و خۆ بە زل گرتن و ڕق و کینە و سیفاتی غەیری ئینسانی. دڵی بە خەبەریش، ئەو دڵەیە، کە لە یاد و زکری خوا غافڵ نەبێ و لە یادی دوا ڕۆژ بێ خەبەر نەبێ و دڵی خەڵک ڕاگرێ و خەڵک ناڕەحەت نەکا. دڵی نووستوو و بێ ئاگاش، ئەو دڵەیە، کە خەریکی ڕابواردنـی ژیانی دنیا بێ و لە خوا غافڵ بێ و دەربەست بە شایی و شینی خەڵک نەبێ.

فەرمووی: جا ئەی خەڵکینە، بیر بکەنەوە و موحاسەبەی دڵی خۆتان بکەن و بزانن داخۆ دڵتان لەو شەش سیفەتە، کامەی تێدا مەوجودە.

یەکێک لە مەجلیسەکەدا عەرزی دەکا و دەڵێ: قوربان، شتێکم فێر کە، کە لە خوا نزیکم کاتەوە وە خەڵک خۆشیان بوێم، شێخ لە وەڵامیدا دەفەرموێ: [امّا اَلَّذي يُقَرِّبُکَ اِلیٰ اَللهِ فَسُأَلَتُهُ وَ أمّا الّذي يُقَرِبُکَ إلیٰ النّاسِ فَتَرْکُ مَسْئَالَتِهِمْ] ئەوەی کە تۆ لە خوا نزیک دەکاتەوە، ئەوە دوعا و پاڕانەوە و داوا کردنی تۆبە لە خوا، تـا دەتوانی پەنا بەرە بەر خوا و لە بەری وەپاڕێ، تا زیاتر لێی نزیک وەبی. فەرمووی: بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوە کە خەڵک تۆیان خۆش بوێ و لە خەڵکت نزیک دەکاتەوە، ئەوەیە داوای هیچیان لێ نەکەیت و نەبیتە سەربار بە سەر شانیانەوە.

دەیفەرموو: وریا بن، شەهوەت پەرست مەبن، چونکە کاتێ نەفسی ئینسان غاڵب بوو، ڕووی کردە ئارەزوو بازی و شەهوەت پەرستی، ئەوە بە سەرتانا زاڵ دەبێ و کاتێ نەفسی ئینسان زاڵ بوو بە سەری دا، ئەوە دڵـی ڕەش دەبـێ و کـە دڵیشی ڕەش بوو، دڵی تاریک دەبێ و کە تاریکیش بوو، سینگی ئەو کەسە تەنگ دەبێ و کە سینگیشی تەنگ بوو، خوڵق و خووی ناخۆش دەبـێ، کـە خـوڵق و خوشی ناخۆش بوو، خەڵک دەیبوغزێنن، کە خەڵکیش بوغزانـدیان، ئـەویش خەڵک دەبوغزێنێ، دیارە کە بوغز و حەسەدیش کەوتە مابەینەوە، زوڵم لە یەکتر

دەکەن، جا کەواتە تا دەتوانن و بۆتان دەکرێ هەوڵی ئەوە بدەن، نەفس بە سەهوتان نەبا و تووشی زوڵم و دوژمنایەتیتان نەکا.

دەیفەرموو: لە زەمانی حەزرەتی ئادەمەوە تا ئێستا، هەر شەڕ و ئاژاوە و فیتنەیێک کە یەخەی خەڵکی گرتووە، بە زۆری بە هۆی تێکەڵاوی و نزیک بوونەوەی خەڵک پەیدا بووە، کە زۆربەی ئەو تێکەڵاویە لە شوێنی خۆیدا نەبووە، جا لە بەر ئەوەیە کە تا ئێستا، کەم کەس لە دەست و زمانی خەڵک بە سەلامەتی ڕزگاری بووە، ئەو کەسە نەبێ کە خۆی لە خەڵک بە زۆری پارستبێ و تێکەڵاوی خەڵک نەبووبێ.

دەیفەرموو: ڕوتبە و دەرەجە و مەقامی عالمان و زانایان لە دوای ڕوتبە و دەرەجە و مەقامی پێغەمبەرانەوەیە، و لە دوای مەرتەبەی نوبووەتیش، هیچ مەرتەبەیەک لە مەرتەبەی عیلم و حیکمەت گەورەتر نیە و نیشانەی عیلم و حیکمەتیش لەو سەردەمەدا ئەوەیە، کە ئەو زانایە، خۆی بپارێزێ و بێ دەنگ بێ و قەت لە خۆڕای قسە نەکا، ئەگەر ناچاریش بوو قسە بکا، تەنیا وەڵامی پرسیار بداتەوە و زۆر بڵێ نەبێ.

دەیفەرموو: کەم دوێی و بێ دەنگی و خامۆشی، نیشانەی ئینسانی دانا و زانایە و ئینسانی کەم دوێ، ئەوەی بیشی لێ، زۆر بەتام و خۆیی دەڵێ و خەڵک سوودی لێ دەکەن.

فەرمووی خوای گەورە هەشت شتی لە عەبد و بەندەگان دەوێ: یەکەم، دوو شتی لە دڵی خەڵک داوا کردووە، کە یەکەمیان ئەوەیە، دەبێ بە دڵ ئەمر و فەرمانی خوای لە لا گەورە و پیرۆز بێ و دووەمیان دەبێ، ڕەحم و شەفەقەتی دەرهەق بە عەبد و بەندەگانی خوای گەورە هەبێ. دووەم، دوو شتی لە زمانی ئینسانی دەوێ، یەکەمیان دەبێ، بە زمان ئیقرار بە وەحدانیەت و تاک و تەنیایی خوا بکا و دووەمیان، زەمانی لە گەڵ خەڵک خۆش بێ و زمان شڕ نەبێ. لە ئەعزا و

ئەندامەکانی تریشی دوو شتی داوا کردووە، یەکەم، بە کارهێنانیان لە ئەمر و ئیتاعەی خوادا و یارمەتی خەڵکیان پێ بدا. وە لە خولق و خۆی ئینسانیش دوو شتی داوا کردووە، یەکەم، دەبێ لە سەر ئەمر و فەرمانەکانی خوا سابیر بێ و دووەم، دەبێ لەگەڵ مەخلوقی خوادا، نەرم و حەلیم بێ.

ڕۆژێک فەرمووی: یەکێک لە پیاوە گەورەکان فەرموویەتی: شەیتانی لەعین وتوویەتی، من ئەوەندە نەزان و نەفام و بێ عەقڵ نیم، کە هەر لە ڕێوە وەسوەسەی خەڵک بدەم بۆ کافر بوون، جارێ لە پێشدا هەڵیان دەنێم بۆ شەهوەت و ئارەزووی شتی حەڵاڵ، جا کاتێ حەریس بوو لە سەر شەهوەت و ئارەزوی شتی حەڵاڵ و نەفس زەفەری لێ دێ، وردە وردە، لە ئارەزووی حەڵاڵەوە، ڕووی کردە ئارەزووی شتی حەرام و بە قسەی نەفسی کرد، ئەو کاتە وەسوەسەی دەدەم بۆ خۆ کافر کردن و لادانی لە دین و ئایین.

دەیفەرموو: هەمیشە هەموو ئادەمیزادێک ڕەفیقی پێنج شتە: یەکەم، خواوەندی گەورە. دووەم، نەفسی خۆی. سێیەم، شەیتانی لەعین. چوارەم، دنیا و ماڵی دنیا. پێنجەم، ئەو خەڵکەی کە لە زەمانی ئەودان. و دیارە قەت ئینسانێک لە حاڵی حەیاتا، نیە کە لەو پێنج شتە یەکیانی لە گەڵ نەبێ.

جا ئەی برای موسوڵمان، ئەگەر تۆ لە ژیانی ڕۆژانەتدا، هەر یەکە لەو پێنجانە حەقی خۆیان بەتەواوی بدەیتێ، ئەوە ئەو ڕۆژە، زۆر بە خۆشی دەبیتە سەر، بەڵام ئەگەر هات و زوڵمت لەو ڕەفیقانە کرد و حەقی خۆت نەدانێ، ئەوە زوو بە هیلاک دەچی. فەرمووی: جا حەقی ڕەفاقەتی خواوەندی گەورە ئەوەیە، کە هەرچی خوا بیکا پێی ڕازی بی و ئیعترازی لێ نەگری. حەقی ڕەفاقەتی نەفسیش ئەوەیە، کە بۆ داوای بێ شەرعی بە قسەی نەکەیت و وەڵامی نەدەیتەوە. حەقی ڕەفاقەتی شەیتانی لەعینیش ئەوەیە، بە لەعنەتی بکەی. حەقی ڕەفاقەتی دنیا و ماڵی دنیاش ئەوەیە، ئاگات لە خۆت بێ، بە حەرامی، کۆی نەکەیتەوە و ئەو ڕۆژە

تووشی خراپە نەبی. حەقی ڕەفاقەتی خەڵکیش ئەوەیە، لە گەڵیان بە ڕەحم و میهرەبان بی و ئەگەر بۆت کرا چاکەیان لە گەڵ بکەی. هەر کەسێ ئاوا ڕەفتار بکا بە خۆشی دەژی.

دەیفەرموو: وریا بە! ئەگەر هات و بوویتە هاوڕێی پیاوی عاقڵ، لە قسەی دەرمەچۆ بە قسەی بکە، ئەگەر لە پیاوی چاکیش نزیک بوویتەوە، زۆر بە ئەدەب بەو ڕەخنەی لێ مەگرە، ئەگەر بووی بە هاوڕێی پیاوی نەفام و جاهیلیش، لە گەڵی بە سەبر و لە سەر خۆ بە.

کابرایەک چوە خزمەتی عەرزی کرد: قوربان، زۆر لە فلان کەس دەترسم، چارم چیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: کوڕم، قەت لێی مەترسە، چونکە دڵی ئەو کەسە کە تۆ لێی دەترسێی، بە دەستی ئەو کەسەیە کە تۆ ئومیدت پێیە، ئەو ئاگادارە، جا بۆ لێی دەترسێی!

دەیفەرموو: بە زۆری عەلامەت و نیشانەی ئینسانی خاوەن ئیمان چوار شتە: یەکەمیان ئەوەیە، کە زۆر زیاد زکری خوا بکا. دووەم ئەوەیە، بێ دەنگی، بە زۆری بیر کردنەوە بێ. سێیەم، تەماشا کردنی بە زۆری، بۆ پەند و عیبرەت بێ. چوارەم، ئەوەیە کار و کردەوەی بەزۆری خێر و چاکە بێ.

دەیفەرموو: خۆتان لە ڕەفاقەتی زاڵمان بپارێزن، تا مەحفووز بن و ژیانتان خۆش بێ و خۆتان لە ڕەفاقەتی دەوڵەمەندان بپارێزن، با حەسوودیان پێ نەبەن و تەماع نەتانگرێ و یان ئەوان ماڵ و مڵکەکەتان بە هەرزانی لە دەست نەهێننەدەرێ.

دەیفەرموو: ئەگەر دوو کاندار و ئەهلی بازاری نەبووی، زۆر مەچۆ بازاڕ، با خوو ڕەوشتت خراپ نەبێ و نەگۆڕێ. خۆت لە ڕەفاقەتی ژن و ماڵ و منداڵ بپارێزە، با دڵت نەگۆڕێ و تووشی هەڵە نەبی و ئارەزووی نەفس غەڵەتت پێ نەکا. هەروەها خۆت لە ڕەفاقەتی ئینسانی بێ دین و بەد ئەخلاق و فاسق بپارێزە،

با دین و حەیات پارێزراو بێ.

دەیفەرموو: تا بۆت دەکرێ ڕەفاقەتی ئەو کەسە مەکە، کە تەعریف و مەدحت دەکا، بەو شتەی کە خۆت دەزانی وا نیەو تێتدا مەوجوود نیە، یان بە پێچەوانەی ئەوەی کە تێتدا مەوجوودە، تەعریفت دەکا، چونکە هەر ئەوکەسە، ئەگەر ڕۆژێک وا ڕێ بکەوێ، تووڕە بێ و ڕقی لێت هەستێ، بە شتێکی وات زەم دەکا، کە قەت تۆ ئەو شتەت نەکردبێ.

دەیفەرموو: پەنا بە خوا خەڵکینە، لەو زەمانەی کە زۆربەی خەڵک لەو کاتەدا فاسق و بێ دین دەبن، بە ڕاستی ژیانی خەڵکی ئەو زەمانە زۆر ناخۆش دەبێ، فەرمووی: چونکە هەر کاتێ زۆربەی خەڵک فاسق و بێ دین بوو، ئەوە عادەتەن، پیاو خراپ، غاڵب دەبن بە سەر پیاو چاکەکانیاندا و ئامیر و گەورەی زاڵم، غاڵب دەبن بە سەر عادڵەکانیاندا و کافر دەسەڵات پەیدا دەکا، بە سەر وڵاتی ئیسلام و موسوڵمانانیاندا.

دەیفەرموو: سەت خۆزگە بە دڵی ئەو دەروێشە، کە دەوڵەمەند نیە، چونکە بە ڕاستی زۆر خۆش دەژی، نە لە دنیادا خەرج و زەریبە و مالیات دەدا و نە لە قیامەت و دوا ڕۆژدا، خواوەندی گەورە موحاسەبەی دەکا، تا بترسێ.

دەیفەرموو: [فسبحان الله] بەیانیان کە هەڵدەستم، چاوم بە خەڵک دەکەوێ، دەزانم کێ لوقمەی حەڵاڵی خواردووە و کێ لوقمەی حەرامی خواردووە، چونکە ئەو کەسەی کە هاتە ناو خەڵک و زمانی بە خراپە گەڕا و غەیبەتی خەڵکی کرد، ئەوە نیشانەی ئەوەیە، کە لوقمەی حەرامی خواردووە. ئەوەی زمانیشی بە زکر و فکر و تۆبە و قسەی باشەوە گەڕا و خەریکی کار و کاسبی و نان پەیدا کردنی حەڵاڵ بوو، ئەوە دیارە لوقمەی حەڵاڵی خواردووە.

جا ئەو زاتە گەورەیە، کە لە ساڵی سێسەد و نۆزدەی کۆچیدا، وەفاتی فەرموو، لە پاش وەفاتی لە خەودا چاویان پێکەوت گوتیان: قوربان، خواوەندی گەورە

چی لێ کردی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: نامەی عەمەلیان دامە دەست، وەی خوێنم، تەماشام کرد گوناهێکی تێدا نووسرابوو لە خەجاڵەتیان بۆم نەخوێندرایەوە، لە لایەن خواوەندی گەورە، بانگ کرا، کە ئێمە لە دنیا ئەو گوناهەی تۆمان ئاشکرا نەکرد، لێرەش ڕیسوات ناکەین، ئەوا عەفوومان کردی. ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و ئامۆژگاریە جوانەکانی «شێخ ئەبوویەکری وەڕڕاق». ئومێد دەکەم کە خواوەندی گەورە بە هۆی خۆشەویستی پێغەمبەر و پیاو چاکانەوە لە هەموو لایەکمان خۆش بێ. عەفوومان بکا. لە کاتی نامە خوێندنەوەی ئەعمالدا، خەجاڵەتمان نەکا. لە ژێر ئاڵا و بەیداغی پێغەمبەردا حەشرمان بکا. ئامین.

وَ صَلیٰ اللّٰهُ عَلیٰ سَیِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ السَّلاٰمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٤٠)

## باسی ئەبوو بەکری کەتانی

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَـــمْدُ لِـلْمُهَيْمِنِ الْمَجِـيدِ ... اَلْمُنْزِلِ الْـقُرْآنِ بِـالتَّجْوِيدِ
وَ اَفْضَلُ الصَّلاَةِ وَ السَّلامِ ... عَـلىٰ النَّـبِيِّ سَـيِّدِ الأَنْـامِ
وَ آلِـهِ وَ صَـحْبِهِ القُـرَّاءِ ... وَ تٰابِعِي سُـنَّتِهِ الغَـرّاءِ[١]

گوێ گرینە، هەروەک چۆن میوەجات دەبینن، کە هەریەکەی نەوعەدارێکی هەیە و هەردارەی نەوعە بەرێک دەگرێ و هەر بە رەی نەوعە تامێکی هەیە. یان ئەو کژ و گیا و گوڵزارە، هەریەکەی لە ڕەنگێ و هەریەکەی نەوعە بۆنێکی هەیە و هەریەکەی بە جۆرێکە، زانا و عالم و ئەولیا و پیاو چاکی ئوممەتی پێغەمبەریش (دروودی خوای لە سەر بێ)، بەو جۆرەن. هەر کەسەیان لە کات و زەمانی خۆیاندا، خوو ڕەوشتێکی تایبەتی و تەریقەت و ڕێبازێکی دیاریکراویان بووەو هەر یەکە جۆرە فەرمایشتێکیان فەرمووە و هەر فەرمایشتەی تام و لەزەتێکی تایبەتی هەیە و هەریەکە، بە نەوعێک ئیستیفادەی لێ کراوە و سوودیان بۆ خەڵک بووە.

جا، با وەک ڕۆژان دەچووینە مەجلیسی یەکێک لەو پیاوە بەرزانە، لە چەند

---

١ - شێخ مەعرووف.

دەقیقەی داهاتووشدا، بچینە مەجلیسی یەکێکی تر لەو پیاو چاکانە کە جەنابی «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی»یە، کە لە زەمانی خۆیدا خاوەنی ڕوتبە و مەقامی ئیستیقامەت بوو، ساحیبی فتوا و مەرتەبەی ئیمامەت بوو، شەمع و مۆمی عالەمی تەوفیق بوو، ڕوکن و پایە و کۆڵەکەی کەعبەی تەحقیق بوو، شێخی شاری مەککە و پیری زەمان بوو، لە وەرع و تەقوا و زوهددا ئوستادێکی یەگانە بوو. لە تەریقەدا، خاوەن تەئلیف و تەسنیف بوو. لە ویلایەتدا دارای مەقامی تەمکین بوو. ڕەفاقەتی شێخ جونەیدی بەغدادی و شێخ ئەبوو سەعیدی خەڕڕاز و شێخ نووری کردبوو، وەک یەکێک بوو لە موریدەکانی شێخ جونەیدی بەغدادی.

جا، با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین. «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی» لە ئەسڵدا، خەڵکی شاری بەغدا بووە، بەڵام بە زۆری لە شاری مەککەی موبارەک و لە حەرەمی کەعبەدا، تەمەنی بردوەتە سەر.

ئەوەندە تەوافی ماڵی بەیتی کردبوو، خەڵکی شاری مەککە ئەوەندەیان عەقیدە پێ بوو، بە چرای حەرەمیان ناودەبرد. کەم کەس لە کۆمەڵی پیاو چاکان توانیویەتی بە ئەندازەی «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی» تەوافی کەعبە بکا و ئەوەندە قورئان بخوێنێ، ئەو زاتە موبارەکە لە ماوەی سی ساڵدا، حەرەمی کەعبەی بە جێ نەهێشت و لە تەواف و قورئان خوێندن غافڵ نەبوو. دەڵێن: لە ماوەی ئەو سی ساڵەدا، بە شەو و ڕۆژێک یەکجار دەستنوێژی تازە دەکردەوە و زۆر بە کەمی دەنووست.

ڕاوی دەڵێ: سەرەتای پێگەیشتنی لە خزمەت شێخ جونەیدی بەغدادی دابوو، دەڵێ: لە دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کرد و ئیجازە و خەرقەی لە شێخ جونەیدی بەغدادی وەرگرتووە، داوای لە دایکی کردووە، کە ڕێگای بدا بڕوا بۆ سەفەری حیجاز و دایکیشی ئیجازەی داوە و ڕۆیوە بۆ سەفەرەکەی، بەڵام لە پاش چەند

ڕۆژ، شەوێک ئیحتیلامی دەبێ، زۆری پێ ناخۆش دەبێ و دەڵێ: لە لای خۆی من بەو شەرتە کەوتمە ڕێگا، کە ئیتر هەوای نەفسم نەمێنێ و بە خەونیش ئەو حاڵەتەم بە سەردا نەیێ، دیارە دەبێ لە پاش من، لە ماڵەوە شتێک ڕووی دابێ، غوسڵی کرد و گەڕایەوە.

کاتێ گەیشتە بەردەرگای ماڵەوە، تەماشای کرد ئەوا دایکی لە بن دەرگـا، بـە غەمباری دانیشتووە وەک چاوەڕوانی یەکێک بێ، گورج دەستی دایکی ماچ کرد و گوتی: ئەی دایکە ئاخر تۆ ئیجازەت نەدام بۆ سەفەرەکە؟ ئەی بۆ ئـاوا غـەمبار دانیشتووی و چاوەڕوانی؟ دایکی لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، ئیجازەم دایی، بەڵام لە دوێنێوە زۆر بیری تۆم کردەوە، کە تەماشای ماڵەکە دەکەم بێتۆ چاوم هەڵنایەن و نەم توانی بە تەنیا تێیدا دانیشم، ئێستاش بەو نیەتە هاتمە بەر دەرگا، کـە تـا تـۆ نەگەڕێیتەوە نەچمەوە ژوورەوە. جا دەڵێن ئەو جارە تا دایکی وەفاتی نـەکـرد، سەفەری نەکردەوە و لە پاش مردنی دایکی ئەو جار بە یەکجاری، بەرە و مەککە کەوتە ڕێ.

دەیفەرموو: لە دەشت و سەحرای عەرەبستان بەرە و مەکە و مەدینە دەڕۆیشتم، تەماشام کرد لە قەراغ ڕێگا دەروێشێک مردووە، کەچی بە مردووی پێ دەکەنێ، لام عەجایب بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم: زۆر سەیرە، ئەو دەروێشە مردووە، کە چی پێ دەکەنێ! دەفەرموێ: بە ئەمری خوا وەک مردووەکە وە دەنگ بێ و پێم بڵێ: بەڵێ ئەی «ئەبوبەکری کەتانی»، ئەوەی لە دنیا دا بێ ئەمری خواوەندی گەورە نەکا و موحیببەتی خوای لە دڵدا بێ، دەبێ بە خۆشی و بە پێکەنینەوە بەرەو پیری مەرگ بڕوا و بە خێر هاتنی بکا.

بەڵێ «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی»بەغدای بە جێهێشت و چوو لە حەڕەمی مەکە دانیشت و دەستی کرد بە تەوافی ماڵی بەیت و قورئان خوێندن، دەڵێن: لە ماوەی سی ساڵ مانەوە لە حەڕەمدا، دوازدە هەزار جار قورئانی خەتم کردووە.

«شێخ ئەبوو بەکری کەتانی» جارێک فەرمووی: لە دڵی خۆمدا، زۆرم ڕەخنە لە حەزرەتی عەلی دەگرت و دەمگوت: چونکە پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ)، لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: [لاٰ فَتىٰ إِلاّٰ عَلِي] واتە کەس ئازا و گەنجی تەواو نیە عەلی نەبێ. دەمگوت: خۆ دیارە کەلیمەی «فەتا» لە فتووەتە و شەرتی فتووەتیش ئەوەیە، پیاو لە لایەن تەرەفی موقابیلەوە زۆر شت قبوڵ بکا، کەواتە دەبوو با حەزرەتی موعاویە لە سەر بەتاڵیش بوایە و حەزرەتی عەلی لە سەر حەق بوایە، خەلافەت هەر حەواڵەی حەزرتی موعاویە بکا و ئەو هەموو خوێنە نەڕژێ.

دەفەرموێ: مەنزڵەکەم لە نزیک سەفا و مەڕوە بوو، شەو لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، هەر چوار خولەفاکەی لە خزمەتا بوو، هات و منی دەباوش گرت، لە پاشان ئیشارەی بۆ لای حەزرەتی ئەبووبەکر کرد و فەرمووی: ئەوە کێیە؟ عەرزم کرد: قوربان، ئەوە حەزرەتی ئەبووبەکرە، ئنجا ئیشارەی بۆ لای حەزرەتی عومەر کرد، گوتم قوربان: ئەوە حەزرەتی عومەرە، جا ئیشارەی بۆ لای حەزرەتی عوسمان کرد، عەرزم کرد: قوربان، ئەوە حەزرەتی عوسمانە، جا ئیشارەی بۆ لای حەزرەتی عەلی کرد و فەرمووی: ئەی ئەوە کێیە؟ دەفەرموێ: بەڵام لە بەر ئەوەی کە زۆرم ڕەخنە لە حەزرەتی عەلی گرتبوو، لە خەوەکەمدا شەرمم کرد و نەمتوانی بڵێم: قوربان ئەوە حەزرەتی عەلی‌یە.

پێغەمبەر دەستی حەزرەتی عەلی گرت و هات دەستی منیشی گرت و یەکتری پێ دەباوەش گرتین و ئەوان ڕۆیشتن، دەفەرموێ: هەر لە خەوەکەمدا حەزرەتی عەلی فەرمووی: ئەی «ئەبووبەکری کەتانی» وەرە با بچینە سەر کێوی «ئەبوو قوبەیس» (کێوی ئەبوو قوبەیس ئەو کێوەیە کە کەوتوەتە پشتی «سەفا» و «مەڕوە» و ڕۆژهەڵاتی «کەعبە» و ئێستا بە زۆری خان و بەرەیە).

دەفەرموێ: چوینە سەر کێوی ئەبوو قوبەیس و تەماشای ماڵی بەیت و

کەعبەمان دەکرد. بە ئەمری خوا لەو تەماشا کردنەدا بووم، وەخەبەر هـاتم، کـە دەڕوانم ئەوا بەڕاستی لە سەر کێوی ئەبوو قوبەیسم، بەڵام یەکـزەڕڕە غـوباری ڕەخنە گرتنم، لە حەزرەتی عەلی لە دڵدا نەما بوو.

«شێخ ئەبوبەکری کەتانی»، لە ناو خەڵکی شاری مەککەدا، بە کەڕاماتدار ناو بانگی دەرکردبوو، وا مەشهورە دەڵێن: ڕۆژێک پیاوێکی پیر، لە باب و دەرگای بەنی شەیبەوە، کە یەکێکە لە دەرگا گەورەکانی حەڕەم، دەچێتە لای، زۆر بە سام و شکۆ دەبێ، ڕووی تێدەکا و دەڵێ: ئەی «شێخ ئەبوبەکری کەتانی»، ئەوە بۆ ناچی بۆ لای مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم، خەڵکێکی زۆر لە دەوری زانایک کۆبوونەوە و گوێیان لە ئامۆژگاری حەدیس گرتووە، تۆش بچۆ با گوێت لەو حەدیسانە بێ، گوتی: چونکە دەڵێن، پیاوێکی زۆر گەورەیە، تازە هاتووە بۆ مەکە و فەرمایشتی جوان دەفەرموێ.

«شێخ ئەبوبەکر» سەری بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: باشە، ئەو پیاوە گەورە و زانایە حەدیس لە کێوە ڕیوایەت دەکا؟ کابرای پیرە دەڵێ: لە عبدالرحمن و لە مەعمەر و لە زەهری و لە ئەبوو هورەیرە و لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لە سەر بێ).

«شێخ ئەبوبەکر» ڕوویدەکاتە کابرای پیرە دەڵێ: یا شێخ، تۆ سەنەد و ڕیوایەتی حەدیسی ئەو زانایەت زۆر دوور خستەوە، چونکە ئەوەی کە تۆ دەفەرمووی، ئەو زانایە لەو ڕاویانە ڕیوایەت دەکا، ئێمە لێرە بەبێ واسیتە لە پێغەمبەر و لە خواوە وەری دەگرین، کەواتە پێویست ناکا من بچم گوێ لەو زانایە بگرم، کابرای پیرە دەڵێ: جا چۆنت باوەڕ پێ بکەم کە تۆ لە خوا و پێغەمبەرەوە شت وەردەگری و بەڵگە و دەلیلت لە سەر ڕاستی و دروستی ئەو قسەت چیە؟ «شێخ ئەبوبەکـر» دەڵێ: بەڵگە و دەلیلم ئەوەیە، کە پێیان گوتم تۆ خدری زیندەی، فەرمووی: ڕاست دەکەی، بەڵام ئەی «ئەبوبەکری کەتانی» تا ئێستا دەمگوت، ڕەنگە هـیچ وەلی یەک نەبێ نەیناسم، تا تۆم دی تۆ منت ناسی، بەڵام من تۆم نەناسی بوو، وا دیارە

خواوەندی گەورە پیاو چاک و وەلی وای زۆرن، کە ئەوان من بناسن و من ئەوان نە ناسم.

هەروەها «شێخ ئەبووبەکری کەتانی»، لە فەراسەت و موجاهدات و ڕیازیاتا، دەستێکی زۆر باڵای هەبوو، جارێک عەرزی دەکەن: قوربان، بەعزە کەسێک باسی ژیان و بە سەرهات و حیکایەتی پیاو چاکان دەگێڕێتەوە، ئەوە دروستە و سوودی هەیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ دروستە و سوودیشی هەیە، فەرمووی بەڵگە و دەلیلیشم بە تایبەتی ئایەتی ژمارە سەد و بیستی سورەی هوودە لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ ٱلرُّسُلِ ما نُثَبِّتُ بِهِ فُؤادَكَ﴾ ئەی محمد، ئێمە حیکایەت و باسی پێغەمبەران و گەلەکانیان بۆ تۆ دەگێڕینەوە، بۆ ئەوەی بزانی کە ئەو پێغەمبەرانە لە گەڵ گەلەکەیاندا چۆن ژیان و چۆنیان ڕابواردووە و چیان بە سەر هاتووە، تا دڵت بە خۆت نەسووتێ و ئارام بگری و بەردەوام بی، لە سەر تەبلیغاتی خۆت و گەلەکەشت پەندی لێ وەرگرێ.

فەرمووی: ئەو ئایەتە و چەند ئایەتی تریش لەو بابەتە لە قورئانی پیرۆزدا هەیە، کە بەڵگە و دەلیلن لە سەر ئەوە کە باسی ژیان و بە سەرهات و حیکایەتی ڕابردووان و گێڕانەوەی، سوود و قازانجی تێدایە، بۆ زۆر لە موسوڵمانان، بۆ ئەوەی بە هێندێک بە سەرهات، پەند وەرگرن و عیبرەت گرتوو بن و ڕوو بکەنە چاکە.

هەروەها دەڵێن «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی»، ئەوەندە بە خشووعو بە خزوع بوو، لە نوێژدا ئاگای لەم دنیایە نەدەما، جارێک نوێژی دەکرد، کابرایەکی دز و دەست بڕ هات، بە سپاوی بەرماڵەکەی لە شانی شێخ کردەوە و فڕاندی بەرێ بی فرۆشێ، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا کابرا لە بازار سەکتەی گرت و هەر دوو دەستی وشک بوون، بە ناچار هاتەوە بۆ لای شێخ و بە هەر جۆرێک بوو، لە سەرخۆ بەر ماڵەکەی بە شانی شێخ دادایەوە و دانیشت، خەڵک کە ئەو حاڵەتەیان

دی و ئاوایان چاو بە کابرا کەوت گوتیان: کاکە ئەوە چیت لێ قەوماوە؟ کارەساتی بەرماڵ ڕفاندنەکە و وشک بوونی دەستی بۆ گێڕانەوە، زۆریان لا عەجایب بوو، گوتیان: باشە دەتا لە نوێژ نەبوەتەوە، ڕاکە و سەری خۆت هەڵگرە. لەو کاتەدا «شێخ» سەلامی نوێژی دایەوە و کابرا دەستی کرد بە گریان، شێخ فەرمووی: کوڕم ئەوە بۆ دەگری؟ کابرا بە گریان و خەجالەتیەوە بەرماڵ دزینەکە و دەست وشک بوونەکەی بۆ گێڕایەوە، «شێخ» فەرمووی: قەسەم بە عیززەت و جەلالی خوا، نە ئاگام لە بردنی بەرماڵەکە بووە نە لە هێنانەوەی، ڕووی کردە ئاسمان و دەستی کرد بە پاڕانەوە و گوتی: ئەی خوای گەورە، ئەوەی، ئەو پیاوە بردبووی، هێناویەتەوە و تۆش ئەوەی لێت ستاندوە، بیدەوە، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا هێشتا شێخ لە پاڕانەوەکە نەببووە، کابرا وەک جاران دەستەکانی، دەستیان کردەوە بە ئیش و لە سەر دەستی شێخ تۆبەی کرد و بوو بە یەکێک لە موریدانی.

شێخ جارێک فەرمووی: شەوێک لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، عەرزم کرد: قوربان، چ دۆعایەک بکەم تا خواوەندی گەورە بە بەرەکەتی ئەو دۆعایەوە، دڵم بمرێنێ و لە دەست هەوای نەفس ڕزگار بم؟ حەزرەت لە وەڵامدا فەرمووی: تا ماوەیەک ڕۆژێ چل جار بڵێ:

[یَا حَیُّ یَا قَیُّومُ لاٰ اِلٰهَ إِلاَّ أَنتَ اَسْئَلُکَ اَنْ تُحْیِیَ قَلْبِي بِنُورِ مَعْرِفَتِکَ أَبَداً] ئەی ئەو کەسەی کە هەمیشە زیندوویت و قایم بە زاتی و هیچ خوایە نیە لایقی پەرستش بێ، زاتی پاکی تۆ نەبێ، داوات لێ دەکەم دڵم بە نووری مەعریفەت زیندوو بکەیتەوە، هەتا هەتایە. حەزرەت فەرمووی: ئەو دۆعایە بکە لە هەوای نەفس ڕزگارت دەبێ و شەیتان لێت دوور دەکەوێتەوە.

جارێکی‌تر فەرمووی: خەڵکینە! ئەگەر دەتان هەوێ خواوەندی گەورە تۆفیقتان‌بدا، ڕوو بکەنە خوا پەرستی و دوای ئارەزووی نەفس مەکەون، چونکە شەهوەت و ئارەزووی نەفس، جڵەوی لەغاوی شەیتانە و ئەوەی دەستی پێ

بگرێ، ئەوە دەستی بە لەغاوی شەیتان گرتووە و دەبێتە عەبد و بەندەی شەیتان.

دەڵێن ڕۆژێک کابرایەکی پیری پەککەوتووی سەر و ڕیش سپی دەگەڕا، سواڵی دەکرد، یەکێک ڕووی کردە «ئەبووبەکری کەتانی» و عەرزی کرد: یا شێخ، ئێوە دەفەرموون خواوەندی گەورە ئاگای لە هەموو کەسێک هەیە و ڕازقی هەموو عەبد و بەندەیەکە. ئەی بۆ چی، ئەو پیاوە پیرەی وەدەرکان خستووەو سواڵ دەکا؟ شێخ لە وەڵامدا فەرمووی: [هٰذا رَجُلٌ أَضاعَ أَمْرَ اللهِ في صِغَرِهِ، فَضَيَّعَهُ ٱللهُ في كِبَرِهِ] فەرمووی ئاخر ئەو پیاوە، لە کاتی گەنجی و لاویدا، هیچ ئەمر و فەرمانێکی خواوەندی گەورەی بە جێ نەگەیاندووە، بۆیە خوای گەورەش لە کاتی پیریدا، ئەوی ئاوا بەر هەڵا کردووە، فەرمووی: زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە حاڵی پیریدا، داما و کەساس دەبن و بێ خزمەت لە ملا و ئەولادەکەون و ئاگاداریان ناکرێ،ئەوە خۆیان لە کاتی گەنجی و لاوی و دەست ڕۆیشتنیاندا، موبالاتیان بە ئەمر و فەرمانی خوا نەکردووە و دڵی دایک و باوکیان ڕانەگرتووە و سیلەی ڕەحمیان بە جێ نەهێناوە و ئاگایان لە فەقیر و هەژار نەبووە و واجبات و پێویستی سەرشانیان ئەنجام نەداوە، بۆیە هەر لە دنیادا ئاوا بێ حورمەت دەبن و بە چاوی سووک تەماشایان دەکرێ.

دەجا ئەی ئەو کەسانەی کە باوک و دایکتان ماوە، ئاگاداریان بکەن و دڵیان ڕاگرن، با دۆعای بەخێرتان بۆ بکەن و لە ژێر سێبەرتاندا وە حەسێن و کاتێ ئێوەش بوون بە باوک و دایک و وەکوو ئەوان پیر بوون، خواوەندی گەورە خزمەتکارێکتان بۆ بنێرێ، لە پاداشتی چاکەی خۆتاندا.

«شێخ ئەبوو بەکری کەتانی» ئامۆژگاری زۆر بە نرخی فەرموون، جارێک فەرمووی: خواوەندی گەورە ئاگای لە هەموو کەس هەیە، فەرمووی: دەروێشێک هاتە لام، بۆی گێڕامەوە و گوتی: دە ڕۆژ بوو هیچم نەخواردبوو، لە لای دوو دۆست شکایەتی حاڵی خۆم کرد، لە پاشان چوومە بازار، تەماشام کرد درهەمێک

کەوتبوو، هەڵم گرتەوە، لە سەری نووسرابوو، بۆ، خوای گەورە، ئاگای لە برسێتی تۆ نیە، لە لای خەڵک باسی برسێتی خۆت دەکەی؟!

جارێک پیاوێک عەرزی کرد: قوربان، ئامۆژگاریەکم بکە، فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ لە دوا ڕۆژدا خواوەندی گەورە فریات کەوی، تاماوی بێ ئەمری خوا مەکە.

فەرمووی: ئولفەت گرتنی زۆر بە خەڵکەوە، عقووبەتی بە دواوەیە و نزیک بوونەوە لە ئەهلی دنیا، گوناهی پێوەیە و مەیل وەلای دنیا پەرستان، زەلیلی بەدواوەیە. دەیفەرموو: زاهید و پیاو چاک بەوکەسە دەڵێن، کە هیچیشی نەبێ هەر کەیف خۆش بێ و سۆفی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، ئەخلاقی بەرز بێ.

دەیفەرموو: تۆبەی نەسوحی ئەوەیە، لە هەموو خراپەیەک پەشیمان وەبی و بڕیار بدەی کە جارێکی تر نەیان کەیتەوە و هەر قەرزێکی لە سەرتە بیدەیتەوە و ئەوەی زوڵمت لێ کردووە، ڕازی بکەیت و دەست لە کاری خراپ و حەرام هەڵگریت و چۆن لەززەت و شیرینی گوناه و حەرامت دەچێشت، ئاوا ناخۆشی و تاڵی و ئەلەمی تاعەت و عیبادەت بچێژی و لە سەر شانت خۆش بێ.

دەیفەرموو: تاعەت و عیبادەت و خوا پەرستی هەفتا و دوویابی هەیە و یەک بابی لە حەیا کردن لە خواوەندی گەورە دایە. دەیفەرموو: خوا ناسین، لە عیبادەت و خواپەرستی گەورەترە، دەیفەرموو: خواوەندی گەورە تا دەرگای لێ خۆش بوون، لە عەبد و بەندەگانی خۆی نەخاتە سەر پشت، زەمانیان نایەتە سەر دۆعا و پاڕانەوە و عوزر خواهی ناکەن.

دەیفەرموو: خەڵکینە، بزانن کە عەلامەت و نیشانەی سۆفی و دەروێش و موریدی ڕاستەقینە سێ شتە: یەکەم، ئەوەیە، دەبێ تا خەو تینی بۆ نەهێنێ، نەخەوێ. دووەم، ئەوەیە، دەبێ تا زۆری برسی نەبێ، نەخوا. سێیەم، ئەوەیە، دەبێ تا نۆرەی نەیە و لە کاتی پێویستدا نەبێ، قسە نەکا. دەنا سۆفی و دەروێش و

موریدی ڕاستەقینە نین.

دەیفەرموو: خەڵکینە، دەخیلتان بم، تا بۆتان دەکرێ، بەیانیان زۆر زوو لە خەو هەستن و ڕوو بکەنە خوا و لە بەر خواوەندی گەورە وەپاڕێن تا ئەو ڕۆژە ژیان بە خۆشی و شادی بەرنە سەر و خوای گەورە، لە بەڵا و موسیبەت بتان پارێزێ، چونکە خوای گەورە لە کاتی هەموو بەرە بەیانێکدا، بایەکی زۆر خۆش لە ژێر عەرشی خوا هەڵ دەکاو، دێ ناڵە و پاڕانەوە و ئیستیغفاری عەبد و بەندەکان وە بەر خۆی دەدا و دەیبا بۆ حزور خواوەندی گەورە، کە ناوی ئەو بایە، نەسیمی سەحەریە و بای سوبحی ساڵحانە.

جا ئەو زاتە بەرز و پیرۆزە کە لە ساڵی سێ سەت و بیست و دووی کۆچیدا، لە شاری مەکە، وەفاتی کردووە. کاتێ نەخۆش کەوت و ئەجەل دەوری دا، عەرزیان کرد: قوربان، جەنابت لە حاڵی حەیاتا، بە هۆی چ کردەوەیەکەوە بەو پلەو پایەیە گەیشتی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر تەمەنم بە ئاخری نەگەیشتایە و ئەجەل دەوری نەدامایە نەم دەگوت. فەرمووی: لە ماوەی چل ساڵ تەمەنمدا، من وەک دەرکەوانی ژووری دڵی خۆم وا بووم، ئەوەی بۆنی غەیری خوای لێ بهاتایە، نەمدەهێشت بچێتە ناو دڵمەوە.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی «شێخ ئەبوو بەکری کەتانی»، ئومێد دەکەم خواوەندی گەورە بە هۆی بەرەکەتی ڕۆحانیەتی پیاو چاکان، لە ئێمەش خۆش بێ. عەفومان بەکا. ئیمانمان سەلامەت کا. شیفای نەخۆشمان بدا. لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلىٰ اللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّمْ. وَ اَلسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٤١)

## باسی ئەبوو ئیسحاقی کازرۆنی

﴿ بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

لِــذاتِکَ الْحـامِدُ الْـوَفِيَّةْ ثُمَّ عَـلىَ نَـبِيِّکَ الْـتَّحِيَّةْ

مَعَ الصَّلاةِ وَ السَّلامِ الدّائِمِ وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ الأَكارِمِ[1]

گوێ گرینە، با لەم چەند دەقیقەی داهاتوودا، وەک ڕۆژانی پێشوو، بچینە بارەگا و مەجلیسی باسی یەکێک لە ناودارانی ئیسلام، کە لە کات و زەمانی خۆیدا، پیری دەستگیری ئەهلی تەریقەت بوو، پێشەوای زانایانی ئەهلی شەریعەت بوو، ئەستێرەی ئاسمانی ویلایەت بوو، لە فەڕاسەت و تەجریددا ئوستاد بوو، لە ئەحواڵ و ئاداب دا باکەماڵ بوو، لە مەناقیبدا کەم وێنە بوو، لە خوا پەرستیدا وەک وێنە بوو، جا ئەو زاتە دانا و فانییە، جەنابی «شێخ ئەبوو ئیسحاق ئیبراهیمی کازرۆنی»یە، زۆر بە ئەدەب گوێ بگرن بۆ باسی ژیان و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، ئەو شەوە کە لە دایک بوو، نوورێکیان لەو خانووەدا دی، وەک کۆڵەکە، هاتە دەرەوە و چوە ئاسمان و پڕشنگی بە مـلا و ئەولادا دەهاوێشت، خەڵک زۆریان لا عەجایب بوو، لە ئاخریدا دەرکەوت، کە ئەو نوورە نووری دین و ئیمانی ئەو کوڕە بوو، کە لەو شەوەدا، لەو ماڵەدا، لە دایک بوو.

---

١ - شێخ مەعروف.

باوک و دایکی «ئەبوو ئیسحاقی کازرۆنی»، زۆر موسوڵمان بوون، بەڵام بـا پیری گاور بوو، کاتێ تەمەنی گەیشتە شەش حەوت ساڵ، ویستیان بـیبەنە لای ماموستایەک قورئان و دەرسی دینی بخوێنێ، باپیری ڕازی نەبوو، دەیگوت: ئێمە دەست کورتین، با کاسبی بکا باشترە، زۆریان هەوڵدا، تا ڕازیان کرد، بەڵام وەک کورد دەڵێ: چێشتی خۆش لە ئەنگۆرێڕا دیارە، ئەو منداڵە ئەوەندەی حەزی لە خوێندن بوو، لە پێش هەموو قوتابیەکاندا، لە سەر دەرس حـازر دەبـوو، تـا لە هەموو دەرسەکاندا وەپێشیان کەوت و لە ماوەی چەند ساڵدا تەواوی عیلمەکانی تەواو کرد.

دەفەرمویێ: لەو کاتەدا کە فەقێ بووم. ئارەزووم ئەوەبوو، ئیجازەی تەریقەت لە شێخێک وەرگرم و دوای ڕێبازی ئەو کەوم، ڕۆژێک دەس نوێژم گرت و چووم دوو ڕکاتم سونەتی نوێژی ئیستخارە کرد و سەرم وە سوجدە گرتو گوتم: ئەی خوای گەورە، تکایە لە شێخ عبداللەی خەفیف و لە شێخ حاریسی مەحاسیبی و لە شێخ ئەبوو عەمر یەکیانم بۆ دیاری بکە، تا پەیڕەوی لێ بکەم و بە دەستووری ئەو ڕەفتار بکەم. دەفەرموێ: خـەوم لێ کـەوت، لە خـەومدا یـەکـێک هـات بـاری وشترێکی کتێبی پێ بوو، ڕووی کردە من و گوتی: ئەو کـتێبانە شـێخ عـبداللەی خەفیف بۆی ناردووی، لە خەوەکەم ڕاپەڕیم، زانیم کە ئەوە مـەعنای وایـە کـە حەواڵەی شێخ عبدالله کـراوم، دەفـەرموێ: ڕۆژی دوایـی تـەماشام کـرد، شـێخ حوسەینی دەهقان هات بارێکی کتێب هێنا و گوتی: ئەوە کتێبەکانی شێخ ئەبوو عبداللەی خەفیفن، بۆ تۆی ناردوون، دەفەرموێ: ئەوجار لێم یەقین بوو، کـە لە ئیستخارەکەدا، حەواڵەی شێخ ئەبوو عبدالله، کراوم، جا ڕێبازی ئەوم هەڵبژارد و دەستووری ئادابی زیکر و ویرد و ئەورادی ئەوم ئیختیار کرد.

دەفەرموێ: دەستم کرد بە تەدریس و ئیرشادی خەڵک و بە میوانداری فەقیر و هەژار و دەروێش و ڕێبواران، باوکی کە ئەو ماڵ و میوانەی دی، ڕۆژێک گوتی:

کورِم، ئێمە فەقیرین توانای ئەو هەموو ماڵ و میوانەمان نیە، ئاگـات لە وەزع و حاڵی خۆت بێ، مەبادا ڕۆژێک میوانت زۆر بێ و هـیچ نـەبێ بـخۆن. شـێخ لە وەڵامدا دەنگی نەکرد، ڕەمەزان بە سەردا هات، ئێوارەیەک پڕ بـوو لە مـیوان و هیچیان نەبوو ڕۆژوویان پێبشکێنن، باوکی زۆر ناڕەحەت بوو، لە دڵـی خـۆیدا گوتی: دەمزانی ئەم ڕۆژەم هەر توش دەبی، وەختی بەر بانگ نزیک بوەوە، لە نکاوێک، یەکێک وەژوور کەوت، بارێکی نان و مێوژ و هەنجیر هێنا و گـوتی: ئەوەم بۆ میوانەکان هێناوە بەر بانگی پێ وەکەن! باوکی کە ئەوەی دی، زۆری لا عەجایب بوو، ڕووی کردە شێخ و گوتی: تا دەتوانی لەم ڕۆ، بە دواوە خزمەتی خەڵک بکە، دیارە خوا پەکت ناخا.

ئەو «شێخ ئیبراهیمی کازرۆنی»ە ئەوەندە بە ئەدەب بوو، جارێک دەچوو بـۆ حەج، ڕێگای کەوتە شاری بەسرە، پیاو چاک و مەشایخ زۆر کۆ بونەوە، کـاتێ نانیان هێنا و سفرە ڕاخرا، گۆشتی برژاوی لە سەر بوو، ئـەو گـۆشتی نـەخوارد، ئەوان وایان زانی کە قەت گۆشت ناخوا، لە پاشان فەرمووی: چونکە ئـەو پـیاو چاکانە واین گومان برد، کە قەت گۆشت ناخۆم و لە ناو ئەواندا، ئەی نەفس وات خۆ نیشاندا و جاری واش بوو، کە بە تەنیا بووی ئارەزووت دەکرد، دەبێ لەم ڕۆ بەدواوە، تاماوی گۆشتت دەرخوار نەدەم.

یەکێک لە وەسیەتەکانی «شێخ ئیبراهیمی کازرۆنی» بۆ موریدەکانی ئەوە بوو، کە نابێ قەت بە تەنیا نان بخۆن.

دەڵێن ڕۆژێک خەڵکێکی زۆری لابوو، چوە سەر مینبەر و دەسـتی کـرد بـە ئامۆژگاری، لەو کاتەشدا زانایەکی خۆراسانی حازری مەجلیس بوو، زانـاکـە لە دڵی خۆیدا گوتی: زۆر سەیرە من زۆر لەو عالمترم و تەفسیر و مەعنای حەدیس و شەرع زۆر لەو باشتر دەزانم، کەچی قەت خەڵک ئاوا بۆ من گـوێ ڕانـاگـرن و لەدەورم کۆ نابنەوە،

شێخ فەوری بە فەڕاسەت، خەیاڵی مەلای وەرگرت و ڕووی کردە چراکانی خانەقا و فەرمووی: دەروێشینە، زۆر سەیرە، ئێستا کە من ئامۆژگاریتان بۆ دەکەم، ئاگام لە کێشە و نیزاعێکی زۆر سەیرە، فەرمووی: لە بەینی ئەو ئاو و ڕۆنە کە لە چراکاندا هەیە، ئاو دەڵێ: خۆ هەموو عالەم دەزانێ کە ئاو لە ڕۆن خۆشترە، چونکە ژیانی هەموو گیان لەبەرێک بە ئاوەوەیە و بێ ئاو کەس ناژی، هەروەک خواوەندی گەورە لە سورەی ئەنبیادا دەفەرموێ: ﴿وَ جَعَلْنا مِنَ الْمٰاءِ کُلَّ شَیْءٍ حَیٍّ﴾ ئێمە هەموو شتێکمان بە هۆی ئاوەوە بە زیندوویی ڕاگرتووە. فەرمووی: هەروەها ئاو دەڵێ: نازانم تۆ چۆن هاتووی، لە سەر سەری من دانیشتووی؟! چونکە عادەتی ڕۆن وایە، هەمیشە سەر ئاو دەکەوێ. فەرمووی: بەڵام خەڵکینە، گوێ بگرن و بزانن، کە ڕۆن چەند ئاقڵانە و زانایانە وەڵامی ئاو دەداتەوە و دەڵێ: ئەی ئاو، ڕاستە کە ژیان و حەیاتی گیان لە بەران بە زۆری بە تۆوەیە، بەڵام منیش ئەو گەورەیی و حورمەتەم لە خۆڕایی دەست نەکەوتووە، ڕەنجی زۆرم داوە، تۆوی منیان چاندووە و ئاویان داوم و شین بووم و درەویان کردووم و هاڕێویانم و ئێستاش نامبینی، خۆم دەسووتێنم، تا ڕۆناکیم بۆ خەڵک بێ، بۆیە خوای گەورە منی وەسەر تۆ خستووە.

کاتێ شێخ لە سەر مینبەرەکە هاتە خوارەوە، زاناکە گورج چۆە خزمەتی و دەستی ماچ کرد و عوزری هێنایەوە و گوتی: بە ڕاستی یا شێخ، بۆئەوە دەبی کە ئەو خەڵکە ئاوا وەدوات کەوێ و ڕێز و حورمەتت زیاتر لێ بگرێ، چونکە ئەو وێنە و میسالەت بە کەرامەت بۆ خەیاڵەکەی من هێنایەوە، هەر لەو مەجلیسەدا، مامۆستا بوو بە یەکێک لە موریدانی شێخ و تۆبەی لە سەر دەستی شێخ کرد.

دەیفەرموو: ڕۆژێک بە خەیاڵمدا هات، لە دڵی خۆمدا گوتم: باشە بۆچی خۆم تووشی ئەو هەموو نارەحەتیە کردووە؟ بۆ چی ئەو سەدەقە و زەکاتە وەردەگرم و دەرخواردی میوانانی بدەم؟ بە چی مەعلوومە، کە لە ڕۆژی قیامەتا، لە سەری

موحاسەبە ناکرێم و خەجاڵەت نابم؟ فەرمووی: ویستم بە دەروێشەکانم بڵێم: بڵاوەی لێ بکەن و خەریکی کاری خۆیان بن، لەو سلوکە باشترە، دەفەرمووێ: بەو خەیاڵەوە خەوم لێ کەوت، لە خەوەکەمدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، زیارەتم کرد و فەرمووی: ئەی بازرگانی، ببەخشە و وەرگرە و لە موحاسەبەی قیامەت مەترسە. فەرمووی: کە وەخەبەر هاتم، لە خۆشیان ئاگام لە خۆم نەما و لە پاشان شوکرانەی کەرەمی خوام زۆر کرد.

دەفەرموو: خەڵکینە، وریا بن، هەر کەسێک لە خواردن و خواردنەوە و بەرگ و لیباسدا، حیسابی خۆی نەکا و ئاگای لە خۆی نەبێ و ئیسرافیان تێدا بکا، ئەوە حاڵی وەک حاڵی حەیوانات دەبێ و وەدەزانێ کە خواوەندی گەورە تەنیا هەر بۆ خەو و خواردن و بەرگ و لیباس پۆشین ئەوی درووست کردووە.

دەیفەرموو: بە دڵ زیکر و یادی خوا بکەنەوە و دڵتان لای خواوەندی گەورە بێ و دەستتان بە دنیاوە بێ، نەوەک ئەو بەعزە کەسانە، کە بە زۆری ناوی خوایان لە سەر دەمە و بە زمان زیکری خوا دەکەن، بەڵام بە دڵ دنیایان گرتووە.

دەیفەرموو: ئەوانەی ئەهلی دنیا و زاهیر پەرستن، هەر تەماشای زاهیری خەڵک دەکەن، ئەگەر لە ئەعزا و ئەندامی زاهیریدا بێ عەیب بوون، ئەوە لایان وایە ئەو بەندەیە عەبد و بەندەیەکی تەواوە، بەڵام خواوەندی گەورە تەماشای دڵ و دەروونی عەبد و بەندەگانی دەکا، با بە زاهیریش بێ عەیب بن، ئەگەر دڵیان عەیبدار بوو، ئەوە خوای گەورە ئەو عەبدانەی ناوێ، هەروەک خوای گەورە لە قورئاندا، لە سوورەی مونافقوندا، دەفەرموێ: ﴿وَ إِذا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسادُهُمْ، وَ إِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ﴾ کاتێ چاوت بەو، بە ڕواڵەت باشانە دەکەوێ و تەماشای جوانی و لەش و لارو ئەندامیان دەکەی، سەرت سوڕ دەمێنێ، ئەگەر قسەیش بکەن، ئەوەندە زمان پاراو و لەفز شیرینن، گورج گوێ بۆ قسەکانیان ڕا دەگری، بەڵام ئەوانە دڵیان لای خوا نیە و بە دڵ غافڵن لە خوا، وەک

دارێکی وشک وان، کە بە دیوارێکەوە هەڵیان پەساردبێ.

جا بە ڕاستی موسوڵمانینە، ئەگەر بە وردی سەرنجی مەعنا و مەفهومی ئەو ئایەتە پیرۆزە و فەرمایشتی «شێخی کازرونی» لەو لایەنەوە بدەین، زۆریەی خەڵکی ئێستا، بە تایبەتی زۆر لە ئەوانەی کە بە ناو خوێندەوارن، وە بەر مەعنا و مەفهومی ئەو ئایەتە دەکەون، چونکە بەدەم موسوڵمان و نوێژ و ڕۆژ و دەکەن، بەڵام زۆر باسی خەڵک دەکەن، لە کەس ڕازی نین، لۆمەی خەڵک دەکەن، غەیبەت دەکەن، عەیب و عاری خەڵک باس دەکەن، بەڵام بە داخەوە، ئەگەر بە وردی سەرنجی کار و کردەوە و ئەعمالیان بدەی و تەماشای ئاوێنەی دڵیان بکەی، بە گەرد و تۆزی عەیب و عار و لۆمە و لەقەب و غەیبەت و بوهتان و حەسادەت و بەخاڵەت و دزی و حەرام خواردن تاریک بووە و ڕووناکی کەم بووە. ئەگەر فریای خۆیان نەکەون و بە ئاوی تۆبە و پەشیمانی، ئاوێنەی دڵیان لەو تەپ و تۆزە پاک نەکەنەوە و مشت وماڵی لە ژەنگی گوناه نەکەن، وەبەر مەعنای ئەو ئایەتە دەکەون، مەگەر خوا هەموو لایەکمان ببەخشێ، دەنا ڕزگار نابین.

یەکێک لە کەشف و کەڕاماتی «شێخی کازرۆنی» ئەوە بوو، جارێک، ئەمیر ئەبوو فەزلی دەیلەمی هات بۆ زیارەتی، لە دوای دەست ماچ کردن و بە خێر هاتن، شێخ دەستی کرد بە ئامۆژگاری و مەوعیزە، یەکێک لە فەرمایشتەکانی ئەوەبوو فەرموی: ئەی ئەمیر ئەبوو فەزل، لە ئارەق خواردنەوە تۆبە بکە، ئەمیر لە وەڵامدا گوتی: ئاخر قوربان، ئەمن زۆر لە مەجلیسی فەخرولمەلکی دادەنیشم، دەترسم تۆبەکەم پێ بشکێنن، شێخ فەرمووی: تۆبە بکە، جا ئەگەر چوویتە مەجلیسی وەزیر و گوتیان دەبێ هەر ئارەقمان لەگەڵ بخۆیتەوە، گورج یادی من بکەوە و حەقت نەبێ، ئەمیر لە سەر دەستی شێخ تۆبەی کرد و گەڕایەوە.

لە پاشان ڕۆژێک کۆمەڵێک لە مەجلیسی فەخرولمەلکدا دەبن، ڕوو دەکەنە ئەمیر ئەبوو فەزل و دەڵێن دەبێ ئارەقمان لەگەڵ وەخۆی، لەو کاتەدا یادی شێخ

دەکـاتەوە، بـە ئـەمری خـوا پشیلەیەک بـە غـاردان دێ و خـۆی لە کـووپەی ئارەقەکەدەدا و کووپەکە دەشکێ و ئارەق بە سەر ولاتەکەدا دەرژێ، ئەمیر کە ئەو کەرامەتەی چاو پێکەوت دەستی کرد بە گریان، فەخرولمەلک گریانی ئـەمیری زۆر لا سەیر بوو، گوتی: ئەوە بۆچی ئاوا بەکوڵ دەگری؟ ئەمیر ئەبوو فەزل باسی تۆبە و فەرمایشتی شێخی بۆ گێڕایەوە، فەخرولمەلک گوتی: تۆبەکەت مەشکێنە، ناهێڵم کەس بە زۆر ئارەقت پێ بخوا.

ڕاوی دەڵێ: یەکێ‌تر لە کەڕامات و فەراسـاتی شـێخی کـازرۆنی ئـەوە بـوو، جارێک باوک و کوڕێک دێن بۆ لای و دەڵێن: قوربان، هاتووین لە سەردەستی جەنابت تۆبە بکەین، شێخ تەماشایان دەکا و دەفەرموێ: ئاخر ئـەوەی لە سـەر دەستی ئێمە تۆبە بکا و بیشکێنێ، خواوەندی گەورە لە دنیا و قیامەت عەزابی ئەو کەسە دەدا، فەرمووی: ئەگەر تۆبە دەکەن، تکا دەکەم تا ماون مەی شکێنن، لە سەر دەستی شێخ تۆبەیان کرد بەو شەرتە، بەڵام زۆری نەخایاند شکاندیان، بە ئەمری خوا ڕۆژێک ئاگر لە ماڵەکەیان بەربوو و سەر و ماڵیان تێدا چوو، جـا شـێخ لە مەوعیزەدا، ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: تکاتان لێدەکەم، تۆبە لە خراپە بکەن و ڕوو بکەنە خوا، چونکە کەس لە دەس خوا دەرناچێ.

فەرمووی: ئەگەر ناتوانن وەک پێشینیان بن، لانی کەم پیاو چاکتان خۆش بوێ. چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) فەرموویەتی: [اَلْمَرءُ مَعَ مَنْ اَحَبَّ] ئینسان حەشری لەگەڵ ئەو کەسە دەکرێ کە خۆشی دەوێ، فەرمووی: چونکە ئینسان هەر کەسێکی خۆش بوێ، بە زۆری خوو و ئەخلاقی ئەو هەڵدەگرێ و چاو لەو دەکا.

فەرمووی: شاری کازرون ئـێستا زۆری گـاورن و کـەمی مـوسوڵمانە، بـەڵام ئومێدم وایە بە هۆی هات و چۆ و ڕەفاقەتی پیاو چاکانەوە، ڕۆژێک بێ زۆربەیان موسوڵمان بن و کەمی گاور تێدا وەمێنێ.

دەڵێن: لە دوای ئەو فەرمایشتەی شێخ زۆری نەخایاند، بیست و چوار هەزار کەسیان تۆبەی کرد و موسوڵمان بوون، ڕۆژێک لە ئامۆژگاریەکدا زۆر شتی جوانی فەرموو، بۆ نموونە فەرمووی: ئەگەر لە ژیانی کاتی دنیادا، تووشی ڕووتی و برسێتی و دەست کورتی و زەلیلی و هەژاری و دەربەدەری بوون، خۆتان ڕاگرن و سەبرتان هەبێ، چونکە دنیا تا سەر بۆ کەس نابێ و دەوام ناکا و ئەگەر خۆتان ڕاگرن لە پاداشتدا، لە بەهەشتا تووشی خۆشی دەبن. دەیفەرموو: لە هەموو کارێکی خێر و چاکدا برای موسوڵمانتان وەپێش خەن، تا لە ڕۆژی قیامەتا خواوەندی گەورە وەپێشتان بخا.

دەیفەرموو: ئەگەر بۆتان کرا شەو نوێژ بکەن، وە ئەگەر نەتان توانی یان وەخەبەر نەهاتن. ئەگەر وەخەبەر هاتن بڵێن: [لاَ اِلٰهَ اِلاَّ اَللّٰهُ مُحَمَّداً رَسُولُ اَللّٰهِ] جا بنوونەوە، ئەوە خێری زۆرە.

دەڵێن: ڕۆژێک شێرێکیان زنجیر کردبوو، بە بەر دەمی ساباتەکەی شێخیاندا هێنا، شێخ کە چاوی بە شێرەکە کەوت فەرمووی: ئەی شێر، دەبێ چی خراپت کردبێ تووشی ئەو کۆت و زنجیرە بووی؟

ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: خەڵکینە، ئاگاتان لە خۆتان بێ، شەیتان دەیان کۆت و زنجیری وای هەیە و هەزاران داوی بۆ ناوینەوە، بەڵام پەیان پێ نابەین. فەرمووی: تا ئێستا زۆر شێرە پیاوی خاوەن تەریقەتیش، بە دوای شەیتانەوە بوون، خەڵکەکە دەستیان کرد بە گریان، شێخ ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ئەی خوای گەورە، ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتا، چاکەم لەگەڵ دەکەی، تکایە لە جێگایەکی بەرزم ڕاگرە، تا تەواوی دۆستان چاویان پێ بکەوم، دڵخۆش بن و بە هۆی کەرەمی تۆوە بچنە بەهەشت، بەڵام ئەگەر بە جۆرێکیتر ڕەفتارم لەگەڵ دەکەی، ئەوە تکایە بە ڕێگایەکدا بمنێرە بۆ دۆزەخ، کە کەس چاوی پێنەکەوم، تا دوژمنەکانم دڵخۆش نەبن. فەرمووی: خەڵکینە! من وەک ئینسانێکی غەرق بوو

وام، جاری وایە ئومێدی ڕزگار بوونم زۆرە و جاری واشە دەترسم و بە هیلاک بچم.

فەرمووی: چۆن دەبێ نەترسین لەو دوو دوژمنە، کە لێمان دوور ناکەونەوە، وەک نەفس و شەیتان بن، فەرمووی: وریا بن بزانن، ئەوەی بەر بەرەکانی لەگەڵ زاڵم و زۆرداری دنیایی بکا، ماڵی دنیای لە دەست دەچێ، بەڵام ئەوی موخالەفەی پیاو چاکان بکا، زۆر زەرەر دەکا و لەوانەیە ئیمانی بکەوێتە خەتەرەوە.

دەیفەرموو: ئینسانی سەخی، سەری کیسەی پارەی گوشادە و دەستی گوشادە و دەرگای بەهەشت بۆ ئەو گوشادە، بەڵام ئینسانی بەخیل، کیسەی بەسراوەو دەستی قوچاوە و دەرگای بەهەشتی لە سەر داخراوە و [نعوذ بالله].

ڕۆژێک بە زەردە خەندەوە فەرمووی: بۆ لای چوار کەس بە دەستی بەتاڵەوە مەچن: یەکەم، ئەگەر لە سەفەر چوونەوە، بە دەستی بەتاڵەوە مەچنەوە. دووەم، بۆ لای نەخۆش، بە دەستی بە تاڵەوە مەچن. سێیەم، بۆ لای مەلا و شێخ بە دەستی بەتاڵەوە مەچن، چوارەم بۆ لای پیاوی زاڵم.

جارێ فەرمووی: چۆن دەبێ لە خوا نەترسن لە جێگایەک کە [حَبِيبُ ٱللهِ] و [خَلِيلُ ٱللهِ] و [كَلِيمُ ٱللهِ] و [رُوحُ ٱللهِ] لە خوا ترسابن!

عەرزیان کرد: قوربان، عادەت وایە، کە دۆست خراپە و پیسی لە دۆستی خۆی دوور دەخاتەوە، خۆ ئینسانی موسوڵمانیش دۆستی خوایە، ئەی چۆن خواوەندی گەورە دێڵێ موسوڵمان بە هۆی گوناهەوە پیس بێ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوە بێ حیکمەت نیە، بۆ ئەوەی کە ئەگەر عەبد گوناهی کرد و تۆبەی لە سەر کرد و خوا عەفووی کرد، کەرەمی خوا ئاشکرا دەبێ و ئەو عەبدەش زیاتر لەززەت لە عیبادەت وەر دەگرێ. عەرزیان کرد قوربان، ئەی ئەگەر ڕزقی هەموو کەس دیاری کراوە، بۆ لە بەر خوا دەپاڕێنەوە، فەرمووی: بۆ ئەوەی شەرەفی ئینسان ئاشکرا بێ، فەرمووی: خوای گەورە لە حەدیسی قودسیدا فەرموویەتی: [أَلَـوْ

اَعْطَیْتُکَ مِنْ غَیْرِ مَسْئَلَةٍ لَمْ یَظْهَرْ کَمالُ شَرَفِکَ، فَأَمَرْتُکَ بِالدُّعاءِ لِتَدْعُوَنِي فَأُجِیبُکَ] ئەی ئادەمیزاد، ئەگەر لە خۆڕاو بە بێ دۆعا و پاڕانەوە ڕزقم بدانایە، یان هەموو کار و بارێکم بۆ جێ بە جێ بکردنایە، شەرەفتان دەر نەدەکوت، بۆیە گوتوومە: دۆعا بکەن، تا جوابتان بدەمەوە و ڕێزتان لێ بگرم، فەرمووی: ئەوەی داوا لە غەیری خوا بکا، وەک خانوو لە سەر بەفر بکا وایە.

زۆر جار لە بەر خۆیدا ئەو شێعرەی دەخوێندەوە و دەیفەرموو:

مُصاحَبَةُ الْغَرِیبِ مَعَ الْغَرِیبِ — کَمَنْ بَنَیَ الْبِناءَ عَلیٰ الثُّلُوجِ
فَذابَ اَلثَّلْجُ وَ انْهَدَمَ الْبِناءُ — وَ قَدْ عَزَمَ الْغَرِیبُ عَلَیَ الخُرُوجِ

ڕەفاقەتی غەریب لە گەڵ غەریب، وەک ئیشی ئەو کەسە وایە، کە خانوو لە سەر بەفر دروست بکا. چۆن ئەگەر بەفرەکە توایەوە، خانووەکە دەڕۆخێ، ئاواش غەریبەکە دەڕوا و تۆ تەنیا دەمێنێتەوە.

فەرمووی: هات و چۆی لای پیاو چاک بکەن، چونکە حەزرەت فەرموویەتی: خوای گەورە ئاگاداری ئوممەتم دەکا، ئەگەر یەکێک لە و سێ شتانە بکەن، تا پیاو چاکیان هەیە نە چەنەلای پیاو خراپەکانیان، تا چاکەکان هەن، خراپەکان نەکەنە گەورەی خۆیانو، تا شێخەکان هەن، نەچنە لای حاکمی زاڵم، بەڵام ئەگەر وانەبوو، نانێکی بە ئاسوودەیی ناخۆن.

کاتێ نەخۆش کەوت، خەڵکێکی زۆری لە لابوو، فەرمووی: وادیارە ئەو سەفەرە بە جێتان دێڵم، ئەو چوار کەلیمە وەسیەتەم قبوڵ بکەن: یەکەم، بێ ئەمری جێ نشینەکەم مەکەن. دووەم، دەوام لە سەر دەرسی قوران بکەن. سێیەم، زۆر خزمەتی غەریبان بکەن. چوارەم، لەگەڵ یەکتر باش بن.

دەڵێن، دەفتەرێکی بوو، ناوی تەواوی دۆست و موریدەکانی تێدا نووسی بوو، وەسیەتی کرد، کە مرد بیخەنە ناو گۆڕەکەیەوە، ئەوە بوو لەساڵی چوارسەد و بیست و شەشی کۆچیدا وەفاتی کرد و دەفتەرەکەیان خستە ناو قەبرەکەیەوە،

یەکێک لە خەویدا چاوی پێکەوت و گوتی: خوای گەورە چی لێ کردی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: یەکەم خەڵاتێک کە خواوەندی گەورە بە منی بەخشی، ئەوە بوو هەر ناوێک کە لەو دەفتەرەدا نووسرابوو، بە کەرەمی خۆی بەخشی و عەفووی کردن.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشتەکانی «شێخی کازرۆنی»، ئومێد دەکەم خواوەندی گەورە، لە هەموو لایەکمان خۆش بێ و عەفوومان کا و لە شەڕی شەیتان و بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلىٰ آللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ الْسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ آللّٰهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٤٢)

## باسی ئیبراهیمی خەواس

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

لِلّٰهِ حَمْــدٌ كَـذُكـاء مُـشْرِقُ — لِـلَحظاتِ زَمَـنٍ مُـسْـتَغْرِقُ
وَ صَلٰواتٌ تَمْلأُ الْكونَ عَـلىَ — مُحَــمَّدٍ خَــيرِ نَـبِيٍّ أُرْسِـلاَ
وَ آلِـــهِ وَ صَـحْبِهِ النُّـجُومِ — مَناهِلِ الْحِكَـمِ وَ الْـعُلومِ[1]

موسوڵمانینە! با دووبارە گەشتێک بکەین بە ناو حـەدیقە و بـاغ و گـوڵزاری ئەولیادا و ئیمرۆ هەوارەکەمان بەرینە بارەگا و مەجلیسی «شێخ ئیبراهیمی خواس» کە لە دەورانی خۆیدا سالکی بادیەی تەجرید بوو، نوختەی دائیرەی تەوحید بوو، موحتەشەمی عیلم و عـەمەل بـوو. مـوحتەرەمی حـوکمی ئـەزەل بـوو، مـانگی ڕووناکی تەریقەت بوو. ئەستێرەی گەشی شەریعەت بـوو، دارای تـەئلیفات و تەسنیف بوو، هاوڕێی شێخ جونەید و نووری بوو، زۆر باوەرع و تەقوا بوو، تەنیا تەوەککولی هەر بە خوا بوو.

جا، با لەم چەند دەقیقەی داهاتوودا، زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و کەشف و کەڕامات و فەرمایشتە جوانەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

---

١ - شێخ مەعروف نۆدەیی.

«شێخ ئیبراهیمی خەواس» یەکێک بووە لە خاسانی بارەگای ئیلاهی، یەگانەی زەمانی خۆی بوو، لە پەنا گرتن بە خوادا و زۆر گەورە و بوزورگەوار بووە، زانایان زۆر مەدح و سەنایان کردووە و بە [رَئِیس المُتَوَکِّلِین] یان ناو بردووە. «شێخ ئیبراهیمی خەواس»، لە ئەسڵدا خەڵکی شاری بەغدا بووە و زۆر شتی عەجایب و غەرایبی چاو پێکەوتووە و زۆری کەشف و کەرامات نواندووە و دارای زەکاوەت و فەراسەت بووە.

ڕاوی دەڵێ: زۆر جار خدری زیندووی دیوە، بەڵام جارێک خدری زیندە داوای ڕەفاقەتی لێدەکا، ئەو قبووڵی ناکا، دەڵێ: مەبادا بە هۆی ڕەفاقەتەوە، تەوەککولەکەم زەرەری پێ بگا و غەیری خواوەندی گەورە بێتە ناو دڵمەوە.

لە گەڵ ئەو هەموو تەوەککولە و پشت بەستنی بە خوای گەورەشەوە هەمیشە دەزوو، دەرزی و شووژن و بەن و دۆدانە و ئاو و پارچە خامێک و مەستێکی پێ بوو، دەیفەرموو: ئەوانە زەرەر بە تەوەککول ناگەیێنن.

شێخی دێنەوەری دەفەرموێ: شەوێک لە مزگەوت خەوم لێکەوت، لە خەومدا گوتیان: ئەی دینەوەری، ئەگەر پێت خۆشە چاوت بە یەکێک لە دۆستانی خوا بکەوێ، هەستە بچۆ لە سەر ئەو تەپۆڵکەیە چاوەڕوانی بکە.

دەفەرموێ: کە وەخەبەر هاتم، لە مزگەوت هاتمەدەرەوە، تەماشام کرد، بەفر دەبارێ، چوومە ئەو جێگایەی کە لە خەوەکەمدا پێیان گوتبووم، تەماشام کرد ئەوا «ئیبراهیمی خەواس» بە چوار مەشقی دانیشتووە و بەفر سەر و ڕیشی سپی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو بەفر و سەرمایەشدا ئارەقی پێدا دەهاتە خوارێ، عەرزم کرد: یا شێخ، ئەوە چ حاڵێکە و ئەو مەقامەت بە چی دەست کەوتووە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی دینەوەری، ئەو پلە و پایەیەم، بە هۆی خزمەت کردنی دەروێش و فەقیر و هەژارانەوە، وە دەست کەوتووە.

«شێخ ئیبراهیمی خەواس»، زۆربەی تەمەنی لە گەڕان و سەفەری حەجدا

بردۆتە سەر و زۆری تەوەکول بە خوا بووە، دەفەرموێ: جارێک لە دەشتی عەرەبستان ئافرەتێکم دی، لەو پەڕی جەزبەدابوو، سەری ڕووت کردبوو، عاشقی ئیلاهی بوو، گوتم: خوشکم، سەرت داپۆشە، لە وەڵامدا گوتی: ئەی «ئیبراهمی خەواس»، ئەتۆ چاوت بگرە و نەزەر مەکە، گوتم: ئاخر من عاشقم و عاشق چاوە وەرناگێڕێ لە مەعشووقەکەی، بەڵام ئەو دەفعە بەبێ ئیختیار چاوم بە تۆ کەوت، لە وەڵامدا گوتی: ئاخر منیش مەستم و مەستیش سەر داناپۆشێ، گوتم: مەستی کام شەراب خانەی؟ تووڕە بوو، گوتی: ئەی «ئیبراهیمی خەواس» بۆ لەمنی بەدوور دەزانی؟ لە دنیا و قیامەتا غەیری شەرابخانەی خوا هەیە؟ دەفەرموێ: ئەوجار گوتم، پێم خۆشە ببی بە هاوسەرم، گوتی: ئەی «ئیبراهیم»، وا دیارە هێشتا هەر خامی و کامڵ نەبووی، من لەو ئافرەتانە نیم لە مەرد بگەڕێم، بەڵکو من لە فەرد دەگەڕیم!

یەکێک لە پیاو چاکان دەڵێ: ڕۆژێک عەرزم کرد: قوربان، حەقیقەتی ئیمانی کامڵ چیە و عەلامەت و نیشانەی کامەیە؟ لە وەڵامدا فەرموی: ئێستا وەڵامت نادەمەوە، چونکە هەر چی بڵێم، ئێستا بە قەوڵ و قسەیە، وەڵامی ئەو پرسیارە دەبێ بە کردەوە بێ، دەڵێ: فەرمووی: من خەیاڵی زیارەتی ماڵی خوام هەیە، وەرە با پێکەوە بڕۆین تا وەڵامی پرسیارەکەت دەست کەوێ، دەڵێ لە خزمەتیدا ڕۆیشتم، ڕۆژی دوونانی دێنا پێشەوە، یەکی دەدا بە من و ئەوی دی بۆ خۆی دادەنا، لە بیاباندا تووشی سوارێکی پیر بووین، کە چاوی بە شێخ کەوت لە ئەسپەکەی دابەزی و لەگەڵ شێخ یەکتریان لە باوەش گرت و یەکتریان ماچ کرد و ماوەیەک پێکەوە قسەیان کرد و لە پاشان پیاوە پیرەکە سواری ئەسپەکەی بووەوە و ڕۆیشت، گوتم: قوربان ئەو پیاوە کێ بوو؟ فەرمووی: ئەوە وەڵامی پرسیارەکەت بوو کە لە حەقیقەتی ئیمانت کرد، گوتم: چۆن؟ فەرمووی: ئەوە حەزرەتی خدر بوو، هات داوای ڕەفاقەتی لێکردم قبووڵم نەکرد، لە وەترسام کە لەو سەفەرەدا

پشت بەو ببەستم و زەرەری بۆ تەوەکول ببیٚ.

فەرمووی: ئەوەیە حەقیقەتی ئیمان و ئەوەیە ئیمانی ئیبراهیمی خەلیل الله کە لە ناو ئاگری نەمردوو دا، حەزرەتی جیبرەئیل چوە خزمەتی و گوتی: چی داوا دەکەی تا وا بکەم، لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوەی،ئەمەی بە سەر من هێناوە، ئاگای لە حاڵمە، با ئەو فریام کەویٚ، هیچ کارم بە تۆ نیە.

دەیفەرموو: جارێک بە تەنیا بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتم، زۆرم تینوو بوو، لە تینوان بەلادا هاتم، ئاگام لە خۆم نەما. کاتیٚ وەهۆش هاتمەوە، تەماشام کرد، پیاوێکی سەر و سیما جوان سواری ئەسپێکی شیٚ بووە و بە سەر سەرمەوە ڕاوەستاوە و ئاوم دەداتیٚ، کە هۆشم هاتەوە بەر گوتی: وەرە باوەشمەوە و سوار بە، منیش بۆ حیجاز دەچم، دەفەرمویٚ سوار بووم، چێشتە نگا و بوو، گوتی: تەماشا بکە بزانە کویٚ دەبینی؟ کە ڕوانیم، شاری مەدینە دیار بوو، گوتم ئەوە شاری مەدینەی حەزرەتە، گوتی: خوا حافیزت بیٚ، دابەزە و سەلامی من بە خزمەت پێغەمبەر بگەیێنە، دابەزیم و لە پێش چاوم ون بوو.

دووبارە فەرمووی: جارێک چوومە سەر ئاوێک ئاو بخۆمەوە، ئاوم نخواردەوە. تەماشام کرد، شێرێکی گەورە پەیدا بوو، ڕووی کردە لای من و بۆم هات، چارەم نەما، سەرم بۆ قەزا و قەدەر دانەواند، کاتێک نزیک بووە، تەماشا دەکەم بە شەلەشەل دەڕوا، هات لە پێش دەمی من خۆی بە عەرزیدا دا و دەستی کرد بە ناڵین، زۆرم لا سەیر بوو، کە سەرنجم دا، دەستی ئاوسابوو بلۆقی کردبوو، دارێکی تیژم هێنا و بلۆقەکەم دڕی، هەر کیم و زوخاوێکی تێدا بوو هاتە دەرو پەڕۆ کۆنێکم لیٚ بەست و هەستا ڕۆیشت، زۆری پیٚ نەچوو هاتەوە، دووسیٚ بەچکەی لە گەڵ بوو، هاتن قەدەرێک بە دەورمدا هەڵسوڕان و کلکە سوتەیان کرد و ڕۆیشتن، زۆرم لا عەجایب بوو!

فەرمووی: جارێکی تر بۆ زیارەتی «کەعبەت الله» دەچووم، هیچ شتم پیٚ

نەبوو، هەر بە ئومێدی خوا، ملی ڕێگام گرتبوو، کوڕێکی گەنج بانگی کردم، گوتی: ڕازی ببمە ڕەفیقت؟ کە پرسیارم لێ کرد گاور بوو، گوتم ئاخر ئەو جێگایەی من بۆی دەڕۆم ڕێگای تۆ نادەن، گوتی: هەر دێم، ئومێد دەکەم بێ سوود نەبێ،

دەفەرموێ: چەند ڕۆژێک پێکەوە ڕۆیشتن، ڕووی تێ کردم و گوتی: ئەی موسوڵمان، دە لە بەر خوا وەپاڕێ با شتێکمان بۆ بنێرێ زۆرم برسیە، دەڵێ: ڕووم کردە ئاسمان و گوتم: ئەی خوای گەورە، بۆ خاتری حورمەتی پێغەمبەر، لە لای ئەو گاورە شەرمەسارم مەکە و خواردنێکمان بۆ بنێرە، دەڵێ بە ئەمری خوا یەکێک پەیدا بوو، نان و ئاو و ماسی بۆ هێناین و خواردمان و ڕۆیشتین، ڕۆژێک ڕووم کردە کوڕەکە و گوتم: دەتۆش داوایەک بکە، با خوا شتێکمان بۆ بنێرێ. کابرای گاور ڕووی کردە ئاسمان و چەند دۆعایەکی کرد، زۆری نەخایاند خوای گەورە خواردنی لەوەی من زیاتری بۆناردین و گوتی: وەرە بخۆ، دەفەرموێ: لە خەجاڵەتیان گوتم: ناخۆم، چونکە لام وابوو دۆعای گیرا نابێ، هەستا زۆر بە ڕووخۆشی یەوە هات دەستی گرتم و گوتی: وەرە بخۆ با دوو مژدەشت بدەمێ، گوتم: ناخۆم تا پێم نەڵێی؟ گوتی: موژدەی یەکەم ئەوەیە، کە کەلیمەی شەهادەتم پێ بڵێ تا موسوڵمان ببم و زیننارەکەم فرێ دەم، گوتم بڵێ: [أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلٰهَ إِلاَّ اللّٰه وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّٰه] شادەی هێنا و گوتی: مژدەی دوەمیش ئەوەیە لە دۆعاکەم دا گوتم: ئەی خوای گەورە، ئەگەر دینی ئەو پیاوە ڕاستە، ڕزقێکمان بۆ بنێرە، ئەوە بە هۆی بەرەکەتی تۆە، خوا ئەو ڕزقەی بۆ ناردین، دەفەرموێ: کوڕەکە هات بۆ مەکە و تا وەفاتی کرد لەوێ مایەوە.

ڕاوی دەڵێ: جارێک «ئیبراهیمی خەواس» لە گەڵ چەند پیاوی گەورە و سۆفی، لە شاری بەغدا، لە مەجلیسێکدا دانیشتبوو، کوڕێکی گەنجی ناوچاوان پاکی بۆن، خۆشی ڕوو خۆش بەرە و ڕوویان هات، شێخ ڕووی کردە خەڵکەکە و

گوتی: ئەو کوڕە گەنجە جوانە موسڵمان نیە و جوولەکەیە، کاتێ هات، شێخ هەستا ڕۆیی، کوڕەکە کە گوێی لە قسەی خەڵکەکە بوو، باسی ئەویان دەکرد، وەدوا شێخ کەوت، بەڵام زوو گەڕایەوە و گوتی: خەڵکینە، ئەوە شێخ چی گوت کە من هاتم، بۆچی هەستا؟!

گوتیان: فەرمووی: ئەو کوڕە موسوڵمان نیە و جوولەکەیە، کە کوڕەکە ئەوەی لە خەڵک بیست، دووبارە وەدوای شێخ کەوتەوە و دەستی ماچ کرد و شادە و ئیمانی هێنا و، عالەمەکە زۆری لا عەجایب بوو، گوتیان: ئەوە چیت دی ئاوا پەلاماری دەستی شێختت دا و موسوڵمان بووی؟ لە وەڵامدا گوتی: حەزرەتی مووسا فەرموویەتی: ئینسانی ڕاست خاوەن فەڕاسەتە، کە چاوم بە ئێوە کەوت، گوتم با ئەو کۆمەڵە تاقی بکەمەوە، ئەگەر منیان ناسی، ئەوە ڕاستە موسوڵمانن و دینەکەیان هەقە، جا کە شێخ منی ناسی، زانیم پیاوی خوایە و ئیمانم هێنا، لە ئاخریدا ئەو کوڕە بوو بە یەکێک لە موریدە باشەکانی شێخ.

«ئیبراهیمی خەواس» ئامۆژگاری زۆر بە نرخی بە یادگار بۆ بە جێ هێشتووین. بۆ نموونە دەڵێ: [مَنْ لَمْ يَصْبِرْ لَمْ يَظْفَرْ] ئەوەی لە ژیانی ڕۆژانەیدا و لە کار و باری ڕۆژانەیدا و لە سەر تاعەت و عیبادەت و لە سەر بەڵا و موسیبەت خۆڕاگر و سابیر نەبێ، ئەوە ئەو کەسە قەت بە مەتڵەب ناگا و زەفەر بە ئارەزووی نابا، فەرمووی: چونکە هەر کەسێک دنیا لە سەری نەگری، قیامەت پێی پێ ناکەنێ، واتە ئەوەی خۆڕاگر نەبێ، خۆش ڕانابوێرێ لە قیامەتا.

دەیفەرموو: خۆ ئەو کەسە عالم نیە، کە زۆر بزانێ و عەمەل بە عیلمەکەی نەکا، ئەو کەسە عالمە، کە عەمەل بە عیلم بکا و وەدوا سوننەتی «پێغەمبەر» بکەوێ، با کەمیشی خوێندبێ، ئەوە عالمە.

عەرزیان کرد: قوربان، وەرع چیە و وارع کێیە؟ فەرمووی: وەرع ئـەوەیە و واریع ئەو کەسەیە کە هەر هەق بڵێ، لە کاتی ڕەزادا، یان لە کاتی تووڕە بوون و

غەزەب دابێ و ڕەزای خوا لە چی دابێ، هەر ئەوەی مەتڵەب بێ.

دەیفەرموو: دەخیلتان بم، خۆتان کار و کاسبی بکەن و هەوڵ بدەن، بە هیوای ئەم و ئەو مەبن، چونکە هەر دووکانداریک و تاجریک دەس مایەکەی ماڵی خەڵک بێ، هەر بە موفلیس لە قەڵەم دەدرێ و ئەوەی بە ئومێدی کاسە دراوسێ بێ، هەر برسی دەبێ.

ڕۆژێک لە مەوعیزەکەیدا فەرمووی: [دَواءُ ٱلقَلْبِ خَمْسَةُ أشياءَ: قَرَاْةُ ٱلقُرْآنِ، وَ خَلاَءُ البَطْنِ، وَ قِيامُ ٱلَّيْلِ وَ التَّضَرُّعُ عِنْدَ السَّحَرِ، وَ مُجالَسَةُ ٱلصَّالِحِينَ] فەرمووی: دەوای نەخۆشی دڵی ئینسان پێنج شتە. هەر کەسێک ئەو پێنج شتە بە کار بێنێ، لە نەخۆشی دڵ و بوغز و حەسەد و کیبر و نیفاق ڕزگاری دەبێ. یەکەم، قورئان خوێندنە لەگەڵ بیر کردنەوە لە مەعناکەی. دووەم، کەم خواردنە. سێیەم، شەو نوێژ و دۆعا و پاڕانەوەیە، لە بارەگای خوادا، فەرمووی: چونکە ئینسانی کەم خۆر زۆر خۆی ناڕەحەت ناکا و دڵی پەرێشان نابێ و ئەوەی لە بەر خواش وەپاڕێ و خوا بە ڕازق بزانێ، دڵی ئاسوودەیە. چوارەم، زوو لە خەو هەستانە و پاڕانەوە لە کاتی بەیانیاندایە، کە لەو کاتەدا خێر و شەڕ دابەش دەکرێ. پێنجەم، هات و چووی مەجلیسی پیاو چاکان و گوێ گرتنە لە ئامۆژگاری و مەوعیزەکانیان. ئەو پێنج شتە دەوای قەلب و دڵی ئینسانی خاوەن باوەڕن.

فەرمووی: تا ئەمر و فەرمانی خواوەندی گەورەتان لە لا عەزیز و خۆشەویست‌تر بێ، لای خوای گەورە و لە لای عەبد و بەندەگانی خوا خۆشەویستر دەبن.

دەیفەرموو: برا موسوڵمانەکان، شەیتان بە زۆری بە دوو گوریس ئینسان و دەخا و دەی بەستێتەوە، ئاگاتان لە خۆتان بێ، بەو دوو داوە وەنەبن. یەکەمیان، ترسی فەقیری‌یە و دووەمیان، تەماعە. بە زۆری بەو دوو شتە ئینسان دەترسێنێ و تووشی دەرد و بەلا و موسیبەت و گوناح و حەرام خواردنی دەکا.

فەرمووی: عەلامەت و نیشانە و سیفەتی ئینسانی باش، بە تایبەتی ئەوانـەی داوای مەقامی دەروێشی و سۆفی گەری دەکەن، ئەو دوازدە خەسڵەتن: یەکەم، دەبێ ئیمانیان بە وەعدە و وەعیدی خوا بـێ. دووەم، دەبـێ چـاویان لە دەسـتی خەڵک نەبێ. سێیەم، دەبێ شەیتان بە دوژمنی خۆیان بزانن. چوارەم، دەبێ قەت لە حەق لانەدەن. پێنجەم، دەبێ بە زەییان بە خەڵکدا بێتەوە. شەشەم، دەبێ ئازار و ئەزیەتی خەڵک قبوڵ کەن و زوو لە خەڵک تووڕە نەبن. حەوتەم، دەبێ لە کاتی کێشە و هەرا لە بەینی خەڵکدا، بە خەڵکەوە ماندوو بن و سوڵحیان لە بەیندا بکەن. هەشتەم، دەبێ خۆیان بە زل نەگرن و تەوازوعیان هەبێ. نۆیەم، دەبێ لە خەڵک زیاتر خەریکی خواناسین بن. دەیەم، دەبێ بە زۆری پاک و دەس بە دەس نوێژ بن. یازدەهەم، دەبێ زۆریان هەبێ، کەمیان هەبێ، لە خۆشی دابن، لە نـاخۆشی دابن، بە ئەمر و فەرمانی خوا ڕازی بن. دوازدەهەم، دەبێ ئەگـەر دەس مـایە و سەرمایەیان لە دنیادا هەر فەقیری بێ، زۆر ڕازی بن، دەنا ئەوە سۆفی و دەروێشی ڕاستەقینە نین.

فەرمووی: هەموو بەرەکەتێک و عیلم و حیکمەتێک، لە ئاسمانەوە نازڵ دەبێ، واتە لە لایەن خوای گەورەوە، بەڵام ناچێتە ناو دڵێکەوە کە دنیا پەرست بێ، یان ئیمرۆ غەمی بەیانی بخوا، یان دوو زمانی و فیتنەیی بکا، یان حەسوودی بە برای موسوڵمانی بەرێ.

لە فەرمایشتێکی تردا چەند جوانی فەرمووە، کـە دەڵـێ: هـەر چـی عـیلم و زانـــیاری هـەیە، لەو دوو کـەلیمەدا کـۆ دەبـێتەوە. فـەرمووی: یـەکـەم، ئـەوەی خواوەندی گەورە لە سەری واجب نەکردووی، خۆتی پـێوە مـاندوو نـەکـەی. دووەم، ئەوەی خوا لە سەری واجب کردووی تەرکی نەکەی.

فەرموی: ئەوەی هەوڵ نەدا و هەر چاو لە دەستی خەڵکی بێ و بە ئومێدی خوا ڕوو نەکاتە کار و کاسبی، ئەوە خواوەندی گەورە لە پێش چاوی خەڵکی سووک

دەکا و زیاتر تەماعی دەخاتە دڵەوە، تا زیاتر خەڵک ناخۆشی بوێ.

دەڵێن جارێک جەزبەی گرتبوو، لە دەم و چاوی خۆی ڕادەکێشا و دەیگوت: ئای بەندەی گوناهبار، بۆ تۆزێک لە خەوی غەفلەت وە خەبەر نایێی؟، خۆ خواوەندی گەورە هەمیشە چاوی لە تۆیە، با تۆش چاوت لەو بێ.

ڕۆژێک عەرزیان کرد: قوربان، تۆ ڕزقت لە کوێوە بۆ دێ؟ لە وەڵامدا فەرمووی: لە لایەن ئەو کەسەوە کە ڕزق بۆ منالی ساوا دەنێرێ، لە سکی دایکی دا و کە ڕزق بۆ هەموو تەیر و باڵندەیەک دەنێرێ، لە دەشت و سەحرادا، فەرمووی: دیارە ئێوە ئاگاتان لە ئایەتی سیی سورەی تەلاق نیە، کە خواوەندی گەورە لە وێدا دەفەرموێ: ﴿وَ مَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجاً وَ يَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لاٰ يَحْتَسِبُ﴾ ئەوەی تەقوای خوا بکا، خوا لە تەنگانەدا نەجاتی دەدا و لە جێگایەکەوە ڕزقی بۆ دەنێرێ کە بە خەیاڵیشی دا نەهاتبێ.

جا ئەو «ئیبراهیمی خەواس»ە، ڕۆژێک لە مزگەوتی شاری ڕەیدا، چوە ناو حەوزی مزگەوتەوە غوسوڵ بکا، لە ناو ئاوی حەوزەکەدا، لە ساڵی دووسەد و نەوەد و یەکی کۆچیدا، وەفاتی فەرموو، تەواوی خەڵکی شاری «ڕەی» لە گەڵ جەنازەکەی چوونە سەر قەبران و تەسلیم بە خاکیان کرد.

لە پاش ماوەیەک یەکێ لە پیاو چاکان لە خەویدا چاوی پێکەوت گوتی: ئەرێ قوربان، لە پاش مردن خوای گەورە چی لێ کردی؟ لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، من ڕێگای تەوەکولم گرتبووە بەر، بەڵام بە هۆی دەس نوێژی دایم، جێگام زۆر خۆشە و گوتیان: ئەو مەقامەت بە هۆی ئەوە وە دەست کەوت، کە بە پاک و خاوێنیەوە گەڕایەوە بارەگای خوا.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشتەکانی «شێخ ئیبراهیمی خەواس»، ئومێد دەکەم کە چاو لەو پیاوە خواناسە گەورە بکەن و زاهیر و باتینتان، وەک ئەو لە هەموو خراپەیەک بپارێزن، تا خواوەندی گەورە، وەک ئەو جێگای خۆشمان بە

نەسیب بکا. خوایە عەفوومان کەی، لە ژەنگی گوناح و حەسادەت و بە خاڵەت پاکمان کەیتەوە، لە گەڵ پیاو چاکاندا حەشرمان بکەی، لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزی. ئامین.

وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلَّمْ. وَ اَلْسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَكاٰتُهُ

# (٤٣)

## باسی ئەبولقاسمی نەسرئابادی

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

أَبْهىٰ حِلَى الْمَقَالِ وَ الْكَلامِ    حَمْدُ الإلٰه الْواحِدِ الْعَلاَّمِ
وَ ٱلصَّلٰواتُ وَ التَّحِيّاتُ عَلىٰ    مُحَمَّدٍ وَ آلِهِ خَيْرِ الْمَلاْ...
وَ صَحْبِهِ ذَوُي ٱلعقائِدِ الَّتِي    عَنِ ٱلشُّكُوكِ قَدْ صَفَتْ بِالصُّحْبَةِ[1]

برا موسوڵمانەکان، با وەک ڕۆژان، لەم چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، دەست لە کار و ئیشی دنیا هەڵگرین و بچینە بارەگا و مەجلیسی یەکێ‌تر لە پیاو چاک و ئەولیای خوا و بە گوێ گرتن، لە باسی ژیان و بە سەرهات و ئامۆژگاریەکانی، پەند و عیبرەت وەرگرین و مشت وماڵی دڵ و دەروونمان لە ژەنگی گوناح بکەین.

جا هەوارەکەمان دەبەینە، مەجلیسی ئەو کەسە، کە لە زەمانی خۆیدا دانای عیشق و مەعریفەت بوو، دەریای کەشف و کەرامەت بوو. زانای عیلم و شەریعەت بوو، سەوڵ لێدەری پاپۆڕی تەریقەت بوو، سووتاوی ئاگری خوا ناسی بوو، شەیدای خەڵوەت خانەی ئەسراڕ بوو، ئوستادی عابیدانی ئەحراڕ بوو، ئەو عەبد و بەندەی عالەمی ئازادی‌یە، جەنابی شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی»یە.

«شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی»، لە ئەسڵدا خەڵکی شاری نەیشاپوور بوو، زاتێکی زۆر دانا و زانا و بوزورگەوار بوو، خاوەن ڕوتبە و مەقام بوو، بە شاهیدی

---

١ - شێخ مەعرووف.

زۆربەی خەڵکی ئەو کاتە، یەگانە ئەولادی ئەو سەردەمەی حەزرتی ئادەم بوو، لە دوای شێخی شبلی پێشەوای خەڵکی خوراسان بوو، ئیجازە و خەرقەی ئیرشادی لە شێخ ئەبوو بەکری شبلی وەرگرتبوو، بە خزمەت زۆر لە مەشایخان گەیشتبوو، وەکوو شێخی شبلی و شێخ ئەبوو عەلی ڕودباری و شێخ ئەبوو محمدی مورتەعیش و چەندین پیاو چاک وگەورە و پیاوی‌تریش، لە ناو عالم و زانایانی موتەئەخیریندا، کەس پلە و پایەی ئەوی نەبوو، لە وەرع و تەقوادا بێ هەمتا بوو، لە شۆر و جەزبە و عیشق‌دا دێوانە بوو، لە کەشف و کەراماتدا تاقانە بوو.

بە تایبەتی ئەوەندە عاشقی جەماڵی خوا بوو، زۆر جار ئاگای لە خۆی نەدەما و مەجنوون ئاسا، دەستی دەکرد بە هەڵپەڕکێ و شەرمی لەکەس نەدەکرد، ئەوەندە لە شەوقی خۆشەویستیدا سووتا بوو، ڕۆژێک لە حاڵەتی جەزبە و مەستیدا، دەرپێیێکی لە ناو قەدی خۆی بەست و لە دەورەی ئاتەشکەدەی زەردەشتییەکان، دەستی کرد بە تەواف و دەورەدان، گوتیان یا شێخ، ئاخر ئەوە چ حاڵەتێکە؟ بۆ وادەکەی؟ چۆن ئەوە لە تۆ دەوەشێتەوە؟ لە وەڵامدا یا هویەکی کرد و هەڵسووڕا و گوتی: ئاخر سەرم لێ شێواوە، نازانم چ بکەم، لە دەوری کەعبە، زۆرم تەواف کردوە زۆری لێ گەڕام نەمدی، ئێستا ناچارم، هاتووم لێرە بۆی دەگەڕێم، بەڵکو هەر چۆنێک بێ، بۆنی بکەم.

جارێکیتر لە حاڵەتی جەزبەدا چوە لای جوولەکەیەک گوتی: بێنە نیو دینارم دەیە، با ئاب جۆیەکی پێ بکڕم، جوولەکەکە نەی ناسی، تووڕە بوو گوتی: بڕۆ بەری دووکانەکەم بەردە، ڕۆیشت و دووبارە هاتەوە گوتی: بێنە با بچم بیکڕم، جوولەکەکە، دوبارە تووڕە بوو گوتی: دەبڕۆ ناخۆشی مەکە. ڕۆیشت و لە پاش بەینێک هاتەوە و داوای کردەوە، جوولەکەکەش هەر جارەی بە نەوعێک لێی تووڕە دەبوو و دەری دەکرد، بەڵام شێخ یەک زەڕڕە تووڕە نەدەبوو، وە سەر خۆی نەدێنا، جارێکی‌تر هاتەوە، ئەو جارە جوولەکە ئەوەندە تووڕە بوو گوتی: نازانم تۆ چۆن پیاوێکی، بۆ نیو دینار پارە قبوڵی ئەو هەموو هەتک و زەجرە دەکەیت و بە

خەیاڵتدا نایە؟ شێخ زۆر لە سەر خۆ ڕووی کردە جوولەکە و فەرمووی: ئەی جوولەکە، ئەوەندە بۆ دەروێشان هیچ نیە، زۆر ئاسانە دەروێش بۆ مەرامی کاری خۆیان باری وا هەڵدەگرن، کێویش نایتوانێ. کابرای جوولەکە ڕەنگی گۆڕا و لە دەس شێخەوە ڕاما و دەستی کرد بە گریان و هەستا پەلاماری دەستی شێخی دا و ماچی کرد و گوتی بەڕاستی ئیمانی تۆم بۆ مەعلووم بوو، ئەوەیە ئیمانی ڕاستەقینە و ئەوەیە ئەو ئیستیقامەی کە خواوەندی گەورە ئەمری بە پێغەمبەران و عەبد و بەندەگانی خۆی کردووە، کە دەوامی لە سەر بکەن، جا شێخ خۆی بە جوولەکەکە ناساند و جوولەکەکە لە سەر دەستی شێخ شادە و ئیمانی هێنا و موسوڵمان بوو، وە بوو بە یەکێک لە موریدە باشەکانی شێخ.

شێخ ئەو ڕۆژە ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: خەڵکینە، ئینسانی خاوەن ئیمان نابێ هەر ئاسوودەیی خۆی بوێ، دەبێ هەوڵ بدا بۆ هیدایەتی ئەوانەی دوورن لە ئیمان، یا ئیمانیان زەعیفە، [لِأَنَّهُ قِيلَ ٱلرَّاحَةُ ظَرْفٌ مَمْلُوءٌ مِنَ ٱلعِتَابِ] چونکە زانایان گوتویانە: ئاسوودەیی و ڕەحەتی زەرفێکە پڕە لە لۆمە و سەرزەنشت و عیتاب.

«شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی» لە بەرامبەر حەق‌دا زۆر عەجایب بوو، زۆر بە جواب بوو، ناحەقی و بێ ئەدەبی، لە کەس قبوڵ نەدەکرد، جارێک لە حەرەمی مەکە، تەوافی کەعبەی دەکرد، خەڵکێکی زۆر خەریکی تەواف بوو، بەڵام زۆربەیان لە کاتی تەوافدا قسەیان دەکرد و ئاگایان لە مەعنای تەواف نەمابوو، شێخ کە ئەوەی دی، خۆی پێ ڕانەگیرا و گورجێک چوو هێندێک داری هێنا و لە حەوشی حەرەمدا ئاگری کردەوە، خەڵکەکە گوتیان: کابرا ئەوە چ دەکەی؟ ئەو دارو ئاگرەت، بۆ هێناوەتە حەرەمەوە؟

لە وەڵامدا فەرمووی: دەمەوێ «کەعبەتُ الله» بسوتێنم، تا ئەوانەی لە خوا غافڵن و لە حزور خوادا، ئاگایان لە خوا نەماوە، ئاگاداریان بکەمەوە و ڕوو بکەنەوە خوا، خەڵکەکە هۆشیان هاتەوە بەر و گوتیان: بە ڕاستی حەقی تۆیە، تۆ

ڕاست دەکەی، ئێمە زۆر بە بێ ئەدەبی تەوافمان دەکرد، هەزار ڕەحمەت لە دایک و باوکت، ئاگادارت کردینەوە.

جا هەر وەکوو لە پێشەوە باسم کرد، «شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی» خەرقەی ئیرشادی لە شێخی شبلی وەرگرتووە و شێخی شبلی لە شێخ جونەیدی بەغدادی و شێخ جونەیدی بەغدادی لە شێخ سەڕی سەقەتی و ئەو لە شێخ مەعرووفی کەرخی و شێخ مەعرووف لە شێخ داوودی تائی و شێخ داوود لە شێخ حەبیبی ڕاعی ئیجازە و خەرقەی وەرگرتووە و لە ئاخری عومریدا «شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی» تا وەفاتی فەرموو، چوو لە حەرەمی مەکە مایەوە و خەریکی مەوعیزە و تاعەت و عیبادەت و خوا پەرستی بوو.

«شێخ ئەبولقاسمی نەسرابادی» ئەوەندە خۆشەویست بوو، نازی بە سەر خوادا دەکرد و گەورەیی ئینسانی موسوڵمانی ڕاستەقینەی ئاشکرا دەکرد و دەیفەرموو: ئەگەر ئینسان بێ ئەمری خوا نەکا و بە ڕاستی موسوڵمان بێ، لە هەموو شتێک گەورەترە.

ڕۆژێک لە حەرەمی کەعبەدا دانیشتبوو، باێکی زۆر خۆش پەردەی کەعبەی وەرەقس و سەما خستبوو، بەم لاو ئەولایدا دەدا، شێخ کە ئەو حاڵەتەی دی، سۆزی بزووت و دەستی کرد بە نەعرەتە لێدان و شێعر خوێندنەوە و ڕووی کردە «کەعبەتُ‌الله» و داوێنی پەردەی کەعبەی گرت و ئەو شێعرەی خوێندەوە کە مەعناکەی ئەوەیە: ئەی «کەعبەت‌الله»، ئەی بووکی ڕازاوەی جوانی سەربەرز، تۆ خۆت ئاوا، بە ئاسوودەیی لە ناوەڕاستی حەرەمدا بە ناز و عیشوە دانیشتووی، و بەزەییت بە کەسدا نایەتەوە، کەچی لە تەواوی دنیاشەوە، دڵی ئەو خەڵکە دەبزوێنی و دێن بۆ زیارەتی تۆ، زۆریان لە ڕێگادا، لە دەشت و سەحرادا، لە بن داری موغەیلاندا، لە تینواندا و لە گەرماندا و لە غەریبی بە هیلاک دەچن و دەمرن. دەیفەرموو: بۆ ئەوەندە بە خۆت دەنازی؟ تاکەی ئەو لاف و گەزافەمان بە سەردا لێ دەدەی؟ دەیفەرموو: خۆ ئەگەر دەڵێی خواوەندی گەورە، لە ئایەتی سەد و

بیست و پێنجی سورەی بەقەرە و لە ئایەتی بیست و شەشی سورەی حەجدا نیسبەتی تۆی داوە وەلای خۆی گوتوویەتی: [بَيْتِيَ]، لە حەفتا ئایەتدا ئێمەی بە [عَبْدِي] ناو بردووە و نیسبەتی داوین وە لای خۆی.

جا دەڵێن: حاڵەتی پیاوچاکان هەمیشە، وەک یەک نیە، لەو بە سەرهاتەدا فەخری بە سەر حەرەم و کەعبەدا دەکرد، کەچی گوێ بگرە، لەو حیکایەتە، کە چۆن فەخری بە سەردا دەکەن! ڕۆژێک بە کۆڵانەکانی شاری مەکەدا، دەگەڕا. چاوی بە سەگێک کەوت لە برسان و لە تێنوان، بە ڕوو زەووی کەوتبوو، شێخ کە ئاوای دی زۆری بەزەیی پێدا هاتەوە، بەڵام هیچی پێ نەبوو بیداتێ، هاواری کرد و گوتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە چەند حەجم لێ دەکڕێ، بە نان و ئاوێک ڕاوی دەڵێ: ئەوەندەی هاوار کرد، ئاخری سەوابی چەند حەجی فرۆشت بە نان و ئاوێک و دای بە سەگەکە.

یەکێک لە پیاوە گەورەکان، ئەوەی زانی و کە تووشی بوو، گوتی: ئەی «ئەبولقاسمی نەسرئابادی» ئاگات لە خۆت بێ، فەخر بە سەر کەعبە و خەڵکدا نەکەی، پێت وا نەبێ کە کارێکی زۆر گرنگت کردووە، با پیرە گەورەی تۆ کە حەزرەتی ئادەم بوو، هەشت تەبەقەی بەهەشتیدا، بە دوو دەنکە گەنم، خۆ ئەو نانەی کە تۆ کڕیت، لەوانەیە ئاردی دەیان دەنکە گەنمی تێدا بێ. «شێخ ئەبولقاسم» دەستی کرد بە گریان و ئامۆژگاری کابرای وەرگرت و چوو لە حەرەمدا دەستی کرد بە عیبادەت و فەرمووی: بەڵێ، دەبێ ئینسان ئاگای لە خۆی بێ و بە خێر و چاکە لە خۆی بایی نەبێ و شەیتان بە سەهوی نەبا.

«شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی» پیاوێکی زۆر گەورە و عەزیم بووە، هەتکی نەفسی خۆی کردووە، لە بەر ڕەزای خوا تەرکی ئارەزووی نەفس و شەیتانی کردووە، دەڵێن: جارێک لە ڕۆژی عەرەفەدا، لە عەرەفات، لە کێوی [جَبَلُ ٱلرَّحْمَةَ] نەخۆش کەوت و لەرز و تایەکی زۆر سەختی گرت، خۆ دیارە لە گەرمای عەرەبستاندا پیاو تووشی لەرز و تا دەبێ، بە تایبەتی لە زەمانی ئەواندا، کە

وەسایلی ژیان وەک ئێستا نەبووەو چۆرە ئاوێکی سارد هەر دەست نەدەکەوت، جا وەرە لەرز و تات بێتێ و تینووت بێ، دەبێ حاڵت چۆن بێ و چەند ئارەزووت لە قوومە ئاوێکی سارد بێ؟! لەو حاڵەتەدا، یەکێک لە دۆستەکانی ئێرانی، کە لە کاتی خۆیدا زۆری خزمەت کردبوو، هاتە سەرسەری و ئەحواڵی پرسی، کە چاوی بە شێخ کەوت، لەو حاڵەتەدا و بەو گەرمایە و لەرز و تاشی هاتۆتێ، زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: یا شێخ، چ ئەمرێک دەفەرمووی، تا بیکەم؟ شێخ فەرمووی: چۆڕێکم ئاوی سارد بۆ پەیدا بکە، کابرا لە دڵی خۆیدا گووتی: جا خوایە! لەم گەرمای عەرەبستانەدا، ئاوی ساردی لە کوێ بۆ پەیدا کەم؟

لە بەر ڕەزای دڵی شێخی گۆزەیەکی بە دەستەوە گرت و بۆ لای مەنزڵەکەی خۆیان هاتەوە، ڕاوی دەڵێ:بە ئەمری خوا هێشتا نەگەیشتبووەوە لای مەنزڵەکەی خۆیان، پەڵە هەورێکی هێنا و دەستی کرد بە باران و گوزەڵەکەی لێ پڕ کرد، ئاوێکی زۆر سارد و فێنک بوو، کابرا زانی کە ئەوە لە بەر کەڕامەت و ئارەزووی شێخ، خوای گەورە ئەو ئاوەی باراند، بە پەلە گەڕایەوە، ئاوەکەی هێنا بۆ خزمەت شێخ، گوتی: قوربان، فەرموو، ئەوە ئاوی سارد، شێخ فەرمووی: بەو گەرمایە ئەو ئاوە ساردەت لە کوێ هێنا؟ کابرا باسی بارانەکەی بۆ گێڕایەوە، شێخ هەستی بەوەکرد کە نەفسی گۆڕا و زۆری پێ خۆشە، ئاوەکە بخوا، ڕووی کردە نەفسی و گوتی: ئەی نەفسی زاڵم و سەرکێش، وا دیارە بەو گەرمایە زۆر ناراحەتی و داوای ئاوی سارد دەکەی؟ ڕووی کردە کابرا و گوتی: کاکە، مەقسودم حاسڵ بوو، ئاوەکە لابە، نای خۆمەوە، کابرا ئاوەکەی لابرد و شێخ نەی خواردەوە، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا، هەر لەو کاتەدا خوا شیفای بۆ نارد و لەرز و تاکەی نەما.

ئەو حیکایەتەی «شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی»ئامۆژگاریمان دەکا و دەڵێ: خەڵکینە، بزانن کە شیفا بە دەست خوایەو، دوای ئارەزووی نەفس مەکەون، ئەگەر خواوەندی گەورە ویستی یەکێک ڕزگار بکا، شتێکی بۆ دەرەخسێنێ.

ڕۆژێک مینبەریان بۆ دانابوو، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، لە ئامۆژگاری

یەکەیدا ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: هەموو ئادەمیزادێک، بە دوو ئیعتبار، دوو نیسبەتی هەیە، یەکیان نیسبەت وەلای حەزرەتی ئادەمەکە با پیرەگەورەی هەموو کەسە و، ئەوی تریان نیسبەتی ئینسانە وەلای خوای گەورە، فەرمووی: جا لەو لایەنەوە کە نیسبەت دەدرێ‌وە لای حەزرەتی ئادەم، کە پێی دەڵێن، نیسبەتی تەبیعی و سروشتی، ئەوە زۆر وایە بە هۆی ئەو نیسبەتەوە، ئینسان دەکەوێتە ناو دەیان ئارەزووی شەهوەت و هەزاران فیتنە و فەسادەوە و تووشی زۆر عەیب و عار و درۆ و دەلەسە و حەسادەت و بەخاڵەت و غەیبەت و بوختان و چاکە و خراپە دەبێ، کە ئەوە نیسبەتی بەشەرییەتە. بەڵام لەو لایەنەوە، کە ئینسان نیسبەت دەدرێ وەلای خوا، کە پێی دەڵێن: نیسبەتی عبودییەت، ئەگەر عەبدایەتی و بەندەگی یەکە، عەبدایەتی و بەندەگی ڕاستەقینە بێ، ئەوە ئەو کەسە، دەکەوێتە بازارێکی ترەوە و دەبێتە پیاوی چاک و خاوەن کەشف و کەرامات و دارای عیسمەت و مەقامات و ڕوتبەی ویلایەتی پێ دەبەخشن.

فەرمووی: جیاوازی یەکی‌تر، لە بەینی ئەو دوو نیسبەتەدا ئەوەیە، نیسبەتی ئینسان وەلای حەزرەتی ئادەم، بە مردن کۆتایی دێ، بەڵام نیسبەتی ئینسان وەلای خواوەندی گەورە لە پاش مردنیش، هەر بەردەوام دەبێ و ناگۆڕێ.

فەرمووی: نابینن کە خواوەندی گەورە ئینسانی نیسبەتدا، وەلای خۆی، چۆنی بەگەورە ناو دەبا! ئەوەتا لە ئایەتی سی و شەشی سورەی فورقاندا، دەفەرموێ: ﴿وَ عِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَىٰ ٱلْأَرْضِ هَوْنًا﴾ عەبدانی خوا ئەو کەسانەن، کە فەخر بە سەر خەڵک و زەویدا ناکەن و زۆر بە لەسەر خۆیی دەڕۆن بەرێدا. فەرمووی یا لە ئایەتی چل و دووی سورەی حیجردا، چەند بە گەورە ناوی عەبدانی ڕاستەقینەی خۆی دەبا، لە کاتێکدا ڕووی خیتاب دەکاتە شەیتان، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ﴾ واتە ئەی شەیتان! تۆ قەت ناتوانی زەفەر بەو کەسانە بەری، کە بە ڕاستی عەبد و بەندەی منن و قەت دەسەڵاتت بە سەردا نابێ.

فەرمووی: بەڵام لە کاتی نیسبەت دانی ئینسان، وەلای حەزرەتی ئادەم، زۆر وایە بەو هۆیەوە، ئینسان داخڵی مەقامی زوڵم و جەهل و نەزانی دەبێ و دەکەوێتە بازارێکی‌ترەوە، فەرمووی: هەروەکوو خواوەندی گەورە لە ئایەتی حەفتا و دووی سورەی «ئەحزاب»دا، دەفەرموێ: ﴿وَ حَمَلَهَا الاِنْسَانُ اِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ ئینسان باری گرانی واجیباتی هەڵگرت و خستیە سەرشانی خۆی، کە بەڕاستی بە زۆری زاڵم و جاهیل و نەزانن.

فەرمووی: تەماشا بکەن، کاتێ خواوەندی گەورە، بە نیسبەتی سیفەتی ئینسانی باسی حەزرەتی ئادەم دەکا، دەفەرموێ: ﴿وَ عَصىٰ آدَمُ﴾ بە عاسی ناو دەبا و دەفەرموێ: ئادەم بێ ئەمری کرد، بەڵام کاتێ بە نیسبەتی عەبدایەتی و بەندەگی ناوی دەبا، زۆر بە گەورە و فازیل ناوی دەبا و دەفەرموێ: ﴿اِنَّ اللّٰهَ اَصْطَفىٰ آدَمَ﴾ خوای گەورە ئێوەی ئادەمی هەڵبژاردووە و پەسەندی کردووە، فەرمووی: جا کەوایە ئادەمیزاد ئاگای لە خۆی بێ و بە ئارەزووی نەفس و نیسبەتی تەبیعی و سروشتی ئینسانیە کەیەوە، خۆی تووشی داوی شەیتان نەکا و، لە ڕێگای ڕاستی بەندەگی و عەبدایەتی خوا لانەدا، تا خوای گەورە بە یەکێک لە عەبدانی خۆی لە قەڵەم دا و لە دنیا و قیامەت ڕووسورو سەربەرزی کا.

ڕۆژێک عەرزیان کرد قوربان، سۆفی و دەروێش دەبێ چۆن بن؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەوەی عەمەل بە قورئان و حەدیس بکا و حورمەتی پیر و پیاو چاکانی لابێ و عوزر لە خەڵک قبوڵ بکا و ڕەفاقەتی خۆش بێ و خزمەتی هاوڕێی بکا و خوو و ڕەوشتی جوان بێ و دەوام لە سەر ویرد و ئەوراد بکا و لە خۆڕا و بێ دەلیل شت نەڵێ و مەعنای ئایەت و حەدیس نەگۆڕێ، ئەوە سۆفی و دەروێشە.

«ئەبولقاسمی نەسرئابادی» دەیفەرموو: هەر کاتێ یەکێک لە ناو خەڵکدا ناوبانگی دەرکرد، بە پیاوی چاک و بە دڵ تەرکی دنیای کرد، ئەگەر بە ئاشکرا خۆی وا نیشاندا کە دنیاشی دەوێ، بۆ ئەوەی کە خەڵک بە باشی نەزانن و هات و چۆی زۆر نەکەن، ئەوە داخڵی ئەدەبە و ڕیای نیە، چونکە مەداری چاکی و خراپی

لە سەر دڵە، فەرمووی: خواوەندی گەورە، تەماشای دڵی عەبدانی خۆی دەکا، تەماشای سورەتی زاهیری ناکا.

فەرمووی: هەر لە بەر ئەوەیە کە خواوەندی گەورە [اصحابُ ٱلكَـهْف]ی لە قورئاندا بە فەتا و جوان مەرد ناو بردووە، چونکە بە دڵ و بەبێ واسیتە خوایان ناسیوە،

فەرمووی: خەڵکینە، بزانن ئەوەی سوننەت زۆر بکا، خوا باشتر دەناسێ و ئەوەی واجبات ئەنجام بدا، زیاتر لە خوای نزیک دەبێتەوە و ئەوەی ئەدەبی نەفسی نەبێ، بە ئەدەب نابێ، فەرمووی: ئەوەی شوکری نیعمەت بکا، خوا بۆی زیاد دەکا، بەڵام ئەوەی شوکری خاوەنی نیعمەت بکا، ئەوە زیاتر خۆشەویست دەبێ. جارێک فەرمووی: دەڵێن: پێغەمبەر (درووودی خوای لە سەر بێ)، لە حەدیسدا فەرموویەتی: گۆڕستانی وایە، لە ڕۆژی قیامەتا، دەی خەنە سەر بەهەشت و گۆڕستانی بەقیع، یەکێکە لەو گۆڕستانانە.

جا گوێ گرینە، بە ڕاستی کاری خوا زۆر سەیرە! کەس نازانێ کێ لە کوێ دەمرێ و کێ لە کوێ دەنێژرێ، لە بەر مەعنا و مەفهومی ئەو حەدیسەی پێشوو، شێخ ئەبوو عوسمانی مەغریبی هاتبوو، لە گۆڕستانی بەقیعدا، قەبرێکی هەڵکەندبوو، بۆ خۆی دانابوو کە هەر کاتێ وەفاتی کرد، بەرن لەوێدا بینێژن و تەسلیم بە خاکی بکەن. لە پاش ماوەیەک ڕۆژێک پیاوێک هات خەونێکی بۆ «شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی» گێڕایەوە و گوتی: یا شێخ! خوا وەخێری بگیرێ، ئیمشەو لە خەومدا کۆمەڵێک مەلائیکە جەنازەیان دێنان و دەبردن، زۆرم لا سەیر بوو، لە خەوەکەمدا پرسیارم لێ کردن و گوتم: ئەو جەنازانە بۆ وا دێنن و دەبەن؟ لە وەڵامدا گوتیان: ئاخر لە بەر ئەوەی زۆر کەسی وایە، جێگای لەو گۆڕستانە نیە و لێرە نێژراوە، یان جێگای لێرەیە، کەچی لە شوێنێکی تر نێژراوە، لە بەر ئەوەیە ئاڵ و گۆڕیان پێ دەکەین.

کاتێ کابرا خەونەکەی بە تەواوی بۆ «شێخ ئەبولقاسم» گێڕایەوە، شێخ فەوری

ناردی بە دوای شێخ ئەبوو عوسمانی مەغریبی دا و هـات، «شـێخ ئـەبولقاسم» فەرمووی: ئەی شێخ ئەبوو عوسمانی مەغریبی، تا زووە تۆ لێـرە بـڕۆ، چـونکە مەعنای خەونی ئەو پیاوە ئەوەیە، کە تۆ لێرە نامری و من لێرە دەمرم و ئەو قەبرەی کە تۆ بۆ خۆت هەڵکەندووە، بۆ من دەبێ.

فەرمووی: جێگای قـەبر و گـۆڕێ تـۆ لە شـاری نـەیشاپوورە، شـێخ ئـەبوو عوسمانی مەغریبی زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام تۆ لە کاری خواوەندی گەورە گەڕێ، لە پاش چەند ڕۆژ شێخ ئەبوو عوسمانیان ئیزن‌دا و هات بۆ شاری بەغدا ولەوێوە چوو بۆ شاری ڕەی و لەوێش ئاسوودە نـەبوو، بـە نـاچاری چـوو بـۆ نـەیشاپوور و لە پـاش مـاوەیەک لەوێ وەفـاتی فـەرموو، «شـێخ ئـەبولقاسمی نەسرئاباد»یش، لە ساڵی سێسەد و شـەست و حـەوت‌دا، وەفـاتی فـەرموو، لەو قەبردا ناشتیان کە شێخ ئەبوعوسمانی بۆ خۆی هەڵکەند بو.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتە جـوانـەکـانی «شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی»، لە بەر خواوەندی گەورە دەپارێینەوە، لە وانیش و لە ئێمەش خۆش بێ. عەفوومان کا. وەبەر شیفاعەتی پێغەمبەرانمان بخا. شیفای نەخۆشـمان بدا. چاو لە دەستی نامەردمان نەکا. لە بەڵا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ اَللهُ عَلیٰ سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ اَلسَّلامُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَکٰاتُهُ

# (٤٤)

# باسی ئەبوو عەلی دەقاق

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

| | |
|---|---|
| اَلْحَمْدُ لِلْحَقيقِ بِالْمَحامِدِ | مَنْ خَصَّ بِالْإرْشادِ لِلْعَقائِدِ |
| ثُمَّ صَلاةُ اللهِ كُلَّ حِينِ | عَلىٰ نَبِيٍّ شارِعٍ لِلدِّيْنِ |
| وَ الْآلِ وَ الصَّحْبِ ذَوي الْيَقِينِ | مَنْ حَرَّرُوا، لنا اُصُولَ الدِّينِ[1] |

برایان، با وەکوو کۆڕ و مەجلیسەکانی پێشوو، لەم چەند دەقیقەی داهاتوودا، لەو مەجلیسەشدا، بچینە بارەگای خانەقای یەکێک لە ئەولیای خوا، کە لە سەردەمێکدا ئوستادی عیلم و بەیان بوو، کاشفی ئەسرار بە عەیان بوو، سەرگەردانی دەریای مەوەددەت بوو، مەلەوانی بەحری موحیببەت بوو، موشتاقی بارەگای باری بوو، سووتاوی ئاگری ڕزگاری بوو، زانای حەدیس و قورئان بوو، سوڵتانی حەقیقەت و عیرفان بوو، مامۆستای تەریقەت و تۆبەدادان بوو، ناوبانگی [لِسانُ الرَّحْمٰنِ] بوو، لە ئامۆژگاریدا بێ وێنە، لە کەشف و کەڕاماتدا کەم وێنە، لە سەرەتای تەمەنیدا ئاشەوان بوو، بەینێک دووکانداریێکی هەرزان جان بوو، جا ئەو خاوەن بەرەکەت و ویفاقە، جەنابی «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»ە. با زۆر بە دڵ گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و ئامۆژگاریەکانی و پەندیان

١ - شێخ مەعروف.

لێ وەرگرین.

«شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»، زۆر زانا و دانا بوو. بەڵام، کاتێ بەیعەتی لە سەر دەستی شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی کرد، خەرقەی ئیرشادی پۆشی، خواوەندی گەورە بە لوتف و کەرەمی خۆی، وەهای نووری مەعریفەت خستە دڵەوە و ئەوەندەی ڕوتبە و مەقامی بەرز کردەوە، کە لە زانیاری و کەشف و کەراماتدا، بوو بە ئایەتێکی ئەو سەردەمە، وەهای شەرحی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر دەکرد و مەعنای قورئانی لێک دەدایەوە، لە ناو زاناکانی ئەو سەردەمەدا ناویان نابوو، [لِسانُ الرَّحْمٰن]، واتە زمانی خوا.

لە ناو هەر کۆڕ و کۆمەڵێکدا، مەوعیزەی بکردایە، لە بەر ئەوەی ئەوەندە خاوەنی سۆز و شەوق و زەوق بوو، کەس خۆی بۆ ڕانەدەگیرا، جاری واش بوو خۆی ئەوەندە دەگریا، ئاگری لە دانیشتوان بەردەدا، ناویان نابوو گرینۆکی ناو کۆمەڵی ئەولیا، ئەگەر خواوەندی گەورە، بە چاوی مەرحەمەت تەماشای یەکێک بکا، لەوە ناپرسێ داخۆ ئەوکاتە کار و پیشەی چی بووە، لە پڕێک دەیکاتە کوڕێک، ئارد فرۆش، دەکاتە شوهرەی زەمانە [سُبْحَانَ الله] لە عەزەمەت و گەورەیی خوا.

هەروەها یەکێک لە پیاو چاکان فەرموویەتی: کاروباری خوا زۆر عەجایبە، کە ویستی لە سەر شتێک بوو، ئینسانی تێدا مات و سەرسام دەبێ، جاری وایە لە ناو ئاودا کۆمەڵێک دەبا بۆ ناو ئاگر، وەک فیرعەون و دار و دەستەکەی، کە لە ناو ئاوی دەریای «نیلی» میسردا بردنی بۆ ناو ئاگری دۆزەخ و بە پێچەوانەش، ئاگری نەمردوودی، بۆ حەزرەتی ئیبراهیم کردە باغ و باغات و گوڵستان.

جا ئەو پیاوە گەورەیە فەرمووی: ڕۆژێک لە قەراغ شاری مەڕوە، چاوم بە شەیتانی لەعین کەوت، تەپۆڵکێکی قوڕ وەسەر سەری خۆی کردبوو، هاواری دەکرد و دەینالاند، گوتم: ئەی لەعین، ئەوە چیت دیوە و چیت لێ قەوماوە، وا

هاوار دەکەی و ناڕەحەتی؟ لە وەڵامدا گوتی: جا چۆن قوڕ وەسەر نەکەم و هاوار نەکەم؟ ئەو ڕوتبە و مەقامە و ئەو خەڵاتەی کە چەند هەزار ساڵە، چاوەڕوانی دەکەم و لە ئارەزوویدا سووتاوم، لەو ماوەیەدا، خواوەندی گەورە داونی بە ئارد فرۆشێک، کە «ئەوبوو عەلی دەقاق»ە

جا بە ڕاستی گوێ گرینە، ئەو حیکایەتە ئامۆژگاریمان دەکا و دەڵێ: نابێ ئینسانی خاوەن ئیمان، لە لوتف و کەرەمی خواوەندی گەورە نائومێد بێ، چونکە نائومێدی لە ڕەحمەتی خوا، پیشەی شەیتانی لەعینە، دەبێ ئادەمیزاد بزانێ کە دەریا و بەحری کەرەمی خوای گەورە، هەمیشە لە شەپۆلدایە و ئەوەی تۆزێک لە خوا نزیک وەبێ و ڕوو بکاتە خواپەرستی و وەک «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»، خزمەت و ئاموژگاری خەڵک بکا، ئومێد وایە وەبەر شەپۆلی دەریای ڕەحمەتی خوا بکەوێ.

«شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»، جارێک فەرمووی: من ئیجازە و خەرقەی ئیرشادم لە جەنابی شێخ ئەبولقاسمی نەسرئابادی و ئەو لە جەنابی ئەبووبەکری شبلی و ئەو لە گەورە و ڕەئیسی تەریقەت و شەریعەت، جەنابی جونەیدی بەغدادی و ئەو لە جەنابی شێخ سەری سەقەتی و ئەو لە جەنابی شێخ مەعرووفی کەرخی و ئەو لە جەنابی شێخ داوودی تائی و ئەویش لە جەنابی شێخ شەیبانی ڕاعی وەرگرتووە. «شێخ ئەبوو عەلی» خەلیفە و موریدی زۆر بووە، یەکێک لەو خەلیفانەی جەنابی شێخ ئەبولقاسمی قوشەیری‌یە، کە زاواشی بوو، شێخ ئەبووعەلی فارمەدی، کە یەکێک لە پیاوە گەورەکانی زنجیرەی یەکەمی تەریقەتی نەقشبەندیە، لە فەرمایشتەکانی خۆیدا فەرموویەتی: ئەمن لە ڕۆژی قیامەتا، بە زۆری دڵم بەوە خۆشە، کە «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»م خۆش ویستووە.

جارێک شێخ فەرمووی: هیچ عیلم و زانیاریەک، بەبێ ئوستاد، یان بێ ئیلهامی خوایی نابێ و ڕوتبە و مەقامیش، لە دیندا بەبێ ئوستادێک، دەست ناکەوێ.

فەرمووی: نابینن، درەختێک کە لە خۆیەوە بڕوێ، یان هەر بەر ناگرێ، یان ئەگەر بەریش بگرێ، وەک درەختی پەیوەند کراو، بەرەکەی ئەو تام و لەزەتەی نابێ.

ڕۆژێک جەزبەی گرتبوو، تەنانەت کراسیشی لە بەردا نەبوو، هاتە خانەقای عبداللەی کوڕی عومەر، سۆفیەک ناسی و گوتی: ئەوە «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»ە. خەڵکیکی زۆری لە دەور کۆ بۆوە، چەند زانای بەرز هاتنە خزمەتی عەرزیان کرد: قوربان، زۆر حەز دەکەین دەرسێکمان پێ بفەرمووی، وەڵامی نەدانەوە. ئنجا گوتیان: مەوعیزەیەکمان بۆ بکە. فەرمووی: باشە، کورسیان بۆ دانا و چوە سەری و ڕووی کردە لای ڕاست و بە دەنگی بەرز گوتی: [اَللّٰهُ اَكْبَر] ئنجا ئیشارەی بۆ لای چەپ کرد و گوتی: [وَ اللّٰهُ خَيرٌ وَ اَبْقىٰ] لە پاشان ڕووی کردە قیبلەو گوتی: [رِضْوانٌ مِنَ اللهِ اَكْبَر] بەو سێ کەلیمە حاڵەتێکی زۆر عەجایب بە سەر خەڵکەکەدا هات و دەستیان کرد بە گریان، تەنانەت چەندکەس ماوەیەکی زۆر بێ هۆش کەوتن.

پیاوێک هاتە خزمەتی گوتی: قوربان، وەسوەسەم زۆرە، شەیتان لە کۆڵم نابێتەوە، چی بکەم باشە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: کاکە، تا دەرختی خۆشەویستی دنیا، لە حەوشی باڵەخانەی دڵتا، لە ڕەگ و ڕیشاڵ هەڵنەکەنی، تەیر و تیوری شەیتانی هەر پێوە دەنیشێتەوە، هەروەک چۆن تا درەختی ناو حەوشی کۆشک و سەراکەت مابێ، پارسای و کۆتری هەر لە سەر دەنیشێتەوە، مەعنای وایە خەیاڵ و خەتەرە و وەسوەسە، بە زۆری لە دڵ بە دنیا و شەیتانەوەیە.

بازرگانێک موریدی بوو، نەخۆش کەوت، شێخ ڕۆژێک دەچێ بۆ عەیادەت و ئەحواڵ پرسی و دەفەرموێ: ئەرێ کاکە، هۆی نەخۆشیەکەت چی بوو؟ بازرگان عەرزی دەکا دەڵێ: قوربان، نیوەشە و هەستام دەس نوێژ تازەکەمەوە، دوو ڕکات شەو نوێژ بکەم، دەماری پشتم وەر گەڕا و تووشی ئەو نەخۆشیە بووم، شێخ فەرمووی: جا باشە تۆ چ کارت بە سەر شەو نوێژەوە بوو؟ فەرمووی: کوڕم تۆ

دەبێ دڵت لە ماڵی حەرامی دنیا پاک بکەیتەوە و دەستی خەڵک نەبڕی، نازانی ئەگەر لە جیاتی ئەوە بچی شەو نوێژ بکەی، تووشی پشت ئێشان دەبی؟ فەرمووی: بەڵێ، کەسێک سەری بێشێ و ئاڵتوونی لە قاچی بەستن، ژانەکەی ناشکێ، یان یەکێک دەستی پیس بێ و، بێ فەقیانەکەی بشوا، پاک نابێتەوە.

جا خەڵکینە! بەڕاستی ئەو کورتە چیرۆکەی شێخ، پڕە لە پەند و ئامۆژگاری، بۆ زۆربەی کاسبکار و بازرگان و دوکاندار. دەفەرموێ: بۆ ڕەزا بوونی خواوەندی گەورە و دووری لە دەرد و بەڵا، ئەوەندە کافی نیە کە ئەوانە بە ئاشکرا نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و حەج بکەن، دەبێ لە پێش هەموو شتێکدا، دڵ و دەروونیان لە خواردنی ماڵی حەرام بپارێزن، دەبێ ماڵی خەڵک بە ناحەق نەخۆن، دەبێ دزی لە خەڵک نەکەن، دەبێ خاوەن چاکە و بەزەیی بن، دەنا وەک کابرای بازرگان تووشی نەخۆشی دەبن و شەو نوێژیش فریایان ناکەوێ.

دەڵێن جارێک کوڕێکی گەنج هاتە خانەقا و چوو ڕووی کردە شێخ و گوتی: یا شێخ، ئەگەر یەکێک خەیاڵی گوناە و خراپەیەک بکا، زەرەری بۆ پاکی و تەهارەت هەیە؟ شێخ دەستی کرد بە گریان و ڕووی کردە دانیشتوان و فەرمووی: یەکتان وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، یەکێک لە زانایان و پیاو چاکان لە مەجلیسەکەدا بوو، بە ناوی «زین الاسلام» گوتی: بەڵێ، ئەگەر شەرمم لە شێخ نەکردایە، هەر زوو وەڵامم دەدایەوە و دەمگوت: بۆ تەهارەتی زاهیری زەرەری نیە، بەڵام تەهارەتی باتینی دەشکێنێ و دڵی ئینسان ژەنگاوی دەکا.

شێخ فەرمووی: جارێک تووشی چاو ئێشە بووم؛ چەند ڕۆژێک ئارامم نەما و قەرارم لێ هەڵگیرا، خەوم لێ نەدەکەوت، لە پاش ماوەیەک لە نکاوێک خەوم لێ کەوت، لە خەوەکەمدا گوێم لە دەنگێک بوو گوتی: [أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ] ئایا خواوەندی گەورە لە هەموو کات و ساتێکدا، بۆ عەبد و بەندەگان کافی نیە، فریایان ناکەوێ؟

دەفەرموێ: کە وەخەبەر هاتم، دەتگوت بە حەیاتم چاوم نەئێشاوە، جا بە ڕاستی ئەو ڕووداوە و ئەو حیکایەتە و ئەو خەونە مەعنای وایە، کە هەر موسوڵمانێک تووشی چاو ئێشە بوو، ئەگەر بە ئیمان و باوەڕەوە، ئەو ئایەتەی بە سەردا وەخوێنێ، ئومێد وایە کە خواوەندی گەورە شیفای بدا.

جارێک لە مەوعیزەدا فەرمووی: عیلم و زانیاری، وەکوو کەسابەت و موعامەلاتی دنیا وایە، نابینن ئەو کەسەی کە بەقاڵە، تەرازو و زەرف و گوێنی و سوژن و بەنی زۆر پێویستە، چونکە موعامەلەکەی لە گەڵ خەڵکەو و ئەو شتانەی نەبێ، پەکیان دەکەوێ، بەڵام ئەگەر هەر ئەو دوکانداره، لە ماڵەوە دانیشێ پێویستی بەو شتانە نیە. فەرمووی: عیلم و زانیاریش ئەگەر لە بەر خەڵک و بۆ ڕیایی و ڕوتبە و مەقامی دنیا بێ، دەبێ زۆر وریابی و زۆر بزانی، بەڵام ئەگەر بۆ توێشووی دوا ڕۆژ و ڕەزا بوونی خوا بێ، ئەوە عیلمی کەمیش زۆرە، بەو شەرتە عەمەلی پێ بکەی، چونکە مەبەست لە عیلم و زانیاری لە دەرەجەی یەکەمدا، عەمەل و تەوازوعە، فەرمووی: ئەو کەسەی خۆی بە زل بگرێ و تەکەبووری بوو و تەوازوعی نەبوو، با زۆریش بزانێ و زۆر عالم بێ، ئەوە هەر نەزانە.

خەڵکینە، خۆ بەکەم گرتن و تەوازوع نواندن، وەک «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق» دەبێ، کە بەو هەموو عیلم و ڕێز و حورمەتەوە، ڕۆژێک لە شاری مەڕوەدا، پیاوێک بانگ هێشتنێکی گەورە لە سەر شەرەفی «شێخ ئەبوو عەلی» دەکا و شێخ و خەڵکێکی زۆر دەعوەت دەکا، لە ڕێگادا شێخ تووشی پیرێژنێک دەبێ، دەڕۆیشت و دەگریا و دەیگوت: ئەی خوای گەورە، بۆ چی منت وا فەقیر و برسی کردووە و ئەو هەموو منداڵەشت بە سەرداداوم؟ ئاخر ئەوە کارە تۆ لە گەڵ مندا دەی کەی؟

شێخ تێپەڕی و دەنگی نەکرد و چوە ماڵی کابرا، کاتی نان دانان هات، شێخ فەرمووی: سێنییەک وەڕازێنن، فەوری سێنیەکیان بە ئەنواعی تەعام ڕازاندەوە و هێنایانە خزمەت شێخ، شێخ هەستا سینیەکەی لە سەر سەری خۆی دانا و هەر

چەند کردیان نەیدا بە کەس و بردی بۆ ماڵی پیرێژن.

جا پیاوی خوا دەبێ ئاوابێ، دەبێ دەعیە و دەماری نەبێ. دەبێ ئاوا موتەوازیع بێ. دەبێ ئاوا دەوڵەمەندان هەڵنێ بۆ خێر و خێرات و چاکە و پیاوەتی، دەبێ بە هۆی عیلم و زانیاری‌یەوە، یان بە هۆی ڕوتبە و مەقامەوە، خۆی لێ نەگۆڕێ، ئەگەر پیاوی چاک بێ، دەبێ زیاتر خزمەتی خەڵک بکا.

یەکێک لە فەراسەت و کەشف و کەراماتی «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق» ئەوەیە، کە یەکێک لە پیاوچاکان دەفەرموێ: زۆرم ئیشکال لە «تەوەکول»دا بوو.. ڕۆژێک چوومە خزمەت «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»، بۆ ئەوەی پرسیاری مەعنای تەوەکولی لێ بکەم، کە چوومە خزمەتی، لە سەر مینبەر ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، دەڵێ: دانیشتم، کە تەماشام کرد مەندیلێکی پارچەی «تەبەری» لە سەر بوو، زۆرم حەز لێ کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم: خۆزگە ئەو مەندیلەی دەدا بە من، لە پاشان عەرزم کرد: قوربان، تەوەکول چیە؟ تەماشای کردم و فەرمووی: تەوەکول ئەوەیە، تەماع لە مەندیلی خەڵک نەکەی، دەڵێ: هەر هەستا و مەندیلەکەی لە سەری خۆی کردەوە و گوتی: با بۆ تۆ بێ، هەر چەندم کرد، قبوڵی نەکردەوە.

جارێک فەرمووی: ئەگەر یەکێک بە ڕاستی خوا پەرست بێ، با تاعەت و عیبادەتیشی زۆر نەبێ، خواوەندی گەورە، عیبادەتە کەمەکەی، بۆ زۆر دەکا و دەخاتە دڵی خەڵکەوە کە فلان کەس ئەوەندە عیبادەتی کردووە. فەرمووی:هەروەک جارێک شێخ بیشری حافی، بەلای کۆمەڵێک خەڵکدا ڕۆیشت، کە چی خۆ بە خۆ بە یەکتریان دەگوت: ئەو پیاوە بە شەو ناخەوێ و بە سێ ڕۆژیش جارێک ڕۆژووی دەشکێنێ، بیشری حافی گوێ لێ بوو، فەرمووی: وەبیرم نایە شەوێک تا بەیانی بە تەواوی بە خەبەر بووبم و هەموو ئێوارەیەکیش ڕۆژووم شکاندووە، بەڵام دیارە خواوەندی گەورە بە لوتف و حورمەتی خۆی، بۆ ئەوەی حورمەتی بەندەی خۆی زیاتر کا، دەخاتە دڵی خەڵکەوە کە ئەوەندە

عیبادەتی کردووە.

«شێخ ئەبوو عەلی دەقاق» فەرمووی: هەر چەند ئادەمیزاد زەلووم و جەهوولە و زۆر خوو و ڕەوشتی خراپی تێدا مەوجوودە، وەکوو حەسادەت و بەخاڵەت و عوجب و تەکەبوور، بەڵام لە لایەکی ترەوە، ئەگەر تۆزێ لە خوا ترس و خوا ناس بێ، ئەوە خوا خۆشی دەوێ، هەروەک لە ئایەتی پەنجا و چواری سورەی مائیدەدا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بە زاهیری ئیمانتان هێناوە، وریا بن، خۆتان لە سیفەتی نیفاق و بوغز و غەرەز و حەسادەت و بەخاڵەت و درۆ و دەلەسە و فیتنەیی و دووڕویی و خوو و ڕەوشتی خراپ بپارێزن و ڕوو بکەنە تاعەت و عیبادەت و ڕاستی و ڕاستگۆیی و چاکە و پیاوەتی، ئەگەر وانەبێ و وانەکەن، ئەوە خوا ئێوە لە بەین دەبا و لە جیاتی ئێوە، کۆمەڵە ئینسانێک دێنێ، کە خوا خۆشی بوێن و ئەوانیش خوایان خۆش بوێ.

شێخ ئەبوو سەعیدی ئەبولخەیر دەفەرموێ: کاتێ «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق» هاتە «نەسا» خانەقای لێ نەبوو، «شێخ ئەبوو عەلی» لە خەویدا بە خزمەت پێغەمبەر دەگا، دەستی زیارەت دەکا و حەزرەت لە جێگای خانەقای ئێستا خەتێکی بۆ دەکێشێ و دەفەرموێ: «ئەبوو عەلی»، ئەو شوێنە بکە بە خانەقا، بەیانی دوای نوێژ و ویرد و ئەوراد، لە گەڵ کۆمەڵێک لە موریدەکان، دەچنە سەر ئەو زەمینە کە پێغەمبەر لە خەویدا بۆی دیاری کردبوو. کە تەماشای دەکەن؛ بە ئەمری خوا، ئەو خەتەی کە شەو لە خەویدا پێغەمبەر بۆی کێشا، دیار بوو، حەمد و سەنای خوایان کرد و سڵاوەتیان لە دیداری پێغەمبەر لێدا و هەر ئەو ڕۆژە دەستیان کرد بە دروست کردنی خانەقا، کە لە دوا ڕۆژدا، بوو بە جێگای ئەولیا و دەڵێن: مەرقەدی چوارسەد ئەولیای لێیە، فەرمووی: جا لە بەر ئەوەیە، تەبەقەی سۆفی ناویان ناوە شامی بچووک، واتە هەروەک وڵاتی شام گۆڕی ئەنبیای زۆرە،

شاری «نەسا»ش لە ولاّتی خوراسان، گۆڕی ئەولیای زۆرە.

بەڕاستی «شێخ ئەبور عەلی دەقاق»، سەرچاوەی ئەدەب و عیلم و عیرفان بوو. ئوستادی ئامۆژگاری و مەوعیزە و نوکتە و فەرمایشتی زۆر جوان بوو، لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: هەر کەسێک موخالەفەی قسەی ئوستاد و پیری خۆی بکا، ئەوە تەرکی ئەدەب و تەرکی تەریقەتی کردووە و عەلاقەی لە گەڵ شێخ و ئوستادەکەی دەپچڕێ.

دەیفەرموو: ئەوەی تەرکی حەرام بکا، ئەوە لە ئاگر و عەزابی دۆزەخ، ڕزگاری دەبێ، بەلاّم ئەوەی نەک هەر حەرام نەخوا، بەڵکوو دووری لە شتی شوبهەدار بکا، ئەوە دەچێتە بەهەشت، فەرمووی: بەلای منەوە، ئەگەر ئینسان لە تەواوی تەمەنی خۆیدا، جارێک بە عەمدی بێ ئەمری خواوەندی گەورە بکا و خوای گەورە لە پاشان عەفووی بکا و بچێتە بەهەشت، لەوێ بە سەر چاویدا بدەنەوە کە تۆ فلاّن جارە بە عەمدی بێ ئەمری خوات کرد، ئەوە لە خەجاڵەتیان بەهەشتی لە بەر چاوی دەبێتە دۆزەخ، بەلاّم بە پێچەوانە، ئەگەر لە تەواوی تەمەنی خۆی دا، جارێ بە ڕاستی ڕووی کرد بێتە خوا و بیبەنە دۆزەخ و لەوێ وەبیری بخەنەوە، کە تۆ فلاّن ڕۆژە بەڕاستی ڕووت کردە خوا، ئەوە لە خۆشیان، ئاگری دۆزەخی لە بیر دەچێتەوە و لە پێش چاوی دەبێتە بەهەشت.

دەیفەرموو: خواوەندی گەورە ئەگەر عەزابمان بدا، ئەوە ئیزهاری قودرەتە و ئەگەر عەفووشمان بکا، ئەوە ئاشکرا کردنی لوتف و ڕەحمەتە.

دەیفەرموو: هەر لە سورەی فاتیحادا، خوای گەورە باسی شەریعەت و تەریقەتی بۆ کردوین. کە دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ ئەوە مەعنای وایە، ئاگاتان لە شەریعەت بێ و کەدەش فەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەمرە بە حەقیقەت.

دەیفەرموو: خۆ بەکەم گرتنی ئینسانی دەوڵەمەند و تەوازوعی لە بەر پیاوی فەقیر و دەست کورت، بەدیانەت لە قەڵەم دەدرێ و تەوازوعی پیاوی فەقیریش،

لە بەر پیاوی دەوڵەمەند، بە ڕیایی حیساب دەکرێ.

دەیفەرموو: تا بۆتان دەکرێ، خۆتان لە دەسەڵاتدار و زاڵم دوور خەنەوە، چونکە ئینسانی زاڵم بڕیاری وەک بڕیاری منداڵە و پەلاماری وەک پەلاماری شێرە.

ڕۆژێک لە مەوعیزەدا دەستی کرد بە گریان و لە بەر خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت: ئەی خوای گەورە، بۆ خاتری گەورەیی خۆت، لە ڕۆژی قیامەتا خەجاڵەت و ڕیسوام مەکە، لە لای خەڵک، چونکە لە وەکالەتی تۆوە، لە سەر مینبەری ئامۆژگاری، زۆرم لاف و گەزاف لێداوە. دەیفەرموو: تکایە لە لای ئەو خەڵکە عەفووم کە، ئەگەر هەر خەجاڵەتیشم دەکەی، با خەڵک ئاگای لێ نەبێ، با لە بەر ئەوەی من بەرگی دەروێشیم خۆش دەوێ، لە ڕۆژی قیامەتا، خەرقەیەک و دۆدانەیەک دەست وعەسایەکم بدە دەست و ڕەوانەی شیوێک لە شیوەکانی دۆزەخم کە، تا هەتا هەتایە، لە خەجاڵەتی خۆم و دووری ویسالی تۆ بگریم.

دەیفەرموو: ئەی خوای گەورە، تا ئێمە نامەی ئەعمالمان بە گوناە ڕەش کردووە، تۆ مووی ڕەشی ئێمە بە هۆی ناهەمواری ڕۆژگارەوە سپی کردووە، کەواتە ئەی خوای گەورە، ئەی خالقی ڕەش و سپی، کردەوەی ڕەشمان بە مووە سپیەکان ببەخشە.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و ئامۆژگاریەکانی «شێخ ئەبوو عەلی دەقاق»، کە لە ساڵی چوارسەد و پێنجی کوچیدا، لە شاری نەیشاپوور وەفاتی فەرمووە، ئومێد دەکەم کە لە قەدەر توانا سوودتان لێ کردبێ و لە خوای گەورە داوا دەکەین، کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەر و ئەولیا عەفوومان کا. شیفای نەخۆشمان بدا. ئەولادمان ساڵح بکا. لە بەلا و موسیبەتی دنیا و قیامەت، بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلیٰ ٱللهُ عَلیٰ سَیِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ ٱلسَّلاَمُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ ٱللهِ وَ بَرَکَاتُهُ

# (٤٥)

## باسی ئەبولحەسەنی شازلی

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

حَمْداً لِمَوْلىً واحِدٍ عَلاّمِ وَ شارِعِ عَقائِدَ الإِسْلامِ
ثُمَّ صَلاةً وَ سَلاماً دائِماً عَلىٰ نَبِيٍّ شَرَعَ الأَحْكاما
وَ آلِهِ المُعْتَصِمِينَ بِالهُدىٰ وَ صَحْبِهِ ٱلَّذِينَ جاهَدُوا العِدىٰ[1]

گوێ گرینە، با لە چەند دەقیقەی داهاتوودا، بچینە بارەگا و مەجلیسی یەکێکی تر لە ئەولیای خوا، کە لە زەمانی خۆیدا ئەستێرەی گەشی ئاسمانی ویلایەت بوو، سەوڵ لێدەری دەریای عیلم و دیرایەت بوو، سەرچاوەی جۆگەی کەشف و کەرامەت بوو، زانا و بە ڕموزی ئەحادیس و ئایات بوو، بینندەی ئەنواری حەقایق بوو، داننندەی ئەسراری دەقایق بوو، پەروانەی شەمعی جەماڵ بوو، ئاشوفتەی سوبحی ویساڵ بوو، هەدەفی تیری مەلامەت بوو، دوڕڕی سەدەفی کەرامەت بوو، جا ئەو مورشیدی تەریقەتە، ئەو پێشەوای شەریعەتە، ئەو زانا خاوەن حەسەب و نەسەبە، ئەو سەییدە حەسەنی یە، جەنابی «ئەبولحەسەنی شازلی»یە. با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین، بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی و دەرس و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

---

١ - شێخ مەعروف.

«شێخ ئەبولحەسەنی شازلی» ناوی عەلی و کوڕی عبداللەیە و بە شازدە پشت دەچێتەوە سەر حەزرەتی عەلی و لە ئاوایی شازلی ناوچەی ئـەفریقا، لە وڵاتـی مەغریب ، لە نـزیک شـاری تـونیس لە دایک بـووە، هـەر لە وڵاتـی مـەغریب عیلمەکانی تەواو کردووە، تا وای لێهات کێشە و موزاکەرەی، لەگـەڵ تـەواوی زاناکانی مەغریب دەکرد و قسەی ئەو سەر دەکەوت، ئەوەندەی تەماشا و موتاڵا و دەر وتەوە تا کـوێر بـوو، بـەڵام خـوای گـەورە هـەر وەک لە عـیلمی زاهـیریدا دەوڵەمەندی کرد، بـردییە بـازاری عـیلمی بـاتینی و تـەسەووفیشەوە و بـوو بـە ئوستادی عولەمای زاهیر و بـاتین و دەنگ و نـاو بـانگ و ئـاوازەی زانـیاری و گەورەیی لە وڵاتی مەغریبدا بڵاو بوەوە، بەڵام هەروەک تا ئێستا عادەت و «الله» لە ناو زانایاندا وا جاری بووە، حەسوودی، بە لە خۆیان زاناتر دەبەن، حەسوودیان پێ برد و لە بەر ئەوەی شتی وای دەکرد، ئەوان پەیان پێ نەدەبرد، بە زیندیق و بێ دین ناویان بڵاو کردەوە و دەستیان کرد بە ئەزیەت دانی خۆی و جەماعەتەکەی، ناچار بوو لە گەڵ کۆمەڵێک لە قوتابیانی هات بۆوڵاتی میسر، بەڵام ناحەزەکانی بەوەش لە کۆڵی نەکەوتنەوە، بەر لەوە ئەو بگاتە میسر، نامەیەکیان نارد بۆ ئەمیری ئەسکەندەریە و بۆ سوڵتانی میسر، کە ئەوا یەکێک لە زیندیقەکانی مەغریب بـە خۆی و بە کۆمەڵەکەیەوە هات، بە ناوی «ئەبولحەسەنی شازلی»یـەوە، ئـێمە لە وڵاتی خۆمان دەرمان کردووە، چونکە بیر و باوەڕ و عەقیدەی خەڵکی دەگۆڕی، جا تکایە ئاگاتان لە خۆتان بێ، زمانی زۆر لووسەو قسەی زۆر بە تام و سەرنج ڕاکێشە، تا شێخ گەیشتە ئەسکەندەرییە، گوێی خەڵکیان لەو قسە پڕ و پووچانە پڕ کرد. لەو کاتەشدا، سەید ئەحمەدی ڕفاعی، شێخ ئەبولفەتحی واسیتی، نارد بوو بۆئەسکەندەرییە، ئیرشادی خەڵک بکا، کاتێ «شـێخ ئـەبوولحەسەن» گـەیشتە ئەوێ، پیاوێکی نارد بۆ لای ئەبولفەتح، ئیجازەی چوونە ناو شاری بدا، چونکە ئەوکاتە عادەتی پیاو چاکان وابوو، ئەگەر پیاوێکی چاک، لە جێگایەک بـوایـە،

دەبوو ئیجازەی لێ وەرگرن، شێخ ئەبولفەتح لە وەڵامدا گوتبووی: بە شێخ بڵێن، کلاوێک جێگای دوو سەری تێدا نابێتەوە، بەڵام بە ئەمری خوا، هەر ئەو شەوە شێخ ئەبولفەتح وەفات دەکا و بەیانی «شێخ شازلی» دەچێتە ناو ئەسکەندەری‌یە. خەڵکی ئەسکەندەریە نەک هەر ڕێزیان لێ نەگرت، بەڵکوو ناردیان بۆ لای ئەمیری میسر و ئەوەندەیان قسەی ناڕەوا بۆ نووسی بوو، ئەگەر بە قسەی ئەوانی بکردایە، دەبوو ئیعدامی بکا، بەڵام ئەمر و ئیرادەی خوا جۆرێکی ترە، سوڵتانی میسر نامەیەکی بۆ سوڵتانی مەغریب نارد و داوای وەزع و حاڵی «شێخ ئەبولحەسەنی» لێ کرد، لە وەڵامدا سوڵتانی مەغریب، زۆر بە جوانی تەعریفی «شێخ ئەبولحەسەنی» بۆ نووسی و، نوسی بووی کە ئەو پیاوە یەکێکە لە زانا بەرزەکانی ئوممەتی پێغەمبەر، لە ئەولادی حەزرەتی عەلی‌یە، زۆرت ئاگا لێ بێ، سوڵتانی میسر کە ئەو جوابەی لە سوڵتانی مەغریبەوە پێ گەیشت زۆری پێ خۆش بوو، دەستووری دا، کە دەبێ زۆر حورمەتی بگرن و هەر کەسێک دڵی بیشێنێ، خراپی پێ دەکەم.

«شێخ ئەبولحەسەن» دەستی کرد بە دەرس گوتنەوە و مەوعیزە و ئامۆژگاری، لە بەیانیڕا تا ڕۆژ ئاوا، بۆ نوێژ و نان خواردن و کارێکی دیکە نەبوایە، هەر خەریکی دەرس گوتنەوە و ئامۆژگاری بوو، دەیان زانا و فەیلەسووفی وەک شێخ «عزالدین»ی کوڕی عبدالسلام و «ابن دقیق العید» و «عبدالعظیمی مونذیری» و «ابن الصلاح» و «ابن العصفور» و «ابن الحاجب» لە مەدرەسەی کامیلیەی قاهیرەدا، حازری حەلقەی دەرسی دەبوون، لە سەرچاوەی پڕ بەرەکەتی عیلمی زاهیر و باتینی ئەو زاتە، زەرفی خۆیان پڕ دەکرد و عالەمی ئیسلامیان پێ پاراو دەکرد، کاتێ لە ڕۆژی جومعە و سێ شەممە و تەشریفی دەچوو بۆ جێگایەک، دەیان دانا و زانا و بە سەدان دەروێش و مورید، لەم لاو ئەولای دەڕۆیشتن و ئالایان لە سەر سەری هەڵدەکرد و تەپڵیان لێ دەدا، تا وای لێهات بناغەی

تەریقەتی «شازلی» دامەزراند و ئێستا زۆربەی موسوڵمانەکانی ئەفریقا، تەریقەتی «شازلی»یان هەیە.

شێخ تاج الدین دەڵێ: «شێخ ئەبولحەسەن» دەیفەرموو: هیچ عالمێک لە مەقامی عیلمدا، کامل و سەقامگیر نابێ، تا تاقی نەکرێتەوە بە چوار شت: یەکەم، تا ناحەز جنێوی پێنەدا. دووەم، تا دۆست لۆمەی نەکا. سێیەم، تا نەزان تەعنەی لێنەدا. چوارەم، تا عولەما حەسادەتی پێ نەبەن. فەرمووی: جا ئەگەر خۆی بۆ ئەو چوار شتە ڕاگرت و سابیر بوو، ئەو کاتە بۆ ئەوە دەبێ ببێتە ئیمام و پێشەوا.

فەرمووی: جارێک لە غەیبەوە پێیان گوتم: لەم عەسر و زەمانەدا، هیچ مەجلیسێک لە مەجلیسەکانی شەرع، لە مەجلیسی «شێخ الاسلام شێخ عزالدین کوڕی عبدالسلام» گەورەتر و خاوەن بەهاتر نیە و هیچ کۆڕ و مەجلیسێک لە کوڕ و مەجلیسی دەرسی عیلمی حەقایق، لە کوڕ و مەجلیسی «ئەبولحەسەنی شازلی» گەورەتر نیە.

«ابن دقیق العید» دەفەرموێ: کەسم نەدیوە لە «شێخ ئەبولحەسەنی شازلی» خواناستر بێ، «شێخ ئەبولحەسەن» هەروەک ئوستادی علومی زاهیری و بایتین بوو، خاوەنی حەلقەی دەرس و کەشف و کەرامات بوو، هەروەهاش مەجلیس ئارایی ئامۆژگاری و مەوعیزە بوو، بە موناسبەی ئامۆژگاری یەکانی وێنەی بە ئایەت و حەدیس دێنایەوە، بۆ نموونە لێرەدا چەند وێنەیەکتان بۆ باس دەکەم.

لە مەوعیزەیەکدا باسی بەلا و موسیبەتی دەکرد و فەرمووی: باشترین سپەر بۆ تیری قەزا، بە تایبەتی خوا نەکەردە، ئەگەر تووشی بەلایەک بوون، خۆڕاگر و سابیر بن و نەکەونە ناشوکری کردن. فەرمووی: وە بۆ ئەوەی خوا بتان پارێزێ، پەشیمان بوونەوەیە لە گوناە و تۆبە کردن و گوتنی کەلیمەی [أَسْتَغْفِرُ ٱللَّه]یە، چونکە خوای گەورە لە ئایەتی سی و سێی سورەی ئەنفالدا، فەرموویەتی: ﴿وَ مَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُم وَ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ هەرگەل و نەتەوە و قەومێک، داوای لێ خۆش

بوون و مەغفیرەت بکا، خوا عەزابی نادا. فەرمووی: موسوڵمانینە! [أَسْتَغْفِرُ اللّٰه] بکەن، با بە زاهیری هیچ گوناهێکیشتان نەکردبێ. فەرمووی: چاو لە پێغەمبەری خۆشەویست، حەزرەتی «محمد المصطفی» بکەن، لە گەڵ ئەوەشدا کە لە لایەن خوای گەورەوە بە شارەت و موژدەی لێ خۆش بوونی پێ درابوو، ڕۆژی چەند جار ئیستیغفاری دەکرد، جا لە جێگایەک کە پێغەمبەر، بەبێ گوناهی خۆیەوە ڕۆژێ چەند جار داوای لێ خۆش بوون بکا و بڵێ: [أَسْتَغْفِرُ اللّٰه] دەبێ ئێمە کە کەم وایە بێ ئەمری خوا نەکەین، چۆن لە بەر خوا نەپاڕێنەوە؟!

دەیفەرموو: هەر کەسێک دۆعای نەکرد و نەپاڕایەوە و زکری خوا لە سەر زمانی گران بوو، بەڵام بۆ قسەو باسی دنیایی، نۆرەی کەسی نەدەدا و بیری لە دوا ڕۆژ نەدەکردەوە، ئەوە بزانە، دڵی پڕە لە نیفاق، جا ئەگەر بیان هەوێ خوا عەفوویان کا، دەبێ ڕووبکەنەوە خوا پەرستی، تا فرسەتیان لە دەست دایە، هەروەکوو خوای گەورە لە ئایەتی هەشتا و نۆی سورەی ئالی عیمراندا فەرموویەتی: ﴿إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَالِكَ وَ اَصْلَحُوا فَإِنَّ اللّٰهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خوا لە دنیا و قیامەتا عەزاب لە سەر پیاو خراپان هەڵناگرێ، لە سەر ئەو کەسانە نیە کە تۆبە دەکەن و لە خراپە دەگەڕێنەوە، ئەوە خوا دەرهەق بەو جۆرە کەسانە غەفوور و ڕەحیمە.

دەیفەرموو: عادەتو «اللّٰه» وا جاری بووە، کە دەبێ هێندێک لە ڕێگای ڕاست لابدەن و لە پاشان تۆبە بکەن، تا خوای گەورە گەورەیی خۆی ئاشکرا بکا و لێیان خۆش بێ، یان تا پێغەمبەر شیفاعەتیان بۆ بکا، ئەوە مەعنای وایە ئەو کەسەی کە لای وابێ، کە نابێ قەت عەبد بێ ئەمری خوا بکا، مەعنای وایە ئەو ئەو کەسە پێی خۆشە ڕەحمەتی خوا ئاشکرا نەبێ و پێغەمبەر شەفاعەت بۆ کەس نەکا.

فەرمووی: جا کەواتە ئەی برای موسوڵمان،

بَـادِرْ إِلَىٰ التَّـوْبَةِ الْخَـلْصاءِ مُجْتَهِداً     وَ الْمَوْتُ وَ يْحَكَ لَمْ يَمْدُدْ إِلَـيْكَ يَـداً

فَــإِنَّمَا ٱلْمَــرْءُ فِي ٱلدُّنْـيَا عَـلَىٰ خَـطَرٍ      إِنْ لَمْ يَكُنْ مَيِّتاً فِي الْـيَوْمِ مَـاتَ غَـداً

لە تۆبە کردندا پەلە بکە، تا مردن دەستی بۆ درێژ نەکردووی، چونکە ئینسان لە دنیادا، هەموو کاتێ لە خەتەر دایە و ئەگەر ئیمڕۆش نەمرێ، بەیانی هەر دەمرێ.

ئەو دۆعایانەی کە «شێخ ئەبولحەسەنی شازلی» کردوونی، هەریەکە دەرمانی دەردێکە و شیفای جۆرە نەخۆشی یەکە و هۆی لاچوونی دەرد و بەلایەکە. دەیفەرموو: ئەگەر تووشی ناخۆشی یەک بوون، من بکەنە تکاکار و بڵێن: ئەی خوای گەورە، «ئەبولحەسەن»مان هێنایە، تکاتان لەو نەخۆشی‌یە ڕزگارمان کە، خوای گەورە کارەکەتان بۆ جێ بە جێ دەکا.

شێخ ئەبولحەسەنی مەرزی، دەفەرموێ: چەندجار ئەوەم بە تاقی کردوەتەوە، خوای گەورە دڵی نەشکاندووم و بەلا و موسیبەتەکەی لە سەر لابردووم.

شێخ عبداللەی شاتبی دەفەرموێ: هەموو شەوێک چەند جار دەمگوت: خوات لێ ڕازی بێ، ئەی «ئەبولحەسەنی شازلی» و لە پاشان دەمگوت: ئەی خوای گەورە، ئەگەر «شێخ ئەبولحەسەنی شازلیت» خۆش دەوێ، بۆ خاتری وی فلان کارەم بۆ بکرێ، بە ئەمری خوا زوو کارەکەم بۆ جێ بە جێ دەبوو. دەفەرموێ: شەوێک لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، عەرزم کرد: [يَا رَسُولَ ٱللهِ] لە پاش هەموو سەڵەوات دانێک لە سەر تۆ دەڵێم، خوایە لە «ئەبولحەسەنی شازلی» خۆش بەو بۆ خاتری «ئەبولحەسەنی شازلی» فلان کارەم بۆ بکرێ، ئەوە باشە یان خراپە؟ فەرمووی: لە خەوەکەمدا حەزرەت فەرمووی: «ئەبولحەسەن» لەفزەن و مەعنەن ئەولادی منە و ئەولادیش جۆرێکە لە باوک و ئەوەی پەنا بۆ ئەو بەرێ، پەنای بۆ من هێناوە.

«شێخ ئەبولحەسەن» فەرمووی: شەوی جومعە بیست و حەوتی مانگی ڕەمەزان، لەیلەت و لقەدەر بوو، لە خەومدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، فەرمووی:

[طَهِّرْ ثِيابَکَ مِنَ ٱلدَّنَسِ تَحُظْ بِمَدَدِ ٱللهِ فِي كُلِّ نَـفَسٍ] ئـەی «ئـەبولحەسەن»، لیباسەکەت لە پیسی پاک بکەوە، خوا لە هەموو هەناسەیەکـدا یـارمەتیت دەدا. عەرزم کرد: قوربان، لیباسەکانم پاکن، فەرمووی: کوڕم، خۆ لیباس هەر ئەوە نیە، کە لە بەر تایە، خواوەنـدی گـەورە پێنج جـۆرە لیـباسی خـەڵاتی تـۆو زۆر لە مـوسوڵمانانیتر کـردووە: ١ـ خـەڵاتی مـوحیببەت. ٢ـ خـەڵاتی مـەعریفەت. ٣ـ خەڵاتی تەوحید. ٤ـ خەڵاتی ئیمان. ٥ـ خەڵاتی ئیسلام. ئەوەی بەرگ و خەڵاتی موحیببەتی درابێتێ، هەموو شتێکی بۆ ئاسان دەبێ. ئەوەی خەڵاتی مەعریفەت کرابێ، تەنیا هەر خوای لا گەورە دەبێ. بە خەڵاتی تەوحید نەفی شەریک لە خوا دەکا. بە خەڵاتی ئیمان، ئەمین دەبێ. بە خەڵاتی ئیسلام، بێ ئەمری خوا ناکا. ئەگەر بیشیکا تۆبە دەکا. جا «شێخ ئەبولحەسەن» دەفـەرموێ: ئـەو کـاتە مـەعنای ئـەو ئایەتەم بۆ مەعلووم بوو، کە خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ: [وَ ثِيابَکَ فَطَهِّرْ] چیە! دەنا خۆ کەس وەک حەزرەت بەرگ و لیباسی پاکی نەپۆشیوە، کەس وا حەزی لە پاک و خاوێنی نەکردووە.

جارێک ڕووی کردە کۆمەڵە مەلایەک و فەرمووی: دەخیلتان بم، وریا بن، عیلمەکەتان بۆ ئەوە بڵاو نەکەنەوە تا خەڵک باوەڕتان پێ بکـا و بـڵێن: مـەلای چاکن، فەرمووی: بۆ ئەوە تەدریس بکەن تا خوا پاداشتان بـداتـەوە، فـەرموی: چونکە عیلم و زانیاری لە دڵدا وەک دینار و دەرەمی بەردەست وایە، چون ئەگەر خوای گەورە ویستی، لەو دینار و دەرهەمە سوودی دنیا و قیامەتت پێ دەگەیێنێ، یان ئەگەر ئارەزووی لێ نەبوو، دەبێتە هۆی نەگبەتی دنیا و قیامەت، عیلمەکەشت ئاوایە، ئەگەر بۆ ڕەزا بوونی خوا بێ، دەبێتە هۆی بەختەوەری دنیا و قیامەت، وەک عیلمی پێغەمبەران و پیاو چاکان. ئەگەر بۆ ڕەزای خواش نـەبوو، دەبـێتە هـۆی بەدبەختی دنیا و قیامەت، وەک عیلمی شەیتان و شەیتان سیفەتان. ئنجا ڕووی کردە شێخ و خەلیفەکان و فەرمووی: ئێوەش وریا بن، بۆ شوهرەت و دەست ماچ

کردن، دەروێش و سۆفی زۆر و بۆر تێکەڵ مەکەنەوە، فەرمووی: ئەوە نەخۆشی‌یەکی زۆر کوشەندەیە، فەرموی: دەروێشێک یان یەک سۆفی، وات هەبێ، بتوانێ ئەسرارِ و نهێنی لا باس بکەی، لە هەزاری بێ کەڵک باشترە.

دەیفەرموو: ئەوەی ڕەخنە لە پیاوی چاک بگرێ، لە پێش مردنیدا سێ جار دەمرێ. جاری **یەکەم** ئەوەیە بە زەلیلی دەمرێ. **دووەم** بە فەقیری دەمرێ. **سێیەم** لە ئاخری عومریدا، چاو لە دەستی خەڵک دەبێ، کە ئەوانەی هەر یەکە مردنێکە.

دەیفەرموو: هەر کەسێک ڕاستەوخۆ، داوای یارمەتی و شەفاعەت لە یەکێک لە ئەولیای خوا بکا، ئەوە وەک کوفر و شیرک وایە، دەبێ پیاوی چاک بکەی بە واسیتە، تا لای خوای گەورە بۆت وەپاڕێ. جا ئەو ئایەتەی سورەی سوجدەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: **﴿مٰا لَکُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِیٍ وَ لاٰ شَفِیعٍ أَفَلا تَتَذکَّرُونَ﴾** لە خوا بەو لاوە، یارمەتی دەرو شەفاعەت قبوڵ کەرێکتان نیە، ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە؟

فەرمووی: بەڵام پیاوی چاک، هەروەک خاوەنی سیفاتی بەشەری‌یە، هەرواش دارای سیفاتی ڕەببانی‌یە، هەروەک زاهیرەن خەڵک خۆشیان دەوێ، بە نهێنیش خوای گەورە خۆشی دەوێ. هەروەک زۆر وایە بە ئاشکرا فەقیرە، لە باتیندا زۆر دەوڵەمەندە. هە روەک ئەو لە ئەمر و فەرمانی خوا لانادا، خوای گەورەش بێ دڵی ئەو ناکا. فەرمووی: جا لە بەر ئەوە، پەنا بردنە، بەر پیاوی چاک، بەو نیەتە کە خۆشەویستی خوایە، هەر پەنا بردنە، بۆ لای خودا و بە قسەکردنیان نیشانەی ئیمانە، پیاو چاکان بە زۆری خوو ڕەوشت و ئەخلاقی پێغەمبەرانیان هەیە، بە زاهیری فەقیر و لە مەعنادا دەوڵەمەند. فەرمووی: هەروەک خواوەندی گەورە فەرمووی: **﴿وَ وَجَدَکَ عٰائِلاً فَأَغْنیٰ﴾** ئەی محمد، تۆ بە زاهیری فەقیر بووی، بەڵام لە مەعنادا دەوڵەمەندمان کردی. بەڵێ، خۆ خوای گەورە، پێغەمبەری بە ماڵی دنیا دەوڵەمەند نەکرد، لە پێش ئەوەیدا کە بکرێ بە پێغەمبەر، بە هۆی ماڵی

حەزرەتی خەدیجەوە، زۆردەوڵەمەندتر بوو، کە بـوو بـە پـێغەمبەر، تـا وەفـاتی فەرموو، هەر دەست کورت بوو، زۆر جار لە برسان بەردی لە سەر سکی خۆی دەبەست، زۆر جار کە میوانێک دەچوە مزگەوت، لە بەر ئەوەی دەیزانی لە ماڵەوە هیچیان نیە دەیفەرموو: ڕەحمەت لەو کەسە، ئەو میوانە دەباتەوە. بەڵام لە مەعنادا زۆر دەوڵەمەند بوو، لە خۆشەویستی خوادا دەوڵەمەند بوو، لە قبووڵی شەفاعەتا دەوڵەمەند بوو، لە خوو ڕەوشتی بەرزدا دەوڵـەمەند بـوو. فـەرمووی: پـێغەمبەر فەرموویەتی: عالم و پیاو چاک لە ناو هەر گەلێکدا بێ، وەک پێغەمبەرێکیان لە ناودابێ وایە و میرات گری پێغەمبەرە. کەواتە هەروەک پێغەمبەر، دۆعای گیرایە و شیفاعەتی لای خوا قبووڵە، پیاو چاکیش لای خوا خۆشەویستە و دۆعای گیرایە.

«شێخ ئەبولحەسەنی شازلی» وەسیەت نامەیەکی هەیە، لەوێدا فەرموویەتی: هەر کەسێک لە دنیادا بەو وەسیەتە عەمەل بکا، خوای گەورە لە دنیا و قیامەتا سەر بەرزی دەکا و لە دنیادا چوار شتی خەڵات دەکا و لە دوا ڕۆژیشدا، دڵخۆشی دەکا، بە چوار شت. فەرموویەتی: ئەوەی کافر نەکاتە گەورەی خـۆی و دوژمـنایەتی ئینسانی موسوڵمان نەکا و پەرهێزگار بێ و خۆی لە ڕیزی مردوان لە قەڵەم بدا و ئیمانی بە خوا و پێغەمبەر بێ و کردەوەی باش بوو، ئەوە خەڵات دەکرێ، لە دنیادا بە [بِالصِّدْقِ فِي ٱلْقَوْلِ، وَ الإِخْلَاصِ فِي الْعَمَلِ، وَ الرِزْقِ كَالْمَطَرِ، وَ الْوِقَايَةِ مِنَ الشَّرِّ] بە ڕاست گۆیی و بە ئیخلاسی لە عەمەلدا و بە رزقی حەلاڵ و لە شەڕ و ئاژاوە دەی پارێزێ. لە قیامەتیشدا خەڵاتدەکرێ بە [بِالْمَغْفِرَةِ ٱلْعُظْمىٰ، وَ الْقُرْبَةِ الزُّلْفىٰ وَ دُخُولِ جَنَّةِ ٱلْمَأْوىٰ، وَ اللُّحُوقِ بِـالدَّرَجةِ الْـعُلْيَا]، بـەڵێ خـۆشبوون و بـە نـزیک بوونەوە، لە خوا و بە چوونە ناو «جنةالمأوىٰ» و بە مەرتەبەی عولیا.

لە ئامۆژگاری یەکدا ڕووی کردە خەڵک و فەرمووی: ئەگەر دەتان هەوێ لە دەست و زمانی خەڵک ئەمین بن ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ بخوێنن. ئەگەر دەتان هەوێ لە تەنگ و چەڵەمە ڕزگار بن، ئیستیغفار زۆر بکەن. ئەگەر دەتان هەوێ

نەترسن، بلێن: [اَعُوذُ بِكَلِمٰاتِ ٱلتّٰامٰاتِ مِنْ شَرِّ غَضَبِهِ وَ مِنْ شَرِّ عِبٰادِهِ وَ مِنْ شَرِّ هَمَزٰاتِ ٱلشَّيٰاطِينِ وَ اَنْ يَحْضُرُونِ] فەرمووی: ئەگەر دەتان هەوێ دوعاتان گیرابێ، وەلامی بانگ دەری مزگەوت بدەنەوە. ئەگەر دەتان هەوێ خوا بەلاتان لە سەر لابەرێ، بلێن: ﴿إِنّٰا لِلّٰهِ وَ إِنّٰا إِلَيْهِ رٰاجِعُونَ﴾ ئەگەر دەتان هەوێ قەرزدار نەبن، بلێن: [اَللّٰهُمَّ إِنِّي اَعُوذُ بِكَ مِنَ ٱلْهَمِّ وَ الْحُزْنِ، وَ اَعُوذُبِكَ مِنَ الْعِجْزِ وَ الْبُخْلِ، وَ اَعُوذُ بِكَ مِنَ غَلَبَةِ الدَّينِ وَ اَعُوذُبِكَ مِنْ قهرِ ٱلرِّجالِ] ئەگەر دەتانهەوێ لە عەزابی قەبر رزگار بن، خۆتان لە پیسی و حەرام بپارێزن. ئەگەر دەتان هەوێ دەوڵەمەند بن، قەناعەت بکەن. ئەگەر دەتانهەوێ لە خەڵک چاکتر بن، چاکە لە گەڵ خەڵک بکەن. ئەگەر دەتان هەوێ ئیمانتان کامیل بێ، خولقتان خۆش بێ. ئەگەر دەتانهەوێ خوا خۆشی بوێن، یارمەتی خەڵک بدەن. ئەگەر دەتان هەوێ خوا غەزەبتان لێ نەگرێ، غەزەب لە کەس مەگرن. ئەگەر دەتان هەوێ قەرزتان لە سەر لاچێ، بلێن: [اَللّٰهُمَّ اكْفِنِي بِحَلاٰلِكَ عَنْ حَرٰامِكَ، وَ اغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواٰكَ] ئەگەر دەتان ئەوێ لە دین لا نەدەن، بلێن: [يٰا مُقَلِّبَ ٱلْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلىٰ دِينِكَ] ئەگەر دەتان هەوێ لە شەڕی زالم ڕزگار بن، بلێن: [اَللّٰهُمَّ إِنّٰا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِم وَ نَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِم] ئەوانەو دەیان ئامۆژگاری جوانیتری فەرمووە.

شێخ ئەبولعەبباسی مەرزی دەفەرموێ: «شێخ ئەبولحەسەن»، هەموو ساڵێک دەچوو بۆ حەج، دەفەرمووێ: لە ڕەمەزانی ساڵی شەش سەد و پەنجا و شەشی کۆچیدا، بە بەردەستەکەی گوت: پاچێک و چەند میتر خام و دەرزی و دەزو هەڵگرە، با بڕۆین بۆ حەج، خادیمەکەی زۆری لا سەیر بوو، گوتی: جا قوربان، بۆ حەج، ئەوانەمان بۆچین؟ فەرمووی: کوڕم تۆ نازانی، لە ڕێگادا لە سەحرای میسردا، کارمان پێ دەبێ، دەفەرموێ: کاتێ گەیشتنە سەحرای عیزاب، شێخ غوسلی کرد و دوو ڕکاتی نوێژ کرد و لە سوجدەی ڕەکاتی ئاخریدا وەفاتی فەرموو، پاچ و خام و شتەکەی فریا کەوت، هەر لەوێ تەسلیم بە خاکیان کرد.

ئەوە بوو بە کورتی، باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی «شێخ ئەبولحەسەنی شازلی»، لە خوای گەورە، داوا دەکەین عەفوومان کا. دۆعامان گیرا بکا. هیدایەتمان بدا. شیفای نەخۆشمان بدا. لە شەڕی شەیتان و بەلآی ناگەهان بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ اَلْسَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اَللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٤٦)

## باسی سەیید ئیبراهیمی دسوقی

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلىٰ أيادي مَنَّ بِها لَمْ تُحْصَ بِالتَّعدادِ
وَ صلواتٌ أشرَقَتْ أنوارُها ثُمَّ تَحايا عَبَقَتْ أَزهارُها
عَلىٰ الحبيبِ المصطفىٰ مُحَمّدٍ و آلِه الأشرافِ أهلِ الرَّشَدِ
وَ صَحْبِه الّذينَ هُمْ أناسٌ في الفضلِ لاٰ شَخْصَ بِهِمْ يُقاسُ

با دووباره بە ناوی خوا، لە چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینە مەجلیسی ئەو پیاوە، کە لە زەمانی خۆی دا یەکێک بوو لە ئەقتابی ئەربەعە و خاوەنی کەڕاماتی زاهیر بوو، دارای مەقاماتی فاخیرە بوو، ساحیب مەئاسیری تاهیرە و بە سائیری باهیرە و ئەحوالاّتی خاریقە و ئەنفاسی سادیقە و هیممەتی عالییە و ڕوتەبی سەنی یەو مەنازیری بەهی‌یە و ئیشاراتی نوورانی و نەفەحاتی ڕۆحانی و ئەسراڕی مەلەکوتی و موحازەراتی جەبەڕوتی بوو، لە حەقایقا دەستی بالاّی بوو، لە مەعاریفدا یەدی بەیزای بوو، ئەمیری زومرەی ئەولیا بوو، نگینی حەڵقەی فوقەڕا بوو، سالیکی بادی‌یەی تەجرید بوو، نوختەی دائیرەی تەوحید بوو، جا ئەو عالمە ڕەببانی‌یە، ئەو قوتبە نوورانی‌یە، جەنابی «شێخ سەیید ئیبراهیمی دسوقی»یە. با زۆر بە ئەدەب گوێ بگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاری یان لێ وەرگرین.

«شێخ ئیبراهیمی دسوقی» بە بیست و یەک پشت دەچێتەوە سەر حەزرەتی عەلی و یەکێک لەو چوار سەیدانەی کەمەشهورن بە ئەقتابی ئەربەعە کە بریتین لە شێخ عبدالقادری گەیلانی و سەید ئەحمەدی ڕەفاعی و سەید ئەحمەدی بەدوی و سەید ئیبراهیمی دسوقی. «سەید ئیبراهیمی دسوقی» خاوەنی عیلمی لەدونی بوو، ساحیب موحازراتی قودسی بوو، دارای ئەسراری عیرفانی بوو، دانا بە غەیبی‌یات بوو، زانا بە ئەنواعی لوغات بوو، زمانی تەیر و باڵندە و وەحشیان بوو، سەرچاوەی کەرامات و خارقی عادات بوو.

«شێخی دسوقی» زۆر فەرمایشتی جوان و پڕ مەعنای فەرموون، زۆر جاریش کە عەرزیان دەکرد: قوربان، ئامۆژگاری یەکمان بۆ بکە، لە وەڵامدا، ئەو شیعرە عەرەبی‌یەی دەخوێندەوە، کە بە کوردی مەعناکەی ئەوەیە: بە ئامۆژگاری من بە تەنیا، نابنە پیاوی چاک، تا خوو ئەخلاق و کردەوەتان چاک نەبێ. جا ڕووی دەکردە نەفسی خۆی و دەیگوت: تا تۆش ڕێگای پیاو چاکان ڕەچا و نەکەی، خۆت بە پیاو چاک لە قەڵەم مەدە، دەیفەرموو: ئەی نەفسی «ئیبراهیمی دسوقی»، زۆر ناشیرینە، دکتۆر خۆی نەخۆش بێ و دەرمان بدا بە خەڵک.

دەیفەرموو: ئەوەی بە ڕێبازی شەریعەتا نەڕوا، دڵ و دەروونی پاک نەبێ و شەریف و داوێن پاک نەبێ، ئەگەر لە خێزانی منیش بووبێ، ئەوە کوڕی من نیە، بەڵام ئەو مورید و سۆفی و دەروێشانەی کە بە شەرع ڕەفتار دەکەن و دیانەت و تەریقەت بە باشی دەبەن بەڕێوە و زوهد و تەقوایان هەیە و بە حەیا و بە ناموسن و تەماعیان نیە، ئەوانە هەموویان کوڕی منن، با خەڵکی دوورترین وڵاتیش بن.

ڕۆژێک خەڵکێکی زۆری لە خزمەتا بوو، ئامۆژگاری دەکردن ڕووی کردە خەڵکەکەو دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: بۆ خاتری خوا تکاتان لێ دەکەم، لە موحاسەبە و عەزابی خوا بترسن، ئێوە نازانن کە ئینسان وەک مەڕی بەردەمی چەقۆ وایە و بەرخی دابەسراوە، سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: ئەی ئەو

کەسانەی، کە تەنووری دۆزەخ بە دیار ئێوەوە گەرم کراوە و سوور بوەتەوە و چاوەڕوانی گۆشتی نەبرژاو دەکا، ئەی ئەو کەسەی کە کێردی ئەجەلت بۆ مشت و ماڵ تیژ کراوە و قاسید و جەللادی مەرگ چاوەڕوانی فەرمانی کوشتن و سەربڕینت دەکا و هاکا پەلاماری دای، لە کاتێکا کە دەیان ئیش و کارت هەیە و ئاگات لە خۆت نیە، فەرمووی: ﴿يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَ أَهْليكُمْ ناراً، وَ قُودُها النَّاسُ وَ الْحِجارَةُ عَلَيْها مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدادٌ﴾ خواوەندی گەورە لە ئایەتی شەشی سورەی تەحریمدا فەرموویەتی: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، خۆتان و ماڵ و منداڵتان، لە ئاگرێک بپارێزن کە دارو سووتەمەنیەکەی، لاشە و بەدەنی ئادەمیزاد و بەردی ڕەقە و کاربەدەستەکانیشی چەند مەلائیکەی بە توانا و خاوەن دەسەڵاتن و لە ئەمر و فەرمانی خوا لانادەن و ئەوەی ئەمری یان پێ بکرێ دەیکەن. فەرمووی جا پەنا بەخوا، دەبێ حاڵی ئەو کەسە چۆن بێ، کە خوای گەورە بە تووڕەییەوە ئەمر بکا بەو جۆرە مەلائیکەتانە و بفەرموێ: ئادەی بیگرن و بیخەنە جەهەننەمەوە! ڕاوی دەڵێ: کاتێ شێخ شەرحی ئەو ئایەتەی بەو جۆرە کرد، کەس خۆی بۆ ڕانەگیرا وەک لەو کاتەدا مردوێکی زۆر خۆشەویستیان مردبێ، دەستیان کرد بە گریان و تا سەعاتێک بێ دەنگی باڵی ڕەشی بە سەر مەجلیسەکەدا هێنا.

دەیفەرموو: ئینسان نابێتە پیاوچاکی تەواو، تا هەموو کەسی خۆش نەوێ و تا عەیبیان دانەپۆشێ و ڕەحمی دەرهەق نەبن، بەڵام ئەگەر خەڵکی ناخۆش ویست، ئەگەر ڕەحم و شەفەقەتی نەبوو، ئەگەر عەیبی خەڵکی بەیان کرد، ئەوە درۆ دەکا پیاو چاک نیە. فەرمووی: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئێوە ئینکاری پیاو چاکان مەکەن، لە سەر هەر حاڵەتێک بن و لە هەر بەرگ و لیباسێکدا بن و هەر جۆرە تەعامێک بخۆن، مەگەر بە ئاشکرا بێ شەرعیان لێ ببین، فەرمووی: چونکە ئینکاری پیاو چاکان وەحشەت دەگەیێنێ و وەحشەتێش دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوەی عەبد لە خوا.

دەيفەرموو: هەروەها با ئەو برايانەی خۆيان بە باش لە قەڵەم ئەدەن، ئاگايان لە خۆيان بێ، مەغروور نەبن. فەرمووی: ئەگەر لايان وايە بە ڕۆژوو بوون و نوێژيان كردووە و زەكاتيان داوە و چوونە حەج و چاكە و پياوەتيان كردووە، ئەوە ئـەو جۆرە كارانە هەموويان دەگەڕێنەوە سەر يارمەتی خوا، چونكە قازی و حاكم لە هەموو كار و كردەوە و چاكە و خراپەيەكدا هەر خوايە، تا ڕۆژی خۆی كـەس نازانێ داخۆ چی لێ وەرگرتووە يان نا، يان چی لە سەر لابردوە، يان چی لە سەر نووسيوە؟

دەيفەرموو: خواردنی ماڵی حەرام، دينی ئينسان سـووك دەكـا و كـردەوەی چاكی ئينسان فاسيد دەكا. هەروەها قسەی بێ شەرعی ئينسان لە كاروانی پـياو چاكان وەدوا دەخا و تێكەڵاوی لە گەڵ پياوی خراپ بەسەر و بەسيرەتت تاريك دەكا.

فەرمووی: خوا ئەو كەسەی خۆش دەوێ كە لە خوا بترسێ و دڵی پاك بێ و خەڵك لە دەست و زمانی ئەمين بن و يادی خوا بكاتەوە و سينگی فراوان بێ. ئەوەی بە ڕاستی خوای خۆش بـوێ، ئـەوە مـەلائيكەی ئـەرز و ئـاسمان، ئـەو كەسەيان خۆش دەوێ و ئەوەی بە ڕاستی ئيتاعەی خوا بكـا، ئـەوە ئـەجيننە و ئينسان ئيتاعەی دەكەن.

دەيفەرموو: ئەگەر يەكێك ئيجازەی ئيرشادی وەرگرتبوو، بەڵام لە سەر خوو ڕەوشتی پياو چاكان نەبوو، يان ئيجازەی مەلايەتی وەرگرتبوو، بەڵام عالم نەبوو، يان عالم بوو، بەڵام عەمەلی بە عيلمەكەی نەكرد، ئەوە ئەوەيان پياو چاك نيە و ئەمەيان مەلا نيە.

دەيفەرموو: قەسەم بە خوا، ئەگەر ئێوە بە ڕاستی ڕوو بكەنە خوا و لە ئەمر و فەرمانی خوا دەر نەچن، كارت بە پياوی چاك نابێ، بەڵام ئێوە بە دەيان دەرد و نەخۆشیيەوە، هاتوونە سەر ڕێگا و موحتاجی دكتۆرن.

كە تۆبەی موريدێكی دا. دەدان دەيفەرموو: كوڕی خۆم ڕێگای قورئان بگرە و

واجباتی دین بە جێ بێنە و چاوت لە ماڵ و تەماعی دنیا نەبێ و خوو ڕەوشتی پێغەمبەر ڕەچاو کە، دەیفەرموو: ئەگەر ئەوەشت پێ نەکرا وەدوای کردەوەی ئوستادەکەت کەوە، دەنا بە هیلاک دەچی. دەیفەرموو: چونکە تۆبە کردن خۆ هەر بە ئیجازە و قسە نابێ، دەبێ عەمەل و کردەوەی لە گەڵ بێ، دەیفەرموو: کوڕم، شێخ وەک دوکتۆر و حەکیم وایە، بۆ مورێد و مورید وەک نەخۆش وایە، جا ئەگەر نەخۆش بە قسەی دوکتۆر ڕەفتار نەکا، چۆن شیفای دێ و چاک دەبێتەوە؟!

دەیفەرموو: ئینسانی چاک دەبێ هەڵگری باری ئەزیەتی خەڵک بێ، لە بەر خاتری ڕەزای خوا، چونکە ئەو خەڵکە عەبدی خوایە، دەبێ ئەگەر لە ڕووی نەزانینەوە ئەزیەتیان دا عەفوویان کا، دەبێ قسەی بێ مەعنا نەکا، دەبێ زۆر خۆ ڕاگر بێ، دەبێ خولق و خووی زۆر خۆش بێ، دەبێ دەهندە و سەخی بێ، دەبێ چاوی لە ماڵی خەڵکەوە نەبێ.

دەیفەرموو: بەڵام ئەی هاوار بە ماڵم بۆ ئەم زەمانە، قەسەم بە خوا، ئەگەر تەمەن وەفای بکردایە، سەری خۆم هەڵدەگرت و دەچووم بۆ ئەو کێو و سەحرا و شیو و دۆڵە و خۆم لە خەڵکی ئەم زەمانە دەشاردەوە، چونکە پیاو لە ناو خەڵکی ئێستادا نازانێ چۆن بژی، دڵیان ڕەقە، ئارەزووی دنیایان زۆرە، ڕاستیان لا نەماوە، بێ باوەڕ بوون، شەو و ڕۆژ بە زۆری لە بێ ئەمری خوادان.

دەیفەرموو: تا شەریعەت شاهیدیت بۆ نەدا، کە تۆ ڕاستی، حەقت نیە ئامۆژگاری خەڵک بکەی، چونکە لێت وەرناگیرێ و سوودی لێ ناکەن، دەبێ دڵت لای خوابێ، جا قسەی زبانت دەچێتە دڵی خەڵکەوە. دەیفەرموو: بەدەن و لاشە و جەسەدی ئینسان، بریتی‌یە، لە دڵ و زمان و ئەندامەکانی‌تر، زمان و ئەندامەکان، مەلائیکەیان بە سەرەوەن و موحاسەبەیان دەکەن، بەڵام دڵی ئینسان، لە ژێر قودرەتی خوادایە، لە بەر ئەوەیە، کە عیلم و نفووسی پیاو چاکان فائیدە و بەرەکەتی زۆرترە، چونکە چاکە و کردەوەی پیاو چاکان بە دڵ و بە ئەندامە، بەڵام کردەوەی خەڵکی‌تر، هەر بە دەمە و دڵیان ئاگادار نیە. جا لە بەر ئەوەی دەبینی زۆر

کەسی وایە بە زاهیری زۆر خەریکی خوا پەرستی‌یە، کەچی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ عوجب و تەکەبووری زیاتر دەبێ.

دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، غەیبەت مەکەن، چونکە غەیبەت چاکەکانتان دەشواتەوە، ئەگەر هەر خۆشتان پێ ڕاناگیرێ، تکایە هەر غەیبەتی دایک و باوکی خۆتان بکەن، چونکە هیچ نەبێ ئەوان لە خەڵکیتر باشترن و خێر و چاکەکانتان باسەوابەکەیان بۆ ئەوان بڕوا باشترە. دەیفەرموو: تەماع دڵی ئینسان ڕەش دەکا و لە خوا پەرستی دوور دەخاتەوە و زۆر وایە بە هۆی تەماعەوە نامەی عەمەلی ئینسان بە گوناه پڕ دەبێتەوە. بە تایبەتی ئەم زەمانە، زەمانێکە دڵ ناڕەحەت کەرە و جەرگی ئینسان دەتوێنێتەوە و ڕێگا لە پیاو ون دەکا. دەیفەرموو: براکانم، عەزمتان جەزم بکەن و خەیاڵ و خەتەرە لە دڵی خۆتاندا دەڕاوێن و کار و باری خۆتان حەواڵە بە خوا بکەن و لە قسەی گەورە و ئوستادەکەتان لا مەدەن.

دەیفەرموو: بە تایبەتی ئەوانەی قورئانیان خوێندووە، ئاگیان لە خۆیان بێ و ئەو دەمە قورئانی پێ دەخوێنن، بە خواردنی حەرام و بە قسەی پڕ و پووچ و بە غەیبەت و باسی خەڵک پیسی نەکەن. دەیفەرموو: با ئەوانە بزانن، کە زۆر جار ئەو ئایەتەی سورەی نووریان خوێندۆتەوە، کە خواوەندی گەورە لەوێدا هەڕەشەی لە ئینسان کردووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ دەفەرموێ: بە ڕاستی ئەو کەسانەی قسە بەو ئافرەتانە دەڵێن، کە ئاگایان لە هیچ نیە و بوهتانیان بدەمەوە دەکەن، ئەو جۆرە کەسانە، لە دنیا و قیامەتا لەعنەتیان لێ کراوە. فەرمووی: ئەوەی قورئان خۆین بێ و بوهتان بە دەم خەڵکەوە بکا، و ئاگای لەو جۆرە ئایەتە نەبێ، وەک ئەوە وایە، کە بەعەمدی قورئان بخاتە ناو زەرفێکی پیسەوە. فەرمووی: عولەمای شەرعیش فەرموویانە: هەر موسوڵمانێک قورئان بخاتە ناو زەرفی پیسەوە، کافر دەبێ.

دیفەرموو: تا دەتوانن، هەوڵی زانیاری یەکی وابدەن، کە لە دنیا و قیامەت لە بەری وەحەسێن، دەیفەرموو: ئەگەر شتێکتان زانی مەڵێن: بەسمانە، تەماشای

ئایەتی سەد و چواردەی سورەی تاها بکەن، کە لەوێدا خوای گەورە بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿قُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾ ئەی محمد، بڵێ، ئەی خوای گەورەی مـن، عـیلم و زانـیاریم زیـاد کـە. فـەرمووی: پـێغەمبەر بـەو هـەموو عـیلمەوە، خـوا فەرموویەتی: داوای زانیاری لێ بکا، جا چۆن دەبـێ ئـێمەی نـەزان هـەوڵی بـۆ نەدەین؟!

دەیفەرموو: براکانم، ئاگاتان لە خۆتان بێ، ڕەفیقی خراپ تووشی خراپەتان نەکا، وە ئەگەر لە هاوڕێتان خراپەتان دی، ئامۆژگاری بکەن، بەڵام خـۆشی لێ بپارێزن، چونکە بە ڕاستی کەوتووینە زەمانێکەوە کەم کەسی وا هەیە، بە قسەت بکا و ئامۆژگاری وەرگرێ، فەرمووی: جاری وایە، ئەوەی ئامۆژگاری دەکـەی، ئەوە خراپەت لە گەڵ دەکا، ئەوەی تۆ دەتهەوێ بەرزی بکەیتەوە، ئەو لە عەرزت دەدا. فەرمووی: لە زەمانی پێغەمبەردا کە زەمانی سەعادەت بوو، مونافق و درۆزن زۆر بوون، جا دەبێ ئێستا کە دەور، دەوری درۆ و سیاسەتە چۆن بێ؟!

دەیفەرموو: دەبێ مـورید لە بـەر دەسـتی شـێخ داو قـوتابی لە بـەر دەسـتی مامۆستادا و کوڕ لە بەر دەستی باوک دا و شاگرد لە بەر دەستی وەستادا و بچووک لای گەورە وەک مردووی بێ حەرەکە وابن، بە تایبەتی ئوستاد وەک باوکی نەهێنی ئینسان وایە، دەبێ وەک باوک، بگرە لەویش زیاتر، حورمەتی لێ بگیرێ، چونکە باوکت بوەتە هۆی بەوەلەد بوونی تۆ، بەڵام ئوستادەکەت پێت دەگەیێنێ و ڕێگای ڕاستت نیشان دەدا. دەفەرمووێ: باوک و باپیرانی ئێمە، قەدر و حورمەتی پـیاو چاک و ئوستادیان زۆر لابووە، دەبێ چاو لە وان بکەین تا بە هرەمەند بین.

جا گوێ گرینە! هەروەک بۆم باس کردن، «شێخی دسۆقی» یەکـێک بـوو لە ئەقتابی ئەربەعە و کەشف و کەرامات و عیلم و زانیاری و زوهد و تەقوای زۆر بووە، لێرەدا بۆ نموونە یەکێک لە کەرامەتەکانی دەگێڕمەوە، کـە شـێخ یـوسفی خدری لە کتێبی [رَوضَةُ الناظِرَ]دا گێڕاویەتەوە، تا بزانن کە کەسێک بە ڕاستی خوا پەرست بێ، چۆن خوا فریای دەکەوێ و بێ دڵی نـاکـا، دەفـەرموێ: جـارێک

«شێخی دسۆقی» بە شاگردێکی دەڵێ: کوڕم، بچۆ لە ئەسکەندەریەوە لە فلان جێگا فلان شتمان بۆ بکڕە و زوو وەرەوە. دەڵێ: بەڵێ قوربان، شاگردەکە دەچێ بۆ ئەو جێگایە و لە شت کڕینەکەدا، لە گەڵ کابرای دووکاندار لێیان دەبێ بە هەرا و کابرای دوکاندار دەچێ بۆ لای قازی شکایەتی لێ دەکا و دەی بەن بۆ لای قازی، قازیش لەو کاتەدا یەکێک دەبێ لەوانەی کە دوژمنی شێخ و ئەولیا و پیاو چاکن، ئەمر دەکا کوڕەکە بەرنە بەردەمی قازی، لە پاش ماوەیەک قازی سەر بەرز دەکاتەوە و بە تووڕەییەوە تەماشایەکی دەکا و دوو سێ شەقە زللەی لێ ڕادەکشێ و دەڵێ: بی بەن بۆ بەندیخانە حەبسی بکەن، گورج بە ئەمری قازی کوڕە پەل بەستوو دەکەن و دەی بەن بۆ زیندان، کوڕەکە لە بەندیخانەوە تەواوی کارەسات و بەسەرهاتی خۆی بۆ شێخ دەنێرێتەوە و دەڵێ: قوربان فریام کەوە، کاتێ خەبەری گرتنی بە شێخ دەگا، شێخ زۆر ناڕەحەت دەبێ و لە نامەیەکدا ئەو شیعرە بۆ قازی دەنووسێ و بۆی دەنێرێ، دەفەرموێ:

سِهامُ اللَّيلِ سائِبَةُ المَرامِي … إذا وُتِرَتْ بِأَوْتارِ الخُشُوعِ
يُقَوِّمُها إلىٰ المَرْمىٰ رِجالٌ … يُطِيلُونَ السُّجودَ مَعَ الرُّكوعِ
بِأَلْسِنَةٍ تَهُمُّ في دُعاءٍ … بِأَجْفانٍ تَفِيضُ مِنَ الدُّمُوعِ
إذا وَتَرْنَ ثُمَّ رَمَيْنَ سَهْماً … فَمَا يُغنِي التَّحَصُّنُ بِالدُّروعِ

نووسی بوی: ئەی قازی، وریا بە، ئەو تیرەی لە شەوا بهاوێژرێ، بە خەتەر ناچێ و دەدا لە هەدەف، ئەگەر بە ژێ و کەوانی خشوع و خوزوعی باوێژن و لە لایەن کەسانێکەوە بێ کە درێژە بە سوجدە و ڕکوع دەدەن لە نوێژدا و بەو زمانەی کە دۆعای پێدەکەن و بەو پێڵوە چاوانەی کە فرمێسکی پەشیمانی دەڕێژن. نووسی بووی، کوڕە ئەگەر هاوێژرا، تازە بە زرێی ئاسن و پۆڵاش ناتوانی بەرگری لێ بکەی، جا تکایە، تا ئەو تیرەمان نەهاویشتووە ئەو کوڕە بەر بدە.

کاتێ ئەو نامەی شێخ گەیشتە دەستی قازی و خوێندیەوە، تەواوی کاتب و خەڵکی دەورو بەری کۆ کردەوە و گوتی: تەماشا بکەن، ئەو سەیدە کە خۆی بە

ئەولیا دەزانێ چی نووسیوە؟ جا زۆری جنێو بەو کەسەدا کە نامەکەی هێنابوو، جا دووسێ قسەی ناشیرینی بە شێخ گوت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی نامەکەی شێخ بۆ خەڵکەکە و بە گاڵتەو پێکەنینەوە شێعرەکانی بۆ دەخوێندنەوە، تا گەیشتە ئەو شێعرە کە شێخ نووسی بووی، کە پیاوی خوا تیری توورەیی هاویشتە کەوان لە هەدەف دەدا و کاری خۆی دەکا وْ ناگەڕێتەوە، دەڵێ بە ئەمری خوا تیرێکی زۆر تیژ لە پاکەتی نامەکە دەرپەری و لە سینگی قازی دا و لەپشتی تێپەڕی و کوشتی. پەنا بە خوا لە بێ باوەڕی بە ئەولیای خوا، خەڵکەکە کە ئەوە کەرامەتەیان چاو پێکەوت، شادە و ئیمانێکی بەهەقیان هێنا و گورج چوون پیاوەکەی شێخیان لە بەندیخانە ئازاد کرد و لە گەڵ ئەوەی نامەکەی هێنابوو خەڵاتیان کردن و زۆر بە حورمەتەوە ڕەوانەیان کردنەوە. جا ئەوەیە کە گوتوویانە دەخیلە قەت خۆت مەکە بە سپەری تیغی پیاو چاکان، چونکە کە هاوێژرا کاری خۆی دەکا.

ئەوە بوو بە کورتی باسی ژیان و بە سەرهات و کەشف و کەرامات و ئامۆژگاری‌یە جوانەکانی «شێخ سەید ئیبراهیمی دسوقی»، کە یەکێک بوو لە ئەقتابی ئەربەعە و ئەولیای خوا کە لە ساڵی شەش سەد و حەفتا و شەشی کۆچیدا لە تەمەنی چل و سێ ساڵیدا وەفاتی فەرموو. ئومێد دەکەم سوودی بووبێ و لە خوای گەورە داوا دەکەین کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەر و حورمەتی پیاو چاکان لێمان خۆش بێ. ئیمانمان سەلامەت بێ و لە تیری توورە بوونی پیاو چاکان بە دوورمان کا. زەلیلمان نەکا. عیبادەتمان قبوڵ کا. لە بەلا و موسیبەتی دنیا و قیامەت بمان پارێزێ و لە خزمەت «پێغەمبەر» و پیاو چاکاندا حەشرمان بکا. ئامین.

وَ صَلىٰ اَللهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ السَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٤٧)

## باسی سەیید ئەحمەدی بەدەوی

﴿ بِسْمِ ٱللهِ ٱلرَّحْمٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

اَلْحَـــمْدُ لِــلْمُهَيْمِنِ الْـفَتّاحِ مُصَرِّفِ الْقُلُوبِ وَ الرِّيـاحِ
وَ أَفْضَلُ الصَّلاٰةِ وَ التَّحايا عَـــلىٰ ٱلنَّبي سَـيدِ البرايٰـا
وَ آلِهِ الْمَزيدِ فَـضْلُهُمْ عَـلىٰ سِواٰهُمُ وَ صَحْبِهِ ذَوي العُلا

گوێ گرینە، با دو بارە وەکو مەجلیسەکانی ڕابردوو، لە چەند دەقیقەی داهاتووی تەمەنماندا، بچینەوە کۆڕ و مەجلیسی یەکێک لە ئەولیای خوا و بە تایبەتی یەکێک لەو چوار زاتەی کە زۆربەی زاناکان بە ئەقتابی ئەربەعەیان ناو بردوون و داوای دۆعای بە خێریان لێ کردوون. جا گلۆپ و چرای ڕووناک کەرەوەی ئەم مەجلیسەمان، یەکێکە لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی ویلایەت، مەلەوانێکە، لە مەلەوانەکانی بەحری دیرایەت، سەوڵ لێدەرێکە، لە لێ خوڕانی کەشتی شەریعەت، سانقێکە لە سایقەکانی پاپۆڕی تەریقەت، شاسوارێکە لە چابووک سوارەکانی مەیدانی مەعریفەت، گلۆپێکە لە چڵ چرای نووری ڕیسالەت، قوتبێکە لە ئەولادی ئیمامەت، جا ئەو جگەر گۆشەی ئەولادی مستەفەوی یە، جەنابی «سید ئەحمەدی» بەدەوی یە. با زۆر بە ئەدەب و بە گوێی دڵ گوێ ڕابگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و کەشف و کەڕامات و فەرمایشتەکانی و پەند و ئامۆژگاریان لێ وەرگرین.

«سەید ئەحمەدی بەدەوی» کوڕی سەیید عەلی، کوڕی سەیید ئیبراهیمی، کوڕی محمدی کوڕی ئەبووبەکری، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی عومەری، کوڕی عوسمانی، کوڕی حسینی، کوڕی محمدی، کوڕی مووسای، کوڕی یەحیای، کوڕی عیسای، کوڕی موحەممەدی، کوڕی حەسەنی، کوڕی جەعفەری، کوڕی مووسای، کوڕی ئیمام جەعفەری، کوڕیم ئیمام محمد باقری، کوڕی ئیمام عەلی زین العابدینی، کوڕی ئیمام حوسەینی، کوڕی حەزرەتی عەلی‌یە و لە شاری «فاس»ی ولاتی مەغریب لە دایک بووە، چونکە با پیرە گەورەی لە زەمانی حەجاجی سەقەفیدا، کە ئەولادی پێغەمبەری دەکوشت، چوو بۆ ئەو ولاتە.

کاتێ «سەید ئەحمەدی بەدەوی» تەمەنی بوو بە حەوت ساڵ، شەوێک باوکی خەونی دی، لە خەونەکەیدا پێیان گوت: بەیانی بە خۆت و ماڵ و منداڵەوە بڕۆ بۆ مەکە و ئەم ولاتە بە جێ بێڵە، چونکە ڕووداوێکی زۆر موبارەکو گرینک چاوەڕوانتان دەکا، لە ساڵی شەش سەد و سێی کۆچیدا ئەو خەونەی دی.

سەید حەسەنی برای «سەید ئەحمەد» دەڵێ: باوکم و دایکم و چوار خووشک و سێ برا وەڕێ کەوتین، لەو دێ بۆ ئەو دێ و لەو شار بۆ ئەو شار و لەو ڕەشماڵە بۆ ئەو ڕەشماڵ بە ناو هۆز و عەشایری عەرەبدا هاتین، زۆریان حورمەت لێ گرتین، لە پاش چوار ساڵ گەیشتینە شاری مەکە، لە شاری مەکە ماینەوە، زۆر بە خۆشی ژیاین و حەجمان کرد و حورمەتمان زۆر بوو، تا باوکم لە ساڵی شەش سەد و بیست و حەوتدا، وەفاتی کرد و لە گۆڕستانی موعەللا، تەسلیم بە خاکمان کرد. دەفەرموێ: «سەید ئەحمەد» تەمەنی لە من کەمتر بوو، بەلام، زۆر لە ئێمە شوجاعتر و ئازاتر و سوارچاک بوو، لە ناو سوار چاکەکانی مەکەدا، ڕەقیبی نەبوو، دەفەرموێ: ناردم بۆ قوتابخانە قورئانی خەتم کرد، بەلام بە ئەمری خوا، حاڵەتێکی بەسەردا هات، حاڵی گۆڕا و لە خەڵک دوور کەوتەوە و بە تۆبزیش قسەی نەدەکرد، ئەگەر قسەشی بکردایە، یان پرسیارێکی لێ بکرایە، بە ئیشارە

وەڵامی دەدایەوە و قسەکەی دەکرد.

تا ساڵی شەش سەد و سی و سێی کۆچی، لە شەوی یازدەی مانگی موحەڕڕەمدا خەونی دی، لە خەوی دا، سێ جار پێیان گوت: کاری تۆ لێرە نەماوە، بەیانی بەرە و ڕۆژهەڵات برۆ، دوو سێ شەو لە سەریەک، ئەو خەونەی دی، ئاخری ناچار بوون، لە گەڵ سەید حەسەنی برای وەڕێ کەوتن، هاتنە بەغدا، لەو کاتەدا دوو قوتبی گەورەی ئوممەتی پێغەمبەر (درووی خوای لە سەر بێ) «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» و «شێخ عبدالقادری گەیلانی» لە بەغدا بوون، زۆریان بە خێر هاتن کردن و زۆریان حورمەت لێ گرتن و گوتیان: ئەی «ئەحمەدی بەدەوی»، کلیلی عێراق و یەمەن و هیندوستان و ڕۆم و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، لە بەردەستی ئێمەدایە، کوێ داوا دەکەی تا پێشکەشت بکەین، لەوەڵامدا فەرمووی: پێویستم بە کلیلی ئێوە نیە، من میفتاح لە فەتتاح نەبێ وەرناگرم.

سەید حەسەن دەفەرموێ: لە بەغدا زیارەتی گۆڕی ئەولیاکانمان کرد و لە پاشان چووین بۆ ناوچەی ئومو عوبەیدە، کە ئێستا دەبێتە شاری عەممارە و دەوروبەری و یەکێکە لە لیواکانی عێراق. دەفەرموێ: من گەڕامەوە بۆ مەکە و «سەید ئەحمەد» چوو بۆ لای ئافرەتێک بە ناوی فاتیمە، کە لەو کاتەدا لەو ناوچەیە بە ناو بانگ بوو، زۆر زانا بوو، سەلبی ئەحواڵی لە پیاو چاکان دەکرد، بەڵام کاتێ «سەید ئەحمەدی بەدەوی» تەماشایەکی کرد و تەوەجوهێکی لێ کرد، هیچی لا نەما و هات لە سەر دەستی «سەید ئەحمەد» تۆبەی کرد و تەواوی موریدە و مەنسووبی ئیزن دان و خۆی بوو بە موریدی «سەید ئەحمەدی بەدەوی» پێی دەڵێ: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر دیاری یە، لە ناو هەموو ئەولیادا و ئەوەی لەو کاتەدا [illegible] بەو بە سەرهات و کارەساتەی زانی.

ئنجا شەوێک دووبارە خەونی دی، لە خەوەکەیدا پێیان گوت: ئەی «ئەحمەدی بدوی»، کار و واجبی تۆ لە عێراق نەماوە برۆ بۆ شاری تەنتا، لە وڵاتی میسر،

جێگای تۆ لەوێ دیاری کراوە و چەند پیاوی گەورە و ئەولیای خوا، لە سەر دەستی تۆ پێ دەگەن، وەکوو «عبدالعال» و «عبدالوهاب» و «عبدالمجید» و «عبدالمحسن» و «عبدالرحمن» و چەند کەسی تر، (ڕەزای خوایان لێ بێ).

لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی شەش سەد و سی و چواری کۆچیدا ئەو خەونەی دی و تەشریفی ڕۆیشت بۆ وڵاتی میسر و چو بۆ شاری تەنتا، کەچوە ناو شار، یەکسەر چوە سەر بانی ماڵی شێخ شوحەیت و ڕووی کردە ئاسمان و دانیشت. شەو و ڕۆژ بۆ کاری تایبەتی نەبوایە، نەدەهاتە خوارەوە و خەو خواردنی نەمابوو، چاوی وەک پشکووی سور، سور هەڵگەڕابوون، تا ماوەی چل ڕۆژ بەو حاڵە مایەوە، لە پاشان هاتە خوارێ و چوو بۆ ناحیەی فیسامنارە و دەتگوت شێتە، لەوێ منداڵە وردکە وەدوای دەکەوتن بە شێتە شێتە. دوان لەو منالآنە، «عبدالعال» و «عبدالمجید» بوون. کە لە خەونەکەیدا، پێیان گوتبوو «عبدالعال» و «عبدالمجید» لە سەر دەستی تۆ دەبنە ئەولیای خوا.

ڕاوی دەڵێ: لە بەر ئەوەی ئەو ماوەیە نەنووستبوو، تووشی چاو ئێشە ببوو. چاوی سور هەڵگەڕا بوون. لەو کاتەدا کە منداڵەکان گاڵتەیان پێ دەکرد، ڕووی کردە ئەو منداڵە کە ناوی «عبدالعال» بوو گوتی: کوڕم بچۆ لای دایکت هێلکەیەکم بۆ بێنە، با بیکەمە چاوم، عبدالعال گوتی: ئەو جەریدە سەوزەم بدەیە با بچم بۆت بێنم، شێخ جەریەدەکەی دایە و «عبدالعال» چوو بۆ ماڵەوە بۆ لای دایکی و گوتی: دایە، شێتێکی بە دەوی هاتووە، چاوی دێشێ، ئەو کاغەزەشی دامێ، گوتی: بچۆ لە لای دایکت هێلکەیەکم بۆ بێنە تا بیکەمە چاوم، دایکی سوێندی خوارد و گوتی: واللە ڕۆڵە هێلکەمان نیە. عبدالعال هاتەوە گوتی: دایکم دەڵێ: هێلکەمان نیە. شێخ فەرمووی: ڕۆڵە! بچۆ بە دایکت بڵێ: دایە، لەو هێلکانەی کە لە ژووری پەرستشگا کە دان، هێلکەیەکم بدەرێ با بۆی بەرم. «عبدالعال» هاتەوە بۆ لای دایکی و گوتی: دایە کابرای شێتە ئاوای گوتووە، دایکی قسەکەی لا سەیر بوو، چوو تەماشای

کرد، پڕە لە هێلکە، دایکی ئەوەندەی‌تر سەرسام بوو، نەیدەزانی چ باسە، هێلکەیەکی دایە و هێنای بۆ لای شێخ. «عبدالعال» لەوەوە خوی بە شێخەوە گرت و نەدەچووەوە بۆ ماڵەوە، هەرچەند دایکی بانگی دەکرد، وەڵامی نەدەدایەوە، دایکی توورە دەبوو دەیگوت: تەماشا ئەو کابرا بەدوی‌یە چ بەڵایەک بوو بۆ ئێمە، ئەو کورەی چۆن لێ بەدخو کردم، ڕۆژێک فەرمووی: ئەگەر دایکی «عبدالعال» بیگوتایە ئای ئەو کابرایە چ بەرەکەتێک بوو بۆ ئیمە، ئەوە ڕاستی دەکرد. فەرمووی: بچن بە دایکی «عبدالعال» بڵێن، ئەو کابرایە دەڵێ: لە شاخی گاکەوە، کوڕەکەی بۆتە کوڕی من.

جا با قسەتان بۆ بکەم کە حیکایەتی گاکە چۆن بووە. بە مەزەندە کاتێ دایکی عبدالعال، عبدالعالی بە بەرەوە دەبێ، ڕۆژێک دەچێ کا، بۆ گاو و مانگاکانیان تێکا، عبدالعال لە ناو ئاخورەی وەڵاغەکاندا دادەنێ تا کایەکە تێکا، لە نکاوێک گایەک سەردادەنەوێنێ بۆ کا خواردن و شاخی دەپەڕۆی «عبدالعال»ەوە دەگیرێ و وەسەر شاخانی داوێ و دەردەپەڕێ و بە کەس ناگیرێتەوە، لەو کاتەدا «سەید ئەحمەدی بەدەوی» لە ئومو عوبەیدەی عێراق دەبێ، ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا لەوێوە دەست دەبا و بە سپاوی کوڕەکە لە سەرشاخی گاکە دێنێتە خوارەوە و لە بەردەمی دایکی دای دەنێ.

جا دایکی کە ئەو قسەی «سەید ئەحمەدی» پێ دەڵێن، دەست دەکا بە گریان و دەڵێ: بەڵێ ڕاستە، نەک هەر «عبدالعال»، بەڵکوو خۆم و ماڵ و منداڵ و سەرووەت و سامانم هەمووی بە فیدای سەعاتێکی ئەو بن، ئەویش هەڵدەستێ دێتە خزمەتی و دەبێتە موریدی.

ڕاوی دەڵێ: کاتێ «سەید ئەحمەدی بەدەوی» هاتە شاری تەنتا، تەنتا چەند پیاوی گەورە و ئەولیای خوای لێ بوو، یەکێک لەوان شێخ حەسەنی سائغ بوو. فەرمووی: کوڕینە، خاوەنی وڵات هات، تازە ئێمە لێرەدا جێگامان نابێتەوە، هەستا

ڕۆیی بۆ ناحیەی «ئینجا» و شێخ سالمی مەغریبی، سەری تەعزیمی بۆدا دەنەوێنێ، بەڵام یەکێک لە پیاو چاکان بە ناوی «وجەالقمر»، شەیتان بە سەهۆی دەبا و خۆی تەسلیمی ئەمر و قەزا و قەدەری خوای گەورە ناکا و حەسوودی بە «سەید ئەحمەد» دەبا، سەلبی ویلایەتی لێ دەگرێتەوە، پەنا بە خوا، لە ئاخریدا زۆر بە ناڕەحەتی دەمرێ.

ئەو کاتەدا مەلیکی میسر، مەلیک زاهیری بیبریس بوو، زۆری عەقیدە بە «سەید ئەحمەدی» بەدەوی بوو. کاتێ خەبەری هاتنی «سەید ئەحمەدی» زانی، بە خۆی و وەزیر و وزەراوە هاتە خزمەتی و خواوەندی گەورەش بە هۆی ئەوەوە کە مەلیک زاهیر، زۆری حورمەت لە پیاوی خوا و عالمان دەگرت، تەرەقی پێدا و فتوحاتێکی زۆری کرد.

«سەید ئەحمەدی» بەدەوی، دارای مەقامی قوتبیەت و خاوەن کەشف و کەرامات بوو، بۆ نموونە یەکێک لە کەراماتەکانی ئەوە بوو کە شێخ «تقیالدین» کە مەشهور بوو بە «ابن دقیق العید» لەو کاتەدا، قازی قوزات بوو، لە وڵاتی میسر، کاتێ دەنگ و باسی «سەید ئەحمەدی» بە دەوی پێ گەیشت و باسی ژیان و کەشف و کەرامات و کردەوەی «سەید ئەحمەدیان» بۆ کرد، بە دڵی خۆی لێ ڕازی نەبوو، هەستا لە قاهیرەوە لەگەڵ چەند قازی و زانای تردا چوو بۆ تەنتا، بۆ لای «سەید ئەحمەدی بەدەوی»، بۆ تاقی کردنەوەی، لە پاش بە خێرهاتن و ئیسراحەت، ڕووی کردە «سەید ئەحمەد» و گوتی: یا شێخ، ئەوەی بۆ منیان گێڕاوەتەوە لە کردەوەی تۆ باش نیە و زۆر موخالیفی شەریعەتی ئیسلامە، گوتی: تۆ کە داوای ویلایەت دەکەی، نابێ کردەوەت موخالیفی شەرع بێ، گوتی: دەڵێن یان هەر نوێژ ناکەی، یان ئەگەر بیشی کەی قەت بە جەماعەت نایکەی، گوتی ئەوە ڕێبازی پیاو چاکان نیە، کاتێ قازی ئەو قسانەی کرد، «سەید ئەحمەد» ڕووی تێ کرد و فەرمووی: قازی، بێ دەنگ بە، دەنا تۆزی ئاردەکەت بە هەوا هەڵلا

دەبەم، چونکە قازی مەشهور بوو بە «ابن دقیق»، واتە کوڕی ئارد.

ڕاوی دەڵێ: هەر بەو کەلیمە قسە، قازی بێ هۆش کەوت و ئاگای لە مەجلیسەکە نەما، وای زانی لە جەزیرەیەکی چۆڵ و پان و بەریندایە و کەسی لە لا نیە، بۆ خۆی لە دڵی خۆیدا لۆمەی خۆی دەکرد و دەیگوت: ئەی بێ عەقڵ تۆ چ کارت بەسەر کاری ئەولیا و پیاو چاکەوەیە؟ هەر لە بێ هۆشییەکەیدا دەستی کرد بە گریان و دۆعا و پاڕانەوە، لە نکاوێک پیاوێکی بە سام و هەیبەت و باویقار بەرە و ڕووی هات و سەلامی لێ کرد و گوتی: ئەوە چی دەکەی لەم جەزیرەدا و چیت لێ قەوماوە؟ حیکایەتی خۆی و «سەید ئەحمەدی» بۆ گێڕایەوە و گوتی: دەخیلتان بم فریام کەون و لەو حاڵە ڕزگارم کەن.

کابرا گوتی: هەستە بڕۆ بۆ لای ئەو گومەز و مزگەوتە دانیشە، تا «سەید ئەحمەدی بەدەوی» بۆ جەماعەتی نوێژی عەسر دێ بۆ ئەوێ لە گەڵ چەند ئەولیا، لە پاش نوێژەکە، ئەولیاکان ڕۆیشتن، بچۆ دەستی ماچ کەو تۆبە لە سەر دەستی بکە، کە جارێکی تر قەت ڕەخنە لە ئەولیای خوا نەگری، گوتی: مەترسە، تۆبەکەت قبوڵ دەکا و دەت باتەوە جێگای خۆت، هەر لە بێ هۆشی یەکەیدا هەڵدەستێ و دەچێ و کۆمەڵێک دێن، «سەید ئەحمەد» دەبێ بە ئیمامیان، جەماعەتیان بۆ دەکا و ئەوان دەڕۆن و قازی دەچێ دەستی ماچ دەکا و «سەید ئەحمەد» دەفەرموێ: ئەوا عەفووم کردی، بەڵام جارێکی‌تر کارت بە سەر کاری ئەولیاوە نەبێ، کە چاو هەڵدێنێ بە ڕیوایەتێک دەڵێن: لە میسر، لە بەر دەرگای ماڵی خۆیان چاوی بە خۆی دەکەوێتەوە و تا ماوەیەک لە ژوور نایەتە دەرەوە. لە پاشان کە خەڵک لە قازیان دەپرسی و دەیان گوت: ئەرێ قوربان، «سەید ئەحمەد بەدەوی» دەرەجەی چۆنە؟ لە وەڵامدا دەیگوت: دەریایەکی بێ بنە.

بەڵێ «سەید ئەحمەدی بەدەوی» بە زاهیر لە ساڵی شەش سەد و حەفتا و پێنجی کۆچیدا لە دنیا دەرچوو وەفاتی فەرموو، بەڵام هەروەک خوای گەورە لە

ئایەتی شێست و چواری سورەی یونس‌دا فەرموویەتی: ﴿لَهُمُ الْبُشْرىٰ فِي الْحَيٰوةِ الدُّنْيا وَ فِي الآخِرَةِ﴾ ئەولیای خوا لە دنیا و لە قیامەت مژدەیان پێ دراوە، ئەوەی لە دنیا کردوویانە، لە دوای مردنیشیان خوا بۆیان دەکا و هەروەک لە حاڵی حەیاتا کەشف و کەراماتیان هەیە، لە پاش مردنیش بێ ئاگا نین.

بۆ نموونە دەڵێن: خەڵکی شاری تەنتا و دەور و بەری، لە پاش وەفاتی «سەید ئەحمەدی بەدەوی» کردبوویان بە عادەت، هەموو ساڵێک کۆ دەبوونەوە و دەچوونە سەر مەرقەدی و مەولوودیان دەکرد، یەکێ لە زانایانی ئەو سەردەمە بە ناوی ئیبنولەبان زۆری پێ ناخۆش بوو، زۆر مونکیری ئەو مەولوودی‌یەو ئەو کۆبوونەوە بوو، تا بۆی بکرایە خەڵکی مەنع دەکرد کە بچن بۆ سەر مەولوودی‌یەکە. ڕاوی دەڵێ: ڕۆژێک باسی ئەو مەولوودەی دەکرد، حاڵەتێکی بە سەرداهات، فاتیحا و قورئانی لە بیر چووەوە، ناچار بوو، هەستا چوو بۆ لای شێخ یاقووتی عەرشی، کە یەکێک بوو لە پیاو چاکانی ئەو کاتە و باسی خۆی بۆ گێڕایەوە، شێخ یاقووت لە گەڵی هات بۆ سەر مەرقەدی «سەید ئەحمەدی بەدەوی» و داوای عەفووی بۆ کرد، دەڵێن: بە ئەمری خوا دەنگێک لە گۆڕەکەیەوە هات و گوتی: ئەی یاقووتی عەرشی، ئەوا بەخشیمان ئەگەر جارێکی‌تر نەگەڕێتەوە سەر ئەو بیرو باوەڕە، پێشی بڵێ: ئەگەر ڕەخنەی لە مەولوودی‌یەکە هەر ئەوەیە کە ژن و پیاو تێکەڵ دەبن، خۆ لە تەوافی کەعبەشدا، ژن و پیاو کۆ دەبنەوە، فەرمووی: بەڵام بە گەورەیی خوا، هەر پیاو و ئافرەتێک تا ئێستا هاتبێتە سەر مەولوودی من، خوداوەندی گەورە هیدایەتی داوە و تۆبەی بە نسیب کردووە و گەڕاوەتەوە. دەڵێن: هەر لە سەر مەرقەدی «سەید ئەحمەد» زاناکە تۆبەی کرد و چووەوە سەر حاڵەتی تەبیعی جارانی و لە پاشان شێخ یاقووت، کچەکەی خۆی لێ مارە کرد و لە ئاخریدا بوو بە یەکێک لە ئەولیای خوا.

هەروەها شێخ محمدی شەناوی دەڵێ: شێخ ئەبولغەیس، یەکێک بوو لە

عالمەکانی گەورەی قاهیرە و بە زاهیری پیاوێکی زۆر سالح بوو، جارێک دەچێ بۆ شاری بولاق، تەماشا دەکا زۆربەی خەڵکی ئەو شارە خۆیان ئامادە کردووە برۆن بۆ سەر مەولوودی «سەید ئەحمەدی بەدەوی»، زۆری لا سەیر بوو، گوتی: تەماشای ئەو خەڵکە، چۆنیان خۆ شێت کردووە، قەت بۆ مەولوودی پێغەمبەر ئاوا کۆبوونەوە؟ یەکێک عەرزی دەکا و دەڵێ: قوربان، ئاخر «سەید ئەحمەد» زاتێکی زۆر گەورە بووە، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: بەڵێ گەورە بووە، تازە ئەو مردووە، ئێستا لەو مەجلیسەی ئێوەدا هەیە مەقامی لەو بالاترە. دەڵێن: لە دوای ئەو قسەیە کابرایەک نیوەڕۆ دەعوەتی کرد و خواردنەکەیان ماسی بوو، بە ئەمری خوا ئەووەڵ پارو خواردی، درکێکی لە قورگ گیرا و بە هیچ جۆرێک بۆیان دەرنهاتەوە، تا نۆ مانگ پێیەوە تلایەوە و خەو خواردن و خواردنەوەی لێ هەڵگیرابوو، خوای گەورە لە بیری بردبوەوە کە ئەوە بە هۆی ڕەخنە گرتن لە «سەید ئەحمەدی بەدەوی»یەوە تووشی ئەو دەردە بووە، کاتێ کەوتەوە یادی، گوتی: هەڵمگرن و بمبەن بۆ سەر مەرقەدی «سەید ئەحمەدی» بەدەوی، کاتێ بردیان، لە سەر گۆڕەکەی دەستی کرد بە گریان و خوێندنی سورەی یاسین، دەڵێین: بە ئەمری خوا هێشتا سورەی یاسینی تەواو نەکردبوو، کە درکە ماسی یەکە، لە قورگی دەرپەری بە خوێنەوە، کاتێ ئاویان بۆ هێناو دەمی شتەوە، نە ئازاری ماو نە برینی پێوە ما، ڕووی کردە مەرقەد و گوتی: «یا سیدی»، تۆبە، کە من جارێکی‌تر ڕەخنە لە ئەولیا بگرم.

شێخی ئیبنو حەجەر، دەفەرموێ: بەڵێ «سەید ئەحمەدی بەدەوی» زاتێکی زۆر گەورە و خاوەن کەرامات بووە. دەفەرموێ: جارێک کابرایەک بە لایدا دەڕوا، گۆزەڵە شیرێکی بە دەستەوە دەبێ، «سەید ئەحمەد» تەماشای دەکا و بە قامک نیشارەیەک بۆ لای گۆزەڵەکە دەکا، گۆزەڵەکە دوولەت دەبێ و شیرەکە دەڕژێ و مارێکی تۆپیوی تێدا دەبێ.

یەکێ لە پیاو چاکان دەفەرموێ: لە خەوا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم، فەرمووی: وڵاتی میسر لە دوای محمدی شافیعی، لە ناو ئەولیادا لە «سەید ئەحمەدی بەدەوی» گەورەتری لێ نەبووە.

هەروەها خاوەنی شەرحی قەسیدەی بوردییە، شێخ عەدەوی دەڵێ: کۆمەڵێک زانای میسر فتوایان دا، کە مەولوود لە سەر مەرقەدی «سەید ئەحمەد» بەتاڵە، چون داوایان لە شێخ یەحیای مەناوی کرد کە فتوا نامەکەیان ئیمزا بکا، وەلامی نەدانەوە، چوون بە سوڵتان مەلیک زاهریان گوت، بانگی بکا و پێی ئیمزا بکا، سوڵتان ناردی و هات داوای لێ کرد ئیمزای بکا، فەرمووی: من ناتوانم بڵێم مەولوودی بەتاڵە، بەلام دەڵێم دروست نیە لە سەر مەولوودی بێ شەرعی بکرێ، سوڵتان گوتی: ئەی ئەو مەلایانە بۆچی گوتوویانە بەتاڵە؟ ئیمام یەحیا فەرمووی: «سەید ئەحمەدی بەدەوی» زاتێکی زۆر گەورە بووە، ڕەخنەی لێ ناگیرێ، زۆری پێ ناچێ ئەوانە تووشی نارەحەتی دەکا.

پەنا بە خوا لە تووڕە بوونی ئەولیا! زۆری نەخایاند ئەو مەلایانە تووش بوون، یان لە وەزیفە دەرکران، یان نەفی کران، یان خرانە بەندیخانە.

ئەوە بوو بە کورتی، باسی ژیان و بە سەرهات و کەشف و کەراماتی «سەید ئەحمەدی بەدەوی»، ئومێد دەکەم لەم چەند دەقیقەی گوێ گرتنەدا کاتێکی خۆشتان و بردبێتە سەر و سوود و پەند و ئامۆژگاریتان لێ وەرگرتبێ.

لە خواوەندی گەورە داوا دەکەین، ئیمانمان سەلامەت کا. عەقیدەمان نەگۆڕێ. لە زوڵمی زاڵمان بە دوورمان کا. زەلیلی دنیا و قیامەتمان نەکا. شیفای نەخۆشمان بدا. لە بەلا و موسیبەت بمان پارێزێ. ئامین.

وَ صَلىٰ اَللّٰهُ عَلىٰ سَيِّدِنٰا مُحَمَّدٍ وَ عَلىٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ السَّلاٰمُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَكٰاتُهُ

# (٤٨)

## باسی سەیید ئەحمەدی رەفاعی

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

أَحْمَدُ مَنْ يُثِيبُ كُلَّ عـامِلِ لِوَجْهِهِ فِي عاجل وَ آجِـلِ
مُصَلِّياً عَلىٰ النَّبِي المـرسل لِـلْعالَمِينَ نـاسِخاً لِـلْمِلَلِ
وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ مِنْ بَـعدِهِ وَ سائِرِ النّحاةِ نَحْوَ قَـصْدِهِ

گۆی گرینە، با لە چەند دەقیقەی داهاتوودا، بچینە بارەگا و بەر دەرگای یەکێک لە ئەقتابی ئەربەعە و یەکێک لە کوڕە خۆشەویستەکانی حەزرەتی عەلی و فاتیمەی زەهرا و فەخری عالەم و وەلی یەک لە ئەولیای خوا، کە لە زەمانی خۆیدا و تا ڕۆژی دوا ڕۆژ فەیز و بەرەکەت و کەشف و کەڕاماتی هەر بەر دەوامە و لە هەموو گۆشە و کەناری ولاتی ئیسلامی، هەزاران کەس پەنای بۆ دەبا و هاواری دەکاتێ.

جا ئەو ئەستێرە گەشەی ئاسمانی ویلایەتە، ئەو سەوڵ لێدەری دەریای مەعریفەتە، ئەو مەلەوانی بەحری حەقیقەتە، ئەو پیری دەستگیری تەریقەتە، ئەو بادە نۆشی مەجلیسی سوبحانیە، ئەو دێوانەی سەرمەستی فانیە، ئەو کلیل بەدەستی دەرگای کەڕامەتە، ئەو سەردەفتەری بارەگای وەحدەتە، ئەو خاوەن سەرچاوەی سەخاوەتە، ئەو گەورهەرەی شەوچرای نبووەتە، ئەو باوک و ئوستادی دەروێشانە، ئەو پێشەنگی کۆڕی زکر و عیرفانە، ئەو تاجی سەر سەری ئیماندارانە، ئەو لەغا و بە دەستی شێر و مارانە، ئەو گوڵی باغی حەزرەتی عەلییە،

جەنابی «سەید ئەحمەدی ڕفاعی»یە. با زۆر بە ئەدەب لە باسی مەجلیسی ئەو قوتبە گەورەدا گوێڕاگرین بۆ باسی ژیان و بە سەرهات و کەشف و کەرامات و خوو ڕەوشت و زوهد و تەقوا و سەخاوەت و خواپەرستی و فائیدەی لێ وەرگرین و داوای بەرەکەتی لێ بکەین.

+ «سەید ئەحمەدی ڕفاعی»، کوڕی سەیدْ سوڵتان عەلی، کوڕی سەیید یەحیای، کوڕی سەید سابتی، کوڕی سەید عەلی حازمی، کوڕی سەید ئەحمەدی، کوڕی سەیید عەلی، کوڕی سەید حەسەنی، کوڕی سەیید مەهدی، کوڕی سەیید محمدی، کوڕی سەیید حەسەنی، کوڕی سەیید حوسەینی، کوڕی سەیید ئەحمەدی، کوڕی سەیید مووسای سانی، کوڕی سەید برایمی مورتەزا، کوڕی ئیمام مووسای کازم، کوڕی ئیمام جەعفەری صادقی، کوڕی ئیمام محمد باقری، کوڕی ئیمام عەلی زین‌العابدینی، کوڕی ئیمام حوسەینی، کوڕی حەزرەتی عەلی‌یە.

«سەید ئەحمەدی ڕفاعی»، لە عەشیرەتی ڕفاعی‌یە و باوکی لە ولاتی مەغریبەوە هاتوەتە «ئومو عوبیدە»، واتە «بەتایح»، کە ئێستا دەبێتە ناوچەی شاری «واست» و «عمارە» لە عێراقدا و لە ڕۆژی پێنج شەممەی پازدەی مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنسەد و دوازدەی کۆچیدا لە ئاوایی «قەریە حەسەن»، «سەید ئەحمەد» لە دایک بووە. کاتێک تەمەنی دەگاتە حەوت ساڵی، باوکی لە بەغدا وەفات دەکا و خاڵی کە شێخ مەنسوری تائیحی‌یە و مەشهورە بە بازی ئەشهەب، سەید ئەحمەد و دایکی و براکانی دەباتە لای خۆی و لە پاشان «سەید ئەحمەد» دەنێرێ بۆ لای زانای پایە بەرزی ئەو زەمانە، جەنابی شێخ ئەبوولفەزلی واستی بۆ خوێندن، کاتێ دەست دەکا بە دەرس خوێندن، لە مەدرەسەی شێخ ئەبوولفەزلدا، زۆر زیرەک دەبێ، لە ماوەیەکی چاوەڕوان نەکراودا، وە پێش موستەعید و مامۆستاکانی دەکەوێتەوە و لەتەواوی عیلمەکاندا ناو بانگ پەیدا دەکا، لە پاشان دەست لە عیلمی زاهیری هەڵدەگرێ و ڕوو دەکاتە تەسەووف و جیهادی نەفس و پشت

دەکاتە سەروەت و سامان و ئەوەتا لە ئاخریدا بوەتە ڕەئیسی دائیرەی تەریقەت و عالەمی ئیسلامی پەیڕەوی لێ دەکا.

ئیبنو خەلکان دەڵێ: کۆڕ و مەجلیسی «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» و حەلقەی زکری مورید و دەروێشەکانی زۆر عەجایب بوو، شتی وایان دەکرد زانایان سەریان لێ سوڕ دەما، دەفەرموێ: بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا «سەید ئەحمەد» خۆی لێ نەگۆڕابوو، زۆر لە سەرەخۆو موتەوازیع بوو، لە کەس تووڕە نەدەبوو، ئەگەر ڕقیشی هەستایە زۆر زوو ڕقەکەی دەخواردەوە، زۆر ڕوو خۆش و دەم بە پێکەنین بوو، هەمیشە زەردە خەندەی لە سەر لێوان بوو، زۆر نان بدە و نان خۆش و سەخی بوو، باوکی فەقیر و هەژاران بوو، زۆر خاوەن بەزەیی بوو، دەچوو بە دەستی خۆی لیباسی گول و داماوانی، دەشت و سەری پاک دەکردەوە و نانی لەگەڵدەخواردن، جاری وابوو حەلقەی زکری دەروێشەکانی دەگەیشتە شازدە هەزار کەس و ڕۆژی دووجار لە سەر سوفرە و خوانی ئەو نانیان دەخوارد.

ئەگەر چاوی بە کوێرێک، پیرێک، سەقەتێک، پەککەوتوویەک، بکەوتایە دەستی دەگرت و دەیبردە ئەو جێگایەی کە بۆی دەچوو. ئەگەر یەکێک نەخۆش بوایە، زوو دەچوو بۆ ئەحواڵ پرسی. کاتێ لە سەفەر دەهاتەوە کە نزیک دەبووە، دەچوو باوەشێکی چرپی و دار کۆ دەکردەوە و وەسەرشانی دەنان، کە دەروێش و موریدەکان دەیان زانی شێخ دار کۆدەکاتەوە، ئەوانیش خێرا هەریەکەی باوەشێکی کۆ دەکردەوە و سەر شانیان دەنا و دەیان بردەوە، کاتێ دەگەیشتنەوە «قەریە حەسەن»، شێخ دارەکانی دابەش دەکرد بە سەر پیرێژن و پەککەوتەو هەژاراندا.

«سەید ئەحمەدی ڕفاعی»، دەرهەق بە هەموو گیان لە بەرێک بە ڕەحم بووە، یەکێک لە زانایان لە حاشیەی کتێبی «مختصر ابن ابی حمزه» دا دەڵێ: سەگێک تووشی نەخۆشی گولی دەبێ، دەچێتە بەر دەرگای هەر ماڵێک دەری دەکەن. ڕۆژێک «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» پێ دەزانێ کە ئەو سەگە تووشی ئەو نەخۆشییە بووە، هەڵدەستی دەیبا لە دەشتێک سێبەری بۆ دەکا و وەختی نان

خواردن، هەموو ڕۆژێ دەچێ نان و ئاوی بۆ دەبا و برینەکانی دەرمان دەکا، تا لە پاش چل ڕۆژ چاک دەبێتەوە، ڕۆژی چلەمین «سەید ئەحمەد» ئاوی بۆ گەرم دەکا پاک و خاوێن دەی شوا و لەگەڵ خۆی دەی باتەوە، خەڵکەکە ئەوە دەزانن عەرزی دەکەن دەڵێن: قوربان، جا چۆن ئەو سەگە، شایانی ئەوە بوو جەنابت ئاوا خزمەتی بکەی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئاخر لەوە دەترسام، کە لە ڕۆژی قیامەتا خواوەندی گەورە موحاسەبەم بکا و بڵێ: «ئەحمەد»، ئەوە بۆ هیچ ڕەحمت دەرهەق بەوگیان لەبەرانە نەبوو؟ لە وە نەدەترسای کە تۆش، تووشی نەخۆشی یەکی ئاوا بی؟ «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» ئاوا بەڕەحم بوو.

دەڵێن جارێک بەلای دووسێ منالدا دەڕوا و تەماشا دەکا شەڕ دەکەن، دەچێ لێکیان دەکاتەوە و ڕوو دەکاتە یەکێکیان و دەفەرموێ: ڕۆڵە، کوڕی کێی؟ کوڕەکە بە تووڕەییەوە دەڵێ: جا تۆ چ کارت بە سەر منەوە داخۆ کوڕی کێم، «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» دەست دەکا بە گریان و دەفەرموێ: بەڕاستی ڕۆڵە، ئامۆژگاری یەکی باشت کردم، خوا پاداشت بداتەوە.

«سەید ئەحمەدی ڕفاعی» تووشی هەر کەس بوایە، ئەو لە پێشدا سەلامی دەکرد، وەک لە پێشدا باسم کرد زۆر بە ڕەحم بووە، جارێک لە کاتی نوێژدا پشیلەیەک لە سەر فەقیانەکەی خەوی لێ دەکەوێ، دڵی نایە وەخەبەری بێنێ، ناردی مەقەستێکی بۆ هات و فەقیانەکەی بڕی تا خەوەکەی لێ تێک نەدا و هەستا چوو بۆ جەماعەت، لە پاش نوێژ هاتەوە بە سپاوی بەدەرزی و دەز و فەقیانەکەی دوریەوە، هێشتا پشیلەکە وەخەبەر نەهاتبوو.

جارێکی‌تر دنیا زۆر سارد بوو، دەس نوێژی هەڵگرت و ماوەیەکی زۆر دەستی ڕاگرت، لەو کاتەدا، یەعقوبی خادیم هات بچێ بۆ سەر منارەکەی مزگەوت بانگ بدا، پەلاماری دەستی «سەید ئەحمەدی»دا و ماچی کرد «سەید ئەحمەد» فەرمووی: ئای یەعقووب! لەو زەعیفەت تێکدا، یەعقوویی خادیم گوتی: قوربان، کام زەعیفە؟ فەرمووی: ماوەیەک بوو ئەو مێشوولە بە دەستمەوە

بوو، ڕزقی خۆی دەخوارد، تۆ هاتی هەڵت فڕاند!!

خۆ ئەگەر باسی کەشف و کەڕاماتی بکەین، ئەوە لە حیساب نایەن، هەتا دنیادنیایە هەزاران شێخ و دێوانە و دەروێش هەر لە سەر حیسابی ئەو جۆرە کارانە دەکەن، بەڵام با بۆ نموونە، کەڕاماتێکی «سەید ئەحمەدی ڕفاعی»تان بۆ وەگێڕم.

لە ساڵی پێنج سەد و پەنجا و پێنجی کۆچیدا، «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» و شێخ عبدالقادری گەیلانی و شێخ حەیاتی حەرانی و شێخ عودەی شامی و چەند ئەولیا و پیاوی گەورەی تریش، لەو ساڵەدا دەچن بۆ حەج. کاتێ چوونە مەدینە بۆ زیارەتی پێغەمبەر، (سەلات و سەلامی خوای لە سەر بێ)، لە بەرامبەر ڕەوڵەی حەزرەت بە سەف ڕاوەستان و سەلامیان لە پێغەمبەر و حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر کرد. «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» حاڵەتی بەسەردا هاتو بە سەرچۆکدا کەوت و دەستی کرد بە گریان و زۆر گریا، لە پاشان بە دەنگی زۆر بەرز نەعرەتێکی لێدا و گوتی:

فِي حَالَةِ الْبُعْدِ رُوحِي كُنتُ أَرْسِلُها تَقَبِّلُ الأَرْضَ عَنِي وَهِيَ نائِبَتِي

وَ هٰذِهِ دَوْلَةُ الأَشباحِ قَدْ حَضَرَت فَامْدُدْ يَمِينَکَ کَيْ تَحظَىٰ بِهٰا شَفَتِي

ئەی باپیرە، لە کاتی دووریدا ڕۆحم دەناردە خزمەتت، تا لە وەکالەتی من خاکی بەری پێت ماچ کا، بەڵام لە سایەی خواوە ئێستا خۆم هاتوومە بەردەمی بارەگات و لە خزمەت ڕەوڵەی موبارەکتدا بە چۆکدا هاتووم و سەری تەعزیمم بۆ دانەواندی، تکات لێدەکەم بێ دڵم مەکە، دەستی موبارەکت بێنە با زیارەتی کەم و لێوم ئەو بەهرەی دەست کەوێ، دەڵێن: بە ئەمری خوا لە پێش چاوی ئەو ئەولیا و حاجیانە، دەستی موبارەکی پێغەمبەر لە ڕەوڵەی شەریفەوە هاتە دەرو «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» ماچی کرد و ئاوا بووەوە.

لە زەمانی زانای بە ناو بانگ، شێخی سیوتیدا، عەرزیان کرد: قوربان، ئەو قسە ڕاستە کە دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ) دەستی موبارەکی بۆ

«سەید ئەحمەدی ڕفاعی» هێناوەتە دەر و ماچی کردووە؟ شێخی سیوتی، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا، ریساڵەیەکی نووسی و چەند حەدیسی لە سر مەعنای ئەوە هێنایەوە کە پێغەمبەران، بە تایبەتی پێغەمبەری خۆمان، لە گۆڕدا نامرنو زیندوون و ئاگایان لە هەموو شتێک هەیە و دەتوانن زۆر شت بکەن. فەرمووی: بەڵێ ئەوەی لە «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» دەگێڕنەوە، شکی تێدانیە و ئینسانی خاوەن ئیمان دەبێ باوەڕی پێ بێ، دەنا بۆ ئیمانی زەرەرە. فەرمووی: «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» یەکێک بووە لە ئەولیای گەورە و کێوێک بووە، لە کێوە قایمەکانی ئائینی بەرزی ئیسلام و بە حرێک بووە بۆ سەرچاوی سوننەت و ڕەئیسی ئیمانداران و گەورە و پێشەوای قەوم بووە. فەرمووی:

هَيْهَاتَ أَنْ يَأْتِي الزَّمانُ بِمِثْلِهِ إِنَّ الزَّمـانَ بِمِثْلِهِ لَـبَخِيلُ

زۆر دوورە، کە جارێکی‌تر دایکی زەمانە ئەولادێکی‌تری وای ببێ، چونکە بە ڕاستی زەمانە بەخیلە و دڵی نایە جارێکی‌تر ئەولادێکی ئاوا پێش کەش بە خەڵک بکا.

لە لایەکی تریشەوە «سەید ئەحمەدی ڕفاعی»، مەجلیسی ئامۆژگاری زۆر گەرم بووە، فەرمایشتی وای فەرمووە دەبێ وەکوو ئاڵقە بیانکەینە گوێ. شێخ یەعقوبی خادیم دەڵێ: ڕۆژێک «سەید ئەحمەدی ڕفاعی»، تەماشای دار خورمایەکی کرد و فەرمووی: یەعقووب، تەماشای ئەو دار خورمایە بکە، چونکە خۆی بەشت دەزانێ و سەری بەرز کردوەتەوە، خواوەندی گەورە ئەو بارە قورسەی لە سەر سەری داناوە، بەڵام یەعقووب، تەماشای داری کولەکە بکە، چونکە ڕووی خۆی بەکەم گرتن و تەوازوعی لە سەر خاک داناوە، ئەگەر دەیان کولەکەی گەورەش بگرێ، ئەزیەتی پێناگا و ئەرز بارەکەی بۆ هەڵدەگرێ. فەرمووی: ئینسانیش ئاوایە، ئەوەی سەرکێشی بکا، باری خۆی گران دەکا و ئەوەی تەوازوعیش بنوێنێ، باری شانی سووک دەبێ و کەمتر هەست بە ئازار و نارەحەتی دەکا.

دەیفەرموو: هەرکاتێ هاتنە لام و هیچی خواردنم لانەبوو، داوای دۆعای بە خێرم لێ بکەن، چونکە لەو کاتەدا ماڵەکەم وەک ماڵی پێغەمبەر دەچێ.

دەیفەرموو: برای ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە، ئەگەر ئاگای لێ نەبێ، ماڵیشی بخۆی، ناڕەحەت نەبێ، کە چاوی بە دەروێشێک دەکەوت، عەبا و بەرگی دەروێشی لە بەردا بوو، دەیفەرموو: کوڕم، تەماشای خۆت بکە. لیباسی کێت لەبەر کردووە؟! بزانە خۆت نیسبەت داوە، وەلای کێ! دەیفەرموو: ئەو بەرگەی لە بەرت کردووە، ئەگەر، بەرگی ئەنبیا و ئەولیا و پیاوچاکە، دەبێ لە کردەوەشدا ڕێبازی ئەوان بگری، دەنا عەیبە، ئەو لیباسە لە بەر مەکە، با ئابڕوی پیاو چاکان و دەروێشان بە تۆوە نەچێ.

دەیفەرموو: ئەگەر دڵ پاک و ساڵح بوو، ئەوە دەبێتە جێگای وەحی ئەسراری خواوەندی گەورە و دەبێتە سەرچاوەی نوور و دەبێتە مەنزڵی مەلائیکە، بەڵام ئەگەر پاک نەبوو، تاریک و فاسید بوو، ئەوە دەبێتە کانگای زوڵم و شوێنی شەیتان و فەساد.

دەفەرموو: ئەوەی سوود لە کردەوەم وەرنەگرێ، سوود لە قسەکانیشم وەرناگرێ و هەر برایەک لە دنیادا سوودی بۆ برای موسوڵمانی نەبوو، لە قیامەتیشدا سوودی بۆ نابێ و ئەگەر شتێکتان زانی، بە خەڵکی بڵێن، تا خێرتان بگا.

دەیفەرموو: ڕێبازی ئێمەی دەروێش، بناغەکەی لە سەر سێ شت دانراوە: یەکەمیان ئەوەیە، کە داوا نەکەین. دووەمیان ئەوەیە، شت ڕەت نەکەینەوە. سێیەمیان ئەوەیە، کە شت زەخیرە نەکەین.

کە چاوی بە پیرێک دەکەوت، دەچوو بۆ لای کەس و کاری و دەیفەرموو: ئاگاتان لێ بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر بێ)، فەرموویەتی: هەر کەسێک حورمەتی پیرێک بگرێ، کە پیر بوو، خواوەندی گەورە یەکێکی بۆ دەنێرێ خزمەتی بکاتەوە.

«سەید ئەحمەدی ڕفاعی» بەحری سەخاوەت و دەریای تەوازوع بوو، بە

دەیان شەیتان سیفەتانی ئادەمی ڕوخسار، شلۆ نەدەبوو، لە دەور و بەری شاری «قەریە حەسەنی»، کابرایەکی زانای زاڵمی مونکیر، زۆری شێخ ئەزیەت دەدا، هەر دەروێشێکی بدیایە، نامەیەکی پێدا دەنارد بۆ شێخ و دەیان جنێوی تێدا دەنووسی و دەیگوت: ئەو نامە بەرە بۆ شێخ. کاتێ شێخ نامەکەی دەخوێندەوە دەیان قسەی ناشیرینی تێدا نووسرابوو، لە پاشان ڕووی دەکردە ئەو کەسە کە نامەکەی بۆ دێنا، دەیفەرموو: ئەوەی ئەو کاغەزەی داوە بە تۆ ڕاست دەکا و دەستی دەبرد شتێکی دەدایە و دەیفەرموو: خوا پاداشت بداتەوە، چونکە تۆ بوویە هۆی ئەوە کە ئەو خێرەم پێ بگا. کاتێ کابرای ناپیاو، زانی کە «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» وەک دەریا وایە و بە هیچ لێڵ نابێ، لە کردەوەی خۆی پەشیمان بووە و بە سەری ڕووتی و بە پێی پەتی، مێزەرەکەی لە ناو قەدی خۆی خستبوو، یەکێک ڕای دەکێشا و هاتە خزمەت «سەید ئەحمەد»، شێخ فەرمووی: ئەوە بۆچی وات کردووە؟ خۆ تۆ هەر چاکەت بۆ من بووە، کابرا دەستی کرد بە گریان و گوتی: قوربان، تۆبە، و دەخالەت پەنام بۆ تۆ هێناوە، شێخ عەفووی کرد و کابرا بوو بە یەکێک لە موریدەکانی «سەید ئەحمەدی ڕفاعی».

ئاگای لە زۆر شت بووە. دوو خەلیفەی بوو، یەکێکیان ناوی مەعالی و ئەوی دی ناوی عبدول مونعیم بوو، ئەو دوو خەلیفە یەکتریان زۆر خۆش دەویست، ڕۆژێک چوو بوون بۆ دەشت و سەحرا، یەکێکیان بەوی تری گوت: دەمێکە ئێمە لەبەر خوا یەکترمان خۆش دەوێ و لە خزمەت شێخداین، لە خوا داوادەکەم بە گەورەیی خۆی و لە بەر خاتری ئوستادەکەمان و لە بەر برایەتیمان لە ئاگری دۆزەخ بمان پارێزێ. ڕاوی دەڵێ: بە ئەمری خوا لەو کاتەدا باێکی هەڵکرد و لە ئاسمانەوە کاغەزێک بەربووەوە بەر دەمیان، تەماشایان کرد هیچی تێدا نەنووسرابوو، گوتیان: با بیبەینەوە بۆ لای شێخ، کاتێ گەڕانەوە، کاغەزەکەیاندا بە شێخ، تەماشایەکی کرد و چوە سوجدە، لە پاشان سەری هەڵبڕی و فەرمووی: حەمد و سەنا بۆ خوا، کە هەر لە دنیادا نامەی ئازادی دوو موریدی نیشان

دام،گوتیان: قوربان، خۆ ئەو نامەیە هیچی لێ نەنووسراوە، فەرمووی: کوڕی خۆم، نامەی دەستی قودرەت، بە مەرەکەب نانووسرێ تا ئێوە ببینن، بە نوور دەنووسرێ.

ڕۆژێک لە مەجلیسی «سەید ئەحمەد»دا باسی شێخ عبدالقادری گەیلانی‌یان دەکرد، کابرایەک گوتی: بەسە تاکەی تەعریفی شێخ عبدالقادر دەکەن، «سەیید ئەحمەد» تووڕە بوو خێ‌سەیەکی لە کابرا کرد و بە ئەمری خوا هەر لە مەجلیسەکەدا کابرا مرد. «سەید ئەحمەد» ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: کێ دەتوانێ بە تەواوی باسی گەورەی عبدالقادری گەیلانی بکا و کێ دەتوانێ بگاتە پلە و پایەی ئەو؟ فەرمووی: شێخ عبدالقادر لە لایەک دەریای شەریعەتە و لە لایەکی ترەوە بەحری حەقیقەتە و لە هەر دوو لادا بە ئارەزووی خۆی دەتوانێ مەلە بکا، ڕووی کردە موریدەکان، فەرمووی: وەسیەت بێ، هەر کاتێ چوونە بەغدا، لە پێشدا بچنە زیارەتی عبدالقادر، یا دوای وەفاتیشی بێ، فەرمووی: چونکە عبدالقادر فەرموویەتی: ئەوەی تاماوم بێتە لام، یا لە دوای مردنم بێتە سەر گۆڕەکەم، بە ئاواتی خۆی دەگا. فەرمووی: ئەو ڕۆژە کە عبدالقادر لە سەر مینبەر فەرمووی: [قَدَمي هذِهِ عَلىٰ رَقَبَةِ كُلِّ وَلِيٍّ اللهِ] وا پێی من لە سەرەوەی گەردەنی هەموو ئەولیایەکە، یەکەم کەس کە سەری دانەواند من بووم، عبدالقادر ئەوەندە گەورەیە.

شێخ یەعقووبی خادیم دەڵێ: کاتێ «سەید ئەحمەدی ڕفاعی» نەخۆش کەوت، لە خزمەتیدا بووم. ڕووی کردە ئاسمان و فەرمووی: ﴿للَّهُمَّ اجْعَلْنِي سَقْفَ الْبَلاءِ عَلىٰ هٰؤُلاءِ الْخَلْقِ﴾ ئەی خوای گەورە! من بکە بە، بانی بەڵا گێڕەوە لە سەر ئەو خەڵکە. دەڵێ عەرزم کرد: قوربان، ئەوە بۆ وا دەفەرمووی؟ فەرمووی: بەڵایەکی زۆر گەورە ڕووی کردە ئەو خەڵکە و من بە باقی تەمەنم لە خوای گەورەم کڕی و لە سەر خەڵکم لابرد. دەڵێ ئەوەی فەرموو لە پاشان فەرمووی: ﴿أَشْهَدُ اَنْ لاٰ إِلٰهَ إِلاَّ ٱللهُ وَ أَشْهَدُ اَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ ٱللهِ﴾ ئەوەی گوت و لە ڕۆژی پێنج شەمەی

دوازدەی مانگی جیمادولئولا، لە ساڵی پێنج سەد و حەفتا و هەشتی کۆچیدا، وەفاتی فەرموو، لە ڕۆژی پێنج شەممەی پازدەی مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنج سەد و دوازدەی کۆچیدا، لە دایک بووە. واتە تەمەنی شەست و شەش ساڵ بووە و لە بارەگای خۆیدا، لە «قەریە حەسەن» تەسلیم بە خاک کراوە. (ئەمن نووسەری ئەو کتێبەم لە گەڵ خەتیبی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی شێخ محمدی قەرەداغی و چل مەلای‌تر لە ساڵی هەزار و نۆسەد و هەشتا و حەوتی زایینیدا چووینە زیارەتی لە ناحیەی «قەریە حەسەن» کە لام وایە سەر بە لیوای «واسیتە» بە لای شاری «عەممارەوەیە».

ئەوەبوو بە کورتی باسی ژیان و فەرمایشتە جوانەکانی «سەید ئەحمەدی» ڕفاعی، ئومێد دەکەم سوودتان لێ وەرگرتبێ. لە کۆتاییدا لە خواوەندی گەورە داوا دەکەم، کە بۆ خاتری گەورەیی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەر و حورمەتی ئەو پیاو چاکانە، عەفوومان بکا. ئیمانمان بە نسیب کا. فەقیری دنیا و قیامەتمان نەکا. شیفای نەخۆشمان بدا. رزق و ڕۆزیمان زیاد کا. لە شەڕی شەیتان و بەلای ناگەهان بە دورمان کا. لە ژێر ئالای پێغەمبەردا، لە گەڵ پیاو چاکان حەشرمان بکا. ئامین.

وَ صَلیٰ اللهُ عَلیٰ سَیِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلیٰ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ سَلِّمْ. وَ السَّلامُ عَلَیْکُمْ وَ رَحْمَةُ اللهِ وَ بَرَکاتُهُ

له دانان و نووسینەوەی ئەم بەرگی دووەمی مەجلیسی ئەولیایە بـوومەوە، له ڕۆژی بیستی مانگی ڕەبیع الاوەڵی ساڵی هەزار و چوارسەد و دوازدەی کۆچیدا، بەرامبەر بە بیست و هەشتی مانگی سپتامبر (مانگی نۆیی) ساڵی هەزار و نۆ سەد و نەوەد و یەکی زایینی، له شاری سولەیمانی، له خوای گەورە داوا دەکەم کە وەک بەرگی یـەکـەم له چـاپ بـدرێ و مـوسوڵمانان بـیکەنە شـەو چـەرەی کـۆڕ و مەجلیسەکانیان و سوودی لێ وەرگرن و دوعای خێریش بـۆ مـن بکـەن، خـۆ هیچیان لێ کەم نابێتەوە. وَ آخِرُ دَعْوٰنَا اَنِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعٰالَمِینْ